2000

ڕۆمان

# پیرشالیار

نووسینی

حەمە کەریم هەورامی

2004

2704

حکومەتی هەرێمی کوردستان
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە
زنجیرە (٢٥٠)

رۆمان

# پیرشالیار

نووسینی:
حەمە کەریم هەورامی

2004- 2704

# پیرشالیار

ناوی نووسەر: حەمە کەریم هەورامی
تایپ: ئاویستاو بێساران حەمە کەریم
نەخشەسازی: زاگرۆس مەلا مەحموود
نەخشەسازی بەرگ: دیاری جەمال
سەرپەرشتیاری چاپ: عەتا مەحمود
تیراژ: (١٥٠٠)دانە
ژمارەی سپاردنی(٣٤٥)ی ساڵی ٢٠٠٤ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە
سایتی وەزارەتی رۆشنبیری: www. roshnbiri. org

## خوێنەری بەڕێز

* کەش‌و هەوای رۆمانی(پیر شالیار) لەفەزاو زەمینەی کات‌و شوێنی ئەوسای کوردەواری‌و ناوچەی هەورامانی پێش سەد ساڵەی هاتنی ئیسلامەوە هەڵ هێنجراوە... ئەوکاتە هاوچەرخی دوا سەد ساڵەی دەوڵەتی ساسانی بووە، کەزۆربەی مێژووناسانی ئەمڕۆ وای بۆ دەچن کە ئەو دەوڵەتە چۆن لەناو جەرگەی وڵاتی کوردانداا سەری هەڵداو بنیات نرا ، هەروەهاش بنەچەی دامەزرێنەرو پاشاکانی بەرەگەزو رەچەڵەك کورد بوون... لەدوا سەردەمی فەرمانڕەوایی ئەو دەوڵەتەدا پیر شالیاری هەورامی کە یەکێك بووە لە گەورە پیاوانی ئەو سەردەمە سەری هەڵداوە.....ئەو پیر شالیارەی کە تا ئێستاش چەرخی ناهەمواری گەردوون نەیتوانیوە ناوو ئاسەوارو پەندەکانی لە هۆشی مێژووی کوردا یادەوەرییەکانی بسڕێتەوە، ئەو پیر شالیارە، پاڵەوانی سەرەکی ئەم رۆمانەیە، هەموو رووداوو، وردو درشتێکی پێکهاتەکانیشی لە سرۆش‌و کاریگەری ئەو لە دەورووبەرەکەیدا سەرچاوەیان بەستووە، وەك دەردەکەوێ ئەو پیر شالیارە(نوێگەری ئاینی زەردەشت)بووە.

* هەندێ‌لەوانەی لەسەر ئەو پیرەیان نوسیووە، وێڕای ئەوەی ناوەکەیان شێواندووە، پێناسەیەکی تریان بۆ داتاشیوە! گوایا بەنیازی خۆیان لەم کارەیاندا ویستویانە چاکەی بۆ بکەن و چەند سەدەیەك بۆ پێشەوە هێناویانەوخستویانە تەك خەڵکانی تر! گوێیان بەوە نەداوە، بەو کارەیان مێژووی کورد دەشێوێنن، هەر

ئەو کارەیان بووەتە هۆی ڕێ گومکەرە بۆ ئەوانەی کە دەیانەوێ مێژووی ئەمڕۆمان بەدوێنێمانەوە ببەستنەوە... سەرەڕای ئەوەش ئەوشێواندنەیان بووەتە هۆی خەفەکردنی چرایەکی رووناکی دیکەی ناو مێژووە شپرزەکراوەکەی نەتەوەکەمان

* هەندێکی تر لە نووسەران پێیان وایە، چەند پیر شالیارێك هەبوون، گوایە دوا پیر شالیاریان ئەوە بووە کە دەکەوێتە پاش فەتحی ئیسلامییەوە! ئەو نووسەرانە بۆ ئەمەیان خەرقەیەکی عەرەبیان بۆ دووریوەو بە ئارەزووی خۆیان ناویان لێ ناوەو پاشبەندی ناوەکەیان بە تاڵەموێکی باریك بۆ عەرەبستان راکێشاوە!!

* جا گریمان وایە.. کەلەراستیدا وانییە.... ئەی پیرشالیارەکەی یەکەم کێ بووە؟ ناوی چی بووە؟

کەس خۆی لەبواری وەرامدانەوەی ئەم پرسیارە نەداوەو هۆکەشی دیارە لەبەر چییە؟.

* ئەوەی گومانی تیا نەبێ: بەر لەهاتنی ئیسلامو سەقامگیر بوونی ئاینی زەردەشت لەوڵاتی کوردانداا بەتایبەتی لەدەڤەری هەوراماندا زاتێکی مەزن هەبووە نازناوی(پیر شالیار)بووە، ئەو زاتە زانایەکی گەورەی سەردەمی خۆی بووە، لە ئاینناسیو حیکمەتسازیدا لەهەموو پیرەکان شارەزاتر بووە، بە پیری پیران یان مۆبیدی مۆبیدان ناسراوە، رابەرو سەرچاوەی رێنماییە ئاینییەکان بووە.

* پیر شالیاری هەورامان تا ئەمڕۆش ناوی وێردی سەر زمانەو ئاسەوارەکانی شاهیدی پایەداری ئەو کەسە هەڵکەوتەیەن..... ئەی ناوی چی بووە؟

* ماوەیەکی زۆر بوو سەودا سەری گەڕان بەدوای ناوی ئەو زاتە بزرگە بووم، خولیای بۆ دۆزینەوەی ناوەکەی وایلێ کردم کە بەدوای چەندان سەرچاوەدا

بگەڕێمو چەندان پرس‌وڕا بە کەسانی بەتەمەنی ناوچەی هەورامان بکەم..... تا لەدواییدا بە شوێنەوارو کۆپلە شیعرەکانی پاشماوەی خۆیدا بۆم دەرکەوت کەناوی(سیمیار) بووە....

* هەڵ هێنانی ئەو ناوە دەروازەیەکی گەورەی بۆ من خستە سەر پشت‌وئاسۆی تێڕوانینی ئەم رۆمانەی بەرفراوان تر کرد.... ئەم سیمیارە بەر لەوەی نازناوی پیر شالیاری بدرێتی بە (زانای سیمیار) ناودار بووە، رێی تێدەچێ(زانای سیمیار) ئەو کەسە بێ کە پاشاکانی ساسان داوایان لێ کردبێ کە پارچە پەرش‌و بڵاوەکانی ئاوێستای بە تاڵان براوکۆ بکاتەوە و زەندێکیان بۆ بنوسێ کە ئەم زەندە مێژوونوسان بە (دین کورد)واتە(دینی کوردان) ناوی دەبەن، کەزانای سیمیار ئەو کارەی بەئەنجام گەیاند لەلایەن پاشای ساسانەوە ئەو نازناوەی بە شایستەی خۆی پێ درابێ...... لەوانەشە پاش خۆی ئەو نازناوە لەفەرهەنگی کوردەواریدا جێگیر بووبێ و وەك میراتێك بەو پیرانە بەخشرابێ کە لە شاری هەوراماندا کاروباری ئایینیان پێ سپێررابێ.....

* لەم رۆمانەدا چەند پێم کرابێ ئەوەندە هەوڵم داوە لە لۆجیك‌و بیروباوەڕو رەوشت‌و خوو خدە و نەریت‌و کاروکردەی دەڤەری هەورامانی ئەو سەردەمە نزیك ببمەوەولە ئاستی ئەواندا بار بخەم و لەبەر بەرۆچکەی ئەواندا خۆم بکەمەوە، بۆیە برێ جار هەر لەبەر تام‌وچێژ ساودان هەندێ دەستەواژەو زاراوەم بە شێوەی هەورامی بەکار هێناوە .......

* گەلێ هەوڵیشم دا ناوی خێزانەکەی پیرشالیار بدۆزمەوە،پرس‌و رایەکی فرەم لەو بارەوە کردووە، وەلێ ئەو ناوانەی کەپێم وتران نەیان گەیاندمە رادەی دڵنیایی....لە بەر ئەوە وام بە پەسەند زانی ناوی بنێم(نازەنین)....هەم وەك

سمبولێك بۆ شكۆمەندی ئافرەتی كورد بەكارم هێناوە..هەم وەك هێمایەك بۆ گشت ژنانی دەڤەری هەورامان

* هەورامان: هەم دەڤەرەو هەم دێیەكی گەورەیە كە دەكەوێتە ناوەڕاستی دەڤەرەكە.. هەورامییەكان، هەر لە كۆنەوە پێیان وتووە (شاری هەورامان) من لەم رۆمانەمدا تائەوكاتەی پیرشالیار كردوویەتی بە سەنتەری ئەو ناوچەیە هەر بە(دەگای هەورامان) ناوم بردووە(دەگا) لە شێوەزاری هەورامیدا واتە گوندێكی گەورە...

* ئەم رۆمانە پێشكەشە بەو رێنیسانسە رۆشنبیرییە كە ئەمڕۆ لەكوردستاندا دەستی پێكردووە.. هەروەها بۆ هاوسەرم: دایكی ئاوێستا، ئەو نازەنینەی كە هەر بەرهەمێكم بە رۆڵەیەكی جگەرگۆشەی خۆی دەزانێ

٢٠٠٣/٢/٤

هەولێر

# (١)

لەو شەوە کپ‌و مات‌و ساردو سڕەی مانگی ڕێبەنداندا هەموو خەڵکی دەگای هەورامان: هەر کەسەو لەماڵی خۆی‌و لەگەڵ خێزانی خۆیدا لە دەور ئاگردانی گەرمدا دەستی لەمل خەوی شەوگاری ماندوو کردبوو، (خواداد)نەبێ لەداخ (پەسەند)ی ژنی‌و لە پەژارەی (سیمیار)ی برازای خەو لەچاوی تۆرابوو.. نەخەوتنەکە وای ڕەتاندبوو خراپ کاتەکەی لێ تێك دابوو، نەی دەزانی شەوگارەکە چۆن هاتووەو چۆن چووە وەلێ کەرووی بەلای ئاگردانەکەدا وەرچەرخان‌و دی سکڵی ئاگرەکە خۆی لە خۆڵە مێشەکەی پێچاوەو تروسکەی لێوە نایەت ئەوجا زانی خەو بەبێ پرسی ئەو نەك لەچاویەوە بەڵکو لەناخییەوە دزەی لێ کردووەو بەرەو مەملەکەتی خەون بردویەو لەوێ بەدیداری (هورمزیار)ی برای – باوکی سیمیار– شادی کردووە، ئەی کە ڕوانییە ئەو خەونە ڕەنگینەی چۆن بینی؟ ئەوە بوو لەو خەونەیدا دی: هورمزیاری برای گۆچانێکی بەمرواری مۆتریەکراوی هەمە ڕەنگەی بەدەستەوە داو پێی وت(خواداد ئەم گۆچانە بگرەو بیدە بە سیماری کوڕم، بابەو گۆچانە بزنەو بەرخ‌و ئاژەڵەکانت بۆ بەخێو بکات‌و بە نووکەکەی هەم تێر شیریان بکات هەم شمشاڵیان بۆ بژەنێ، نەکا چەمەی ئەم گۆچانە بەردا...). کە هورمزیار گۆچانەکەی لە مووچی دەستی خوادادنا ولەبروسکەولەچاوتروکاندن خێراتر لە قوڵایی ئاسمانێکی نوورانیدا توا یەوە...گۆچانەش خوادادی بەرەو جیهانی ماسووت هێنایەوە...... گۆچانەکە

سەیر بوو لە خوارەوە حەوت کونی شمشاڵ ئاسای تیا بوو، نووکەکەی لە گوانی بزن دەچوو، لەسەرەوە بە جۆرە نووسینێك نەخشێنرابوو مەگەر هەر لەو خەونەدا نەخش‌و نیگاری وای دیبێ....

خواداد کە بەئاگا هات سەیرێکی ناو مووچی دەستیخۆی کرد، بۆ ئەوەی گۆچانەکە لە دەستی بەر نەبێتەوە بە پەنجەکانی توند ناو لە پی دەستی راستی خۆی نووقاند...خەو بەبینینی گۆچانەکە ماڵە تاریکەکەی خوادادی کردبوو بە دنیایەکی وەها کە جێگای هەموو کەسی تیا دەبووەوە....لە شوێن خۆی نەبزواو هەوڵیدا بەناو خەونە ناکاوەکەیدا روو بچێتەوە، بەڵام سوودی نەبوو...نەچاوەکانی دەنووقاو نە ناخی دەروونە رووناکەکەی خەفە دەبوو....لەناو نوێنەکەیدا خەیلێ خۆی مات دا بەڵکوئێ!.. پرخەی خەوتنەکەی(پەسەند) خوادادی هەڵ نا کەبچێتە دەرەوە، نەوەك ئەویش کەوتبێتە ناو خەونێکی وەهاوە، هەم بە چوونە دەرەوەکەی کاتەڵێ شێواوەکەی دیاردەکاتەوە، هەم سەرێکی سیمیاری برازای دەدات...

کە دەرگاکەی کردەوە هەستی بۆ دواوەی خۆی راگرت، زانی پەسەند بەجیرەی گێژەنەی دەرگا کردنەوەکە بە ئاگا نەهات.. لە بەر تارمەی بانێژەکەدا راوەستاو سەیری ئاسمان‌و شاخەکانی هەر چوار لای دەگای کرد جگە لەهاژەی ناو مێشکی خۆی‌و دەنگی قەڵبەزە خنکاوەکانی ژێر بەفرەکە نەبێ هیچ دەنگێکیتر نەدەهاتە گوێی...ئەو دوو رۆژو شەوەی پێشو پەردەی کش‌و ماتی بەسەر دەورو بەرەکەدا دابوو، شاخەکان بە شاڵێکی سپی‌و هەڵاوەیی دەرەدامێن‌و بێ گەردەوە لە ئاستانەی ئاسمانێکی ساف‌و شینی پڕ لە ئەستێرەی ورشە دارەوە راوەستابوون، دەتووت: مۆغانە زەردەشتییەکانن دەیانویست لەو شەوە کپەدا خۆیان بدەنە بەر شەپۆلی میهرو روناکی خواوەند...جگە لەبن پاساری ماڵەکان نەبێ، تاکە

خاڵێکی ڕەش لەسەر گۆنای ئەو بووکە ڕازاوەی سروشتدا بەدی نەدەکرا، ئەویش بۆ ئەوە بوو تا ڕێگە بدات پڵپڵەو گوارە چلوورینەکانی دەگا شۆڕببنەوەو بریقەو ورشە بدەنەوە....

ئەستێرەکان بە پرشەو ورشەی یاقوتیوزیوینی خۆیان شاباشی ئەو بووکەیان دەکرد، هەر دەڕۆیشتنو بۆ ئەو ئاوڕیان دەدایەوە، دیار بوو مژدەی هاتنی ڕۆژێکی پڕ بەختەوەری ئایندەیان دەگەیاند بۆیە بە ئاستەم دەڕۆیشتنو لە ورشە وەشاندن نەدەکەوتن، مانگ بەجێی هێشتبوون دەنا ڕادەوەستانو نە دەڕۆیشتن.......

ئەو گەردە تەڵخانەی کە ڕەوشە تازەکەی ناو ماڵەوەی خواداد هێنایو بەرووی پەردەی دڵیدا دابووی، لە ناو جاویدانی ئەو سروشتە بێ سنوورەدا ڕەویەوەو وەك مینای بێ گەردی لێ کرد.

ئەو وای دەزانی بەرەو بەیانەو خەڵکی دەگا زانیویانە سروشت هەموو هێزی زستانی خستووەتە کارو بەفر هەمو شاخ ودۆڵ و چەم و دارو دروختێکی پێکەوە ماڵەداوەو لە ئامێزی خۆیدا خڕی کردونەتەوەو ئەوجا مەودای بە ئەستێرەکان داوە بکەونە ڕوانینو سەیرکردنی ئەو ئارایش دانە.... ئیتر خەڵك لە بن ئارای ئەو بووکەدا خپو بێ دەنگ دەبن لەناو نوێنی گەرمدا دەست لە مل خەونە ڕەنگینەکانیان دەکەن، خەڵك وا ڕاهاتبوون لە هەوری وادا مەڕو ماڵاتەکانیان ڕانەدەنو نەیانبەنە دەرەوە.... خواداد بۆ ئەوەی خۆی لەوە دڵنیا بکات شەو چەندی ماوەو چەندی ڕۆیشتووە. هەنگاوێکی بەرەو ڕۆخی گوێسەوانەکە ناو ڕوانییە پەرستگاکەی ئەوبەری دەگا. نە ڕووناکی نە تروسکەی ئاگری بەدی نەکرد... لەوە حاڵی نەبو کە ئایا بەفر بەری داڵانی پەرستگاکەی داپۆشیوە؟ یان ئەو ئاگرەکەی نابینی؟ یا مۆغانی پەرستگاکەش وەك خەڵکانی تری دەگا لە ناو خەودا نقوم بووە! لە ئاگر کردنەوەکە بێ ئاگا بووە! چی تیایە

ئەویش وەك هەر كەسێك مرۆڤەو ڕەنگە لەبەر سەرماو جوانی سروشتو كەیل بوونی كەشو هەوا لەناو باڵنگانی نەرمدا دەستی لەمل بووكە خەوینەی خۆی كردبێ....

لەو كاتەدا خواداد ئاواتە كۆنەكەی جارانی خۆی كەوتەوە یاد كە لە مێژبوو ئاواتی دەخواست دەگای هەورامانیش وەك وڵاتانی تری ئاریان زەمین ئاتەشگایەكی گەورەو پەرداخی وایان هەبێ، هەم ئارامگەی هەژاران بێ هەم پەرستگاو هەم كاروان سەراو شوێنی فێركردن بێ.......

مەخابن لەوا بوو، خواجە بەهمەن خۆی بە سەرداروو میرزا دەزانێ كەچی خەمی پەرستگاكەی لەبەر نەبوو، لەدڵەوە دەیوت:

– ئەگەر ئەو نەبوایە، لەزووەوە بەیەك گەلەكاری جوانترین پەرستگامان دروست دەكرد.........

پاگژ بوونەوەی پەردەی سنگی خواداد وردە هزركاری دەرگای مەملەكەتی خەیاڵاتی بۆ خستە سەر پشت باش بوو كۆخە كردنەكەی پەسەندی ژنی زنجیرەی ئەو وردە خەیاڵانەی لێ پچڕاندو بردیەوە سەر هۆی هاتنە دەرەوەكەیو.. ئیدی هەست ڕاگرتنی بەگوێیدا چپاندی:

ئەگەر شەو درەنگە ئەی بۆ بارەو پرمەی ئاژەڵەكانمان نایەت؟. ئەگەر هیشتا زووە ئەی بۆ ئەستێرەی گەلاوێژ پاش كەرنەڤاڵی ئەستێرە گەشەكان كەوتووە هێشتا ئەوەندە بەرەو خوار شۆڕ نەبووەتەوە؟ كەواتە ئێستا ئەو كاتەیە كە هەمو شەوێ لەگەڵ پەسەندا ڕادەبووینو ئاڵفمان بە ماڵاتەكەمان دەدا.. بەڵێ ئەمە ئەو كاتەیە ئەستێرەكان درۆ لەگەڵ زەویدا ناكەن... گریمان وانەبوو، ئەی خۆ جاران پێش ئەم ساتە بزنو مەڕەكان هاڕەو باڕەی برسی بونیان لێ بەرز دەبووەوە، وڵاغەكان دەستیان بە سمەكوڕێ دەكرد، كەرەكەش بەش بەحاڵی خۆی

دەیلووشاند...کوا یەك دەنگیان لێوە نایە؟.. تۆ بڵێی بەبێ ئاگا هێنانی ئەو پەسەند نەهاتبێ ئاڵفی پێدابن؟   نە! پەسەند ئەوەندە خەو سووك نییەو ئەوەندەش ئازانییە....

ختوورەی پەسەند هەردوو لای لێگرتبوو، هەم هانیدەدا هەم لێی تێكدەدا، ئەم لای هێزێكی نهێنی بوو بەرەو سیمیار رای دەكێشا، هەنگاوی بەرەو دەرگای گەوڕی بزن‌و مەڕو ماڵاتەكان پێناو وڵفی دەرگاكەی ترازاندوو وای دەزانی لەمە دەرگای كردەوە ئاژەڵەكان وەك جاران بەیەك دەنگ دەكەونە باعە باع‌و پرمە پرم‌و پێشوازی لێدەكەن، بە بارە باڕ بۆی دەخرۆشێن، مانگاكان‌و كەرەكەش بە لووشەو بۆڕە بۆیان دەسێننەوە!.

گەوڕی وەرەوبزڵەو مەڕو بزنەكان بە تەیمانێكی قایم لە گەوڕی رەشە ولاخەكان دابڕدرابوو، ئاخوڕیان جیا بوو، ئەو ئاڵفەی هەبوو ئەوەی نەبوو هەموویان تیایدا بەشداربوون، لە هەندێ ئاڵفدا جیاوازیان هەبوو، هەندێ شت گا دەیخوارد مەڕو بزن‌و كەر حەزیان لێ نەدەكرد، لەسەر خواردن شەڕیان نەدەكرد، وەك یەك تا تێر دەبوون دەلەوەڕان.

بە چوونە ژوورەوەكەی ئەو هەندێ لە بزنە سەركەشەكان نەبێ بە ئاستەم بەزمانی بێ زمانان وەك جاران دەنگی پێشوازییان بۆ هەڵبڕی ئەوانی تر وەك لەشكری تالیم دراو لە جێی خۆیان نەبزوان، ئەوانەشیان كە لەبەر دەرگاكە راكشابوون بەبێ ئەوەی راپەڕن، بەكاوەخۆ هەڵ سانەوەو رێی هاتنە ژوورەوەو هەنگاو نانیان بۆ چۆڵ كرد.

بزنە(ژیوا) كە بزنە مەرەزێكی بە تەمەن‌و بەبنەكداری هەموو بزنەكان دەژمێردرا ، هەموو ساڵێك دوو بزڵەی دوانەی مەرەزی گوڵەنكداری وەك خۆی دەبوو، شیرو فرۆیەكی دەداو تا كۆتایی پایز وشكی نەدەكرد،ببوو بە بزنە فەرداری هەموو

بزنەکان، یەکێك بوو لەو بزنانەی کەباوکی سیمیار بەر لە مردنی بە پەسەندی براژنی بەخشیبوو... ئەو بزنە هەمیشە لەدەم دەرگاکەوە رادەکشاو رووی دەکردە هەموو بزن و مەڕەکان، پاش هەمووانیش دەچووە سەر ئاخوڕی ئالف خواردن، کە خواداد دەرگەی کردەوە بە ئاستەم هەڵساو وەك پێشوازیو سۆزنواندن خۆی لە خواداد سواند. ئەویش دەستی خستە سەر ملیو بە پەنجەکانی گەمەی بە هەردوو گوڵەنگە سروشتییەکانی بن گەردنی کردو دەسەکەی تری بە تووکە خزە مەرەزەییەکەیدا خشان و ویستی بزانێ ئاوسیەکەی ئەمساڵیشی وەك هی ساڵانی پێشووە؟ داخۆ دوانەیەکی تریان بۆ دەبینێ؟. لە کاتی دەست خشاندن بەسەریا(ژیوا) لموزی بەرز کردەوەو بە ئاستەم نیمچە دەنگێکی گڕی پیرانەی دەربڕی و وەك بیەوێ پێی بلێ (خەمت نەبێ دوو کۆرپە بزڵەی گوڵەنگدارم لە سکدایەو بەم زوانە دەزێم و هەمووتان بە فرۆو شیرو ماست خەنیو تەسەل دەکەم).

خواداد چەمییەوەو لەسەر چۆك راوەستاو دەسی لە مل کردوو وردە وردە بەر چاوی خۆی روون کردەوە، دی هەموو بزنەکان پەچەیان داوەو بە ئاستەم کاوێژ دەکەن... پێی سەیر بوو! خەریك بوو هەمدیسان بکەوێتەوە ناو گومانی کات لێ تێك چوونەوە. ئەگەر کەڵە شێرەکەیان لەو دەمەدا یەکدوو جار باڵی بەیەکدا نەدایەو نەی قوقاندایە، وەك ئێشکگرەکانی شەو کەڵەشێرەکانی تری ناو دەگایش بەهەمان بەزمو دەنگ بۆیان سەندەوە، بەوا زانی ئەو دەمە سەر لە بەیانیانە، ئەی بۆ ئاژەڵەکان وا ئارامیان گرتووەو وەك مەست بووبن ناجوڵێن و خەریکی کاوێژ کردنن؟! بۆ وەك جاران ململانێ بەرەو چوون و جێگرتنی سەر ئاخوڕەکە ناکەن؟!.
ئەی رەشەوڵاخەکان بۆ بێ دەنگن؟! پێی سەیر بوو.... دەیوت:

- خۆ جاران کە دەهاتمە ژوورەوە تا ئالفەکەم دەکردە ناو ئاخوڕەکە لێم ئالنگارە دەبوون، لە هەمان کاتدا گاوەکان‌و ئێسترو کەرەکە ئۆقرەیان لیٚ دەبڕاوتا بەشم دەبردن کامیان دەکردو دەیانویست تەیمانەکەی نێوانیان بشکێنن‌و بێنە ناویانەوەو لەباریان بەرن!....

ئەی ئەوان بۆ وا داساکاون وجۆلەیان نییە؟! دەلیٚی تازە لەخواردن بوونەتەوە!...

ئەو رووداوە، ئەو وردە پرسیارانەی لەو شوێنەدا دەجماندو بیٚ وەرام دەمانەوە!. دیارە شتێك هەیەو ئەو نایزانیٚ!.. کسپەی مۆچڕکێك لە تەپلی سەریەوە هات‌و هەموو لەشی راتەکاند.. ئەی کوا سیمیار؟!. دیارە لەناو ئاخوڕەکەدا نووستووە!. ئەی ئێوارە پەسەندی ماموژنی رکی لیٚ نەگرت‌و نەیووت:

- با لەناو ئاخوڕەکەدا بخەویٚ!..

- هەی پەسەندی ناپەسەند چییت لیٚ بکەم..... خواداد وای وت‌و بۆ ئاخوڕەکەی روانی و دی تریفەیەکی زیوین بەدرێژی دوو گەزو پانی نیو گەز ئاخوڕەکەی روناك کردووەتەوە، سەرسام ما، لەو کاتەدا خەونەکەی هورمزیاری برای وەبیرهاتەوە، ماوەیەك کەم یا زۆر راماو چاوی بڕیە ئەو روناکییە، سەیرێکی گشتی بن میچی کۆزەکەی کرد. لەپێشەوە وای زانی تریفەی مانگە شەوەو لە قەلاروژنەکەوە دەڕژێتە ئەویٚ، وەلیٚ زوو هاتەوە یادی کە مانگ هەر لە ئێوارەی ئەو شەوەوە ئاسمانەکەی بەجیٚ هێشتبوو،، خۆ روناکی بەرە بەیانیش نییە!.. ئەوەتا تازە کەلەشێری بەر بەیانیان یەکەم خوێندنیان دەست پیٚ کردووە. خۆ لەم ساتەشدا شەو بەر لە هەلهاتنی کازێوەی بەر بەیانیان پەردەیەکی لیٚل‌و تاریك بە رووی دەورووبەردا دەدات ئەوجا لەترس روناکی هەڕا دەکات....گریمان لەبەر

سپیەتی بەفرەکە نەیتوانیبێ ئەو کلکە لەقێیە لەو ساتەدا بکات خۆ دەنگی کەڵەشێرەکان شایەتی بەرە بەیانێکی تازە بوون.

– رانەچڵەکاندنی سیمیار لەو ساتەداو ئاڵف نەدانی ئەو ماڵاتە دوای دیتنی ئەوەی کە خواداد بەچاوی خۆی دی کارێکی نابەجێ نەبوو...بەڵکو تێکدانی دیاردەو شڵەژاندنی سرۆشێکی یەزدانیو ژاکاندنی پەرەی ئارایشدانی نهێنی یەکی کەم رووداو بوو. بۆیە بە ئاستەم بەرەو دوا کشایەوەو دەرگاکەی چۆن کردبووەوە واش پێوەی دایەوە، لە ناو حەوشەکەدا وەك پەرستیارێکی بووزی چاوی بریە شینایی ئاسمانەکەو کۆمەڵە ئەستێرەیەکی تری بەدی کردن کەتازە لەسەر کەلەکانەوە هەڵدەهاتنو دەدرۆشانەوە، کەمێ کاڵ بوونی بەیانییەکەیان پێوە دیار بوو، دەوەستانو مژدەی هەڵ هاتنی رۆژێکی نوێیان دەدا.. خواداد چاوەکانی لەناو ئاسمانەکەدا وڕمابوونو گوێی بۆ دەوروبەرەکەی هەڵ خستبوو، تاکە چرکەو دەنگێك بەرگوێی نەکەوت، ئەوەی لە بارەگای سروشتدا هەبوو چ زیندەوەر چ نا زیندەوەر لە ژێر پەردەو تارا سپیە بێ گەردەکەیدا خامۆش ببوون، وەك تارماییەکی داکوتراو هەر سەیری ئەو دەوروبەرەو ئەو ئاسمانەی دەکرد، هەندێ لە ئەستێرە ناسیدا شارەزایی هەبوو، سەیر کردنو چێژ وەرگرتن لە دیتنی ئەستێرەکان لەو ساتەدا جیاوازی زۆری لەگەڵ جاراندا هەبوو..... جاران وەك پەیامبەری بەر گوزیدەی ناو تاریکەستان، بە هەڵەداوان بە ناو ئاسمانەکەدا تێدەپەڕینو ئاوڕیان نەدەدایەوە، کەچی ئەمشەو دەڵێی بۆ سەیران دێنو ئەوەتا چاویان لە دەگای هەورامان کلا ناکەن!.

خوادادێکی وا گورجو چۆست بۆ لەو شەوەدا خەریك بوو جەستەی بەسەر دەرونیدا بتوێتەوەو لەناو ئەو گەردوونەدا بپژێ؟!... کەی وابووە؟ وای دەوتو گورج خۆی بردەوە ناو تیلمی جارانی خۆیوچووەوە بەر بانێژەکەو هەستێکی

تری راگرت، یەکەم دەنگ کە کوپی بەرە بەیانەکەی راچڵەکاند دەنگێکی ئاستەم بوو لەماڵی خواجە بەهمەنەوە کەوتە بەر گوێی، لەو بەریشەوە زێرگەوانی پەرستگاکەش بە کۆخەیەکی گڕنی خنکاوی ناو دوکەڵ رابوونی خۆی بۆ دەگا راگەیاند...

خواداد دەستی بۆ وڵفی دەرگاکە برد بیکاتەوە، وەك یەکێك رای بکێشێتە دواوە دەستی گێڕایەوە، لەگەڵ خۆیدا راوێژی کرد:

– ئایا ئەوەی دیومە بۆ پەسەندی بدرکێنم؟ یان نە؟.... زوو بڕیاریدا:–

– نە ... چۆن بۆی بدرکێنم!...ئەی ئەو نەبوو کەوتە رکو وتی:

– نابێ ئەو کوڕە لەگەڵماندا بخەوێ...

– منداڵێکی وەها کەی خوا رابەرداری هەیە لەناو ئاخوڕی بزنو مەڕدا بخەوێ!.. هەی تەوقی ستەمکاران لە گەردنت بناڵێ پەسەند...خۆ ئەو لێفو بالنگانەی لەسەری دەخەوێ لە باوكو دایکی ئەوەوە بۆی بەجێ ماون...دیارە ئەهرۆمەزدا چاوی لە بێ تاوانو بێ نەوایانەو نگابانییان دەکات.. لە ستەمی ستەمکاران دەیانپارێزێت...

– نا ئەوەی دیومە با نهێنییەك بێ لەدڵ خۆمدا حەشاری دەم، لای پەسەندی ناپەسەندو کەسی تر نەی درکێنم، نەوەك بیکاتە چرەو قاوی دەگاو ئەوکات تووشی چوترمێکی بکات...خواداد بڕێ چیلکەی وشكو کۆمەڵە دارێکی قلیشاوی راکێشایە لای ئاگردانەکەو بەکلکی مەسەکە بووڵەکەی ناوی لادایەوەو پەنگری ناو ژیلەمۆکەی دەرداو وردە چیلکەکانی لە دەور گرمۆڵە کردو بەفوولێکردن مەشخەڵەی بەئاگرە داو کەوتە نێڵە نێڵ .......

پەسەند بە ئاگا هاتبوو، لەژێر لێفەکەیدا خۆی مات دابوو، بۆ بەهانەیەك دەگەڕا لەبری شەوە لەدەست چووەکە خۆی لە خواداد نێگەران بکات.. بۆیە لەمە

لچکی لێفەکەی لەسەر دەموچاوی خۆی لادایەوە، لەباتی دەس خۆشی ئاگر کردنەوەکەی لێ بکات وتی:

– خواداد!.... ئەوە بەم نیوە شەوە سەرت لێ شێواوە یان جنۆکە خەویان لێ رفاندووی!.

– کنا پەسەند دێرا.... ئەی نازانی دنیا بەتەواوی لەناو بەفردا نوقوم بووە؟ خەڵك وا خەریکن خۆیان بۆ سەریان ماڵێن ئامادەدەکەن .. ئاگات لە چییە!...

– هەی خوا پێ نەداو بۆ نایەیی راکشێی.. بەم نیوە شەوە چی دەکەی!.

– کنا پەسەند.. نیوە شەوی چی!.. بۆ ئەوەندە بێ باکی و حەزت لەخەوە!...

– من بێ باکم یان تۆ؟..

– بەخۆت بڵێ و خۆت لە گێلی مەدە...

– کنا... لەبەر تۆمە، وتم با لەخەوت نەکەم.. چووم سەری ماڵاتەکەم دا..

– ئالفیشت دانێ!...

– ئا .. ئا ئالفیشم دانێ...

– ئەی بۆ گوێم لە دەنگیان نەبوو؟.

– جا خەو بەرت دەدا تاگوێت لێیان بێ...

– نا... دەزانم بۆ منت بە ئاگا نەهێناوە...خۆت لێم دزیوەتەوە .. وانییە؟..

– ئەگەر بڵێم وانییە....وانییە! چی تیایە با ئەم شەومان وابێ...

– حەزم لەناو کادانی گزرەکەیە.. خۆ سیمیار لەوێ نییە؟!

خواداد سەرێکی باداو قسەی نەکرد....بێ دەنگیەکەی خواداد وای بە پەسەند گەیاند کە سیمیار لەناو کادانی گزرەکەدا دەخەوێ بۆیە وتی:

– ئەوێشی لێ قەدەغە کردین! ئەی نەموت با لەناو ئاخوڕی بزنەکاندا بخەوێ؟!

– ژنەکە ویژدانت هەبێ لێرە دەخەوێ دەڵێی لێمان تێك دەدات، لەوێیە دەڵێی قەدەغەی دەکات...بەزەییت هەبێ سبەی ڕۆژ دەبیتە خاوەن کۆشێ منداڵ‌و ڕەحمت دەکرێتەوە. ئەوجا پەشیمان دەبیتەوە..

– ئەوە تۆ چی بە من دەڵێی: کە دەتزانی وەهای بۆ منت خواست.. خۆ باوکی فەرەنجی لە بەران نەمردبوو، ئێستاش سەدان هەن پێڵاوم ماچ دەکەن...لەسەر کانی هەر دەتوانم وەڵامی ژنان بدەمەوە، لێم دەپرسن: شووت بە کێ کردووە؟. بە خواداد!؟. منیش هەر دەتوانم بڵێم:

– پاسە خاسا....ژن مەردە دەزانێ چۆن قەدری ژنی ڕابگرێ...ئەمەش قەدرەکەی تۆیە! لە خوا بەزیادم نەکرد...

– جا لەوە بەقەدر تر هەیە کەتۆم بەم شەوە ساردە نەرەنجاند..

– بەوە پینەی مەکەو خۆت لەرێ لامەدە..لە کەیەوە منت لەناو ئەم یاگە ساردوسڕەدا بەجێ هێشتووە؟ دەی پێم بڵێ!..

کنا ئەی نابێ ئاڵف بەو بەستەزمانانە بدەم...

ئەی من بەستەزمان نیم..... یان لەوان کەمترم؟!

– تۆ پەسەندی یەك پەسەند لەم دەگایەدا هەیە.....

– ئەی بۆ جاران بەبێ من نەدەچووی بۆ ئاڵف دان!

– ئەی سیمیار لەوێ نییە!.

– (بەتووڕەیی) ئەوێشی لێ گرتم..

– پەنا بە تۆ خوایە......ئێستا تۆ چیت گەرەکە؟

– چیم گەرەکە؟...بێوەژن کۆشیم گەرەکە!..

خواداد زانی پەسەند لە بنی مەنجەڵی‌دا، بۆیە پێی وت:

– با ئەوە لەگەڵ ئەمشەودا چووبێ، خۆ دنیا هەر ئەمشەو نییە...

پەسەند بە تووڕەبوونێکی خەمزەدارەوە خۆی لە لێفەکەی پێچایەوەو پشتی لە خواداد کردو وتی:

- (چێش ما چی واچە)...

شەوقی ئاگرەکە ماڵەکەی پڕ لە روناکی کردبوو، پەردەی تاریکی لەسەر هەموو شتەکان لادابووەوە، گەردنی پەسەند لەدوو تۆیِ ئەو زوڵفە رەش‌و پرش‌و بڵاوانەیدا شەوقی ئاگرەکەی دەدایەوەو لە قوڵایی ناخی دەروونیدا ئاوەژو دەبووەو گڕی بەردەدایە ئارەزووی مەگێزە کپ بووەکانی خواداد، ئیتر توانای رووبەڕووبوونەوەی پەسەند تیایدا خاو دەبووەوە،

تۆڵاشی دارە قڵشاوەکان لە گەرووی ئاگرە گڕگرتووەکەدا کسپەیان دەهاتوو دەبوونەسکڵی گەش، چلۆسکە تەڕەکانیش لەتاودا دەستیان بەجزەجزو ئاوەسۆ کردبوو، کوجیەکە دووکەڵەکەیانی هەڵ دەمژی‌ولەناو فەزای دەرەوەدا کەمێ دەمدراوە و لوول دەدراو ئەوجا وەك گیانی رەوانی مردووەکان لەناو گەردووندا دەتوایەوە...ماڵەکانی تریش لەبەر روناکی ئەو بەیانییە نوێیەدا کەزی رابوونیان داهێناو هەناسەی پڕ گوڵاوی خۆیان تێکەڵاو بەجوانی سروشتەکە کرد...

وتەکانی پەسەند بێ تام‌و تغت بوون،خواداد وەك خەمزەکردنێك لێی وەردەگرت، پێی وابوو وشکە کەڵەکی قسەی ژنانەن‌و زارەکی وبێ مانان، رۆژانە چەند جار گوێی لەروخانی ئەو وشکە کەڵەکە دەبوو، وێڕای ئەوەش ئەو نەیدەویست لەماڵەکەیدا ئاژاوە دروست ببێ‌و بەسەر سیمیاردا بشکێتەوە...

ئەوەی ئەو شەوە دیبووی، وا هەست‌و هۆشی بەرین کردبوو هەموو شتێك تیایدا جێی دەبووەو نەی دەژاکاند، نە وتەکانی پەسەند دڵی روشان نەرکەکەی دوێنێی تیا جوڵا.. ئەی دوێنێ رکی نەگرت‌و نەیووت( یان من یان

سیمیار!...نابێ لەگەڵ ئێمەدا بخەوێ)..سیمیار کەزانی لەسەر ئەو دەمەقاڵێیانە، هەر ئەو ئێوارە بە ئاستەم چووە ناو کۆزی بزن و مەڕەکان خەوت....

خواداد لە ئێوارەوە ئەو مەسەلەیەی دەدایە بەر هزری و ئازاری پێوە دەچەشت ، لە دواییدا بۆی دەرکەوت گەلێ ناڕەوا ستەمێك بوو بەو کوڕە بێ دایك و باوکەکرا کە هێشتا لە سیرەی منداڵی دایەو ئەو مامییەتی و نگابانی و بەخێوکردنی لە ئەستۆ ئەو دایە..لەبن ئەو ستەمەدا جۆرە راستییەك بەدی دەکرا، ئەوەتا پەسەند هێشتا خەنەی بووکیەتی دەس و پەنجەکانی کاڵ نەبووەتەوە، هێشتا بە تەواوەتی چاوی لە ماڵەکەدا نەکراوەتەوە، سۆزی بەتەواوەتی تێکەڵاو بە ئەوان نەبووبوو....سیماریش هەستی کرابووەو شتی دەزانی....

خواداد پەندێکی(ژێرلەی مەرێ)ی هاتەوە یاد کەوتبووی (ژن وەك خەپلەی هەرشتەیە بەگەرمی نەی خۆی دەتخوا).

سەری راستبێژی بۆ پەندەکە دەلەقاندو دەیووت:

– قەی ناکا.... تا ئێستا چۆن بووم هەروادەبم.... هەقیەتی نازم بەسەردا بکات....

ویستی لەپی دەستی بە گەردنە ئاگراویەکەیدا بخشێنێ، وەلێ زوو لەو نیازەی پەشیمان بووەوەو دەستی نەگێڕایەوە بەڵکو چمکی لێفەکەی بەسەر گەردنیاداو وتی:

– وریا بە نەسووتێی!.

پەسەند خۆی لەگێلی داو هەناسەی لەخۆی چنی....هەروەها ویستی بیدوێنێ، ئەمە هاتە سەر زاری

–( دەزانی خەونێکی خۆشم پێتەوە دیووە؟ ئۆجاغمان روون دەبێ).وای وت و دەرگاکەی کردەوەو چووە دەرێ.....پەسەند لەبەر خۆیەوە دەیووت:

– ئەوە چۆنی زانیوە...چەند رۆژێکە تەبیعەتم لەسەر خۆی نییەوهەڵ دەچێ...دوێنێش دایکم تێی‌گەیاندم، وتی: (مژن دەکەی، سکت هەیە). وادیارە خواداد خەونێکی باشی پێمەوە دیووە...

ئەو وتەی لەدەم خواداد ترازا، تروسکەی رووداوە حەشاردراوەکەی سیمیار بوو، پاڵی بە ناهەستیەوەناو لە دەمیەوە سەری کرد..(ئۆجاغمان روون دەبێ) بۆ پەسەند وتە لەدەمترازاوەکە جێی خۆی گرت، هەستێکی دڵ خۆشکەرانەی بۆ هێنا ئاراوە، بار سووکیەکی دەروونیش بوو بۆ خواداد....

لەگەڵ شۆربوونەوەی کەزییە زێرینەکانی خۆر بۆ دەگا، گۆشەوارەو پڵپڵە بلوورینەکانی گۆشەی پاسەبانەی ماڵەکان کەوتنە چکە چکەو هەنسکەدانی جیا بوونەوە...

خەڵکی دەگا وەك پوورەی هەنگ شڵەژان‌و ژاوە ژاوی کارو هەرمان، رەوتی رانەوەستانی ژیانیانی هێنایەوە سەر دەقی ئاسایی، هەر بابا بوو دەسی دابووە وەروەرەو ماڵینی سەربان، کرپەی ماڵینی بەفرو ترپەی خستنە خوارەوەی دڵە تەپێی هەرەس هێنانی بۆ بەفرە خزەکەی قەت پاڵە لووسەکان دروست کردبوو.

خواداد حەزی نەکرد سیمیاری برازای بانگ بکات‌و وەك هەموو کەسانی تر لەگەڵ خۆیدا بیباتە سەربان‌و یارمەتی سەربان ماڵینی‌پێ بکات...ئاگای لەوە نەبوو کە سیمیاریش لە خوارەوە دەستی داوەتە وەروەرێك‌و خەریکی لادانی بەفرە تەپیوەکەی بەر دەرگای ئاژەڵەکان‌و حەوشەکەی خۆیانە...

لەرۆژانی وادا مەڕو ماڵات دەرنادرێن، کەچی سیمیار ئاژەلەکانی خۆیانی دەردان، وڵاغەکانی بۆ رچەشکاندن پێش خۆی دان، خۆیشی کەوتە پاش بزن‌و مەڕەکانەوەو بەرەو چەمەکەی ئەوبەری دەگا بەئاسانی رەویان کرد، خەڵکەکە پێیان سەیر بوو، رچە شکاندن‌و ئاژەڵ دەردان لە رۆژێکی وەهادا شتێکی ئاسان

نەبوو، کە سیمیار وای کرد بەلایانەوە شتێکی ئاسایی نەبوو، لە یەکتریان دەپرسی: چۆن ئەو مێرد منداڵە بەو ئاسانییە ئەو ئاژەڵەی بردە سەر چەمەکەی ئەو بەرو بەو ئاسانییە هێنانییەوە؟. لەو ماوەیەی کە سیمیار ماڵاتەکەی رادابوو، خواداد سەرێکی کادانی گزرەکەی داو، دڵنیا بوو لە ئەو شەوەی رابردودا سیمیار ئالفی بەو ئاژەڵە نەداوە! پتر لەوەش سەری لەوە سوڕمابوو کە هێنانیە دەرەوە ئەوەندە پەلی برسی بوونیان نەدەکوتا! وەك جاران لاساری‌و بۆڕەو بارەیان لێوە نەدەهات!.

خواداد هیچ دەنگی نەکردو ئەو شتانەی لەناو دەفەی سینگی خۆیدا حەشاردان‌و لەو بارەوە خۆی لە گێلی دا...

سیمیار کە ئاژەڵەکانی بردنەوە ناو کۆزو گەوڕەکە. خێرا هەواڵی بەمامی داو وتی:

– مامە!...بزنە(ژیوا) ماتە...وا دەزانم خەریکە دەزێ..... خواداد هەواڵەکەی سیمیاری وەك مژدەیەك وەورگرت‌و زوو سەری داو دی پالێ کەوتووەو سەراوی تەقیوەو خەریکی ژانە....

خوادادیش بە گورجی هەواڵەکەی بە پەسەند گەیاندوو پێ‌ی وت:

– پەسەند!....مژدە بێ بزنە(ژیوا)ت خەریکی زاینە..ئادەی بزانم چۆن دایکێتی بۆ دەکەی!.

پەسەند لە دڵەوە هەواڵەکەی پێ خۆش بوو کەچی بەجۆرە ساردییەکەوە وەری گرت‌و وتی:

– ئەوە بوو بە منت دەوت...

خواداد قسەکەی بڕی‌و نەی هێشت تەواوی بکات‌و وتی:

– نا..نا.. ئەمە جیایە.

پەسەند زانی، ئەوەی ئەو لە خوادادی شاردووەتەوە، ئەویش زانیویەتی.....بۆیە بێ دەنگ بوو..

تا پەسەند بەخۆی کەوت(ژیوا) زاو دوو بزڵەی گوڵەنگداری مەرەزی بوو..

*          *          *

( ٢ )

کچە تاقانەکەی خواجە بەهمەنی سەردارو دەمڕاسی دەگای هەورامان، دەردێکی بێ دەرمانی تووش ببوو، ناویان نابوو نەخۆشی خەمۆکێ، بۆ ساغ بوونەوەی چاك نەمابوو نەچنە سەری....وتبوویان لەشاری ئەکباتانە مۆغانێکی گەورەی وا هەیە، دەسگیری گشت دێوو درنجەکانەو دەتوانێ هەموویان کۆ بکاتەوەو کامیان بەو دەردەی بردووە لەبەردەم خۆیدا رای بگرێو قەمتەر لە دەمی بکات، گوایە چەندان زاوای بەسراوی کردووەتەوەو هەزاران ئیفلیجو کەسانی گەوجی چاك کردووەتەوە... نەك بەرد دەخاتە قسە، بەڵکو ئاوی لێ دەردێنێ، فوو لە دەنکە جۆ بکات دەیکات بە گامێش، گامێش دەکاتە ئەسپێ! ئەویش قەیرانی ساڵێکی بۆ چاك بوونەوەکەی دانابوو ساڵەکە تێپەڕی نازەنین بەرەو خراپترچوو ..مۆغانەکەی شارەزووریش وەك مۆغانەکەی ئەکباتانە بەناوبانگ بوو، ئەویش مسی بەسەردا تواندبووەوەو شکلی هەمووگومەتەو دێوو دێوەزمەکانی هێنابوونە بەر چاو کەچی هەر چاك نەبووەوە!

چاك نەبوونەوەی نەخۆشییەکەی نازەنین بیرو ڕای خەڵکەکەی بە مۆغەکان لەدڵدا لەق کردبوو.......

تا ئەو کاتەی مۆغانەکەی دەگای هەورامان نویشتەی بۆ هەر نەخۆشێك بنووسیایە یان بۆی روانیبێ رووی تومارەکەی دەیزانی دەردەکەی چییەو چاکی

دەکردەوە! کەچی نەخۆشییەکەی نازەنین لە سنووری  ئەم دەمودووی ئەودا نەمابوو...دڵی بەوەش خۆش بوو کە ئەو هەموو بردنە لای مۆغان و ئەم لاو ئەولایە دەمودوەکەی ئەویان نەبەزاند. لە هەمان کاتیشدا دڵی گەلێ بەو کچە نازدارە تاقانەیە دەسووتاو لەگەڵ نوێژدا نزای بۆ دەکردو دەیووت:

( خوا بەزەیی بە جوانیدا بێتەوە).

چوار ساڵ بوو ماڵی خواجە خۆشی بەخۆیەوە نەدیبوو، هەموو خەوو خواردنێکیان وەك نەخۆشییەکەی نازەنین بێ تام ببوو.

رۆژانە پیرە ژنە دنیا دیتەکان دەچوونە دیوەخان لای هەنار خانی دایکی نازەنین خەونەکانیان سەبارەت بە نازەنین بۆ دەگێڕایەوەو شتێکی دڵ خۆشکەرانەیان رادەگەیاند، نەخۆشییەکەی دەنگی دابووەوە... گفتو لفتی جارانی‌و جوانییە بێ هاوتاکەی بەزەیی هەموو کەسێکی بۆ لای خۆی‌و بنە ماڵەمەی راکێشابوو..... لەو بارەوە لە(ژیرلەی‌مەرێ) یان پرسیبوو کە ئایا ئەو چ جۆرە چارەسەرێك بۆ نەخۆشییەکەی نازەنین دادەنێ؟ دوای بیرکردنەوە وتبووی: (بیکەن بە بەرخەوان چاك دەبێتەوە).... قسەکەی ژیرلە لەو رۆژەوە ببوو بە گاڵتەو گەپی ناو پەندەکان.......

خواجە بەهمەن وەك جاران نەمابوو، نەخۆشییەکەی نازەنینی کچی وەهای تەپاندبوو، هەموو بیرو هۆشێکی پژاندبوو. بۆ دەرمانی دەردەکەی نازەنین ئەوەندە سەراوو دەراوی کردبوو هێزی لێ برابوو، هەموو سامانی بەو کەسە بەخشیبوو کە بتوانێ نازەنینی بۆ بخاتەوە قسەو زمانی بکاتەوە......

سیمیار رۆژ بە رۆژ هەڵی دەداو بەرەو تۆفی لاویەتی‌و هەرەتی گەنجایەتی هەڵ دەکشا. ژیری‌و بلیمەتیەکەی جوانییەکەی رازاندبووەوە. پیاوان حەسودیان بە خواداد دەهات کە برازایەکی هەڵکەوتەی وەهای هەیە بارتەقای حەوت کوڕە،

ژنانیش رژدیان به پەسەند دەبرد، کە لاوێکی وەهای لەبەر دەستایەو هەموو هەرمان‌و کارێکی پیاوانەو ژنانەی بۆ دەکات، ئەو هەموو نازو پێزەی کە بە سەریدا رژابوو لە نێوچاوانی ئەو کوڕە پاك و چاك رەفتارەوەیە. ناوی سیمیار وێردی سەر زاری هەموو کچانی دەگابوو، پیاوەکان لەکاتی پشوودان‌و خڕبوونەوەیاندا سەری قسەیان‌و بنی قسەیان دەچووەوە سەر باسی سیمیار

ناهەقیان نەبوو شتی سەیریان لێوە دیبوو .... لە کاتی دەردانی ئاژەڵەکان بۆ دەرەوەی دەگا بۆ لەوەڕو هێنانەوەیان. سیمیار وەك سەرکردەی لەشکری ئاملاو هەنگاوی مەحکەمی دەناو لە پێشیانەوە دەڕۆیشت‌و پێیانەوە ماندوو نەدەبوو! رێگەی دەرو بەرکردنەکەی‌و هاتنەوەی بە بەردەم ماڵی خواجە بەهمەندا تێدەپەڕی.... نازەنین کاتی رابوون‌و گەڕانەوەکەی سیمیاری دەزانی کەیە لە هەردوو کاتەدا دەرگای باڵەخانەکەی لەسەر خۆی رەپێش دەکردو لە دەلاقەیەکەوە تا سیمیار لەبەر چاو بزر دەبوو سەیری خۆی‌و رەوگەی ئاژەڵەکانی دەکردو دەگەشایەوە، ئەو بێ دەنگییەی کەلە ناخی‌دا پەنگی دەخواردەوە لەو ساتانەدا بەو روانینە دەبووە باهۆزەیەك لە ناخییەوە هەڵی دەکردو گوڵاڵەسوورەی نێو نیگاو سەر زاری دەتنگانەوە... یان ئەو روانین‌و سەیر کردنە دەبوون بە هارمۆنی مۆسیقای سروودێکی دەروونی یەزدانی هەموو دەرگا داخراوەکانی ناوەوەی واز دەکرد، هەر لەو کاتانەدا گەمەی بەو کەسانە دەهات کە دەیانووت: نازەنین تووشی نەخۆشی خەمۆکی بووەو قسەی لە بیر چووەتەوە!.

دایکی لە درزی دەرگاکەوە چەند جارێ سەیری ئەو رەوشەی نازەنینی کردبوو، پێی سەیر بوو نەی دەزانی نازەنین لەو کاتانەدا بۆچی شادمانە؟....لەبەر دیمەنی ئەو کەرو گاجووتە بوو کە لە گەڕانەوەیاندا، هەر یەك بارە چیلکەیەکیان لێ بارکرابوو، بەپێکەوە وەك دوو برادەر دەڕۆیشتن؟ یان لەبەر

ئەوە بوو لەوێ نەی دیبوو گا وەك كەر بار بكرێو لەگەڵ كەرداوا تەبابێ؟ یان لەبەر تیپی ئەو مەڕو بزنانە بوو كەكۆڕیان دەبەستو لەدوای یەك دەڕۆیشتن؟ یان لەبەر سیمیار بوو؟ لەم سەرەوە پێش ئاژەڵەكانی دەكەوتو لەو سەرەوە لەدوایانەوە دەڕۆیشتو لەسەرخۆ هەنگاوی دەنا، كە دەگەڕایەوە گۆچانەكەی لە سەر ملیدا دەناو، شمشاڵەكەی بە لاقەدی چەپی پشتێنەكەیدا دەكردو پێت وابوو شازادەیەو لە شەڕی سەركەوتندا گەڕاوەتەوە.......

هەنارخان لە چاك بوونەوەی نازەنین دەستی ششتبوو، شت نەمابوو بۆ چاك بوونەوەی ئەو بەكاری نەهێنێ ئەوەی پێی كرابوو لەرێی چاك بوونەوەیدا هەوڵی دابوو، لەم دواییەشدا داوای لە دەستە خوشكان و هاوئازەكانی ئەو كردبوو كە لە كاتی پەردەژانیاندا لای كۆ ببنەوە و بە قسەی خۆشو گەمەو گێڕانەوەی رازو نیازو باسكردنی دەورو بەر خجڵی بكەنو خۆشی بخەنە ناو دڵیەوە، ماوەیەك وای بۆ دەكرا، وەلێ ئەوانە هیچیان وەك ئەوەی كە لە پەنجەرەكەوە دەیڕوانییە رەوگەكەی سیمیار دڵ خۆشكەرە نەبوون، ئەوەی لەو كاتەدا بیدیایە وای دەزانی هۆزاری حەپس كراوەو دەیەوێت بەروازی پەنجەرەكە بەرین بكاتو بڕواتە ناو رەوگی مەڕو بزنەكانی سیمیارەوەو وەك بەرخۆڵەیەك بەرەڵلای ناو ئەو شاخو كێوو دەشتو دەرە ببێ.......

هەنار خان كە ئەوەی لە نازەنینەوە دی كەوتە ناو گێژاوی چەند پرسیارێكەوە كە سەری هەموویان دەچووەوە سەر ئەم پرسیارە! تۆ بڵێی تیری عیشقی ئەو كوڕە كاری لە نازەنین نەكردبێ؟.... لەدڵەوە وای دەووتو لە دەریشەوە دەیووت:

چۆن كچی خواجە گیرۆدەی عیشقی كوڕە شوانكارەیەكی بێ دایكو باوك دەبێ! لەناو دڵە راوكێی ئەو دوو پرسیارەدا، شتێكی وەبیر هاتەوە! چەند ساڵێك لەمەو بەر ئەو كوڕە بە فەرمانی مامە ژنی بۆ كارێك هاتبووەماڵیانو چاوی بە

نازەنین کەوتبوو، لەوێوە تروسکەی گومانێك لەناو گۆمی خەیاڵیدا سەری هەڵدا، ئەجیای ئەوەی لا بەتین کرد کە گرفتاربوونی نازەنین بەو دەردە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتەی کە ئەو کوڕە چووەتەماڵیان.....چی تیایە! بۆ ئەو سەرە داوە نەگرێت و تاقی نەکاتەوە!؟ بۆیە لەدڵ خۆیدا وای دانا بە هەر هۆیەك بووە سیمیار بانگ بکات بۆ ماڵ خۆیان و لەنزیکەوە نازەنینی پیشان بدات و سەرنج لەو دیدارەیان بدات......بەڵکو ئێ!.....

هەنارخان یەکێك لە کارەکەرەکانی نارده لای پەسەند ژنی خواداد کە بە سیمیاردا جامی چل کلیلەی بۆ بنێرێ.......

پەسەند ماوەیەك بوو حەزی دەکرد هەنارخان هەرمانێکی پێ بکەوێ و بۆی بکات، بەڵکو بەو بۆنەوە خۆی لای نزیك بکاتەوە، بۆیە دەست بەجێ جامێکی چل کلیلەی ئامادە کردو بەتاسەوە خۆی بۆی برد، کە هەنار خان دی پەسەند خۆی هێناویەتی، گەلێ بە ساردییەوە پێشوازی کردو سەیرێکی جامەکەی کردو پێی وت:

– ئۆە...! ئەوەکەی خۆشمان هەر وایە!...زوو بیبەوە، چونکە دوو جامی وەك یەك لەماڵێکدا فریشتەی لێ دەڕەوێتەوە!... پەسەند کە ئەوەی لە هەنار خانەوە بیست وەك ئاوێکی سارد بە تەوقی سەریدا بکەیت و بەلاقیدا بچۆڕێتەوە وابوو ئەو وا بەتەما بوو بەو بۆنەوە تێر قسە لەگەڵ هەنارخاندا دەکات... هەروەهاش باسی خۆی و شووکردنی بە خوادادو ئەو فەرو خێرەی کە بەسەریاندا رژاوە بۆی دەکات، هەر بەو بۆنەشەوە هەواڵی نازەنین دەپرسێ و ئەویش وەك ئافرەتانی تری دەگا زڕە خەونێکی لەو بارەوە بۆ دەگێڕێتەوە، باسی دوو کۆرپەکەی خۆی و سیمیاریشیان بۆ دەکات....کەچی ئەوەی کەدەیویست وای بۆ نەهات، بەسەر خۆیدا شکایەوەو بەخۆی و جامی چل کلیلەیەوە وەك ئەتك کرابێ

به لۆژەلۆژ گەڕایەوەو لە دڵەوە هەزار نەفرەتی بۆ هەنارو ئەوانەی وەك ئەون دەنارد.....هەنارخان خۆی بە گەمژەو نەزان هاتە پێش چاو، لێوی پەشیمانی خۆی دەكرۆژتەوە، نەدەبوو پەسەند بەو چەشنە بەڕێ بكاتو بەو جۆرە ر اسپاردەیە نەخشەكەی ساز بدا..... هێنانو بردنی جامی چل كلیلە ئیشی ئافرەتانە، نەك پیاوان.......تا ئەو كاتە نەیزانیبوو كە سیمیار لەپەرستگادا فێری خوێندنی گاتاكانو سروودەكانی(یەسنا) بووە...دەبوو داوا لە پەسەند بكات سیمیاری بۆ بنێرێ یەسنایەك بەسەرماڵەكەیدا بخوێنێ بۆ ئەوەی ئەو دێوە رەشانەی كە وەك خووگ خزاونەتە ناو ماڵیان بیانرەوێنێتەوە...نەدەبوو بەو نەدواندنو روو نەدانەی پەسەند دەرگای ماڵی خواداد لە سەر خۆیان كلۆم بكات، كارێكی جوانی نەكردا. لە ئادگاری هەنار خان نەدەوەشایەوە وا بكات، وەلێ تازە شتەكە هاتو تێپەڕی:..

نازەنین لە گوێی گادا نەخەوتبوو، دەیزانی دایكی خەریكی چییەو، چ كارێكی ناڕەوای كرد، لە دڵیشەوە بەزەیی پیا دەهاتەوە، چونكە بەهۆی ئەوەوە سەری لێ شێوابوو.....

نازەنین جگە لە زمان بە سراویو نەدویی لەم دوایەشدا كەم خەویو شەو بێداری پێوە دیار بوو.

بەشەودا چاوی دەبڕیە بن میچی خانووەكەو جارجارێ بە زەردەخەنەیەكی ئاستەم نێو نیگا جوانەكەی خۆی دەدرۆشاندەوە......

ئەو حاڵە نوێیەی ئەوەندەی تر هەنارخانی لە ناو گێژاوی خەمدا سەرنگوم كردبوو، تاكە تروسكەیەك كە لە دڵی دامابوو ئەوەبوو كە ئەجیای دەكرد سەرە داوێكی بۆ چارەسەری ئەو دەردەی نازەنین دۆزیوەتەوە، لە دڵەوە پەیمانی بەخۆی دابوو كە سەری ئەو داوە بەرنەداو تا دەتوانێ بە دوایدا بڕوات...

لەگەڵ گزنگی رۆژدا لەو کاتەدا کە نازەنین هەموو بەیانیو ئێوارەیەك لە پەنجەرەکەوە سەیری چوونو هاتنەوەکەی سیمیاری دەکرد، ئەویش لە پەنجەرەکەی تری باڵەخانەکەوە، وەك پێشوازی تیشکی خۆرەکە بکات، دەیڕوانییە سەر لووتکەی شاخە بڵندەکەی ئەو بەرو سینگی خۆی رووت دەکردەوەو دەیدایە بەر تیشکەکەو دەستی نزای بەرز دەکردەوەو نوێژی بۆ ئەهرۆمەزدا دەخوێندنو دەپاڕایەوەو دەیووت:

(هۆ گزنگە بێگەردەکەی یەزدانی مەزن، بیکە بەخاتری ئەو تیشکە زێڕینە کە هەموو گەردوونی پێ روناك دەکەیتەوەو هیچ لایەکی لێ بێ بەش ناکەیت، روناکییەك بخەرە دڵمەوە، ئەم کچە نازدارەم لەو گرفتەی تووشی بووە رزگار بکە...ئەی تیشکە زێڕینەکەی رۆجیار، هۆ پەیامبەری یەزدان، خۆ تۆ هیچ گیاندارو بێ گیانێك لەو میهرەی خۆتە بێبەش ناکەیت، خۆ لێت کەم نابێتەوە ئەگەر روناکییەکیش بخەیتە ناو دڵی منەوە....خۆ هەم زانای هەم توانا، من هەر ئەو تاقە کچەم هەیە، لەو دەردو بەڵایە رزگاری بکە....).

کە لە نزاکە بووەوە فرمێسکە گەرمەکانی سەر کوڵمە گەچراوەکانی بەلاچمکی چەتفە هەورێشمینەکەی سەری سڕینەوە، سەیرێکی نازەنینی کرد، روومەتە ئاڵەکەی وەك مانگی تابان بە ئەگریجەو زوڵفە خاوەکانی دەورە درابوو، چاوەکانی دەریایەك بوون مانای هەموو نهێنییەکی گەردوونیان تیا دەخوێنرایەوە.... بە میهرەبانیو دڵی پڕ سۆزەوە سەیری یەکتریان کردو باوشیان بۆ یەکتری کردەوە...

هەنار خان بەدەم هەنسکەدانو فرمێسك رشتنەوە دەیووت:

- ئازیزەکەم...کچە تاقانە جوانەکەم، سۆمای چاوەکانم، بۆ وات لێ هات، بۆ قسە بۆ دایکی خۆت ناکەی؟

نازەنین جگە لە هەنسکەدان و ئەسرین بەردانەوە ورتە لەزمانیەوە نەدەهات.......

- نازەنین گیان بۆ دەگری؟....دەی ئازیزەکەم، زارت بکەرەوە، کێ بەچاوی بردی؟ کام دێو کام درنج زمانیبەستی؟. (دەی پەنەم واچە) ئازیزەکەم...

نازەنین لەجیاتی وتە ئەسرین بەسەر کوڵمەکانیدا دەهاتنە خوارێ و جۆگەیان دەبەست، زۆری دواند، وەلیٚ زمانی نەهاتە گۆ، شتێ بلێ...لەو کاتەدا رۆژ تیشکی خۆی لە پەنجەرەکەوە رژاندە ناو ژوورەکە، هەنار خانی بە ئاگاهێنا کەژوانی رووکردنە دەرو لەماڵ دەرچوونە.....لە پەنجەرەکەوە روانییە رێگاکەی بەر ماڵیان و بە نازەنینی وت:

- ئازیزەکەم وەرە سەیرکە وەختی چوونە دەرەوەیە وا خەڵك پۆل پۆل مەڕو ماڵاتیان داوەتە بەرو بەرەو کێڵگەو باخ و رەزو کەیوان دەڕۆن..... وەرە لەم پەنجەرەوە سەیرێکی ئەو دیمەنە ئەفسووناویە بکە، چەند جوانە خەڵك وا دەبزوێن و ئاژاڵەکانیان پێش خۆیان دەدەن و دەڕۆن و پێشوازی بەهارەکە دەکەن و مانا بەژیان دەبەخشن........

نازەنین بەگورجی زوڵفە خاوەکانی لەسەر رومەتی لادایەوەو بەتاسەوە سەری بردە بەر پەنجەرەکەو لەتەنیشت دایکییەوە سەیری رێگەکەی ئەم بەرو ئەو بەری دەکرد، ئەو بەتاسەوە تەماشای رەوتی خەڵکەکەی دەکردو دایکیشی خۆی کردبوو بە دوو بەشەوە، چاوێکی لە دەرەوە بوو، هەستەکانی تری بۆ روانینەکەی نازەنین راگرتبوون ...

کاتێ کە سیمیار بەخۆی و ئاژەڵەکانییەوە بەبەردەمی ماڵی خواجەدا تێدەپەڕی، نازەنین سەری دەبردە پێشەوە کە چاوی بە سیمیار دەکەوت، سەر کوڵمەکانی وەك گوڵاڵە ئاڵەی نەسرینی قەد پاڵەکان شەوقی ناو دڵی ئاوەژوو

دەکردەوەو سوور هەڵ دەگەڕان، کە سیمیار دەرکەوت نازەنین وای دەزانی ئەو هەموو شاخ‌و دەورووبەرە چاوەڕوانی گەیشتنی ئەو دەکەن، ئەو مانای ئەو گەردوونەیە! لەدڵەوە دەیووت: سەیرکەن چۆن دەڕواو چۆن بەنەزاکەتەوە هەنگاو دەنێ، بڕوانە ئەو ڕێگەی بەر پێیەی چۆن خۆی بۆی تەخت دەکات، ئەوەتا بزن‌و مەڕەکانی وەك سەربازی تالیم دراو دەکەونە شوێنی‌و یەکێکیان پێش ئەوی‌تریان ناکەوێت.....شاخە سەرکەشەکەی ئەوبەریش دەستەو نەزەرە بۆی‌و سەری بۆ گەیشتنی چەماوەتەوە درەختەکان، گوڵاڵەکان هەزار ڕەنگە خۆیان تنگاندووەتەوە وەك دیوانەی ئەڤیندار بەدەم فێنکی بای بەهارەکەوە دەشەکێنەوە ..

هەنارخان خەریك بوو دڵنیا بێ کە ئەوەی ئەو بیری لێ دەکردەوە وا لە گومان دەچێتە دەرەوەو دەبێتە یەقین، بۆیە بڕیاری دا لایەنی سیمیار بگرێ‌و بەری نەدا..

دەبێ چی بکات باشە!...لە دڵ خۆیدا وای دەووت: ئەوە کوڕێکی هەتیوی بێ دایك‌و باوکە، وەرویڕك‌و بەر دەستی پەسەندە، بەڵام چەند بڵێی کوڕێکی ژیرو جوان‌و هەڵکەوتەیە....جا چار چییە؟!. تاکە ڕۆشنایی چاوەکانم کە بینای ئەم جیهانەی پێ بکەم، تاکە دڵم کە بۆ ژیان لێ بدات تەنها نازەنینە، نازەنین هەموو شتێکی منە...ئەگەر فریای نەکەوم لەوانەیە، دەردەکەی کاریگەرتر ببێ، من لە ئاسمان بۆ دەرمانی ئەو دەردە دەگەڕام کەچی وا هاتووەتە بەر دەستم.....هەنار خان لەبن زمانی‌دا وای دەووت، بەخەیاڵیش ئەوەی لێك دەدایەوە! چی بکات لە سیمیاری نزیك بخاتەوەو بیبینێ تا بەتەواوی دڵنیابێ کە دەرمانی دەردەکەی نازەنین لەماڵ خۆیانەوە دوور نییەو نزیکە......

ئەو ساڵە وەك ساڵەکانی پێشوو تووش‌و فرە تەڕ نەبوو، وشکە ساڵیش نەبوو، وەرزەکە بە هەموو هێزێکی هونەرییەوەی بەهارەکەی ڕازاندبووەوەو تاج‌و تارای

بەختەوەری سروشتی پۆشیبوو,خەڵکەکە جەژن و سەیرانی نەورۆزیان لە ئامێزی ئەو سروشتەدا پیرۆز کردبوو، پاش جەژن هەر کەسەو پەلاماری هەرمانی ساڵی تازەی دەداو ئارەقی ماندووبوونی خۆیان لە قەد پاڵ شاخ و بەستێنی و روبارو دۆڵ و کێڵگەو توونا و توونی باخ و رەزدا دەچاندو دوای چەند مانگێك دەبوو بە خەزێنەی بەهادارو وەك دەرامەت یەك بە دە دەهاتەوە دەستیان و بارمتەی ژیانی ساڵیان مسۆگەر دەکردەوە، ژیانی هەزاران ساڵەی لەوەو بەریشیان هەروەها سەر لەنوێ تازە کردووەتەوە، ئەگەر لەولاتانی تردا هەندێ جار مردن بە سەر ژیاندا زاڵ بووبێ ئەوا لە هەورامانادا هەمیشە مردن لە مردندا بووەو ژیان لە سەرکەوتندا..

هەنارخان و نازەنین و هەندێ کارەکەری دیوەخان نەبێ، لە ناو حەوشەی رەق و باڵاخانەی قیتی هەڵچوودا دەمانەوە، ئیتر خەڵکەکەی تر هەر لە بەیانییەوە تا زەردەپەڕی ئێوارە کۆڵیان لە پشت دەبەست و توێشەبەریان پڕ بە خواردن دەکردو لە ماڵ دەردەچوون و لە ناو بەهەشتی سروشتدا وەك مێشە هەنگ بە شوێن کاردا پەرت و پەروازە دەبوون، خۆیان بە گۆرانی چڕین و پێکەنینی دەم کار پاکژو تازە دەکردەوە. ئارەقەی ناوچاویان تێکەڵاو بە هزرو بیری رۆژانەیان دەکردو لەناو خاکی پڕبەپیتدا دەیان چاندو دەیان پژاند، بەیانیان چەندیان لەتەك خۆیاندا دەبرد، ئێواران چەند جای ئەوەیان دەهێنایەوە. هەنارخان لەبەر سایەومایەی خۆی نەی دەدرکاند، دەنا لە دڵەوە ئاواتی ئەوەبوو ئەویش وەك ژنانی دەگا کۆڵی لە پشت خۆ ببەستایەو منداڵی خۆی وەپێش دایەو لە ئامێزی دایکی سروشتدا خۆی خەریك بکردایە...

باخەکەی خۆیان کەوتبووە ئەو دیوی دەگاوە، لەوێ سەیرانی ساڵانەی خۆی سازدەدا، لەتەك هەندێ نۆکەری دەنگ خۆش وکارەکەردا خواردن و پێویستی

ڕۆژێکیان دەبردو تا ئێوارە دوور لە جەنجاڵو ژاوەژاوی هاتووچۆکەرانی دیوەخان سەیرانەکەی خۆیان تەواو دەکرد، هەر جارەی کە خواجە بەهەمەنیان لەگەڵدا بوایە نەبوو بە دیوارێکی ڕەق بەرچاوی دەگرتنو دەنگو ڕەنگی سەیرانەکەی لێ کپ دەکردنەوەو نەی دەهێشت لە پێستی خۆیان بچنە دەرەوە...

هەنار خان دەمێك بوو بیری لەوە دەکردەوە کەکارێکی واسازبدا لە شوێنێك نازەنینو سیمیار بەرامبەر بەیەکتری ڕابگرێو سەرنجیان بدات، باشترین تەگبیر هاتە سەر ئەوە سەیرانی ئەمساڵیان ببەنە ناو باخوپاوانەکەی خواداد، بەڵام گرفت خولجە بوو، بە هاتنی ئەو لەوانە بوو نەخشەکە سەر نەگرێ، بۆیە هەنارخان سەیرانەکەی بەبەهانەی دڵتەنگی نازەنینەوە دواخست، مەبەستی ئەوەبوو تا خواجە بەسەفەر بڕوات....چونکە ئەو هەموو ساڵێ لەو کاتەدا سەردانی بەگو دەهاقینەکانی دەڤەرەکانی دەورووبەری ناوچەی هەورامانی دەکردو لە گەڵیاندا بۆ سەیرانو ڕاوشکار دەچوو، ئەو ڕۆژەی کە ئەو ڕۆیشت، بۆ دوو بەیانی هەنارخانیش بەخۆیو دەسو پەیوەندو تەدارەکێکی شکۆمەندانەوە بەرەو سەیرانگە کەوتنەرێ، تا نەگەیشتنە کەنار باخەکەی خواداد جگە لە خۆیو نازەنین کەس نەی دەزانی لە کوێدا بارو بارخانەی سەیران دەخەن، لەولاپاڵەدا کە بەهار لەبەر تیشکی ڕەنگینی ڕۆژو هاژەی چەمو قرمەی قەڵبەزەی ئاوی بەفرو بادەی سەرخۆشی لەسەر نابوو، لەو لالە زارەدا، گوڵە نەسرینو هەڵاڵە سوورەو شلێرو هەڵاڵە برمەو وەنەوشەو چنوور دەشنانەوەو سەمایان بۆ جریوەو جووکەی مەلو قاسپەی کەوو هۆزاری ناو پاوانەکە دەکرد، هەنارخان فەرمانی دابەزینی لەو شوێنەدا، کە تەلانێکی تەختو بەرین بوو دەکەوتە نێوان باخو پاوانەکەوە...ئەو شوێنە لە پشتەوە دەیڕوانیە پەرستگای دەگا...ئەو وای دانابوو ئەگەر یەکێك لێی پرسی بۆچی ئەو شوێنەی هەڵبژارد، بڵێ:

– حەز دەکەم رووم لە پەرستگاکەمان بێت و لێی دوور نەکەومەوە....دای‌نابوو وا بلێ کەچی کەس ئەو پرسیارەی لێ نەکرد.. لەوانەش بوو خواجە بەهمەن کە بهاتبایە ئەوێ، ئەویش ئەو پرسیارەی لێ نەکردبا... ئەو شوێنە لەوەرگای بزن و مەڕەکانی سیمیار بوو...

دەسو پەیوەند خەریکی ئامادەکردنی خواردن و خواردنەوەی سەیران و گەمەو پێکەنین بوون، کەچی هەنارخان بەم لاو بەو لادا چاوی دەگێڕا سیمیار بەدی بکات، لەهیچ لایەك بەر چاوی نەدەکەوت! بزنەکان دوو دوو لەسەر تاشە بەردەکان پاڵیان دابووەوەو لەسەر خۆ کاوێژیان دەکردو یەکێکیان نەدەجووڵایەوە، هەمووشیان وەك لەچاوەڕوانی سیمیار دابن وا روو بەرەو خوار دەیانڕوانی! کەچی سیمیار دیار نەبوو!.

هەنار خان هەر لە مژووری ئەوەدابوو کە بزانێ سیمیار لە کوێیە؟ لە دواییدا ئەگەری ئەوەی کرد کە رەنگە بۆ خوێندن چووبێتە لای مۆغانەکە، ماوەیەك چاوەڕوان بوو، هەر دیار نەبوو...لەوە زیاتر خواییتی نەما، وای بەباش زانی بەبۆنەی نان و خواردن بردن بۆ مۆغانەکە یەکێك لە نۆکەرەکانی بنێرێ بۆ پەرستگاکە تا بزانێ لەوێیە!. ئەگەر لەوێ بوو بۆ ئەوەی زوو بگەڕێتەوە پێی بڵێ: ئەمڕۆ هەنارخان لە ناو موڵکەکەی ئێوەدا سەیران دەکات... هەروەهاش تێی بگەیەنێ کە بزڵەو بەرخی خەڵکی تر تێکەڵاو بە بزن و مەڕەکانیان بوون و دەیان چەکێنن!...

تەنها خواداد دەیزانی سیمیارلە لای مۆغانەکە دەخوێنێ، ئەویش لای کەس نەیدرکاندبوو، پەیمانی لە مۆغانەکەش وەرگرتبوو کە لای کەس دەنگ نەکات، بەرامبەر بەو پەیمان و فێرکردنە، جیرەی بۆ بڕیبووەوە، دوو رۆژ جارێ جامێ ماستی بۆ دەناردو سەری ساڵیش دوو بزن و یەك تەوریزی رۆنی

ئەدایە....کەچی وا دیاربوو هەنارخان زانیبووی سیمیار خەریکی خوێندنە!.
داخۆ هەنار خان چۆنی زانیبێ؟!.

کابرای نۆکەر کە لە پەرستگاکە چووە ژوورەوە، دی سیمیار لە بەردەم مۆغانەکەدا بەچۆکدا هاتووەو بەدەنگێکی ناسكو شیرین شتێکی دەخوێندەوە دڵی دەتواندەوە، ئەو پەرستگایە کە دەتووت کۆنە ئەشکەوتی ئادەمیزادی چەرخی بەردینەو لەبن میچەکانیەوە دێوەژەنی دووکەڵاوی رەشی پیا شۆڕ ببووەوە بۆنی شتی گەنیوی لێوە دەهات، کەچی بەو ئاوازو خوێندنەوە بزرگییەکی وای پەیدا کردبوو. ببوو بە ئارامگەی حەواندنەوەو رەوانیو سامو سەیبەت، دڵی مرۆڤ چەند رەق بوایە لەو ساتەدا دەبووە مەنجەڵی گوڵاو گرتنەوەی سەر ئاگر، کابرا وا لەهەدەر چوو، لەناو ئەنێشەدا نقوم بوو، ئەوەی پێی وترابوو لە بیری چوو. وەك کاروانچییەك لەسەر وڵاغەکەی خەوی لێ بکەوێ، تاوڵاغەکەی سەر سمێکی ناقوڵا ئەدا بە ئاگا نایە وەها ئەگەر مۆغانەکە زوو خواردنەکەی لێ وەرنەگرتایە، ئەوەی بۆی هاتیوو لەبیری ئەکرد.... مۆغانەکە پیاوێکی چلێس بوو زوو پەلاماری خواردنەکەی داو نەی هێشت سیمیار پێی بزانێ، باش تەقەتی کرد، نەبادا بەتەمابێ بەشی بدا...رووی لە کابرای نۆکەر کردو دەسێکی بەریشە درێژەکەیدا هێناو زەناری بەر کەمەرەکەی شل کردو سمێڵە دوکەڵاویەکەی لەسەر لێوی لادایەوەو بە ئاستەم وتی:

– کێ تۆی نارد؟

– هەنار خان.

– لەکوێیە؟

– لە سەیران.

– لە کوێ؟

- له باخی خواداد.

- له باخی خواداد!؟

مۆغانەکە وای وت‌و رووی بەلای سیمیاردا وەرچەرخاندو خوێندنەکەی پێ بڕی‌و وتی:

- سیمیار؟ گوێت لێ بوو؟.هەنار خان لەناو موڵکەکانی ئێوەدا سەیران دەکات...

سیمیار سەری حاڵی‌بوونی خۆی بۆ مۆغانەکە لەقاند....

- هەڵسە بڕۆ دروودی منی پێ بگەیەنەو پێ‌ی بڵێ: نزاکردن بۆ ئەو هەمیشە وێردی سەرزمانمە...لە ئەهرۆمەزدام داوایە هەر پایەدارو بەرقەرار بێ، وای وت‌و چوو باوشێ تەڕکە داری هێناو خستنیە ناو ئاگرە خەفە بووەکەوەو بە کوڵ فووی پیا کردن، بۆ ئەوەی بە خەستی چڕە دوکەڵیان لە بۆخارییەکەوە دەرچی‌و لەدەرەوە بەرز بێتەوە نیشانەی منەتباری ئەو بۆ هەنارخان دەربخات....

سیمیار سیپارەکەی سەر کۆشی بەجوانی دەقداو لە تاقی سیپارەکان دایناو بەنەزاکەتەوە نزا خوازی لە مامۆستا مۆغانەکەی کرد،، لەسەر خۆ بەرەو ئاژەڵ‌و پاوانەکەی خۆیان گەڕایەوە....

نە کابرای نۆکەر لە بیری ما راسپاردەکوی هەنارخان بگەیەنێ، نە ئەویش پرسیاری لێ کرد....

ئاژەڵەکان لەمە دییان سیمیار هاتەوە رابوون‌و کەوتنە جموجۆڵ، ئەویش بەبێ ئەوەی تێکەڵاوی سەیرانکەران ببێ بەلایاندا تێپەڕی‌و چووەوە ناو مەڕو بزنەکانی‌و لەسەر تاشە بەردێك دانیشت‌و شمشاڵەکەی دەرهێناو بەزمی (هەی گوڵ هەی بەهار)ی بۆ لێدان. ئاژەڵەکە بەپێ‌ی نەزم‌و ئاوازی شمشاڵەکە دەجوڵان‌و بەلاپاڵی شاخەکەدا پەخش دەبوون ...

هەنارخان‌و نازەنین بە نەوای شمشاڵەکە کەیل ببوون، ئاگایان لە دەست‌و پەیوەندەکەیان نەمابوو کە ئەوانیش لەکاتی ژەندنی شمشاڵەکەدا دەستیان لەهەموو کارێکیان بەربوو، هەنارخان‌و نازەنین دوور لەوان دانیشتبوون، ئیشی تایبەتی خۆیان هەبوو، ئاگایان لەوان نەمابوو، کەدییان مەڕو بزنەکان بەناو لەوەڕگاکەدا پژان‌و بەپێی بەزمی بلوور ژەندنەکە هەڵس‌وکەوت دەکەن،، وەك گرێی بەرەبینی گەرووی گۆمێکی خنکاو دەر بدەن وەها هۆشی نازەنین لێشاوی بەسەر زمانی دا هێناو کرایەوە! بەبێ هەدەرانە، رووی کردە دایکی‌و وتی:

– دایە!...

هەنارخان وەك نیگای لەبەهەشتەوە بۆ هاتبێ، لە خۆشیاندا باوشی بە نازەنین دا کردو لە ئامێزی خۆی ناو پرمەی گریانی شادی لە گەروویدا تاساو پێی وت:

– دایە بالاگەردانت بێ....ئەوە تۆیت! پێم دەڵێی دایە؟!! دەی جارێکی تریش پێم بڵێ دایەو شایی مەرگم بکە...ئۆخەی نازەنین گیان، ئەوە گوێم دەزرنگێتەوە، کە پێم دەڵێی دایە! یان خەون دەبینم!...

هەنارخان لە خۆشیاندا خەریك بوو شایی مەرگ ببێ....پەشۆکا، نەی‌ویست ئەوانەی کە لەوێ بوون بزانن کە نازەنین زمانی کراوەتەوە...، ئەویش بۆ ئەوەی دایکی دڵنیا بکات کە گرێی زمانی کراوەتەوە، هەردوو دەستی ماچ کردوو وتی:

– دایە! ئەوە نییە زمانم بەربووە....گوێت لە نەوای ئەو شمشاڵەیە چی دەڵێ؟! ئەو بزن‌و مەڕانە دەبینی چۆن بەو نەوایە دەجووڵێن؟. ئەو گوڵانە، ئەو دارانە، ئەو مەلانە چۆن لە خۆشیاندا دەشنێن‌و دەشەکێنەوەو بۆی دەسێننەوە؟! نازەنین کەوای دەوت، چاوە مەستەکانی لەناو فرمێسکی بلووریندا وەك دەریایەکی پیرۆزەیی شین، هەموو مانایەکی ئاسمانی تیا جەم بوو...هەنارخان لە

ناو دەریای ئەو چاوانەدا پەیامێکی بە پەلەی بۆ هاتبوو لە ناو ئاوەزووی ئەودا خۆی نواندو پێی وت:

- دەردەکەی نازەنین دەروونییە، پەیامێکە لە عیشق گەورەو پایەدارترە، جۆرە نهێنییەکە زمان نازانێ گوزارشتی لێ بدلتەوە...نهێنییەکی یەزدانی وایە تەنها ئەو دەتوانێ ئەو راسپاردەیە بەگا بێنێ....

ئەوەی نازەنین لەدەورو بەری سیمیاردا هەستی پێدەکرد بەهەمان ئەندازەو چەشن لەناو هەستی دایکیدا ئامادەگی نەبوو، ئەم لە خۆشی زمان بەربوونەکەیدا هەموو هەستێکی خستبووە سەر چاك بوونەوەکەی نازەنین، ئەوای بلوێرەکە نەبێ هەردووکیا نی دەلاواندەوە ، دەنا هەریەکەیان لەجیهانی خۆیدا خەریك بوو...

هەنار خان بەو هەموو کارامەیی‌و ژیرییەوە لەخۆشیاندا خەریك بوو لێی بشێوێ! نەی دەزانی چی بکات! هاوار بکات نازەنین چاك بووەتەوە! یان بێ دەنگ بێ؟ ئایا سیمیار بانگ بکەنە لای خۆیان؟ یان بەبەهانەی خۆشی ئەو شمشاڵەوە بچنە لای!...چی بکات باشە؟...رووی کردە نازەنین‌و وتی:

- نازەنین گیان!...داوای لێ بکەم بێتە لامان؟ یان ئێمە بچینە لای؟ پێم بڵێ کامیان بکەین؟....

نازەنین توورند باوشی بەدایکیدا کردو بەماچێکی گەرمی روومەتی پێشنیارەکەی بۆ مۆر کردو وتی:

- دایە! بابڕۆینە لای...

دەستوو پەیوەندەکە کە بە تفاقی سەیران‌و کاروباری خواردنەوە خەریك بوون، خەریکی بگرەو بەردەی خۆیان بوون، وتەی راست‌و رەوایان تێکەڵ بە چەوت‌و ناڕەوا دەکرد، بەهارەکە هەموو دەرو دیوێکی والآکردبوون، چی خەوش‌و خارێکی بن هەست‌و سەر هەستیان هەبوو بێ پەروا لە بەروازی تەسك‌و تروسکی خۆیاندا

ترازابوون‌و خۆیان دابووه بەر ئەو رۆژە بێگەردەی بەهار...بۆنی گوڵاڵەو هەڵاڵەو چنووری پای بەفرو فڕکەو هۆڕی باڵندەو فجوق کردنی ژەرەژان پەردەی بەندووباوی راماڵی بوون‌و هەرکەس لەبن کڵاوی خۆیدا بە شتێ کەیل ببوو بە دەپلی خۆی شادی دەژەند.

سیمیار بە پێی پێویست تێکەڵاو بە خەڵك دەبوو، حەزیشی نەدەکرد کاتی خۆی لەشتێکدا بە فیڕۆ بدات کە پەیوەندی بەوەوە نەبێ، یان سوودی هەمووانی تیا بەدی نەکرایە، لەبەر ئەوە نەبوو خۆی یان خەڵك بەکەم بزانێ، بیری بەرفراوان بوو، وەك خەڵك بەتیلایی چاو تەماشای شتەکانی نەدەکرد، هەموو زیندەوەرانی بەهاوبەشی ژیانی مرۆۋ دەزانی، ئەو دارو درەخت‌و ئاژەڵانەی بە هەڤاڵی خۆی دەزانین..... دوای ئەوەی ئاژەڵەکانی بە نەوای شمشاڵەکەی بە قەد پاڵی چیاکەدا پەخش بوون، شمشاڵ‌و گۆچانەکەی لەسەر ئەو بەردەی کە بلوێری لەسەر لێدا دلناو چووە ناو رەزەکەو دەسی کرد بەکێڵانی بن رەزەکان، وەختێ کەدی هەنارخان‌و نازەنین هاتنە سەر ئەو بەردەو نیازی دیتنی ئەویان هەیە. پاچەکەی دلناو بەکاوەخۆ هاتە لایان‌و بە گوفتێکی شیرین پێی وتن:

– ئەم ناوە، ئەم پاوانە پایاندازتانە...

هەنارخان بەنازونیانەوەپێی وت !

– ئاوا پێشوازیمان دەکەی

– خانم نەمزانیوە ئەم ناوە گەورە دەکەن، دەنا گلەییت رەوابوو...

– ئێمە ئیمڕۆ میوانی ئەم ناوەین

– بەدیدارتان شادمانین....لە هەر شوێنێ بن ماڵی خۆتانە..

– ئەمە چەند ساڵە نازەنین نەخۆشەو لێمانت نەپرسیوە....

سیمیار تێڕوانینێکی هێمنانەی پڕ میهری ئاراستەی نێو نیگای نازەنین کرد، بەناو گۆمی چاوە مەستەکانیدا چووە خوارەوە. و هەموو گاتا ونبووەکانی ئاوێستای تێدا سۆراخکردو وتی:

- ئەوانەی نازەنینیان بە نەخۆش زانیوە، نازەنینیان نەدیوە، ئەوەی کەدیویانە دیدی خۆیان بووە.

هەنارخان بەتەواوەتی لە مەبەستی قسەکانی سیمیار حاڵی نەبوو، بەڵام وتە پڕ نەزاکەتو پڕ بەمتمانەکانی وای لێکرد کەلەوە دابێ هەموو نوێشتەو دەمودووی گشت جادوو مۆغانەکان کاری یەك وتەی سیمیاریان لەباردا نەبووبێ!. ئەو دەردەی کەبۆ دەرمانەکەی وڵات نەمابوو بەشوێنیدا نەگەڕێن، پیاو چاك نەمابوو، پەنای بۆ نەبەن،ئەمەتا! چەند هەنگاوێك لەماڵ خۆیان دوور نەبوو!....

دایك و کچ هەردووك چاویان لەنێو نیگای سیمیار کلا نەدەکرد، هەنارخان کە قسەی لەگەڵ سیمیاردا دەکرد، ئەو نێو نیگا پاکەی، ئەو گفتو لفتە پڕ نەزاکەتەی سامێکی خستبووە دڵیەوەو زمانی بەیەکدا دەهات، لە دڵەوە دەیووت:

- ئەی یەزدانی مەزن، ئەوە چ نهێنییەکی سەیرە کە لە ئافەریدەی خۆتدا حەشارتداوە؟! ئەی خوایە ئەمە پەیامبەرە یا فریشتەیە؟

- دیارە جوانی پیاو بە ئافرەت دەزانرێ، جوانی ئافرەتیش لای پیاوە!..جوانییەکەی سیمیار لە چاو ئافرەتدا جوانییەکەی نازەنینی دەبەزان... پەنا بەخوا ...ئەو جوانیو ژیرییەی لە سیمیاردا کۆبووبوونەوە، هەموو تەختو چقەیەکی شاهانەی دەهێنا..

هەنارخان چەند لەو کوڕە ورد دەبووەوە، ئەوەندەش لە دڵ خۆیدا لەبارەیەوە لێکی دەدایەوەو دەیووت:

– خوایا ئەم کوڕە نازدارەت بۆ بەیەکێکی وەك من نەدا!. ئەمە کەی لایەقی یەکێکی وەك پەسەندە، کەی حەقە شوانکارەی ئەو بێ!ئەوە بافتی ئەوەیە لەتاق و سەرایەکی پاشانەدا بژی..نەك شوانکارە بێ!..تۆبە!..خوایا، خۆت دەزانی چی دەکەی......

لەوکاتەدا کەهەنارخان کەوتبووە ناو ئەو جۆرە خەیاڵانەوە، سیمیار بەنازەنینی دەوت:

– نازەنین! هەڵسە..

وای وت و، نازەنین هەڵسایەوە سەر پێ..سیمیار گۆچانەکەی دایە دەستی و پێی وت!

– ئەو گوڵاڵە دەبینی؟....

ئاماژەی بۆ گوڵە نەسرینێکی سوور کرد، کە چەند هەنگاوێك لێیانەوە دوور بوو، بەدەم بایەکی فێنکەوە دەشنایەوە.

نازەنین وەك بە فەرمانی سەردارێکی گەورە هەڵسابێ وەها بەسووك و ئاسانی و رووی گەشەوە هەڵسایەوە...

– بڕۆ ئەو گوڵاڵە بێنە..

– بۆ منە ؟ یان بۆ تۆ؟!

– بۆ خۆت، بۆ هەنارخان...

چووە لای گوڵەکەو دەسی بۆ درێژکردو وتی:

– ئەگەر بۆ منە، یان بۆ هەنارخانە، نای هێنم.....

دەسی لە لاسکەکەی داو زوو دەستی گێڕایەوەو راچڵەکاو وتی:

– ئای ئەوە چی بوو؟!..

هەنارخان بەو راچڵەکینەی نازەنین سەرسام بوو وتی:

- ئەوە چی بوو؟!

- دایە گوڵاڵەکە لەمە دەستم بۆ برد زیڕاندی.....

سیمیار زوو ڕێی قسەکردنی لەو بارەوە لێ گرتن‌و ڕووی کردە هەنارخان.

ئەو گوڵاڵە چاوی ئەو چیایە بوو، بۆ ئێوە دەشنایەوە!

هەنارخان قسەکەی پێ سەیر بوو!

- بۆ ئێمە.؟!

- بەڵێ.....وای وت‌و گۆچانەکەی لێ وەرگرتەوە ، لەکاتی وەرگرتنەوەیدا دەستی لەسەر چەمەی گۆچانەکە تێکەڵاو بەدەستی نازەنین بوو، بروسکەیەکی کارەبایی هەردووکیانی تێکەڵاوکرد....

سیمیار ڕووی کردە هەنارخان‌و وتی:

- ئەم گۆچانە بۆ لەوەڕاندنی مەڕو ماڵاتە، مەڕو ماڵات‌و دارو درەخت‌و گژو گوڵ‌و گیا وەك ئێمەن، ئەگەر ئەوان نەبن ئێمە ناژین، کەوا بێ دەبێ نگابانیان بکەین، بیانپارێزین، گۆرانی خۆشیان بۆ بڵێین، شمشاڵیان بۆ لێدەین، خۆمان لێیان دوور نەخەینەوە دەنا هەناومان دەغزدار دەبێ‌و پەکمان دەکەوێ!...

هەنارخان لە وتەکانی سیمیار هەر ئەوەندە حاڵی بوو کەئەو توانی زوو ناو هەناوی هەنارخان بخوێنێتەوە، نازەنینیش سەرنجی خستبوە سەر ئەوە کە ئایا دایکی لەمەبەستەکانی قسەکانی سیمیار حاڵی دەبێ یان نا

نەدایکی لەوتەکانی سیمیار حاڵی بوو نە نازەنین نهێنی ئەو گۆچان بەدەستەوە گرتن‌و هێنانی گوڵاڵە سوورەکە تێگەیشت، هەر ئەوەندەی لێ حاڵی بوو بەجێبەجێکردنی فەرمانەکەی سیمیاروبەدەستەوەگرتنی گۆچانەکە جۆرە تێکەڵاوبوون‌و ناسیاوییەك لە نزیکەوە دروست بوو، لەوکاتەوە دەستی لەدەستی کەوت هەستی بەبار سووکییەکی دەروونی کرد، وای دەزانی حەوت دەرگای

چوونە ژوورەوەی نهێنییەکانی بۆ کراوەتەوە...هەنارخان ناحەقی نەبوو لەدڵەوە دەیووت: خوایا ئەم کوڕە لەم تەمەنەدا ئەو قسە پڕ بەحیکمەتانە چۆن دەزانێ، وەسە هەر حەوت دەرگاکەی ئاسمانی بۆ کرابێتەوە!....

روانینی هەر یەکەی سیمیارو نازەنین بۆ ئەوی‌تر، روانینی پاشکەوتەی دڵداری نەبوو، بەڵکو روانینێکی تربوو رەخسێنەری ناسیاوی‌و لەیەك نزیك بوونەوەبوو....

کەچی روانینەکەی هەنار خان پڕ لە گومان‌و نەسرەوتی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا وای دەزانی لەپڕ لەسەر تەختی شاهانە دانراوە یان باڵندەی هۆما لەسەر شانی نیشتووەتەوە، نەیدەزانی چی بڵێ...هێزی دایە خۆی شتێ بڵێ، پێی نەوترا! دەستی دایە شمشاڵەکەی سیمیارو وای گرت وەك ئەوەی بیەوێ پێی بڵێ: بەزمێکیان بۆ لێدە...

سیمیار شمشاڵەکەی لەسەر لێوی داناو پەنجەکانی لەسەر ریز کردو بەزمی(هەی ناز نازەنین)ی لێدا...چ خەوشێ لەدڵیاندا هەبوو باهۆزەی ئەو نەوایە هەمووی راماڵی.. ئیتر پاش بیستنی ئەو نەوایە پێیان وابوو هەموو دەورو بەر هاتووەتە قسەو مژدەدانی رۆژێکی نوێی گەیاندووە...

نازەنین کەدی دایکی گەلێ دڵشادە پێی وت:

– دایە!...

هەنارخان بەوتەکەی(دایە) هاتەوە سەرخۆی‌و توند باوشی پیاکردەوەو وتی..

– بەڵێ دایە گیان دەی زوو زوو بڵێ دایە..

– دایە گیان من هەر وتوومە دایە..تۆ گوێت لێم نەبووە، ئەوە نییە هەر دەڵێم دایە؟!.

– ئۆخەی لە یەزدان بەزیاد بێ....ئەوە چی پێ وتی وا چاك بویتەوە؟.

– هیچ ، هیچ ! کوا من نەخۆش بووم، من هەر وابووم، دایە لەمە دەستم دایە ئەو گۆچانە، گیانم چوون پەپوولەی ئازاد کەوتە باڵە فڕێو بەناو لەشمدا گەڕاو لە هەموو دەغزێك پاکی کردمەوە، جاران وا هەستم دەکرد فاقەدراوم ئێستا وانەماوم، گوێم بۆ هەموو دەنگێ کراوەتەوە، بینایی چاوم فراوانترو بەر ڕۆشنترە،هەموو شتی لەگەڵمدا ئاشنایە، زارم بووە بەکلیلی هۆشم..دایە گیان لەمەو دوا ئەوەندە قسەت بۆ دەکەم بێزار ببی!....

لەو کاتەدا کە نازەنین قسەی بۆ دایکی دەکرد ، سیمیار شمشاڵەکەی بەقەد خۆیدا کردەوەو دەسی دایە گۆچانەکەیو داوای مەرەخەسبوونی لێ کردن..

چوو لە داوێنی مەڕو بزنەکانیدا راوەستاو خۆی بەسەر گۆچانەکەیداداو رووی تێکردن..

نازەنین بە دایکی وت:

– دایە حەزدەکەم ببم بە شوانکارە!..

هەنارخان زوو هاتە خۆیو پێی وت:

– ئێرە شوێنی ئەو قسانە نییە، با بگەڕێینەوە، لەماڵەوە ئەو قسانەم بۆ بکە!..

هەنارخان و نازەنین وەك هێزێکی نهێنی پاڵیان پێوە بنێ، پاش ئەو قسەی نازەنین کردی، بەئاستەمو روویەکی گەشەوە گەڕانەوە لای سەیرانکارەکان....

هەنارخان بڕوای نەدەکرد نازەنین بەیەکجاری چاك بوویێتەوە، بۆیە هەر دەیدواند، بەپەلە کورتە پرسیاری لێدەکردو وەرامدانەوەی لێدەویست، بۆیە نازەنین وتی:

– دایە دەڵێی بڕوات نایە کە چاك بوومەتەوە!..

- هەناوی دایەلەخۆشیا دڵم بڕوای نایە؟! دەترسم؟.

- لەچی؟..

- نازانم....لەخۆشیاندا هۆشم ناکەوێتە سەر یەقین....پێم بڵێ نازەنین گیان بەو کارەکەرو نۆکەرانە بێژین: نازەنین چاك بووەتەوە؟

- بەڵێ..... بێژە.....ئەوەتا قسە دەکەم، لەگەڵ ئەوانیشدا هەر ئێستا قسە دەکەم....

کارەکەرو دەستو پەیوەندەکە کەزانییان نازەنین چاك بووەتەوەو بە ئاسانی دەتوانێ قسە بکات، نازەنینیان لەناوەراستی خۆیاندا راگرتو دەستیان بە شایی و سەماو قریوەو گاڵە کرد، ویستیان بەرووی دەگادا بچڕن کە نازەنین چاك بووەتەوە، وەلێ هەنارخان نەیهێشت...

ئەوان نەیانزانی چی چاکی کردەوە! نزای مۆغانەکە؟ خۆشی شوێنەکە؟ ئەوای شمشاڵەکە؟ دیتنی سیمیار؟ یان هەموویان بەیەکەوە؟!.......

# (٣)

هەنارخان بەروالّەت بۆچوونەکەی بۆ باخی خواداد بۆ سەیران چوون دانابوو، کەچی لەراستیدا بۆچوونەکەی بۆ دیتنی سیمیارو تاقیکردنەوەی بۆچوونەکەی خۆی بوو، کە بۆی دەرکەوت بە هەلّەدا نەچووە وای دەزانی ئەو هەموو جیهانە لەناو دلّی ئەودا شایی و زەماوەندییەتی...هەندێ ترس لەدلّیدا مابوو، خەمی بوو ئەو چاك بوونەوەی نازەنینە کاتی بێ و تاسەر نەبێ....بەوە دلّی خۆی دەدایەوە کەئەگەر کاتیش بێت خۆ سیمیار دوورنییەو لەدەست دەرناچێ.

هێشتا خۆر گوریسێکی مابوو ئاوابێ سێبەر بە تەواوەتی دانەبەزیبوو، بەرەو مالّ بەخۆشی وشادی گەڕانەوە، لەمەگەیشتنە ناو دەگا گولّنازی کارەکەر، دەستەسڕەکەی راوەشاندو دەستی بە قریوەوگۆرانی و هەراو زەنا کردو دەیووت

– مژدەبێ نازەنین چاك بووەتەوە.. هۆ دۆستینە، هۆ خزمینە وەرن گوێ لەزاری شیرینی نازەنین بگرن...وەرن گوێی لێ بگرن، چ شیرین گوفتارێکە.. ئەوەی بڕواناکات بابێت گوێی لە ئاوی پاکی ژیان و نەمری ناو دەمی نازەنین بگرێ... وەرن قسەی لەگەلّدا بکەن و خۆتان لەنەزاکەتی بێبەش مەکەن.

چڕینەکەی گولّناز چوون بروسکەی هەوری بارانێکی تینوو مژدەی بە هەموو مالّ و کوچەیەکی دەگای هەورامان دا.. ژنان و پیاوان و منداڵان: ئەو کەسانەی

تازە لەسەر کار گەڕابوونەوە ناو دەگا بەو مژدەیە هەموو شادبوون و ڕژانە بەر ماڵی خواجە بەهمەن، پیرۆزباییان لە هەنارخان دەکردو ئاخاوتنیان لەگەڵ نازەنین دەزدا، لەخۆشیاندا دەیانقریواندو بەستایش کردن ئافەریدەیی خۆیان بۆ ئەهرۆمەزدای پەروەردگار دەنواند.

ئەوانەش کە تازە لەسەر کار دەگەڕانەوە کە ئەو مژدەیان درایە یەکسەر بەرەو ماڵی هەنارخان دەچوون و لە چاك بوونەوەی نازەنین خۆیان دڵنیا دەکرد.

هەنارخان مەرجی لەخۆی گرتبوو! ئەگەر نازەنین چاك ببێتەوە چی لەدەستی دێ بیبەخشێ...ئیتر ئەو ئێوارە فەرمانی دا کولێرەو گێتەمەژگەی زۆر بکرێ، گوێزو باوی و مێوژو لەپۆرتی هەنجیر بەوانە بدرێ کە بۆ پیرۆزبایی نۆشداریەکەی نازەنین دەهاتن، ئەوەی دەهات کولێرەو خۆشاوی دەرخوارد دەدرا... پیاوەکان لەدیوەخان دەستە دەستە دەهاتن و دادەنیشتن و گێتەو خۆشاویان دەرخوارد دەدراو مژدەی چاکبوونەوەی نازەنینیان وەردەگرت. منداڵەکان گوێزو مێوژیان بەچنگ دەدرایەو لەحەوشەکەدا چەپڵە ڕێژانیان دەکردو لەخۆشی گوێزو مێوژو کاکڵە خواردندا لە هارو هاجی نەدەکەوتن، قریوەی شادی ژنان و خۆشی دەربڕینیان بۆ هەنار خان و بۆ نازەنین سەرووبنی بۆ هاتوچوان نەهێشتبوو.. نازەنین خۆی شەوباشی و شانشینی لەگەڵ هەمووواندا دەکرد، چییان لێدەپرسی وەك میرزادەیەك وەرامی دەدانەوە. ئەو شەوە جگە لە باسکردنی چاکبوونەوەکەی نازەنین هیچ قسەیەکی دیکە لە دەگادا نەمابوو... ئەو خەونانەی کە لەو هەفتەیەدا بینرابوون بە چاك بوونەوەکەی نازەنین لێکدەدرانەوەو ڕاڤە دەکران، هەرکەس بە پێی بۆچوونی خۆی قسەی لەسەر دەکرد، وەك بڵێی هەرکەس گوێزی خۆی لە گیرفانیخۆیدا دەشکاندوکاکڵەکەی پێشکەشی نازەنین دەکرد!.. یەکێك دەیووت:

– نویشتەکەی پیری مۆغان و موبیدەکانی ئەکباتانە یەکاو یەکەو گاڵتەیان پێ ناکرێ، ئەوەی بچێتە خزمەتیان بە دەست بە تاڵی ناگەڕێتەوە!...

یەکێکی تر دەیووت:

– ئەی پیری شارەزوور بۆ ناڵێن: سەدان کەسی چاك کردووەتەوە، چی دێوو درنج و گۆمەتەی ئەو ناوە هەن هەموویان ئاڵقە لە گوێی ئەون!..

یەکێکی تر دەیووت:

– ئەی نزاو پاڕانەوەی مۆغانەکەی خۆمان... ئەوەندە سرودی یاسناو گاتاکانی بۆ خوێند تا خوا بەزەیی پیا هاتەوە!....

هەندێکیش دەیانووت: دەمانزانی چاك دەبێتەوە وەلێ نەماندەزانی کەیە!....

هەندێ لە راکان لە هزرێکی سادەو دڵێکی بێ گەردەوە دەهاتن، هەندێکی تریان بۆ رووپامایی و خۆشیرینکردن و خۆ بردنە پێشەوە بوون ...هەنارخان گوێی لەو هەموو رایانە دەگرت و بە خەندەیەك رازی دەکردن و سەری بۆ دەلەقاندن... ئەو خۆی چاك دەیزانی ئەو نۆشدارییە لە کوێوە هاتووەو چۆن بووە..نازەنینیش گوێی بۆ راکان رادەگرت و بەچاو دەیڕوانییە خەندەو سەر لەقاندنەکەی دایکی....

ئەوەی زەینی بەلای سیماردا دەچوو کە ئەو بە شمشاڵەکەی چاکی کردووەتەوە لەترس بەر پەرچدانەوەی ئەوانەی کەبیریان لە خەڵکی دەرەکی دەکردەوە دەنگیان نەدەکرد، راگرتنی مێرمنداڵێکی وەك سیمیار لەرێزی ئەو مۆغان و پیاوە ناودارانەداو سەرکەوتن بەسەر نویشتەو دەمودویاندا لە هۆش و مێشکیانەوە دوور بوو!.. قبوڵ نەدەکرا، دیارە شتی دەرەکی و دوورەکی و نەبینراوفرە باسکراو پتر دەکەوێتە بەر خەیاڵ و بەبەرگی پیرۆزو هەمەرەنگ دەرازرێتەوەو هۆش و هزری پێ سواغ دەدرێ، لەبەر ئەوە جگە لە هەناخان و

نازەنین‌و یەکدوو کەسێك لە کارەکەرو نۆکەرەکان کەسی تر بیری بەلای سیمیاردا نەدەچوو.. یان دەچوو وەلێ پێی قبوڵ نەدەکرا،،

ئەو شەوە هەنارخان ئەوەی لە خۆی گرتبوو هێنایە دی، ئەوانەی کە بۆ پیرۆزبایی دەهاتنە لای هەمووی بە خواردن‌و شەوچەرەی بە چێژ تەسەل کردن، ئەو شەوە بۆ هەنار خان سەردەفتەری هەموو شەوەکانی ژیانی بوو ..

دوو شت بوونە لەکەی ناو گۆڤەندەکە: یەکەم لەماڵ نەبوونی خواجە بەهمەن کە لەداخ خەمی نازەنینی کچیدا ئاراگێل ببوو بەبۆنەی سەردانی بەگ‌و خواجەو دەمقانەکانی دەوروبەری دەڤەری هەورامان‌و بۆ بەیادانی خەمەکانی لە ماڵ ئامادە نەبوو.

دووەم شت(نۆشا)و(ئەژدەر) خەریك بوو خۆشیەکە تێك بدەن(نۆشا) زڕ برای بەهمەن بوو، پیاوێکی لارو ئەژدەری کوڕی لە خۆی بەدو نەگریس تر بوو، هەردووکیان کەڵکی کۆڕی خۆشی‌و دانیشتنی ناو دیوەخانیان نەبوو، وەك ئەهریمەن بەدەمیاندا رشابێتەوە وابوون، هەمیشە خەریکی پشێوتەو گێچەڵ نانەوەبوون، باوکەکە لە کەڵلەرەقیدا لە بەردی ناو چەم دەچوو، خۆی بە قورس دەزانی کەچی هیچی لە باردا نەبوو، خەڵك لە گیچەڵەکانی خۆیان لادەداو یەك تۆزقاڵە رێزی نەبوو، لەبەر خاتری خواجە بەهمەن نەبوایە کەس ئاوڕی لێنەدەدایەوە، ئەژدەریش کوڕی ئەو باوکە بوو، هەمیشە منداڵاتی بەشەڕ دەدان‌و نەی دەهێشت دوو منداڵ بەیەکەوە یاری بکەن، یان گاڵتەو گەپێك بکەن لێی تێکدەدان‌و بەبێ هۆ بەگژ یەکیدا دەدان، دەسەپاچەبوو هیچ کارێکی نەدەزانی خۆی پێی شیرین بکات، دەنگیشی خۆش نەبوو وەك منداڵان گۆرانییەك بۆخۆی بڵێ

که نۆشا ئەو شەوە هاتە دیوەخان هەموو دانیشتوان خۆیان بردەوە ناو قاپلۆکەکەی خۆیانو جۆرە بێدەنگیو ساردبوونەوەیەك لە ناویاندا دروست بوو، ئەوانەی کە بە قسەی خۆش دیوەخانیان جۆش دابوو کە ئەو هات بەترسەوە قسەیان دەکرد نەك(نۆشا) بەرپەرچی قسەکانیان بداتەوەو ببێ بە ناخۆشی..

هەنارخان هەر ئەو شەوە داوایلە(هێشا)ی کوڕی بەهرۆز کرد کەبەیانی زوو بەشوێن خواجە بەهمەندا بڕواو پێی وت:

– سبەی لەگەڵ گەردو گوڵی بەیانیدا بەرەو ناوچەی ژاوەرۆ و ئازەران دەڕۆیت بەهمەن لەچ شارو دەگایەکدابوو دەچیتە لایو پێی دەڵێی زوو بگەڕێتەوە، نازەنین چاك بووەتەوە..

هێشا بە فەرمانەکەی هەنارخان گەشایەوەو وای دەزانی بەو فەرمانە هەنار خان خەڵاتێکی گەورەی کردووەولە خۆشیاندا وتی:

– ئەی ئەگەر بڕوای پێنەکردم؟!

هەنارخان وتی:

– کەس نییە بڕوا بە تۆ نەکات، چونکە نەخۆت نە باوکت کەس درۆی لێوە نەبیستوون.....لەگەڵ ئەوەشدا نیشانەیەکت دەدەمێ کە یەکسەر بڕوات پێ بکات.....

– هەنارخان ئەنگوستیلەیەکی زیوی گۆ پیرۆزەیی لەپەنجەیدابوو لە پەنجەی دەریهێناو بە هێشای وت:

– ئەگەر بڕوای پێت نەکرد ئەم ئەنگوستیلەی بدەرێ، خۆی دەزانێ مانای چییە. ئەگەر یەکسەر بڕوای پێت کرد پیشانی مەدەو پارێزگاری بکەو بۆمی بێنەوە..

هێشا ئونگوستیلەکەی وەرگرت‌و ویستی ماچی بکات بەڵام لەبەر نۆشا نەبادا لێی بکاتە چڕە نەیکرد..توند لە دەست خۆی ناو بۆ خۆ ئامادەکردن ڕۆیشت‌و دەربەڕی...

لەوکاتەدا کە هەنارخان ئەو ئەرکەی خستە سەرشانی هێشا (نۆشا) خۆی مۆن کرد و وەك گای پەنگاو پیشی خواردەوە. هەموو دانیشتووان زانییان دەمار گیر بووە، هەریەك لەدڵەوە دەیوت، خوایا لە منی دوورکەی، چوون دمارەکۆڵ چزەی ڕەپکردووە، داخۆ بەکێوە بدات؟! لە پڕ هاواری کرد:

- دا یەکێك ئەو ئەژدەرەم بۆ بانگ بکات، بالێرە نەمێنێن!.

هەڵساوە بڕوا، بەڵام دانیشتووان بەتکاو دڵدانەوەی هەندێ ساردیان کردەوەو دلیان نیشتانەوە....

هەنارخان ڕووی تێکرد وتی:

- کاکە بۆ دەڕۆی، بەهەمەن لێرە نییە تۆ لەجێی ئەوی...

نۆشا بەبێ ئەوەی بیر لە زاری بکاتەوە وتی:

- دیارە ئێمە پیاو نین...

هەنارخان پێی وت:

- کێ دەڵێ تۆ پیاو نیت!؟

- ئەگەر ئێمەت بە پیاو دانابا هەڵبەتە پرسێکت بە من دەکرد .

- پرسی چی؟ مەبەستت چییە؟.

- مەبەستم!.... من مەبەست نەزانم وانییە؟!

هەنارخان بە پاڕانەوە وتی:

- کاکە نۆشا!بیکە بەخاتری نووری ئەهرومەزداو دوازدە هەزار پەڕەی ئاوێستا ئەم خۆشییەمان لێ تێك مەدە!...

چەند ساڵە کچم لەماڵەوە کەوتووە ، لە خوا بەزیاد بێ وا ئێستا چاك بووەتەوە، کارێکی وەها مەکە خۆشییەکەمان لێ ببێ بە ناخۆشی ...

هەنار خان چەند دەیویست دڵی نەرم کاتەوە، ئەو ئەوەندەی تر رکی ئەستوورتر دەبوو، هەر ئەوەندەی زانی وتی:

- من خۆشیتان لێدەکەم بە ناخۆشی؟! کەوای لێهات دەرۆم.

دەنگی بەرز کردەوەو وتی(دا ئەو ئەژدەرە خوێڕییەم بۆ بانگ بکەن بابڕۆین، ئێرە جێ‌ی ئێمە نییە).

دانیشتووان سەیری یەکتریان دەکردو قسەیان نەدەکرد، نەبادا سەری گێچەڵەکە لە ئەستۆی قسەکانی ئەوانیش بخرێ....

هەنارخان لەو کردەوە ناشیرینەی(نۆشا) سەری سوڕمابوو، بەرامبەر بە دانیشتووان سەخڵەت ببوو، بەری دەستی راستی بە پشتی دەستی چەپیدا دەداو روی لە مێوانەکان کردو وتی:

- توخوا خەڵکینە بۆ من مەڵێن بۆ خوا بێژن، شتێکی وابووە دڵی ئەوی پێ گەرددار ببێ، ئەگەر هەیە پێمان بێژن چییە!....دەنا چ خوا بەرداریەتی وا لەخۆیەوە توورە دەبێ؟...هەی هاوار من چەند ساڵە ئاواتم ئەوبووە کچم چاك بێتەوە، وا خوا کردی ئاواتەکەم هاتە دی... رووی کردە نۆشا:

- بۆ لە خۆتەوە بەهانە دەگری، خۆ منداڵ نیت!...ئەگەر بەهەمەن لێرە دەبوو، ئەو دەیزانی چی بکات؟...بۆ وا دەکەی؟ ئەگەر شتێ هەیە بۆ نایڵێی ؟!

کەس لە دانیشتوان نقەی لێوەنەهات، بەڵام سەری راستگۆییان بۆ قسەکانی هەنارخان دەلەقان.....

لەو کاتەدا ئافرەتێك بە گریانو دەستی خوێنینەوە هاتە ژوورەوەو روی کردە هەنارخانو وتی:

- هەنارخان ببینە ئەژدەری ئامۆزای نازەنین خان چی بە هۆزای کوڕم کردووەو سەری شکاندووە خوێن لە سەری فیشقە دەکات.....

هەنارخان رووی کردە دانیشتوان و وتی

سەیرکەن!. خۆ گوێتان لێیە؟ ... ئەوە خۆی و ئەوەش کوڕی!.

کە هەنارخان وای وت نۆشا وەك بەڕووی پیشاوی ناو ژیلەمۆ دەرپەڕی وبەکەس نەگیرایەوە، پشت ملی ئەژدەری کوڕی گرت و وەك کلك بەدوای خۆیدا رایکێشا.....

نازەنین تا ئەو ساتە خۆی تێکەڵاو بەو بەزمەی کە نۆشا نایەوە نەکرد، وەلێ کەزلنی میوانەکان خەریکە خۆشییەکەیان لێ تێك بچێ، رووی تێکردن و وتی:

- کەس خۆی سەخڵەت نەکات، کەسیش دڵ لە دڵ نەدات و خۆتان(نۆشا) باش دەناسن، باش بوو رۆیشت ..

خەڵکەکە بە گوفتەکەی نازەنین دامرکانەوە... ئەوجا رووی کردە ژنەکەو وتی:

- کوا کوڕەکەت؟!

- لە دەرەوەیە...

نازەنین بە پەلە چووە دەرەوە بۆ ئەوەی فریای ئەو منداڵە سەر شکاوە بکەوێ..

خەڵکەکە پەشۆکان نەیاندەزانی چی بکەن، کابرا زڕ برای خواجە بەهمەن بوو، لێی دەوەشایەوە ئەوەی لەو بەینەدا قسەیەك بکات لەوانەبوو شانەکە بە سەر ئەودا بشکێ، لەوانەش بوو خواجە دڵی لێ بڕەنجێ، لەترسی ئەو چروکییەی نەبوایە، هەرکەسێکی تر لەو شوێنەدا وای بکردایە رسوا دەبوو، دەدرایە بەر شیپی گاڵتەوگەپ و لە دەگادا ناوی بە بەدخوو دەزڕا...بەڵام خەڵکەکە ئەوەندە هەنارخان و خواجەیان پێ گەورە بوون لەبەر خاتری ئەوان دەنگیان نەکرد، کە

نۆشا هەڵساو دیوەخانی بە جێهێشت بە ئەژدەری کوڕی دەوتو کەف لە دەمی دەردەپەڕی

– ئەژدەر!...کوڕە ئەژدەرە خوێڕی! وەرە پێشم کەوە بڕۆینەوە!.

ئەژدەر بە پاڕانەوە دەیووت:

– تاتە گیان قوربانەتەنا.....بەو ئاگرەی پێغەمبەرانە خەتای من نەبوو، وادەچم ئاشتی دەکەمەوە....

چی لە ئەژدەربوو باوکی بۆیە تووڕەیە، چونکە سەری هۆزای کوڕی(ئەختەر)ی شکاندووە... کەچی ئەو نە گوێی لە قسەکانی ئەژدەر دەگرت، نە ئاگای لەوەبوو کەسەری هۆزای شکاندووە.

هۆزا کوڕێکی هەتیوی بێ باوك بوو، دایکی بەکوڵ کێشیو ناتەسەری بەخێوی کردبوو، منداڵێکی زیرەكو کڕو بێ وەی بوو، ئەختەری دایکی لە دارای دونیادا ئەو کوڕەی شك دەبرد، هەموو ئیشێکی پیاوانەو ژنانەی دەکرد بۆ ئەوەی پارووێکی بێ مینەت بۆ هۆزا پەیدا بکات.

نازەنین زوو سەری هۆزای تیمار کردوو وبەپارچە پەڕۆیەکی پاك بەستیو دڵی دایەوەوکۆشێ گوێزو بادامو مێوژی دایە،

ئەختەری دایکی هەردوو دەستەکانی نازەنینی ماچ کردنو پێی وت:

– هۆزاو دایکی هۆزا باڵاگەردانت بن...

لە خۆشی ئەو نەزاکەت نواندنەو دڵدانەوەی نازەنین فرمێسکی کلۆڵی بۆ خۆی دەباراندو هەنسکی بێکەسی لە قوڕگیدا قوڵپی دەدا...

هەنارخان بەزەیی پیا هاتەوەو پێی وت:

– ئەختەر دڵگیر مەبە، وابزانە سەری منی شکاندووە، کوڕی تۆ سەری شکاوە...ئێمە بەو کارەی باوكو کوڕ کردیان دڵمان شکا...

ئەختەر وتی:

– خانمی گەورەم...من خەمی سەرشکانەکەیم نییە، خەمی ئەوەمە ئەو ئەژنەرە دەستی پێ فێربێ ولەمەولا لە هەر شوێنێ بیبینێ لێی نەگەڕێ...

وتەکانی ئەختەر پڕ لە سۆزی دایکانە بوون بۆیە کاریان لە نازەنین کردو پێ ی وت:

– ئەختەر ! مەترسە یەك پەنجەی پێوە بتلێنێ چاوی دەردەکەم، لە ئەمڕۆ بەدواوە هۆزا لای من دەبێ..رازیت لای خۆم گلی بدەمەوە..

ئەختەر لە خۆشی ئەو بڕیارەی نازەنیندا خەریك بوو ببێ بە پەپوولەیەك بەدەوریدا بگەڕێت...

چاك بوونەوەکەی نازەنین، بوو بە رووداوێکی وا هەواڵەکەی هەموو دەگاکانی دوورو نزیکی گرتەوە، ئیتر خەڵك بۆ پیرۆزبایی بە تاقو جووت سەری ماڵی خواجەیان دەداو خەڵاتو سەوقاتیشیان لەگەڵ خۆیاندا دەبرد، جاران نازەنین بە جوانیو ژیری ناوی رۆیشتبوو وا ئێستا قسە شیرینەکانی ئەوەندەی جوانییەکەی رازاندوەتەوە، ئەوەی گوێ ی لە وتەکانی بووایە بڕوای نەدەکرد رۆژێك لە رۆژان زمانی گیرابێ، ئەویش کەدەیزانی خەڵك لە چاك بوونەوەکەی بەگومانن خۆی بە گفتولفتی شیرین پێشوازی ئەو میوانانەی دەکرد کە بەو بۆنەوە دەهاتن...

ئەوانەی کە گوێیان لێی دەبوو دەیانووت:

– وێڕای چاکبوونەوەی قسەکانیشی لەقسەی ئافرەتێکی پاکیزەو پەرییەکی خوایی دەچێ، وەك بڵێی لەماوەی ئەو چەند ساڵەی نەخۆشیەکەیدا لە ئاسانەی یەزداندا رۆژوی بۆ ئەوە گرتبوو کە خوا ئەو بەهرەیەی بداتێ...

جگە لەو قسەیە کە لەدەم گوڵناز ترازابوو کەوتبووی:( نازەنین بە نەوای شمشاڵەکەی سیمیار چاك بووەوە) ئیدی لەو بارەیەوە هیچێکی تر بەکەس

نەوترابوو...لەگەڵ ئەوەشدا وتەکەی گوڵناز لەناو منداڵانی دەگادا پەرەی سەندو هەر منداڵ بوو دەگەڕا قامیشێ پەیدا بکاتو بیکات بە شمشاڵ، ئیتر لەو رۆژەوە لەناو دەگادا منداڵ چەندان ئاوازو نەقارەو نەواو گۆرانی لەناو منداڵو ژنو پیاواندا پەرەی سەند، زۆربەیان جۆرە ئاوازێك بوون هارمۆنەکانی دەنگدانەوەی سۆزێکی ئاستەمی لە نێوان سیمیارو نازەنین دا دەگەیاند، وای لێهات هەر کوڕێك خۆی بە سیمیارێك دەزانی، هەر کچێك دەیویست وەك نازەنین عیشوە بنوێنێو خۆی چوون ئەو بکات بە هۆمەیلای پەری....

ناوی سیمیارو کارتێکردنی لەچاك بوونەوەی نازەنیندا رۆژ دوای رۆژ پەرەی دەسەند...بەچی چاکی کردووەتەوە؟! وا پرسیار دەکرا : بە شمشاڵ؟ بەجادو؟.. واش خەڵك وەڵامی خۆیانو یەکتریان دەدایەوە...واچەی جادو نهێنییەك بوو ناوی دەوتراو رەنگی نەدەزانرا بە منداڵان لە خەیاڵو بۆچوونی خۆیان وا لێکیان دەدایەوە: کەسی جادوزان دەتوانێ مرۆڤ بکات بە بەرد، یان وەك ئەهریمەن شاخی لێ بروێنێ !..

* * *

دوای چەند رۆژێك هەواڵی گەڕانەوەی خواجە بەهمەن بەناو دەگادا بڵاوبووەوە، هەر منداڵ بوو لەسەر رێی هاتنەوەیدا چاوەڕوانی دەرکەوتنی دەکرد تا زوو موژدەی چاکبوونەوەی نازەنینی بداتێو مژدانەیەك وەربگرێ

نازەنین و هەنارخان و دەستو پەیوەندیش بۆ پێشوازی کردنی تا ئەو دیوی حەکا چوون، کە خواجە لە دوورەوە نازەنینی دی، دەسماڵەکەی ملی هەڵستەوەگرتو وەك ئاڵای سەرکەوتن بۆی راوەشاند، کەنزیك بووەوە لەسەر ولاخەکەی دابەزیو دەستی لەمل نازەنین کردو لەگەڵیدا کەوتە ئاخاوتنو واچە حریرین، خواجە سەری سوڕمابوو خۆی لە ئاست مۆدزەیەکی گەورەدا بینییەوە، ئەو کە نازەنینی بەجێ هێشتبوو لەکونجی ژوورەکەی خۆیدا ماتو بێدەنگ و خەمناك زمان لە دەمیدا نەدەسوڕاو گوێی پێ نەدەکرا، ئەوەتا ئێستا دەڵێی شای پەریانەوەمانگی چواردە لە ناو روومەتیدا تواوەتەوەو زمانی ئەوەندە شیرینە هەنێی سەرچاوەی ئاوی ژیانە. شەتاوە دەکات، لە دڵێ خۆیدا دەیووت: ئەی یەزدانی میهرەبانو بەتوانا، من ئافەریدەیەکی بێ دەسەڵاتم، کەشکۆڵی ژیانم پڕە لە گوناحوکەتن، سەبارەت بەو میهرەبانیەت مەرج بێ تاماوم لەبەر دەرگای میهرەبانیتدا سەرم دانەوێنم....ئەمەی وتو روانییە یەکێك لەو کەسانەی کە لەگەڵیدابوون وپێی وت:

– کوا ئەو نوقڵو نەباتەی کە هێناومە؟..

هەروەها فەرمانیدا نازەنین سواری ولاخەکەی بکەن ئەوجا نوقڵو نەباتباری بکەن..چی داواکرد کرا..پێشوازییەکە ئەوەندە شکۆمەندانەبوو، تا رۆژگارێکی درەنگیش لە یادەوەری دەگادا مابووەوە..

خواجە بەهەمەن لە هێشای نەپرسیبوو، چاك بوونەوەکەی نازەنین چۆن بووە، ئەویش لەبەر ئەوەی پێی نەوترابوو شتێ لەو بارەوە بڵێ، دەنگی نەکردبوو، خواجە لەبەر خۆیەوە وای دانابوو دەمودووی مۆغانەکانو نویشتەکانیان بۆی کەوتونەتەکار! لەبەر ئەوە کە گەیشتەوە ناردی بەشوێن مۆغانەکەیاندا، کە هاتە دیوەخان رێزێکی زۆری لێوەرگرت، بەسەر دەستی چەند ریش سپییەکدا بڕیاریدا

سێیەکی دەرامەتی ئەو ساڵەی موڵکەکانی بۆ پەرستگا تەرخان بکات، تاماوە نەهێڵێ ئاگری پیرۆزی پەرستگا کە نووری یەزدان‌و نیشانەی فروستادەکانە بکوژێتەوە، هەر ئەو کاتەش سەرتاپا جلی بە مۆغانەکە خەڵات کردو بەو پەڕی رێزەوە رەوانەی پەرستگاکەی کردەوە...بۆ سبەیش کە رۆژی چوارشەممە بوو بۆ نەاو دەربرینی ئافەریدەیی خۆی چوو بۆ پەرستگاو، دوای نماکردن، فەرمانی بەنۆژەنکردنەوەی‌دا..

هێشاش ئەو ئەنگوستیلەیە، کە بۆ بەڵگەی چاك بوونەوەی نازەنین هەڵیگرتبوو، بەبێ ئەوەی لای خواجە ئاشکرای بکات دایەوە بە هەنارخان...

* * *

دوای سەیرانەکەی هەنارخان بۆ ناو مۆڵکەکانی خوادادو چاك بوونەوەی نازەنین، مۆغانەکەی دەگا وەك پەرستگاکەی بەسەردا تەپیبێ وا ترسی لێ نیشتبوو!....

ئەو گۆتەو چرپەی منداڵ‌و خەڵکی سادەی ناو دەگا سەبارەت بە سیمیار کە دەیانووت ئەو نازەنینی چاك کردووەتەوە، ئەوەشی لەسەر بێ کە خۆی هەندێ شتی سەیری لێوەدیبوو، هاتبووە سەر ئەو باوەڕە کە چاك بونەوەکەی نازەنین لەو بەدوور نەزانێ...ئەو ئەوهەموو تەمەنەی بەسەربردبوو بەتەواوەتی وردە واندیدات‌و یاسناکانی ئاوێستای پێ لەبەر نەکرابوون، کەچی سیمیار لەگەڵ ئەو هەموو ئەرك‌و کارانەدا کەدەیکرد، لەو تەمەنەداو لە ماوەیەکی کەمدا، چۆن بەرەوانی دەیخوێندنەوە وەهاش لەبەری کردبوون، وێڕای ئەوەش دەنگی

خۆش‌وئادکاری بەرزو شمشاڵ ژەنێکی وا مژدەیەکی بەهاداربوو بۆ ئایندەیەکی ڕوشن...ترسەکەی ئەو لەودابوو ئەستێرەی نگینی ئەو هەڵکشێ‌وجێ بەو لەق بکات!.

خورپەی ناو دڵی بەگوێی هزریا دەیچرپاندو دەیووت: خۆ ئەگەر خواجە لەو باوەڕەدابێ کە سیمیار نازەنینی چاك کردبێتەوە، یان ئەگەر نازەنین دڵی لێی چووبێ، لەوانەیە بیکات بەزاوای خۆی‌و لەجێگای ئەم دایبنێ.....

ئەو وردە خەیاڵانە ڕۆژ بە ڕۆژ لەهۆشی خۆیدا پف دەدان‌و لێی ببوون بەتارمای یەقینێك بەرچاوی تەسك‌و تاریك کردبوو، کە سیمیار بۆ دەورکردنەوە نەچووە پەرستگا وەك جاران ڕووی نەدەدایە، خۆ لەترسی هەنارخان‌و خەمی برینی ئەو جیریە نەبوایە کە خواداد لەجیاتی فێرکردنی سیمیار دەیدایە لەولنەبوو، دەرگای پەرستگاکە لەرویدا دابخات..... کێچ چووبوە کەوڵی، ئەو وردە ئەجیایانە خەوو خۆراکی لێ تاڵ کردبوو، گەلێ جار خەیاڵی خراپیش بەدڵیدا دەهاتن، ئەهریمەن بە گوێچکەیدا دەیچپاند کە وردە یەسناو واندیدەکان بسووتێنێ‌و بیانکاتە تاوانێك‌و بیخاتە ئەستۆی سیمیار! بەمجۆرە هەم لەکەداری دەکاو هەم لەفێربووندا پەکی دەکەوێ... بەڵام ئەو ڕۆژە کە خواجە بەهمەن ناردی بە شوێنیداو ئەو هەموو خەڵاتەی کردوو خۆیشی لە پەرستگا سەری لێدا لەنەخشەکەی پەشیمان بووەو بەخۆی سەلماند کە کەس لەو بارەوە ئاوڕی لەسیمیار نەداوەتەوە....بیستبووی کە ئەوشەوە هەنارخان شایی بۆ چاك بوونەوەی نازەنین گێڕابوو، لەو شەوەدا نۆشاو ئەژدەری کوڕی خەریك بوو لێیان تێکدەن، ئومێدی دەکرد لە کەلێنی ئەوانەوە سیمیار تووشی چوترمێك بکرێ‌ولەبەر چاو بکەوێت...حەزی دەکرد لەبەر چاوی بکەوێ‌و بتوانێ ڕووی نەداتێ، وەلێ کە لێی دەردەکەوت وەك هێزێکی نهێنی پاڵی پێوە بنێ، خۆی پێ

رانەدەگیراو زوو دەرگاکەی بۆ دەکردەوە، ئەویش وەك شاگردێکی دڵسۆز بەنەزاکەتەوە لەبەر دەمیدا رادەوەستاو بەرویدا دەیڕوانی چی خەوشی ناو دەروونی هەبوو بە شەوقی ئەو روانینە پاکژ دەبووەوە.

*      *      *

ئێوارەی شەوانێکی پایز بوو، ئاسمان ساف‌و بێ مانگ بوو.. ئەستێرەکان ئەوەندە گەش بوون سێبەری داڵهۆ ئاسایان بۆ نەرەو دارگوێزە بەرزەکان دروست کردبوو، کۆمەڵێ منداڵی دەگا، دوای ماندووبوونی یاری لەبەردەم باڵەخانەکەی ماڵی(پەروەر)دا دانیشتن، کورتە بەیازی ئەفسوناوی منداڵانەیان بۆ یەکتری دەگێڕایەوە، لە پڕ ئەژدەر پەیدابوو، هەموو بێ دەنگ بوون‌و چوونەوە ناو کلێشەکەی خۆیان‌وکەس نەیوێرا قسە بکات نەوەك خۆی تێ هەڵقورتێنێ‌و بەدرۆی بخاتەوەو شەڕیان پێ‌بفرۆشێ، هێشتا دانەنیشتبوو، گلۆێزی ناو دەمە لارەکەی بەسەر یەکدوانێکد پژان، ئەوانیش دەنگیان نەکرد، پەروەر هەندێ وریاولێزان بوو، بە سروشتی ئەژدەر شارەزابوو، بۆ ئەوەی تووشی هەڵدێرێکی بکات پێی وت:

– باسی ئەوەمان دەکرد: کێ زاتی هەیە بەم شەوە بڕوا سەر گۆڕستانەکەی ئەوبەرو بێتەوە؟!

ئەژدەر زوو هاتە دەم‌و وتی:

– بۆ کەس یارای ئەوێ‌ی نییە؟.

پەروەر وتەکەی لێوەرگرتەوەو وتی:

– ئێمە هیچمان یارای ئەوەمان نییە...وتمان خۆزگە ئەژدەر لێرەبوایە جگە لەو کەسی تر ناتوانێ... بەخوا خاس بوو هاتی!...خۆ ئەگەر یەکێك ئازابێ، لەم شەوی چوارشەممە پیرۆزەدا ئەوە بکات ناوی بە ئازاو یارا دەردەچێ و بەختی یار دەبێ ئیتر کەس ناتوانێ پەنجە لە پەنجەی بدات، هەر کەسێ لەم شەوەدا رۆیبێ کە هاتووەتەوە بەختی کراوەتەوە...ئەژدەر کەزانی ئەوان یارای ئەوەیان نییە...خۆی هەڵکێشاو وتی:

– من دەڕۆم !....

پەروەر پێی وت:

– باشە دەڕۆی، ئەی ئێمە چۆن بزانین رۆیشتوی!....

ئەژدەر تووڕە بوو:

– چۆن! ، بڕوام پێناکەن؟....

پەروەر هەندێ پفیداو وتی:

– ئەوەی رۆیشتووە نیشانەیەکی داناوە، ئەگەر ئەو نیشانەیە دانەنێی کەس بڕوات پێ ناکات و مرازیشت نایەتە دی!.

ئەژدەر وتی:

– وەك چی؟.

– وەك ئەوە، ئەوەی بڕوات کەرێك دەبات، هەم بەسواری ئەو دەڕوات، هەم لەوێ بە کێلە گەورەکەوە دەیبەستێتەوە، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە رۆیشتووە، یان بزنەیەك دەبا لەوێ دەیبەستێتەوە، خۆ ئەگەر کەر ببات، بەختی باشتر دەکرێتەوە، ئەوەی چاوی پێ بکەوێ یەکسەر بۆی کەر دەبێ، خۆ ئەگەر کەرەکە لەوێ زەڕاندی ئەوە بە یەکجاری دەبێتە خاوەن نگین و وەك کوزە کەمتیاری پێبێ بۆ هەر شتێ بڕوات بۆی دێتە دێ....

ئەژدەر کە گوێی لەو قسانە بوو زوو بڕوای کردو لەدڵەوە دەیووت: ئەوە بۆ من باشە..هەم دەری دەخەم کە ئازام، هەم لە چاو مامۆژنەدا زەڕە شیرین دەبم و لەوانەیشە سبەی ڕۆژ نازمنینم بداتێ!....ماوەیەکیش بوو خەمی ئەو سیمیارە لە دڵیدا ببوو بە گرێکوێرەیەك و سەر دڵی گرتبوو، گەلێ جاریش باوکی تفی لە نێوچاوانی کردبوو، پێی وتبوو: خەڵك کوڕی هەیەو منیش کوڕم هەیە...مەبەستی لەخەڵکدا خودادادو سیمیار بوون، هەموو جارێ وایدەزانی ئەو تفانە سیمیار لە چارەی دەکات!..لە زوووەوە خەریك بووگرفتێکی بۆ بتاشێ و رایبکێشێ بۆ مەیدانی خۆی و سوکایەتییەکی پێبکات، بەڵام نەیدەزانی ئەو دەرفەتەی چۆن بۆ دەڕەخسێ!....

کە پەروەر ناوی کەرو بزنەی هێنا زوو هزری چووە سەر ئەوە بزنەیەك یان کەرەکەی ماڵێ سیمیار بدزێ و بۆ نیشانە بیباتە سەر گۆڕستانەکە، خۆ ئەگەر بەیانی زانییان بزنە یان کەرەکەیان دزراوە، خۆی بۆیان ئاشکرا بکات، بەو جۆرە خۆی لای ئەوان و لای خەڵك شیرین دەکات. خۆ ئەگەر لەوێش دەعبایەك خواردی ئەو کاتە دەردەکەوێ سیمیار ئاگای لە هیچ نییەوتەلەسمەکەی دەشکێ، دیارە منداڵەکانیش لەترسان ناتوانن شایەتی لەسەر بدەن....ئابەو جۆرە نەخشەی پیلانەکەی بۆ خۆی داڕشت...ئیستێکی کردو وتی:

– دەبێ یەکێکتان لەگەڵمدا بێن؟.

پەروەر کەزانی ئەژدەر بە دڵ دەیەوێ وابکات وتی:

– نا..جا ئەگەر یەکێك لەتەکدابێ نە ئازایەتی تیا دەمێنێ نەبەختیشت دەکرێتەوە، ئەگەر وابێ هەموو کەس دەڕوا...

ئەژدەر کە زانی خەڵك بە چرووكوپشێونە تەماشای دەکەن، نەیدەزانی چی بکات خۆی لەبەر چاوی خەڵکدا چاك بکاتەوە ئیتر ئەو کارەی بە دەرفەتی خۆی زانی و بڕیاریدا خۆی بەتاك ئەنجامی بدات، رووی کردە منداڵەکانو وتی:

- لێرە مەڕۆن هەر ئێستا دەڕۆمو زوو دەگەڕێمەوە!

پەروەر وتی:

- دەبێ یان بەسواری کەر بڕۆی یان بزڵەیەك بخەیتە سەر ملتوبیبەی لەوێ بیبەستیتەوە...سیمیاریش لە گەڵ مۆغانەکەدا ئەوگرەوەی بردەوە بۆیە وا بەختی کرلومتەوە..

- کە پەروەر وای وت، ئەژدەر ئەوەندەی تر لەسەر ئەو کارە گەرمتر بوو...

کە ئەژدەر رووی لەو کارە کردو پشتی وەرچەرخان هێشتا بە تەواوەتی لە چاو گووم نەبووبوو مێرد منداڵەکان ترسی ئەوەیان لێنیشت کە ئەو پیلانەیان ببێ بە دلوێك لە مل هەموویان بئاڵێ بۆیە پەیمانیاندا کە دەنگیان یەك بکەن ونەترسنو لای کەسیش نقە نەکەن، هەر ئەو دەمە بەبێ دەنگی بڵاوەیان لێکرد..

هەر بەو شەوە ئەژدەر بەدزییەوە چووە ناو حەوشەکەی ماڵی سیمیارو ویستی گیسکێك بگرێو بیخاتە سەر ملی، لەمە دەستی بۆ برد بزڵەکە باڕاندیو ئەژدەر لەترساندا دڵی لەسەر سەد لێی دەداوگیانی گەیبە سەر کوونە لووتی....هەندێ خۆی مڵاسدا کە بزنەکان ئارام بوونەوە،رۆیشتە لای کەرەکە کەبە مێخەکەوە بەسرابووەوە، گوریسەکەی لە مێخەکە کردەوەو لەملی کەرەکەی خستو بەئاستەم لێکێشا، کەرەش وەك بەگوێیدا چپێنرابێ لە سەر خۆ پێشی کەوتو بەرەو گۆڕستانەکە سواری بوو، کە گەیشتە نزیك کەندەکەی ئەوبەر، کەرەکە سینی کردو نەڕۆیشت!...ئەژدەر بۆ ئەوەی لە دواوە نەقیزەی بدات، دابەزیو بەلێدانو بەنەقیزە تێوە ژەنێ پاڵیدا، کەرە نەیکردە نامەردی لەمە جووتەیەکی لێوەشاند

ئەژدەری لەکەندراوەکە خستە خوارەوەو هەردوو کلۆکی شکاند، کەرە کە بەرەو ماڵەوە گەڕایەوە، بەڵام ئەو گوریسەی کە لەملیدابوو ئەو سەرەکەی لە هەردوو دەستی ئەژدەر ئاڵابوو، کە ئەژدەر کەوتبووە خوارەوە گوریسەکەی لەدەست بەربووو ئیتر ئەوسەرەکەی لەبەر ئەوەی چەڵەمەدارەوو لە بنە دار بەڕوێک ئاڵا....کەرەی بەستەزمان چەند هەوڵی دابوو گوریسەکە بەری نەدابوو ......

لەبەرەو بەیانیدا کەرەکە دەستی بە زەڕان کرد، ئەوەی بەئاگابوو پێی سەیر بوو ئەو کەرە لەوێدا بۆ دەزەڕێنێ!؟

منداڵەکان هەموویان خەوی پاش ترسی ئەو شەوە بردبوونییەوە،تەنها پەروەر نەبێ، لە پەنجەرەی ماڵەکەیانەوە جارجار دەیڕوانیە گۆڕستانەکەی ئەوبەرو هەستی رادەگرت، تا ئەو کاتە بەباشی نەیزانیبوو چ پەندێکی بە ئەژدەر داوە، کە گوێی لە زەڕەی کەرەکە بوو ئەوەندەی تر خەوەکەی لێزڕاو خەمی بەیانی لێنیشت‌و نەیدەزانی خۆی چۆن بشارێتەوە، یان چۆن خۆی گێل کات‌و گوێی نەداتێ....

بەیانی کە رۆژ بووەوە خەڵکێکی زۆر گەیشتنە شوێن ئەو رووداوە، سەریان سوڕماو نەیاندەزانی ئەو کەرە بۆوا لەوێدا گیری خواردووە! کەدییان حاڵەکە وەهایە، وا ئەژدەر لەخوارەوە لەناو چەمەکەدا کەوتووەو تەنیا نووزەی دەردێ‌و هەردووکلۆکی شکاوە، زوو هەواڵیان بۆ باوکی (ئەژدەر) برد، کە گەیشتە سەری لەجیاتی ئەوەی فریای بکەوێ یەک نووکە شەقی لە قەپرغەی سرواندو وتی:

– لە رەسەنی کەری، دەنا وات بەسەردا نەدەهات!...

خەڵکی کەرەکەیان بەرداو گەڕایەوە ماڵی خاوەنی، ئەژدەریش وەک دارە مەیت بۆ ماڵەوە برایەوە، جگە لە شکاندنی هەردوو کلۆکی زمانیش لەدەمیدا نەمابوو، ئەوەشی لەبیر نەدەهاتەوە کە بۆچی وای بەسەر هاتووە...

ئەژدەر گێژ بوو، بەڵام نەمرد، دەیزانی کەری ماڵی سیمیاری دزیوە! وەلێ نەیدەزانی بۆ!....کەلەلابوونەکەی بووبە مایەی ئاسوودەیی منداڵ و مێرمنداڵانی حەگای هەورامان.

ئەوانە کە ئەو شەوە لەگەڵ پەروەردا ئەو گەمەیان بە ئەژدەر کردو وا تووشیانکرد، کە چاویان بە پەروەر دەکەوت پێیان دەووت: داوەرە با ئەو دەستانەت ماچ بکەین، هەر خۆیان دەیانزانی بۆچی وای پێدەڵێن!

مۆغانەکەش کەوتە ناو خەمێکی ترەوە، ئەو حەزیلێبوو ئەژدەر وەك تووترکی قەراغ رێگە پەلوپۆدەرکاو نەهێڵێ سیمیار بەو ئاواتە بگات کە ئەو لەبەر خۆیەوە بۆی وێناکردبوو....

* * *

خواداد نگابانییەکی بەردەوامی سیمیاری دەکرد، هەمیشە دڵی لای بوو، ساتێك لاشەخەری نەدەکرد، سیمیار حەزی لە دووره پەرێزی نەدەکرد وەلێ لەبەر ئەرکی زۆر پێی نەدەکرا تێکەڵاوی خەڵك ببێت، خۆ خەڵکی دەگا خوا یاریان بێ لەمیانییەوە تا ئێوارە دەستیان لەکار بەرنەدەبوو، هەرمانیان دەکرد، بە تایبەتی لەوەرزی بەهارو هاوینو پایزدا، ئێوارانیش زوو لەناو ماندووبوون لە باخەڵ دەگای پڕ ئارامدا لە ناو خەودا خپ دەبوون.

دوای ئەو ساڵەی کە پەسەند وڕکی لە خواداد گرتو سیمیاری ناچارکرد لە ناو ئاخوڕی ئاژەڵەکاندا بخەوێ، ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە، خواداد هۆدەیەکی

سەربەخۆی بۆ دروست کرد، لەو هۆدەدا خەریکی دەورو لەبەر کردنی ئەو شتانە دەبوو کەلەلای مۆغانەکە دەیخوێندن، خوادادو پەسەند دەیانزانی ئەو هەموو خێرە، ئەو دەرگای نگینە کە لە سەریان کراوەتەوە لە چاکیو نێوچاوانی سیمیارەوەیە....

سیمیار بەرەو تافی لاویەتی هەڵکشابوو، هەرچەند بەتەمەن لە قۆناغی شۆخیدابوو، کەچی بەکاروکردە، بە هۆشو بیرکردنەوە لە ئاستی پیاوێکی کارمەندو شارەزادابوو....گەنە تووکی سمێڵی تازە سەریان دەرهێنابوو، نێونیگای چەند بە منداڵی پاکو جوان بوو، لەو قۆناغەدا بەرەو جوانتر گۆڕابوو، جوانی سروشتو پاکی نێوچەوانی نازەنین لەودیو جووانییەکەی ئەودا دەدرۆشایەوە، چاوی سەیرکردن لەئاستیدا خۆی پێ ڕانەدەگیرا، لە سەیرکردنی ناوچاوانیدا ڕەوانەی لای نازەنین دەکرای لە سەیرکردنی نێونیگای نازەنینیشدا ڕەوانەی لای سیمیار دەکرای، هەر لەبەر ئەوەبوو خوادادو پەسەند کارێکیان پێ نەدەکرد تێکەڵاو بەخەڵی بکات.....

وەك جاران بە خۆیو نازەڵەکانیەوە لە کاتو ساتی خۆیدا دەچوودەهاتەوە...نازەنین لەپەنجەرەکەوە بەتیشکی چاوەکانی پێشوازی دەکردو ئەمیش زەردەخەنەیەکی ئەفسوناوی لە پاداشتی ئەو بروسکەدا بەخەڵات بۆ دەنارد....

هۆدەکەی خۆی کردبووە خەڵوەتگاو تیایدا هەر خەریکی جۆرە کاروبارێك بوو، نەخواداد نە پەسەند سەریان لێ دەرنەدەچوو، لەگەڵ ئەوەشدا پرسیاریان لە بارەی کاروباری تایبەتی خۆیەوە لێنەدەکرد، چوونکە دەیانزانی ئەوەی ئەو خجڵی دەبێ بێ سوود نییەو پەکیشی لە ئەرکەکانی سەرشانی ناخات....

کەتوی پەسەندمان بردەوە دەبێ ئەوەش بووترێ کە لە ماوەی ئەو چەند سەنەدوو کوڕی بوون، ئیدی هەستی دایکیەتی خستییە سەر ئەو یەقینە کە حیشەویستی ئەو منداڵانەی لەپاکی سیمیارەوەیەو لە ئایندەشدا ئەو دەبێتە پشتو پەناو سایەبانیان، لەوەوە سیمیاری بە برا گەورەی منداڵەکانی خۆی حەزتی لە دڵیشەوە لەوەی کە چەند ساڵێك لەوەبەر دەربارەی کردبووی پەشیمان جو. سیمیاریش ئەوی بە دایکی خۆی دەزانی..

ژنان حەسوودیان بە پەسەند دەبردکە یەکێکی وەك سیمیار لەبەر حستیایەوگوێ رایەڵیەتی، ئەویش شانازی پێوەدەکرد لە ناو ژناندا خۆی بەو مەحکێشا...

ژیان لەچاوسیمیاردا گەلێ جیاوازی لەچاو خەڵکەکەدا هەبوو، لەچاو ئەودا ژین چەند بەرفراوان بوو، ئەوەندەش پڕ لە رووناکیو هیوا بوو، بە رۆژ لەگەڵ حیو مەڕو ئاژەڵەکانیدا دەچووە کۆشی ئەو سروشتە بێگەردو بەر فراوانە لەگەڵ حیو درەختو بەردو رووەكوئاووهەواو زیندەوەراندا تێکەڵ دەبووو شتیان لێوە فێر دەبوو، بەزمانی حاڵ لە تەکیاندا دەدوا!...ئێوارەش کە دەگەڕایەوە لە ئوورەکەی خۆیدا چی دیبوو، چی بیستبوو دەیدایەوە بەر تیشکی هزری خۆیو نموونەی ئەو گژوگیایانەشی لەگەڵ خۆیدا دەیهێنانەوە لە گەڵاو لاسکو بنجەکانیان ورد دەبووەوەو پیایاندا رادەما

بیری لە ئاسمانو ئەستێرەو خۆرو مانگو هاتنی شەووڕۆژ دەکردەوە، ئەو نەیویست بەر لە هەموو شتێ بیر لەو شتانە بکاتەوە کە لەبەر دەستیدا هەنو پێویستی خەڵك جێبەجێ دەکەن،

لە ئەنجامی بیرکردنەوە لەو شتانە ئەوەی بۆ دەرکەوتبوو کە گشت زیندەوەرانو دارو گژوگیا هەموو خزمی یەکنو هەموو چوون یەك

دەبن‌ودەشێنەوە، کۆرپەیی‌و لاویەتی‌و هەراشبوون‌و پیری‌و مردن هەموویانی بەداوا کردووە، وەلیٚ بۆ هەر گرۆپێك جۆرە کابینەیەکی بۆ رەخساوەو خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەیە، دەنا لە بنچینەدا هەموو یەکن .....

ئەو جۆرە بیرکردنەوەو ئەو جۆرەقسەو باسەی کە سەبارەت بەو دەکران، گۆشەیەکی وای لەناو هزری ئەودا داگیر نەکردبوو، لە دەگادا، لە دیوەخان‌و کۆڕی دانیشتنەکاندا، لەکانی ژنان‌و شایی‌و دیدەنیدا باس هەر باسی ئەو ونازەنین بوو، گوایا بە جادوو بۆ خۆی چاکی کردووەتەوە!... کە ئەو جۆرە باسانە بەگوێیدا دەدرا باکی نەبوو چونکە دەیزانی نازەنین لە کەلۆیەکی وادانییە هەندیٚ کەس دەسیان بیگاتیٚ، یان بەهەندیٚ تەفرە بدریٚ، لەبەر ئەوە خۆی پێوەی خەریك نەدەکرد،چونکە ئەو لەناخەوە هەستی بە دەنگی نامەیەکی پیرۆز دەکردکە گەیاندنی ئەو نامەیە بەر لە هەموو شتیٚ پێویستی بەخۆ ئامادەکردنێکی پڕ رەنج‌و خۆ تەرخان کردن هەبوو،

خواداد لەپەناوە سەیری هەڵسوکەوتەکانی سیمیاری دەکرد، رۆژێك دی لەناو پاوانەکەدا گەڵای دارودرەختی کۆدەکردەوەو بۆنی دەکردن ودەیسووتاندن‌و دوای سووتاندن دەیهاڕین‌وگیراوەی لیٚ دروست دەکردن یان وشکی دەکردنەوەو دەیهاڕین..یان گوڵی رووەکەکانی ریز دەکردن‌و لێیان ورد دەبووەوە، ئارەزووی زانین پاڵی بە خوادادەوەناو لێی پرسی:

- ئەوە خەریکی چیت، بۆ وادەکەی؟!

سیمیار بە روویەکی گەشەوە وەرامی مامی دایەوەو وتی:

- دەمەویٚ بزانم رووەکەکان چەند لەیەکەوە نزیکن‌و چەند خەسڵەتێکیان هەیە..چۆن دەڕوێن، حەزیان لەچ کەشوهەوایەکە، چ رەنگیان هەیە....ئەوانە هەموویان سوودیان بۆ ئێمە چییە؟!

خواداد بەچاکی گوێی لە وتەکانی سیمیار گرتبوو، گەرمکیبوو بەو کارەی پێکەنینێك بکاتو پێی بڵێ:

- ئەوە کارە تۆ دەیکەی؟!

بەڵام نەیوت، چونکە دەیزانی ئەوەی ئەو دەیکات لە ئەقڵی ئەوەوە دوورە، بۆیە قسەکەی خۆی قووت دایەوەو بەبێ دەنگی رووی وەرچەرخانو لێی گەڕا.. لەدڵیشەوە نزای بۆ دەکردو دەیوت...خوایا ئەم برازامە بپارێزی خوایا...چاوی بەد لەئاستیا کوێرکەی...

* * *

(هێشا) برادەرێکی گیانی سیمیار بوو، دڵی پێی دەکرایەوەو بە وردی گوێیان لە یەکتری دەگرت، ئەو لەو کاروانو ئەراگێلانەیدا کە لەگەڵ باوکیدا(بەهرۆز) بۆ شارو دێهاتەکانی دەوروبەر دەیکرد، چی دەبینیو چۆن کڕینو فرۆشتنی دەکرد، چۆن ڕێگەی سەختو پڕ لە مەترسی دەبڕی بۆ سیمیاری دەگێڕایەوە، سیمیار گێڕانەوەی ئەو شتانەی لە هۆش خۆیدا وێنا دەکردنو لەسەر دەفەی سنگی خۆیدا نەخشەی بۆ دەکێشان، بەباسکردنی خوونەریتی ئەو خەڵکەوە کە بۆی باس دەکرد لەسروشتی کۆمەڵایەتیان بیرۆکەیەکی وەردەگرت، بڕوای بە هێشا هەبوو هەر شتێکی دیبوو بەبێ ڕتووشو دەسکاریکردن دەیگێڕایەوە.... قسەکانی سیمیاریش لای هێشا پاراوو ئاوەدانکەرەوەی هۆشو دەروون بوون، ئەو وتانەی سیمیار بۆ ئەوی دەکردن دەتووت کلیلی کردنەوەی دەرگای نهێنییەکی دەدەنێ کە لە زووەوە ئارەزووی کردنەوەیان لە هۆشیا هەبووە بەڵام

بۆی نەکراونەتەوە، وتەکانی لە تیلمەی ژیانی رۆژانە دەرنەدەچوون، کەچی فرە بە پێزو نەبیسراوو بەتام بوون چوون نەوای شمشاڵەکەی ئاوازێکی دڵڕەفێن و دەربڕینێکی گریکداریان هەبوو.

هێشا هەر کات دڵی بگوشرایەو بیویستایە رووناکی تێبخاتەوە سەری لێدەدا، باوکی هێشا کاروانچی ماڵی خواجە بوو، هێشاش خەریك بوو جێی باوکی بگرێتەوە، دەنگیش هەبوو: دەکرێتە سەرقافڵەی قەتارچییەکان و بەو بۆنەوە تێکەڵاوی لەگەڵ ماڵی خواجەدا پتەو بوو، رۆژانە هەنارخان و نازەنینی دەدیت و قسەیان لەگەڵ دەکات، کەچی لەوبارەوە شتی لێنەدەپرسی و ئەویش لەو بارەوە هیچی نەدەدرکان، خۆ ئەگەر شتێکی پەیوەندیدار بە هەنارخان یان نازەنین پەلکێشی بۆ ناو قسەکانیان بکردایە هەردووکیان ئەو شتەیان بە زەردەخەنەیەکی واتادارو لە دوو توێی وتەکانیاندا دەیانپێچایەوەو سەریان دەنایەوە...

سیمیار وەك تاقیکردنەوەی رادەی تێگەیشتنی هێشا هەندێ جار وتەی بە پێزو ماناداری بۆ دەخستە روو، تا بزانێ لەو گەشت و گەڕیانەیدا تا چەند هۆشیان راهێناوە، ئەوەشی دەزانی هێشا کە شتێکی دەبیست گوێی بۆ رادەگرێ، گەر پێویست نەبوایە ئەوەی دەیبیست بۆ کەسی نەدەدرکاند...

کەچی مۆغانەکەی ناو دەگا هەندێ قسەی لە سیمیارەوە بیستبوون لەبەر ئەوەی لێیان تێنەگەیشتبوو بە مەبەستی شکاندنی لای خەڵك بڵاوی کردبوونەوە، بۆ نموونە:

کە سیمیار وتبووی:

((دارەن گیاندارەن جەرگ و دڵ بەرگەن

گاهێ بێ بەرگەن گاهێ پڕ بەرگەن))

ئەو وتەیەی لێکردبوو بە ئەنگێکو لای خەڵکانی بێ ئاوەڕوو دەیشکاند، کەچی ئەو دو بەیتەیان کە بۆ (ژیرلەی مەڕێ)ی خوێندبوونەوە یەکسەر وتبووی: ,ئەمەیە گوفتاری راست) ئێوارەیەک بوو هێشا بۆ شەونشینی چووە لای سیمیار، دی لەبەر ئاگرێکی کزی کەم شۆڵەدا دانیشتووە، هەندێ شتوومەکی لەبەر دەستا بوو لای کەس ئەو شتانەی نەدیبوون، هەندێ کاسەو کەوچکو کۆچەڵە و هاونو دۆڵی شت هاڕینی دارینو گەلێ شتی تری لەو چەشنە لە دەوروبەری خۆیدا دانابوونو خەریکیان بوو، هێشتا حەزی نەکرد بە چوونی ئەو دەستبەرداری ئەو کارەی کە پێوەی خەریک بوو ببێ بۆیە بەبێ بیرلێکردنەوە پێی وت:

– کاک سیمیار دەڵێی خەریکی خەراتیت؟

سیمیار پێکەنینێکی بە ئاستەمی کردو پیی وت:

– خەراتی؟ حەزت لە چییە بۆت دەتاشم، حەزت لە میزروحە؟ لە بێشکەیە؟ لە تەختەیە؟ لە رەوڕەویە؟ لە چیە ئامادەم؟!

هێشا پێکەنیو وتی:

– تا منداڵ بووین کەسێکمان نەبوو میزروحێکمان بۆ بتاشێ بە تەماش نیم بەم زووانە ژن بێنمو منداڵم ببێ تا میزروحو بێشکەو رەورەوەی بۆ ئامادە بکەم، بەخوا ئێمەو تەختیشیان نەوتووە.

سیمیار بە خەندەوە وتی:

– خەراتمان زۆرن، جا ئەگەر دەڵێی دەچم لایان چیت دەوێ بۆت دەکەم...

هێشا خەریک بوو لە قسەکەی خۆی تەریق بێتەوە...بۆیە وتی:

– نا هەروا قسەیەک بوو هاتو حەزم نەکرد بیگێڕمەوە...

قسەیەکی باش بوو خەراتمان زۆرن، ئەگەر نەبوایەن بە دڵو بە گیان حەزم دەکرد خەڕات بم، لانکەو میزرۆح بۆ منداڵان دروست بکەم، سەرەو رەورەوەو میزرۆحیشم بۆ هەردووکمان دروست دەکرد، ئەو ئارەزووە مردوەی منداڵی خۆمان زیندوو دەکردەوە...

هێشا بە دڵدانەوەکەی سیمیاردا زانی قسەیەکی خراپی نەکردووە، بۆیە وتی:

- ئەی تەخت؟

سیمیار پرسیارەکەی هێشای بە دڵ بوو.

- بۆ خۆمو بۆخۆت خراپ نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە خۆمان لەسەر تەختین، چونکە دڵمان بەخۆمان خۆشە.

سیمیار گەلێ بە سەردانەکەی هێشا شاد بوو، پیکەوە دانیشتنو دەستیان کرد بە شەوچەرە خواردنو خۆشاو نۆشینو باسی رۆژانەو رووداوەکانی ناو دەگاو دەورووبەرو کۆڵکێشیو کاروانو گوزەرانو دەرامەتی ساڵ کاتێکی زۆریان بردە سەرو ئارەزووی دیداریو دیتنی خۆیان تەسەڵ کرد.

سیمیار دەیزانی هێشا حەز دەکات بزانێ ئەو کاسەو کوچەڵانە چین لە دەور خۆی خڕی کردوونەتەوە! بۆیە پێی وت:

- دەزانم چاوێکت لەو شتانەیە، دەتەوێ بزانی بۆ چین .

- حەز دەکە بزانم خەریکی چیت، تا منیش فێربم..

سیمیار وتەکەی هێشای پێ خۆش بوو، بۆیە پێی وت:

- دەزانم حەزت لە کارە..

ویستی کارو هەرمان پتر لای هێشا شیرین بکات، بۆیە وتەکەی خۆی خستە ناو قالبی شۆخییەوە، درێژەی دایە، تۆ وەرە لە پێشەوە من فێری کارەکانی خۆت بکە.. ئەوجا منیش فێری ئەوەت دەکەم ..وا باوە تۆ فێری شتێ ببی، دەبێ تۆش خەڵکی فێر شتێ بکەیت. وایە..؟)

هێشا یەکسەر وتی:

– وایە...بەڵام ئیشی من هەموو کەس دەیزانی، لە پێشینانەوە ماوەتەوە، کاروان‌و کەڵك، کڕین‌و فرۆتنی سەربەسەر، چت بە شت..

– جا لەو کارە چاکتر هەیە، چت بە شتدان، گۆڕینەوە، دیتنی وڵاتان‌و خەڵك، هێنان‌و بردن، بەوە ئاشنایەتی پەیدا دەبێ، نیتە بگرەو نێمە بێنە گوزەران ساز دەدات، پاروو بەچێژ دەکات.

هێشا بە وتەکانی سیمیار دڵی بە خۆی‌و کارەکەی خۆش بوو، بۆیە وتی:

– واتە با لەسەر ئەو کارە خەریك بم!

– ئەوەو شتی تریش، ئێمە لە پێشینانەوە ئەوەی هەیە بۆمان ماوەتەوەو فێری بووین، دەشێ ئێمەش شتی تازەی خۆمان بخەینە سەر ئەوەی ئەوان‌و پاشینانی خۆمانی پێ فێر بکەین، دەنا ئێمە لەو بەینەدا چیمان کرد؟ وایە؟

بەڵێ وایە...

سیمیار بە (بەڵێ وایە)ەکەی هێشا گەشایەوەو وتی:

– کاکەبرا کە وای لێهات با باسی ئەو شتانەی خۆمت بۆ بکەم، بۆ نموونە: ماوەیەکە خەریکم دەرمانێ بدۆزمەوە، کە شتی پێ بنووسرێ، وەك ئەوەی کە سپیارەکانی پەرستگاکەمانی پێ نووسراوە، هەندێ گیاو هەندێ دانەوێڵەی هەڕشتەم سووتاندوون تا وەك خەڵوزیان لێهاتووە، ئەوجا بەیەکەوەهاڕیوومن‌و هەندێ کەتیرەو هەندێ بنێشتی هاراوەی سووتاوم تێکەڵاو کردوون‌و لەو گیراوەیە

دەمەوێ دەرمانی نووسین دروست بکەم، خەریکم بەڵام هێشتا ماومە بگەمە ئەنجام...

کوچەڵەیەکی پیشانداو وتی: ((ئەمە گیراوەیەکەو پارچە پەڕۆیەکی نەرمم تێ ئاژاندووە، لەناویدا بووە بە لیقە بۆ ئەوەی دەرمانەکە هەڵمژێو نەڕژێ، کە قەڵەمت تێ ئاژنی هەر نووکەکەی بە دەرمان بێ ئەمەم بۆ ئەو دەرمانە ئامادە کردووە. ئەگەر بوو باشە، ئەگەر نەبوو شتی ترم بۆ ئەو مەبەستە ئامادە کردووە، لە پێستی بزن هەڵیزو هەمانە هەیە لەگەڵ تۆڵاشی گەورەو سافکراودا دەیکەم بە دیمەکی سفتو لەسەریان دەنووسم..خۆشت دەزانی هەر قامیشو نەیزۆرە لەوانیش قەڵەم دەتاشم، باشە یان نا؟....

هێشا لە وتەکانی سیمیار رامابوو..بێ بیرکردنەوە وتی:

– جا ئەو شتانە پاروو دەکەن؟

سیمیار زوو هاتە دەمو وتی:

– ئەی چۆن؟ ئەو شتانە رێ لەبەردەم پاروو پەیدا کردندا روون دەکەنەوە، لاس بۆ ژێری دەنێنەوە، ژێری توێشەی پاروو پەیدا کردنە، ئەوەتانێ سەدانساڵ لەمەوبەر زەردەشت فەرموویەتی: (بیرکردنەوەی چاك، وتەی چاك، رەوشتی چاك).

تۆ سەیرکە مرۆڤ هەر کارێ کە دەکات ، پێشەکی بیری لێدەکاتەوە، بیری چاك بۆ ئەوەی بەرهەمی چاك بێ، ئەو بیرە دەکەوێتە سەر زمان، بۆ ئەوەی بە چاك بیسورێنێو خەڵکی بە چاکی فێر بکات، ئەوجا دەبێتە رەفتارو ئادگاری چاك، کردەوەی چاك ئەو کردەوەیە چییە؟ پاروە، نانە، بژێوییە، پێداویستیەکانی بژێوییە، بۆ بیرو هۆش دروست کراوە، کە لەسەر دایە بۆ وتەو زمان کە نوێنەری هۆشەو زاری بۆ دروست کراوە، بۆ کاریش دەست دروست کراوە، هەردوو

دەستی خۆی بۆ بەردەم هێشا درێژ کردن، ئەم دەستانە هەم بیرن، هەم وتەن، هەم کارن، کاریش بۆ پارووە، بژێوییە، ژیانە، هێشا هەموو هۆشی خستبووە سەر حاڵی بوون لە وتەکانی سیمیار، ئەویش لە سەر وتەکانی بەردەوام بوو، دەیویست هێشا چاك لێی حاڵی بێ و وتی:

– ئەگەر بەو جۆرە بکەوینە کار نەك پارو بەڵکو هەموو ڕازو نیازێکت بۆ دەردەخسێنێ ئەوەی دەتەوێ لەسەر، لەناو زەویدا، لە بەر پێتدا هەیە، خۆت خەریك بکە هەموو شتێ ئامادەیە.. لە ناودارو درەختدا، لەناو گژوگیادا چیت دەوێ هەیە، چاوەڕوانت دەکا، ئەوەتا هەندێ شیرنن، هەندێ تاڵ، هەندێ تفتو هەندێ ترش، هەندێ ڕەش و هەندێ سپی، برێ بۆندارو برێ بێ بوون، هەموو هۆشی مرۆڤ دەکەنەوە، با بزانین بۆ وانە؟ بە کەڵکمان دێن یان نا؟.. ئەگەر مرۆڤ هۆشی بکاتەوە بەو شتانەدا بڕوانێ دەزانێ لەسەر چ گەنجینەیەکی لە بن نەهاتوو دانیشتووە.. یەزدان کلیلەکەی بە دەستمانەوە داوە کە ئەم پەنجانەیە.. تۆ سەیریان کە، بە شێوەیەکی وەهانە بۆ هەموو کارێك دەست دەدەن، ئەوانەی چاو دەبڕنە موڵکی خەڵکی، یان وڵاتی تر داگیر دەکەن گەمژەن نە دەستو پلی خۆیان دەبینن، نە بەرپێیان.

هێشا هێشتا بەتەواوەتی لە وتەکانی سیمیار حاڵی نەبوو بەڵام لە هۆشیدا جۆرە دەنگێکی ئەفسوناویان دەدایەوە، پێی وابوو لە ئاسمانەی پیرێکی دانادا ڕاوەستاوەو لە ناو لێشاوی نووردا مەست بووە، بۆیە حەزی دەکرد هەر لە سەر وتەکانی بەردەوام بێ.. سیمیاریش کە زانی هێشا لە وتەکانی بێزار نابێ، بەڵکو هۆشی خۆی بۆ وتەکانی کردووەتەوە، بۆیە لەسەر قسەکان بەردەوام بوو:

پەروەردگار کە مرۆڤی دروست کردووە، خۆ بەم جۆرەی ئێستا نەبووە، بەڵکو بە پێی کەوتنەکارو خەریك بوونی هێناویەتە سەر ئەم سەروسەکوتە، سەیرکە

چاوی مرۆڤ بەرەو ئاسۆیە، کە چی هی ئاژەڵانی تر بەرەو زەوییە.. بۆ؟ ئەم هەر لەوەڕەکەی بەسەو لەوەڕیش لەسەر زەوییە.. ئەو چاوی لە نێوان ئاسمان‌و زەوی دایە، دەشێ هۆشی لای یەزدان بێو دەستی گوزەران‌و بژێوی لە ناو زەویدا گیر بکات.. مرۆڤ بریکاری یەزدانە کە لەسەرەوە چاودێریمان دەکات، بۆ ئەوەی ناو لەشمان تاریك نەبێت، بۆ هەریەکەمان چەپکێ رووناکی لە نووری خۆی، لە لەشماندا داناوە کە هۆشمانە، روناکی هۆش بە کارکردن دەگەشێتەوە هەر بەویش چاکەو خراپە لێك جیادەکرێنەوە، لەشمان پڕ لە ئامێری هەزار چەشنەیە، هەر کامێکمان لەسەر کار رابێنی رووناکییەکە روو لەوێ دەکات‌و دەکەوێتە کارئافەرین بۆ کەسێك بزانێ چۆن خۆی بخاتە بەرکارو دەوروبەری رووناك بکاتەوە، هەر کەسێ وا بکات بۆ هیچ پەکی ناکەوێ، نزای راستی ئەوەیە مرۆڤ بتوانێ خۆی رابێنی‌و چاوی بکاتەوە، دەستی بخاتە ناو نازو نیعمەتی ئەم ناو زەوییە، خۆ حاڵی بووی چیم وت؟

هێشا خۆی تەریق نەکردەوە نەیویست ئەو بزانێ وتەکانی بە بادا دراون، بۆیە وتی:

– ئاه ! حاڵی بووم (بیری چاك ، وتەی چاك ، رەفتاری چاك).

* * *

لە هەر شوێنێك باسی جوانی بکرایە، جوانییەکەی نازەنین بە جوانی بێ چوون ناودەبرا، نەك لە هەوراماندا بەڵکو لە دەورو بەری هەورامانیشدا دەنگی دابووەوە، گۆرانی بێژەکان لە کاتی چڕینی گۆرانی‌و شایی‌و زەماوەندا بە نەزاکەتەوە

بەشێوەی درکەو تێلنیشان‌و وشەی توێکڵ دار، لە گۆرانییەکانیادا ئاماژەیان بۆ دەکرد، لەو گۆرانیانەدا کە باسی نەبەردی‌و ئازایەتیان دەکرد بە ئاشکرا ئەویان دەکرد بە نموونە، چەند لە دەڤەری هەورامان دوور دەکەوتییەوە ئەندێشەی دڵداران پتر پەردەی جوانی بەسەر جوانیەکەیدا دەداو کرابووە شای جوانان‌و شاپەری شۆخ‌و جەمین جامان.. ئەوەی لە نزیکەوە بە دیداری شاد بووبێ جوانییە بێ وێنەکەی ئەوی دەکرد بە پێوەری جوان ئافەریدەیی خوای جوانی. ئەوەش گوێی گفت‌وگۆی گرتبێ پێی وابووە یەزدان شیرین گوفتاری وای دروست نەکردووە، ئەوەش بە فەرمانی ئەو کارێکی کردبێ پێی وابووە ژنی وا خاوەن بیرو ڕا ڕاست نەبووەو نەدیتراوە..

لە دیوەخانی بەگ و مۆبید و دەهقان و سانەکاندا بە نازەنینی هەورامان ناو دەبرا هەریەکە لەبەر خۆیەوە، بۆ خۆی یان بۆ کوڕی خۆی دەیویست داوای بکات، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو زاتەیان تیا نەبوو بچنە پێشەوە، ئەوانەی کە هەرزەکاری بنەماڵە دیارەکان بوون، یان خاوەن دەسەڵات‌و سەرۆك هۆزو ناودار بوون حەزیان دەکرد ببنە هاوسەری نازەنینی خواجە بەهمەنی هەورامان وەلێ کە دەیانزانی نازەنین لەو کچانە نییە باوکی بە ئارەزووی خۆی بیدات بە شوو ئیتر لە شوێن خۆیان ئەو ئاواتەیان دەخواست‌و پەڕیان نەدەکێشا گەلێ داواکارو دلخوازی هاتبوونە پێشەوەو بەدڵشکاوی گەڕابوونەوە، دایك‌و باوکی نازەنی بە دەست رایی کردن و وەرامدانی خەڵکەوە ورس ببون، ئەو مەیدانی داخوازی کارلنی نازەنین بە خەیاڵ پڵاو بەرینیان کردبوو لەچاو ئەودا گاڵتەجاڕی بەزەیی پیاهاتنەوە بوو، ئەو داخوازیکارانە بە خۆڕایی لە دایك‌و باوکی زویر دە بوون:

هەر داخوازیکارێك کە دەهاتن، خەڵکی دەگا پێیان وابوو هاتوون پاشای وڵاتیان یەخسیر دەکەن، کە نازەنین بەرێی دەکردن ئەوەندەی تر شکۆمەندو

خۆشەویست دەبوو...ئەوان بەتەمای ئەوە بوون نازەنین خان وەك چۆن كچی خۆیانە، بووكی خۆشیان بێ و لەناو خۆیاندا دەرنەچێت، بۆ گەنجێكی شایستەی دەگا بێ نەك بۆ كەسانێكی لایدەی نەناسراو...چونكە نازەنین سایەو مایەی نگینو خۆشەویستی دەگا بوو، لەدڵیشەوە متمانەیان هەبوو كە ئەو لەو كچانە نییە هەروا بە ئاسانی بۆ خەڵكانی تر بێ، بۆ سایەو پایەی لەبەر چاو، خۆی لەدەس ئەو هەموو كەسوكارو خوێشو دەسو پەیوەندە بدات، كە ئەو تاجی سەری خۆیان دەزانن، لە ناخیشەوە ئەو هەستەیان لا دروست ببوو كە نازەنین كەوتووەتە ناو خەرمانەی ئەڤینێكی جاویدانییەوە كە بە سیمیار نەبێ كەس نەتوانێ لە ناو بازنەی ئەو خەرمانە دایبهێنێتە دەرەوە...

راستە سیمیار پەروەردەی خوادادو پەسەندی ژینیەتی لە سامانو یاگەو راگەی كۆمەڵدا بە ماڵی خواجە بەهمەن ناگەن ، بەڵام جوانیو هەڵكەوتەیی سیمیار هەموو كەلێنێك كە لە چاو خەڵكدا هەبوو پڕی كردبووەوە، خەڵكیش هەر ئەویان بە شایستەی ئەو دەزانی، ئەویش شتێكی لەو بارەوە بە ئاشكرا نەدركاندبوو، وەڵێ، وا گیرۆدەی ببوو نەیدەتوانی رۆژێك لە پەنجەرەی دیوەخانەكەیانەوە نەیبینێ...

خواجە بەهمەن پێی وترابوو كە گویا نازەنین بە شمشاڵەكەی سیمیار چاك بووەتەوە وەڵێ كە بە گوێیدا چرپاندیان: گویا نازەنین دڵی بە سیمیاری هورمزیارەوەیە گاڵتەو پێكەنینی پێدەهات، كە بە دەست داخوازیكارانەوە هەراسان بوو، ئەو كاتە پێی خراپ نەبوو ئەگەر خواداد داخوازی بۆ سیمیار بكردایە، خۆ ئەگەر وابوایە ئەو كات لەژێر قورسایی باری ئەو هەموو رووڵێنانەی خەڵكە رزگار دەبوو، ئیتر ئەو كات دەوترا نازەنین بە بەنی سیمیارەوەیە ئەوكات خەڵكی دوور و نزیكی لە كۆڵ دەبوونەوە.

خواجه بەهمەن لەوە دەترسا ناوداری کچەکەی پەرەبسەنێ و دەمقانێکی دەسەڵاتدار یان سوپاسالارێکی بیانی لابەلایی یەخەی بگرێو بەخورتی کچەکەی لێ بسێنێ و بەرەو هەندەران بیباو هەتا هەتایە بە شوێنیدا بناڵێ و لە میهری بلوکیەتی و جگەرسۆزییەتی هەردووکیان بێبەش بکات، بە دەستچوونی ئەویش یەکجار ئۆجاغی کوێربێتەوەو تا ماوە هەناسە سارد ببێ، هەنارخانیش هەروەها لەوە دەترسا یەکێکی دەسەڵاتداری بیانی ناچاریان بکات بیدەنێ و ئەو کچە بە نموونەو خانمەی تووشی بە تووشی بەختێکی کەڵتەو نابووتەوە ببێ و ژیانی لێبکات بە دۆزەخ، هەرچەندە ئەو چاك دەیزانی نازەنین بە تەمای کێیەو نیازی چییەو دڵی بۆ کێ لێدەدات، ئیتر دڵی هەزارو یەکی دەکردو لە بەدی ئەو رۆژگارە دەترسا کە چارەنووس نەخشەی خۆی بخاتە کارو ئەوەی ئەو دەیەوە لە هەڵدێرێکدا سەرەونخونی بکاتەوە، گەلێ جار فریشتەی بەخت هەڵی دەنا کە بنێرێ بە شوێن پەسەندا لەو بارەوە بیدوێنێ، بەڵام کە بیری لە گەدەو گیپاڵی پەسەند دەکردەوە لە شوێن خۆیدا پەشیمان دەبووەوەو دەیوت:

- توخوا پەسەندە زلەی لفتە لووتە وای لێهات منێکی بەو هەموو سایەو پایەوە بنێرم بە شوێنیدا! بۆچی بۆ نازەنینی خواجە بەهمەن!. بە قوربانی تۆم خودایە، سیمیار دەخەیتە بەردەستی کێ؟ پەسەندە زلە.! خوایا لێم نەگری وا من نازەنینی ناسكو نازدارم دایە دەس تۆ، تۆش ئارەزووی خۆتە..

خواجەو هەنارخان لەنێوان خۆیاندا رێکەوتبوون ئەگەر کورە گاوانێکی لای خۆشیان بێ گرنگ نییە لای ئەوان ئەوە گرنگ بوو نازەنین لەبەر چاویان کلا نەبێ.

نازەنینیش دەیزانی دایك و باوکی بەهۆی ئەوەوە کەوتبوونە ناو دوو فاقەی کێشەیەکی واوە خەوو خواردنی لێیان تاڵ کردبوو، ئەویش هەموو پاشەرۆژی

خۆی لێکدابووەو بیری لەو کردبووەوە کە دایك و باوکی چۆن لەو تەنگژەیە ڕزگار دەکات‌و چتۆ هاوسەری خۆی هەڵدەبژێرێ..

هێشا بەو نیشانەیە لە جیاتی باوکی کرابوو بە سەرقافڵەی کاروانچییەکانی ماڵی خواجە، لە ماڵی ئەودا وەك مەحرەمی لێهاتبوو، ئیتر ڕۆژانە چاوی بە هەنارخان و نازەنین دەکەوت، ئەوانیش دەیانزانی برادەری سیمیارە، ئەو هەموو داخوازیکارانە بە بەرچاویەوە دەهاتن‌و بەڕێ دەکران، ئەو لەو بارەوە یەك نقەی لە دەمەوە نەدەهات، چ بە چاك چ بە خراپ، ئەوانیش حەزیان دەکرد جارێك وتەیەك بکات..

ئەو چۆن سیمیاری دەناسی ئەوهاش نازەنینی دەناسی‌و دەیزانی تاڵە پەیوەندییەکی نهێنی بێگەردی یەزدانی لەنێوانیاندا دروست بووە، لە ماڵی سیمیارەوە دەکشێ‌و دەگاتە ناو باڵەخانەکەی نازەنین، لەوێشەوە بە هەمان نوور ئاوێزان دەبێ‌و دەگەڕێتەوە ناو هۆدەکەی سیمیار، هێشا هەستی دەکرد ئەو تاڵە پەیوەندییە ڕۆژ بە ڕۆژ قایەو بەتین دەبێ‌و دەبێتە قەیتانێکی ڕەنگین‌و هەردووکیان پێکەوە دەبەستێتەوە.

هەندێ گەنجی چەتوون‌و بەلەسە، هەندێ ژنی پلارومشێن‌و خۆهەڵقوتێن بە بۆنەو بێ بۆنە بە گوێی خودادادو پەسەندا دەیانچپاند کە گوایا فلان بەگ یا قیسار دەهقان‌و سەردار بۆ داوالکردنی نازەنین بە بارو بارخانەوە بەڕێوەن‌و دێن!.

خواداد لەوەی کە لەنێوان سیمیاری برازای‌و نازەنیندا هەیە بێئاگا نەبوو ، ئەوەشی دەزانی سیمیار ئایندەیەکی ڕوون لەبەردەمیایەو هێشتا ماوەیەتی بیگاتێ لەبەر ئەوە، ئەو جۆرە قسۆکانەی بە خلۆربوونەوەی وردە زیخی لاپاڵێکی وشك‌و ڕەقەن دەچووان.

پەسەندیش ئەو وردە تەوسانەی لای خۆش بوون و وەك رۆن قاز لە سینگی دەی پێیان دەگشایەوە، دەیزانی بۆیە ئەو قسانە بە گوێیدا دەدرێن، چونکە مامۆژنی سیمیارەو تا تاقیبکەنەوەو بزانن کاردانەوەی ئەو قسانە لای چۆن دەبێ و چی دەڵێ... رەنگە تەشەربازەکان مەبەستیشیان ئەوە بووبێ کە بۆ خودادی مێردی بگێڕێتەوە، بەڵام پەسەند ئەوەی بۆ نەدەگێڕایەوە، بۆ ئەوەی نەیادا خواداد ئیرەتی هەڵسێ و بۆی بخوازێ، خۆ ئەو لەوە ئاگادار نەبوو، پلاری واش بە گوێی خواداد دا دەدران..

پەسەند دەیویست ئەو مەسەلەیە لە شوێن خۆیدا کپ ببێتەوە، بە عەقڵیدا نەدەچوو نازەنین بە سیمیار بدرێ، جا ئەگەر شتی وا رووبدا، ئەو کاتە ئەو دەبێ بە بەردەستی نازەنین، ئەو جۆرە بیرۆکانەی پەسەند و خۆ هەڵکێشانەکەی بە سیمیار لێی تێك دابوو زۆریش حەزی دەکرد هەنارخان لووتی لە قووڕ بچەقێت و نازەنینی لە دەست دەربچێ و بەختی رەش بێت و هەتەرەی ولاتان ببێ و تا ماوە بە شوێنیدا بنالێنێ...

هەندێ جاریش کە ئەو جۆرە قسانە بە روویدا دەدران دەیوت:

– جا، دایکم بۆ لە رووی مندا قسە دەکەن... من نەکوڕم گەورەیە بۆی بخوازم نە خزمێکی وەهام هەیە ! تەنیا سیمیار هەیە ئەویش بەلای هەموو شتێکدا بچێ بەلای ژنهێناندا ناچێ! با بڕوا تا زووە دایکی خەمێکی بخوا...

قسەکانی پەسەند سەخت و تاڵ بوون، کەس یارای ئەوەی نەبوو وەك چۆن کرابوون بۆ هەنارخانیان بگێڕێتەوە، نەك هەنارخان، بەڵکو ئەوەی گوێی لێیان دەبوو وایدەزانی بەردی رەق بەبن گوێیدا دەدرێ، بۆیە ئەوانە کە ئەو کارەیان پێ راسپێردرابوو بەو شێوازە رەقەی پەسەند بۆیان نەدەگێڕایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا قسەکان هەستی هەنارخانیان دەڕوشان، بەڵام بە قەد تاڵەموویەك خۆی بە

سەخڵەت پیشان نەدەدا.. پەسەند نەیدەزانی هەنارخان چەند کەسانێکی خۆش کردبوون کە ئەو قسانە بە گوێی خوادادو پەسەندا بدەن و قسەکانی ئەوانیشی بۆ ببەنەوە..

* * *

لە ماڵی نۆشادا کە باسی داخوازییەکانی نازەنین دەهاتە پێشەوە نۆشا بە چاوی پڕ لە قین و حەژمەتەوە دەیڕوانییە ئەژدەرە گێڕەی کوڕی و دەیوت:

– ئەگەر کوڕم هەبوایە دەمزانی چی بکەم، نەمدەهێشت دەرگای خۆم بە حەوشەی خەڵکەوە بنرێ، بەڵام ئاخ وانەبوو خۆمی پێهەڵکێشم و بڵێم خاوەن کوڕم...ئەوەتانێ کوڕ بە کەردن ناوی دەرچووە، ئیتر من بە چ ڕوویەکەوە لە خواجە بچمە پێشەوەو داخوازی کچی بۆکوڕم بکەم...کەی خەڵك کچ بە پیاوی سەقەت دەدات!.

ئەژدەر بەو قسانەی باوکی وا هەڵدەچوو خەریك بوو لەناو چەرمە رەقەکەی خۆیدا ئێسکەکانی دەرپەڕن، لەجیاتی ئەوەی دڵی بداتەوەو ژەهری بە قووڕگدا دەکرد... بۆیە ئەژدەر پێی وت:

– ئەوا من وەهامە، ئەی خۆ تۆ زڕ برای خواجەی ئەی بۆ پرسێکت پێناکەن!...

ئەویش بە رکەوە بەرپەرچی دەدایەوەو دەیوت:

– ئێدی باوکی تۆم بۆیە!

ئەژدەر ئەوەندەی‌تر پەست دەبوو و دەیوت:

- خەم مەخۆ رۆژی بووکێنی بۆ چێشت خواردن بانگت دەکەن...ئەژدەر تەشەرێکی جەرگبڕی لە باوکیدا، هەردوو چاوی پەڕیلە تەوقی سەرییەوە پڕ بوون لە قین و خەریک بوو بتلێشێ وەلێ لە شوێن خۆی پێشی خواردەوەو وەک هەنارێکی پێشاو لە شوێن خۆیدا برژاو وەلێ نەتلیشا! ئەژدەر کەزانی باوکی بە وتەکەی سڕ بوو، ویستی دڵی بداتەوەو وتی:

- راوەستە.. رۆژی بووکێنی کە سواری دەکەن بزانە چی دەکەم، ئەگەر لەسەر ئەو وڵاغەی سواری دەبی نەمخستە خوارەوەو دەست و رانێکم نەشکاند هەڵبەتە، من ئەژدەر نیم..

باوکی بە بێزەوەوە خێسمەیەکی لێکردوو ویستی پەلاماری شتێک بدات و دەم و قلقی پێ بکوتێتەوە بەڵام هیچی بە دەستەوە نەهات و وتی:

- ئەو دەم و کەلاوەت دەرمەخە، خەمی ئەوەمە بڵێن کابرا شێت بووە دەنا دەمکردی بە میزڵدانی دەست منداڵە وردە... بۆ وادەزانی نازەنین شوو بە یەکێک دەکات تۆ دەکا بە پشقڵی بەر پێی وڵاغەکەی.

کاڵێی دایکی ئەژدەر بەلای خۆیەوە ویستی میانجییان بکات..هاتە دەم و وتی:

- ئەوە ئێوە بە تڕ گوێز دەشکێنن، یان دەتانەوێ بەسەر حەوت کێودا باز بدەن؟ ئەوە بۆ تەمێ نابن، بۆ قسەیەک ناکەن بەر بگرێ، مەنێک ناپێون سەربگرێ؟. ئەوە لەناو خەڵکیشدا وەها دەم لەناو دەمی یەکتری دەنێن؟ هەی لەو باوک و کوڕە!! توخوا ئێمەو نازەنین کوجا مەرحەبا..

- نۆشا بە توندی قسەکەی بڕی وتی:

- بۆ کاڵێ خان؟ ئێمە چین و ئەوان چین؟!

کاڵی بە تەوسەوە:

- ئێمە، ئێمەین و ئەوان، ئەوان..

نۆشا تووڕەتر بوو:

- یانی چی.

یانی! ...یانی؟ خۆتان دیووە؟ سەیری خۆتان بکەن ئەوسا دەزانن یانی چی؟

ئەژدەر وەك چۆڵە ختەی پشیلەی هار بدەی وا تەقییەوەو هاتە دەم :

- کوڕێ دایکی وەك تۆی هەبێ وەك من دەبێ!

کاڵێ زوو لێی هاتە دەم:

- کوڕە دەچێتەوە سەر باوکی:

کاڵی وای وت‌و دەرپەڕییە دەرەوە، چونکە دەیزانی ئەو گەڕەلاوژێیە بەرەو ئاژاوەیەکی بێ سەروبەر رایاندەکێشێ‌و لە ئەنجامدا بووڵەکەشی هەر بەسەر ئەودا دەکرێ...

*    *    *

هەر کاروانێ رووی دەکردە دەگای هەورامان یەکسەر خەڵکەکە وایاندەزانی داخوازیکاری ترەو بۆ نازەنین هاتوون. جگە لە باسکردنی ئەوو داخوازییەکانی تام‌و تەسەلێکی تر بۆ هەواڵەکانی ناو دەگا نەمابوو، هەر بەو بۆنەشەوە ناوی دەگای هەورامان لە گشت دەڤەرەکانی تر بڵاو ببووەوە، دیتن‌و دیداری نازەنین چوون دیدارو دیتنی خەرامانی چینی لێهاتبوو، خەڵکی ئەوێ جاران دیتنەکەی ئەویان لا ئاسایی بوو، وا ئێستاش وای لێهاتووە خەڵکی دەگاش بە گەورەو بچووکەوە بە ژن‌و پیاوەوە ئارەزووی دیتنی دەکەن‌و پێی شاد دەبن، هەندێ وایان دەزانی هاتنی ئەو هەموو داخوازیکارانە کە لە هەندەرانەوە دەهاتن ماڵی خواجە بەهمەنی پێ بووە بە ئارامگای نگین‌و بەختەوەری، کەچی ئەگەر دڵی هەنارخان‌و

خواجه بەهمەنت بکردایەتەوە، ئەوجا دەتزانی ئاواتیان ئەوە بوو وا نەکەوتنایە بەر چاوو زاران، وا ژیانیان سەخڵەت و تاڵ نەبوایە، وەشڵەیان دەخواست ئەوانیش وەك ئەو خەڵکەی تر بوونایەن، کە بە ئاسوودەیی و بێدەنگی کچی خۆیان دەدەن بە هاوماڵی خۆیان و دەبڕایەوە، هەزارو یەك بەهانەو پەڵپیان دەهێنایەوە تا داخوازیکارێکیان لە کۆڵ دەبووەوە، ئەوەندەی نەدەخایاند یەکێکی تریان بۆ دەهاتە پێشەوەو هەنجەتی دەبڕین، ناچار ئەوانیش رووبەرووی نازەنینیان دەکردەوەو ئەویش دەتوت ئەفلاتوون دەرسی داداوە دەیزانی چۆنیان بەرێ بکات، کێشەکە گەیشتبووە رادەیەکی وەها کە ماڵی خواجە ناچار بکات تەگبیرێکی لێبکەن تەگبیرەکەش ئەوەبوو، دوور لە دەگای هەورامان لەسەر رێگەی هاتن و گەڕانەوەی ئەوانە کە بە نیازی داخوازی روویان لە دەگا دەکرد یان کە لەو کارە دەگەڕانەوە یەك دوو کەسانێك کە گوایە شوانن یان دارەوانن دابنێن، ئەوانەی کە دێن یان دەگەڕێنەوە بە بەهانەی شتێکەوە برۆنە سەر رێیان لێیان بپرسن کە بۆ چ دەچن و بۆچی چوون کە وتیان بۆ داخوازی دەچین، یان لە داخوازی دەگەڕێنەوە پێیان بڵێن ئەو کچە بە کاری ئێوە نایەت، چونکە نەخۆشیەکی لەگەڵدایە، چەند ساڵ جارێك زمانی دەگیرێ و لەگەڵ کەس وتە ناکات، ئەم تەگبیرە پێشنیازی نازەنین خۆی بوو، مەبەست لەو نەخشەیە ئەوە بوو تا ئەوانەی کە رایی نەکرێن نەبنە دوژمنی دەڤەری هەورەمان و سبەی رۆژ رێ بە کاروانەکانیان نەگرن، لە هەمان کاتیشدا وازهێنانی داخوازیکارانی تیابوو، نەخشەکە یەکاو یەك ئەنجامی خۆی پێکا... بەڵام کێشەی شوونەکردنەکەی نازەنین وەك خۆی مایەوە، خواجە بەهمەن و هەنارخان سەریان لەوە ئاوسابوو، دەیانوت: ئەی نازەنین بۆ شوو ناکات؟ بە تەمای چییە؟ چەند مانگێك سەری ئەو مەسەلەیان نایەوە وەلێ زانیان هەروا بێدەنگ بوون نابێ تا رۆژێك وای رەخسان هەرسێکیان لەو رووەوە

رووبەروو ببنەوەو بەبێ پەردە لەسەر ئەو بابەتە بدوێن و بزانن لەبەرچی شوو ناکات، یان ئەگەر یەکێکی داناوە تا بزانن کێیەو بۆ نایەتە پێشەوە، خواجە رووی کردە نازەنین و وتی:

– نازەنین تا کەی من دەست بە رووی خەڵکیەوە بنێم؟

نازەنین بە دڵێکی گەش و فراوانەوەن رووی کردە باوکی و وتی:

– تاتە گیان تۆ دەتەوێ من شوو بکەم؟

خواجە گەشایەوە..

– بەڵێ، ئەی نەتبیستووە وتویانە: کچ دەبێ شوو بکات و کوڕیش ژن بێنی... کچ باش نییە هەر لە ماڵی باوکیدا بمینێتەوە..ئەگەر هەر شوو ناکەیت پێمان بڵێ.......

رووی کردە هەنارخان و وتی:

– تۆش واناڵێیت؟

هەنارخان هاتەدەم و وتی:

– بەڵێ.. منیش گەلێ جار وام پێ وتووە..

گەشانەوەی دەم و چاوی نازەنین ئەوەی دەگەیاند کە گەلێ بەو رووبەڕوونەوەو راستبێژییە شادمانە، بۆیە وتی:

– پێتان دەڵێم...

هەنارخان زوو هاتەدەم و وتی:

– نازەنین... کچە نازدارەکەم لە جێی گشت کەسم، شەرم لەمن و باوکت مەکە، ئەگەر یەکێکت بە تەما کردووە، پێمان بڵێ با دڵمان ئاسوودە بێ دەنا ئەگەر نیازت وایە شوو نەکەیت ئەوەش شتێکی ترە... هەر بیڵێ...

نازەنین بەبێ پەردە وتی:

- نە ئەوەیەو نە ئەوە...

هەندێ بێدەنگ بوو رووی کردە دایکیو وتی: ئێوە ناتانەوێ من بە دڵی خۆم شوو بکەم؟

هەنارخان گەشایەوەو وتی:

- ئێمەش ئەوەمان دەوێ، بە دڵی خۆت شوو بکەیت. جا لە کوێ بێنین بە دڵی خۆت بێ...

نازەنین زوو سەری وتەکەی هێنایەوە لای خۆیو وتی:

- ئێوە مەیهێنن خۆی دێ...

هەنارخان وتی:

- جا کەی؟

- پەلەتانە؟

هەنارخان هاتەدەم....

- نا پەلەی چی! بەس دەمانەوێ بزانین لە کوێوە دێ؟ لە کێوی قافەوە یان لە شاری واق واقەوە؟

نازەنین زەردەخەنەکەی سەر لێوی شێواندو وتی:

- نا دایە! ... بۆ ئافەریدەی خوا لەم دەڤەرەی خۆماندا بڕاوە؟

هەنارخان وتی:

- تۆ بە کەسیان رازی نیت، دەنا...

نازەنین وتەکەی لە دەم دایکیدا پساندو وتی:

- دایە! تۆو باوکم سەیرن! دەزانی ئەوانە کە هاتن جاریّ خەڵکی دەڤەری خۆمان نەبوون، جا نازانم لە کێوی قافەوە هاتبوون یان لە شاری واق واقەوە، دەزانی ئەوانە بۆ منیان دەخواست، یەکێکیان دەیویست من ببات‌و بمکاتە بە تووتی‌و لەناو قەفەزدا دامنیّ‌و وەك ئاژەڵێك خواردن بە دەممەوە بکات...یەکێکی تریشیان دەیویست بمکات بە بووکڵەو لەناو تاقی قەڵایەکی سەختدا بۆ گەمەی خۆی بەکارم بهێنیّ، هەریەکە لەوانە بۆ چەشەی تایبەتی خۆی دەیخواستم، ئایا ئێوە بەو جۆرە شووکردنە رازین؟

خواجە چاك لە وتەکانی نازەنین حاڵی بوو، بۆیە وتی:

- کچم، گلێنەی چاوم ئێمە دەمانەوێت تۆ بەختەوەر بی،

نازەنین بە وتەکەی باوکی شاد بوو وتی:

- دڵنیام دەتانەویّ بەختەوەر بم، جا کەوابیّ ئەی بۆ لێم ناگەڕێن وابم! من دەمەویّ بە ئارەزووی خۆم شوو بکەم...

هەنارخان بە بیستنی ئەو وتەیەی نازەنین، تۆزیّ یەخەی کراسەکەی لادایەوەو سینگی واز کردوو رووی کردە رووناکی پەنجەرەکەو وتی:

- ئەی خوای پەروەردگار کچەکەم نائومێد نەکەی، بەهمەن سەری قسەکانی هێنایەوە لای خۆی‌و وتی:

- دەی بزانم چۆن چۆنی بەختەوەرمان دەکەیت؟ گرنگ ئەوەیە ئەمڕۆ ئەو خەڵکەمان لە کۆڵ ببنەوە...

نازەنین بە پاشبەندی وتەکەی باوکی خۆشحاڵ بوو وتی:

- زۆر باشە، وا دەکەم لە کۆڵتان ببنەوە، من دوو مەرجم هەیەن ئەوەی بۆ من دێتە پێشەوە ئەو دوو مەرجەم بۆ بێنێتە دی بەبیّ یەك‌و دوو بەسەر دەسی هەموو دەگادا شووی پێدەکەم...

هەنارخان بە قسەکەی نازەنین سەرسام بوو، وتی:

- مەرج؟

- بەڵێ بە دوو مەرج..

- ئیتر هەرکەس بێ، خێران خۆ نۆکەرێکی ماڵی خۆمان بێ... خواجە بە تووڕەییەوە ڕووی کردە نازەنین...

- ئەوە چی دەڵێی؟ شێتی یان دەستیان لێوەشاندووی؟

نازەنین لەسەرخۆو بە ئاستەم وتی:

- بابەگیان ناتانەوێ ئەگەر من شوو بکەم، بەختەوەر بم و ئێوەش شانازیم پێوە بکەن... من بە دوو مەرج شوو دەکەم...ئەوەی دێتە پێشەوە با ئەو دوو مەرجەم بۆ بێنێتە دی.

خواجە قسەی بۆ نەمایەوەو وتی:

- پەنا بەتۆ خوایا...ئەمە چ بلیمەتێکە؟

خواجە وای وت و خۆی لە قسە کردن کەنارادا..

هەنارخانیش سەری لە مەرج گرتنەکەی نازەنین کاس ببوو.. هەرگیز چاوەڕوانی ئەو جۆرە شتە ئاڵۆزەی لە نازەنینەوە نەدەکرد، هەندێ مات بوو، لە دڵ خۆیدا دەیوت ئەم پێچ و پەنایەی بۆ چییە، بۆ راستو رەوان لە نیشانە نەدەم؟ بۆیە وتی:

- شتێك هەیە بیڵێم؟

- ئەی بۆ نایڵێیی؟ بۆ شت دەشاریتەوە؟.

- ئەوەی لەناو دەگادا بڵاوەو هەمووشمان دەیزانین بەر ئەو مەرجانەی دەخەی؟

- ئەوەی ئەو مەرجانەم بۆ نەهێنێتە دی، شووی پێناکەم..

– سیمیاریش ؟

– بەڵێ سیمیاریش..

هەنارخان هەناسەیەکی هەڵکێشاو وتی:

– ئەو دوو مەرجە چین؟

نازەنین وتی:

– جاڕ بدەن ئەوەی دەیەوێ من بخوازێ با لە چواردەی مانگی داهاتوودا ئامادەبێ مەرجەکانیان پێدەڵێم..

خواجە کە گوێی لە وشەی مەرج بوو، بە شێوەی پاڕانەوە لێی وتی:

– کچم لە ڕێی خودا بەزەییت هەبێ، بۆ وامان لێدەکەی؟

نازەنین لەسەرخۆو بە میهرەبانیو دڵی پڕ متمانەوە رووی کردە باوکیو وتی:

– تاتەگیان، خەم مەخۆ، ئەوەی من دەمەوێ بە دڵی تۆ دەبێ،

– ئەی ئەگەر دوو کەس مەرجەکانیان هێنایەدی...

نازەنین ئەو وردبینییەی باوکی پێخۆشبوو، بۆیە وتی:

– خەمت نەبێ، هەردوو مەرجەکە بە یەکەوە ناخەمە روو، ئەوانەی یەکەمیان بەجێهێنا، وا دەکەم مەرجی دووەمیان هەر لە یەکێکیان بێتەدی..

– واتە داتناوە، ئەو مەرجانە لە کێدا دێنە دی؟ کەوایە بۆ پێمان ناڵێی؟....

– وەختێ پێتان دەڵێم کە هەموو دەگا شایەتی بدەن کە جگە لەوە لە وێژەی کەسی تردا نەبووە ئەو مەرجانە بێنێتەدی...ئەی ئێوە حەز ناکەن هاوسەرێك هەڵبژێرم لە شانی خۆمدا بێ؟ جگە لەوەش من پەلەی شوو کردنم نییە.

هەنارخان بە تەواوەتی سەری لە بەزمەکە کاس بوو وتی:

– هەی هاوار ئەمە تۆ چیی دەڵێی؟

نازەنین خەمی دایکی بوو کە ئەوەی ئەو مەبەستییەتی ئەو چاك لێی حاڵی نەبێ، بۆیە وتی:

– دایەگیان.. لێم تێبگە، ئەگەر دەتانەوێ خەڵکتان لە کۆڵ بێتەوەو منیش بە دڵی خۆم شووم کردبێ، ئەوەیە کە وتم! ئەوانەی کە داخوازی من دەکەن یا لە شووشەم نەگرن یا لە قەڵای هەزار بە هەزارو گوڵزاردا نەمبەسنەوە، ئەگەر ئازان و خۆیان بە پیاو دەزانن، با بێن مەرجەکانم بێننەدی، یا لە چواردەی مانگی داهاتوودا کە مانگی بەفرانبارە لە دەگا خڕببنەوە، ئەوەی توانی مەرجەکانم بێنێتەدی بەسەر دەستی خەڵکی دەگادا دەبمە هاوسەری ئەو...

خواجە دەیزانی نازەنین وتەی بە دوو نابێ، ئەوەی وتی هەر ئەوەیە، بۆیە بە جۆرە هەراسانییەکەوە وتی:

– تا ئەمڕۆ شتی وام نەبیستووە!

نازەنین بە نەرم و نیانییەوە وتی:

– تاتەگیان، وا بیستت، کچی تۆ دەبێ شوو بە پیاوێکی مەرد بکات، خۆ بووکڵە نییە لە باخەڵ بنرێ، یان لەناو سندوقی چوار پێشەدا هەڵبگیرێ، نازەنینە... نازەنین، کچی خواجە بەهمەنە.

بەهمەن هەردوو لەواسەی دەستی بە یەکدا داو وتی:

– خوا پەنامان بدات، داخۆ نازەنین بۆ کوێ رامان بکێشێ؟

نازەنین هەستی کرد، باوکی لە دڵەوە خۆی بە دەست پێشنیازەکەیەوە داوە، وەلێ لە ئەنجامەکەی دەترسێ... بۆیە وتی:

– پەنای خوا ئەوەیە کە وتم، لە سبەینێوە جاڕ بدەن ئەوەی منی دەوێ با بێتە مەیدان، ئەگەر ئێوە جاڕ نادەن، من خۆم لە سبەینێوە چەند کەسانێك دەنێرم بۆلای ئەوانەی کە داخوازی منیان کرد، با بێن مەرجەکانم بێننەدی...

هەنارخان سەری لەو سەراو دەراوە دەرنەدەچوو، شتی وایشی پێش ئەو کاتە نەبیستبوو، ئەوەی ئەو بۆ ئەو رووبەروو بوونەوەیە ئامادەی کردبوو لەناو گەردەلوولی ئەو مەرجانەدا بوون بە تۆزی دەم رەشەبا.... تا ئەو کاتە ئەو بیری بەلای سیمیاردا دەچوو، وا ئێستا ئەو بیرکردنەوشی لا کاڵ بووەتەوە ئەویش بەر مەرجەکان خراوە، خەمی ئەوەشی بوو ناوداریی‌و جوانییەکەی لێی بووبێ بە نەخۆشی لەخۆبایی بوون‌و فیز، وای ئەجیا دەکرد، لەو لاشەوە (ئیتر هەر کەس ببێ)، کەی ئەو ئەجیایەی لێ تێکدەدا، بۆیە وەك پاڕانەوە لێی وتی:

– نازەنینەکەم...دایکەکەم، بۆ وا دەکەی؟

گڕی یەقین بە سەرکەوتنی نەخشەکەی وەك تیشکی ئەستێرەی گەلاوێژ لەسەر روومەتی دەدرەوشایەوە، ئەوجا بە نیانییەوە رووی کردە دایکی‌و وتی:

– دایەگیان... تۆ ناتەوێ شوو بکەم؟ بەوجۆرە نەبێ نابێ‌و بڕایەوە...

نازەنین وای وتوو بەبێ توورە بوون‌و لەسەرخۆ چووە دەرەوە... باوکی‌و دایکی بەجێهێشت بۆ ئەوەی بیر لە نەخشەکەی بکەنەوە، ئەوانیش تەماشای یەکتریان دەکردو وەك بە یەکتردا راما بن، وا بێ دەنگ بوون...ئەوەی ئەوانی خستە ناو گۆمی سەر لێدەرنەچوونەوە، ئەو مەرجانە بوون! داخۆ ئەو مەرجانەی نازەنین چی بن؟

خواجە هاتە قسەو بە حەسرەتەوە وتی:

– ئەگەر بمزانیایە مەرجەکان چین خەمم نەبوو، لەوە دەترسم کارێکی وەها بکات چەند منداڵ‌و زارۆڵە هەیە لێمان خڕ ببنەوەو حەیامان بچێ..!

هەنارخان زانی بەهمەن دڵتەنگە دڵی دایەوەو وتی:

– بەهمەن! لە نازەنین مەترسێ، ئەوەی دەیکات هەڵەی تێناکەوێت.

خواجه وەك نزایەكی بێدەنگ بكات، هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان پان كردنەوەو دەنگی نەكرد...

*          *          *

# ( ٤ )

مانگی بەفرانبار بە تەواوی کاروانی گەرمای بەرئاگری خۆش کردبوو، دەستێرەی گەلاوێژ کەرمەنەقاڵی ترازوو پێروو کۆی تا سەر کەلەکان بەڕی دەکردو لە پەنای پەڵە هەورەکاندا چاوشارکێیەکی پڕ سۆزی لەگەڵ کێوەکانی ئەم بەرو ئەوبەری دەگادا دەکردو ناو کەمەری ئاسمانەکەی بە تیشک پڕژاندن جوانتر دەکردو بۆ تارای کازیوەی بەیانیانی بەجێدەهێشت...

ئەو بەیانیە چواردەی مانگ بوو، دەگا بە مێوان‌و داخوازیکاران جمەی دەهات، کاروانسەراکان‌و پەرستگاو مالآن چەندان مێوانیان تیا دابەزیبوون... ئەو داخوازیکارانەی بەر لە ئێستاو هی نوێش هاتبوون، ئەوانەش کە تازە هاتبوونە پێشەوە چەندان خەڵکی تری سەیرانکارو تەماشکەر بە خۆیان‌و کەس‌و کاریانەوە رژابوونە ناو دەگا، هەر داواکارێك هاتبێ خەڵکی دەگا بە گەورەو بچووکیانەوە پێشەوازییان لێدەکردن‌و سەیری زاوای چاوەڕوانکراویان بە وردی دەکرد، دەیانپرسی، تۆ بڵێی ئەوەبێ هاوسەری نازەنین خان؟ زوو لەبەر خۆیانەوە دەیانرخاندو رای خۆیان دەربارەی دەردەبڕی (ژیرلەی مەڕێ)ی لێدەرکە، خەڵکی هەورامان تەنانەت خواجە بەهمەن‌و هەنارخانیش سەریان لەو بەزمە سوڕمابوو، بەلآم بە ئارەزوومەندی‌و ژیری نازەنین هەموو بیرو هۆشێکیان خستبووە سەر ئەنجامی ئەو بەزمە کە تا ئەو رۆژە شتی وایان بە خەیاڵدا نەهاتبوو، بەڵێ لەناو چیرۆکەکانی‌پێشینان‌دا بیستبوویان کە پاشای وڵات دەمرێ، بۆ دانانی پاشای

نویْ باڵندەی نگین و بەخت (هۆما) هەڵدەدریْ، لەو رۆژەدا خەڵك جەم دەبن، جا بەسەر کیْوە بنیشیْتەوە ئەوە دەکریْ بە پاشا، بەڵام ئەمەی نازەنین دەیکات نەبووەو نەبیسراوە، خواجە بەهمەن لەو رۆژەدا لە ماڵ نەدەهاتە دەرەوە خۆی دوور لە پرسیاری خەڵك رادەگرت، لەو رۆژەوە ئەو بانگیْشەیە کرابوو، نازەنین خۆی لە جیاتی باوك و دایکی پیْشوازی میوانەکانی دەکردو ئەوانیش ئەو کەسەی کە ئەوی بۆ دەخوازرا بەویان دەناساند.

بەر لە هاتنی چواردەی ئەو مانگە کە رۆژی هیْنانەدی مەرجی یەکەم بوو هەفتەی جاریْك داوای لە ژنان و دەستەخوشکانی خۆی کردبوو کە لە دەوری کۆببنەوەو قسەو سەرگوزشتەی خۆشی بۆ دەگیْرانەوە، لەبارەی شووکردنەکەی خۆیەوە تیْیگەیاندبوون قسەی وای بۆ کردبوون کە تا ئەو ساتە لە کەسەوە شتی وایان نەبیستبوو، سەرو بنی قسەکان باسی دڵداری و منداڵ پەروەری و دەسپاکی و ئاژەڵداری، متمانە بەخۆو میهرەبانی و بەزەیی بە گیانلەبەراندا هاتنەوەو خاویْنی ناوماڵ و دەسترەنگینی و کارو هەرمان، بەدڵ خۆ شووکردن، مەبەستی ئەوەبوو پیْیان بڵیْ پیاو هەر ئەوە نییە لەسەر دوو لنگ بڕواو سمیْڵی هەبیْ و خۆی بابداو ئیتر تەواوە، یان ژن کە سەرسینگی دەرپەڕی و کراسی ئاڵ و واڵای لەبەر کردو زوڵفی شانە کرد ئیتر ئەوە ئافرەتەو بڕایەوە. بەڵکو پیاو ئەوەیە کارو کاسبی قاڵی کردبیْ و لەناو قاڵبی بەرهەمداردا هاتبیْتە کایەوە، نەك بە سەرو گوێلاك و خۆ بە شت زانین...ئافرەتیش ئەوەیە بە ژیری خۆی ریْی خۆی بدۆزیْتەوە، نەك کاڵا بیْ، دەستاو دەسی پیْبکریْ، یان دەفریْك بیْ بۆ پیْویستی ناوماڵ رابگیریْ، هەرکات بۆ بەکارهیْنان نەهات فڕیْ بدریْ، نازەنین لە زووەوە خەڵکی دەگای لەسەر ئەو جۆرە قسانە راهیْنابوون بە تایبەتی لەو رۆژانەی دواییدا شتی وای بە ژنان دەوت، هەرگیز گوێیان لە شتی وا نەبووە، بۆیە ئەو

کارەی ساز دەدا تا خەڵکەکە تێبگەیەنێ، ئەوەی دەیکات بێ حیکمەت نییەو شتێکی رەوایە....

خەڵکەکە ئەوەیان لا سەیر بوو. نازەنینێکی پەروەردەی ناو کۆشکو بەناز بەخێوکراو، ئەو قسانە لە کوێوە دەهێنێو چۆن ئاوەزووی پێیان دەشکێت، ئەوان وا فێرکرابوون لەناو دیوەخاندا باسی دێو و درنجو دێوەزمەو دەعباو دڕندەو خەونی جڕتیو فرتیو کارەساتی دڵتەزێنیان دەکرد،نەك باسی کۆڵبەریو باخەوانیو کشتیاریو ئاژەڵداری وەك ئەو دەیکرد، ئەو دەیوت: حەیف نییە مرۆ نەبێ بە کۆچەڵە ئاوێك درەختێکی تێنوی پێ ئاودەشتە نەکرێ، یان جووتیارێك نەبێ بە مەچەكو ئارەقەو زمرزەرەی نێوچاوانی بژێوی لەناو جەرگەی کێڵگەدا دەرنەدا، کاریگەرێك نەبێ ناوقەدی ئەو شاخانە بە کەڵەکی هەڵچنراوی تووناتوون قەیتان بەستو کەمەربەند نەکات...

وتەکانی نازەنین لە ئاستی ئافرەتانی وادا نەبوون، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەوان خۆیان لەناو ئەو کارانەدا دەژیانو بەو کارانە راهاتبوون، بە رەنجو رۆژی پەیدا کردن لەو بوارانەدا هێزی مەچەكو هۆشیان دەخستەکار چاك لە قسەکانی حاڵی دەبوون، گەلێ جاریش لە کاتی کارکردندا سەری لێیان دەدا، ئەوەندە کارو فرمانی لا شیرین کردبوون، هەریەك خۆی بە خانمی کارامەو دەست ڕەنگین دەزانی وەك پێشەوایەك تەماشای ئەویشیان دەکردو لە دڵەوە ئاواتیان ئەوەبوو ئەو خانمە نازدارەیان لە دەست دەرنەچێ، وایاندەزانی ئەو نگینیدەگایەو مویارەکە...

جگە لە هێشا کەس نەیدەزانی ئەو قسە پڕ لە پیتۆڵانە لەکوێوە دێنێ!.

رۆژێ بەر لەوە نازەنین مەرجەکانی بە داواکارانی رابگەیەنێ، داوای لە پیاوماقوڵو ریش سپیانی دەگای هەورامان کردبوو کە ئامادەی جاڕدانی

مەرجەکانی بن، پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە کە دانرابوو، هەموو داخوازیکارەکان لەبەردەمی ماڵی خواجە بەهمەندا خڕببنەوە...

ئەوانەی کە بۆ داخوازی هاتبوون، ئەوانەش کە ئەو نیازەیان هەبوو، دەبوو لەبەردەم حەوشەکەدا بەرامبەر بە نازەنین ڕاوەستن، پاش بەخێرهاتنیان هۆزای بەردەستی کە ئەو کاتە لە تافی لاوییەتیدا بوو، لەناوی خۆیان و باوك و باپیریان و نەفەرو پیشەو کاریان دەپیرسی تا ئەویش بە نازەنینیان ڕابگەیەنێ...

گەلێ لاوی دەگاش هاتبوونە پێشەوە، پتر بە نیازی ئەوەوە کە نازەنین لەناو خۆیاندا نەچێتە دەرەوە، یان لەبەر ئەوە بوو تا ئەوانە وانەزانن لە دەگادا گەنجی شۆخ و شەنگ کەم هەیە!

کە نازەنین لە بانجێنەی حەوشەکەوە هاتەدەرێ، ڕووبەڕووی داخوازیکارەکان ڕاوەستا، خۆی لەسەر یەك تێل ڕازاندبووەوە. ئەو هەڵوێستە گەنجێکی دەویست بتوانێ خۆی ڕاگرێ و نەشێوێ، ئەوانەیان کە خەڵکی دەگا بوون و ناسیاو، بەرامبەر بەو شکۆمەندی و نموودەی نازەنین کەوتنە شەرمەوەو وەك ڕیزنواندێك بۆی خۆیان کشاندەوە، ئەوانەی لە دەرەوە هاتبوون بە کشانەوەی ئەوانە سامیان لێنیشت و پەشۆکان، کە نازەنین چاوی پیا خشاندن هەموو سەریان داخست.

بە سەرو تەپڵەی زل و پشتوێنی فش و دەسماڵ و خەنجەری زێڕکفتی بەر کەمەرو پوزەوانەی گوڵەنگ شۆڕو فەرەنجی و پەستەك لەبەر، گیزەمل تێکسرپاگ و گەدەو گیپاڵ پف و قەپۆز دەرپەڕیو ڕاوەستابوون، نازەنین بە یەك چاو تەماشای کردن، گەلێ بە ڕێزەوە لەگەڵ وتنی ناوەکانیادا زەردەخەنەیەکی ساوایانەی چوون یەکی بۆ دەکردن.

دوای ئەوەی کە هۆزا بە نازەنینی ناساندن و ئەویش بەخێرهاتنی گەرمی لێکردن و پێی ڕاگەیاندن.

– ئەوەی منی دەوێ مەرجی لەسەرە (هەر کەس ئەو دوو مەرجە بهێنێتەدی ئەوا دەبێتە هاوسەری من‌و زاوای خواجە بەهمەنی هەورامان) ئەوەی ئەو دوومەرجەی تیا هاتەدی نەك من هەر کەسێك کە بیەوێ شووی پێدەکات.

داخوازیکارەکان لەناو خۆیاندا کەوتنە مقۆ مقۆ وەك بیانەوێ بزانن ئەو دوو مەرجە چین، بەڵام هیچێکیان نەیان وێرا بیڵێن کە: لە نازەنین شتێکیان دەوێ‌و پێیان ناوترێ، نازەنین زانی زاتی ئەوەیان نییە لە بەرامبەریدا دەم بکەنەوە وتی:

– ئەوەی بە نیازی داخوازی من هاتووەتە پێشەوە، با بۆم بڕوانێ من ئەوەم کە دەمبینن، ناوم (نازەنین)ە کچی خواجە بەهمەنم ئەوەتام لەبەرچاوتان راوەستاوم، ئەوەی بە خۆیدا رادەپەڕموێ ببێتە هاوسەرم با لەبەر چاو دەگا دەریخات، کە کەسێکی لێهاتووە، هەر ئێستا دەڕوا لە حەوشەی پەرستگاکەماندا لە قەراغ حەوزەکەدا رادەوەستێ‌و چاوەڕوان دەبێ تا خۆم دێم لەوێ تاقی دەکەمەوەو بەسەر دەستی خەڵکی دەگادا دەبم بە هاوسەری.

نازەنین وای وت‌و زەردەخەنەیەکی جاویدانی بەسەریاندا پەخشکردو چووە ژوورەوە.

وتەکانی نازەنین هەرچەند سادە بوون هیچ پێچ و پەنایەکیان تیا نەبوو لەگەڵ ئەوەشدا سامێکی وایان خستە دڵ داخوازیکارانەوە هەر لەوێ خەریك بوو زۆربەیان وازبێنن‌و بەرەودوا بگەڕێنەوە، لەناو خۆیاندا دەیانوت: خۆ نامان خنکێنێ دەڕۆین دەیبینین، ئەوانەیان کە سامیان زۆر لێ نیشتبوو پەشیمان بوون دەیانووت:

– ژنی وا بەکەڵکی ئێمە نایەت!.. دەتوت حاکمی تەتەرەو بۆ لەشکرەکەی وتار دەدات،

هێشا له ڕیزی ئەو داخوازیکارانەدا که خۆیان بۆ هاوسەری نازەنین ئامادە کربوو ڕانەوەستا، بەڵام وەك بینەرو گوێگرێك له کەنارێکدا خۆی پەنادابوو، تا بزانێ نازەنین چی به داخوازیکارانی دەڵێ‌و چۆن مەرجەکانیان پێڕادەگەیەنێ، ئەمه گوێی لیبوو نازەنین پێیانی وت: که هەموو له حەوشەکەی پەرستگاکەدا ئامادە بن، تا خۆی دەگاتە ئەوێ‌و مەرجەکانی دەبیستن، هێشا به پەله خۆی گەیاندە سیمیار، ئەو کاتە تازە سێبەری ئێوارانی شاخەکانی ڕۆژئاوای دەگا شۆڕ دەبووەوە سیمیاریش تازە به مەڕو بزن‌و ئاژەڵەکانیەوە بەرەو ماڵ گەڕابووەوە، که چاوی به هێشا کەوت پێکەو چوونە ژوورەکەی خۆی‌و دوای ماوەیەك هێشا هاتە دەرەوەو بەرەو حەوشەی پەرستگاکە به پەلەو هەنگاوی پڕ به متمانەوە ڕویشت‌و لەگەڵ ئەوانەدا که داخوازیکار بوون ڕاوەستا...

خەڵکی دەگا زوو مەڕو ماڵاتەکانیان ساتۆر کردن‌و دەسه دەسه ڕژانە حەوشەو دەوروبەری پەرستگاکە، حەوشەی مزگەوت‌و سەربانی ئەو ماڵانە که بەسەریا دەیانڕوانی وەك تەماشای زەماوەند بکەن وەها پڕ بوون‌و ژن‌و پیاوو منداڵ تەمووڕەیان داو چاوەڕوانی نازەنینیان دەکرد بێت‌و مەرجی شووکردنەکەی به ئامادەبووان‌و داخوازیکاران‌و موغامی دەگاو پیاوماقوڵان ڕابگەیەنێ...

هێشا لەناو خەڵکی دەگادا هاتە دەرەوەو چوو له ڕیزی داخوایکاراندا ڕاوەستا، ئەو له دەگادا ناوی به چاکەو کارمەندو ئازا دەرکردبوو، ئەو تازە له جێی باوکی بەسەر قەتارچییەکانی ماڵی خواجە بەهمەن دانرابوو، بۆیە هاتنە دەرەوەی لەناو خەڵکی دەگاداو ڕاوەستانی لەناو ڕیزی داخوازیکاراندا خەڵکەکەی شڵەژاندو دەنگدانەوەو هەراو زەنایەکی لەناو خەڵکەکە نایەوە... ئەوانەی که حەزیان وابوو نازەنین لەناو خۆیاندا بمینێتەوەو دەرنەچێ گەڵ بەو خۆهەڵبژاردنەی هێشا دڵشاد بوون، ئەوانەش ئەو کارەیان هەروا به بەزمێکی

نەبیسراوو نەبینراو دەزانی، هەموو ڕووداوەکەیان بەو ڕەفتارەی هێشاشەوە بە هەوەسێکی ژنانەو هەرزەکارانەی نازەنینیان دەزانی، ئەوانە گاڵتەیان بە هێشا دەهات لایان وابوو لە خۆخراپ کردن بەولاوە شتێکی تری بۆ نامینێتەوە، دەنا ئەو لە کوێ‌و نازەنین لە کوێ! هەندێکیشیان ئاوەزوودار بوون تێدەگەیشتن‌و دەیانوت:

– نازەنین شوو بە دوو مەرج دەکات ئەویش‌و خەڵکی تریش مافی ئەوەیان هەیە خۆیان لەو دوو مەرجە بدەن. هەندێکی تریش بە ئاشکرا ئافەرینیان بۆ هێشا دەناردکە بە ئازاینە خۆی لەو کارە وەشاندۆتەوەو شانی لەشانی ئەو شازادەو بەگزادانە داوە.

هێشتا زەردەپەڕ لووتکەکانی ئەوبەری دەگای بەرنەدابوو، خواجە بەهمەن‌و هەنارخان‌و پیاوە ناودارەکانی دەگا لەگەڵ دەست‌و پەیوەندی ماڵی خواجەدا لە ماڵ وەدەرکەوتن، بە شوێنیاندا نازەنین‌و هەندی کەنیزەکیش بەرەو پەرستگا هاتن موغانەکەی پەرستگا لەو بەزمە سەری سووڕمابوو، شتی وای لە پێشینانی خۆیەوە وەك نەریتێك پێڕا نەگەیشتبوو، لەبەر خۆیەوە هەر لێوی دەکرۆژتەوە، لەوە دەترسا ئەو بەزمەی نازەنین هەندێ شتی تیابێ لە ڕکێفی ئایین دەرباز بێ‌و سبەی لەکەیەك بۆ ئەو دروست بکات‌و جێی پێ لەق بکات.

ئەو وای پێ پەسند بوو، نازەنین شوو بە یەکێك لەو داخوازیکارانە بکات کە لە هەموویان دەستەڵاتدارترو خاوەن سامان‌و کۆشك‌و تەلارە، بۆ ئەوەی بە مارە بڕینەکەی دیاری‌و بەخششی چاك‌و چەور وەربگرێ‌و دەستێ جلی پوختەی بە خەڵات بدرێتێ، بەڵام لە ترسی هەنارخان‌و خواجە نەیدەوێرا نقە بکات، خۆ ئەگەر ئەو بەزمە نازەنین بەرپای نەکردایەو یەکێکی تر بوایە بە گومڕاو خوانەپەرست تۆمەتباری دەکرد، کە دی هێشا چووە ڕیزی داخوازیکارانەوە ئەوەندەی تر ڕکی

هەڵستاو لە دەسکەوتو خەلاَتو بەرات نائومێد بوو، لە دڵەوە دەیوت: ئەگەر ئەوە بیاتەوە دەبێ چ خەلاَتو بەراتێکی لێبووەشێتەوە، تۆ وەرە دیار کابرای رووتەڵە، تۆ لە کوێو نازەنین لە کوێ! گرەو دەکەم نازەنین بە خزمەتکاری خۆی نایگرێت، موغانەکە لەبەر خۆیەوە وای دەوت ...

کە (ژیرلەی مەڕێ) زانی هێشا وەك داخوازیکارێك چووەتە پێشەوەو لەریزی ئەولنی تردا راوەستاوە لە خۆشیدا خەریك بوو وەك پەپوولەیەکی پیری پەککەوتە سەر لەنوێ لە قۆزاخە بێتەوەو هەڵفڕێ، درنی بە خەڵکەکە داو هاتە پێشەوەو خۆی گەیاندە ناو حەوشەکە بەرامبەر بە هێشا راوەستاو نووکی گۆچانەکەی لە زەوی چەقاندو خۆی بەسەر چەمەکەیدا داو وتی:

– هەی بە قوربانی ئەو دایکە بم مەمکی خستە ناو دەمتەوە، ئەی تاقە کوڕی ناو دەگا...

نازەنین کە پێی وترا هێشا خۆی هەڵبژاردوە بە ئاسایی زانیو لە دڵەوە گەشایەوە بەلاَم نەیهێشت کاریگەری خۆشی ئەو خۆهەڵبژاردنە لەسە ردەمو چاویو دیمەنی دەرەوەیدا ئاوەژوو بێتەوە، کە گەیشتە بەرەوە چاوێکی بە خۆهەڵبژاردەکاندا گێڕاو لە ئاستی هێشادا زەردەخەنەیەکی ئاستەمی پەخش کرد، بەرێزو نەزاکەتەوە مۆڵەتی لە دایكو باوکیو مۆغانەکەو ئامادەبووان خواست کە مەرجەکان بۆ داخوازیکاران ئاشکرا بکات...

هەموو خەڵکەکە بێدەنگ بوون بۆ ئەوەی گوێیان لێبێ داخۆ مەرجەکانی نازەنین چین؟

– کێی تر ماوە ئامادە بێ من بکات بە هاوسەری خۆی، بێت خۆی تاقی بکاتەوە...

گەلێ لاوی تر هەبوون حەزیان دەکرد بچنە ناو ئەو ئەزموونەوە بەلام خۆیان بە هاوشانی نازەنین نەدەزانی، شەرمی خواجەو هەنارخان دایگرتن. وایان دەزانی بەو کارەیان پلەو پایەی مالّی خواجە بەهەمەن دێتە خوارەوە...ترسی ئەوەشیاز هەبوو بکەونە بەر گالتەجاڕی خەلکەوە، ئیتر جگە لەوانە کە هاتبوون‌و جگە لە هێشا کەسی تر پەڕی نەکێشا بچێتە پێشەوە...

نازەنین وتی:

– ئەوەی منی دەوێ دەبێ پیاوەتی‌و ئازایەتی خۆی بۆم دەربخات، مەرجی یەکەمم ئەوەیە لەم ساتەوە تا بەیانی رۆژهەلات، ئەو کەسە خۆی بخاتە ناو ئاوی ئەم حەزەوە، جگە لەسەری نابێ هیچ شتێکی لە دەرەوە بێ... ئەوە مەرجی یەکەمە هی دووەم وەختێ بەو کەسە دەوترێ کە لە یەکەمدا سەرکەوێت...وای وت‌و خەلکەکە هەموو لەناو خۆیاندا بوو بە مشتومڕیان‌و بە مەرجێکی سەخت‌و لە رادەبەدەری توانای مرۆڤیان زانی ئەوانەی کە لەوێ بوون دەستیان بەناوی ئاوی حەوزەکەدا دەکردو دەستییان دەتەزی‌و زوو دەکشانەوەو دەیانوت:

– جا یەکێك لەناو ئەم حەوزەدا لەناوی کەندووی داریشدا بێ تا بەیانی دەمینێ! تا مەرجەکەی تر بهێنێتەدی؟!

ئەمە مەرجی یەکەم بوو وایە! داخۆ مەرجی دووەم چۆن چۆنی بێ؟

داخوازیکاران گەلێ لە خۆیان‌و لە مەرجەکە تووڕە بوون، بەخۆیان دەوت: ئەگەر ئێمە شێت نەبین ژنی بسك درێژو هەلاوە لەبەر نەبڕاوە... هاوڵریان دەکردو دەیانوت:

– ئەی مەرجی دووەم؟

هۆزا بەناوی نازەنینەوە وەلامی دانەوە:

- نازەنین خان دەڵێ مەرجی دووەم دوای دەرباز بوون لە مەرجی یەکەم ئاشکرا دەکرێ....

ماڵی خواجە چۆن هاتبوون وەها بەرەو ماڵەوە گەڕانەوە... هەندێ مێردمنداڵو هەرزەکار دەیانویست لاقی خۆیان لەناو حەوزەکەدا نقووم بکەن، بۆ ئەوەی بزانن تا چ ماوەیەك دەتوانن خۆیان لەناویدا رابگرن، بەڵام موغانەکە نەیهێشت، وا بکەنو حەوشەی پەرستگا بکەنە شوێن گاڵتەوگەپ بەرپا کردن ..

خەڵکەکە هەموویان بڵاوەیان لێکرد، بەڵام هێشا لەوێ مایەوە، کە هەندێ چۆڵ بوو خۆی رووت کردەوەو لەتۆی دەرپێکەیدا خۆی هاویشتە ناو حەوزەکەو لەناوەراستیدا راوەستا، لە بینەقاقای بە خوارەوە لەناو حەوزەکەدا خۆی نقووم کرد...

هەواڵەکە بەناو دەگادا بروسکەی داو بڵاوبووەوە کە هێشا خۆی لە مەرجەکە داوەو خۆی خستۆتە ناو حەوزەکەوە...

کە نازەنین ئەوەی زانی وەك دڵنیا بێ لەوەی کە هێشا مەرجەکە دەباتەوە، زوو چەند کەسانێکی راسپارد کە وەك گۆڤاو شایەت ببنە ئێشکچی هێشاو نەهێڵن گەڕ لە مەرجەکە بکاتو تا بەیانی لە حەوزەکە بێتە دەرەوە، یەکێك لە داخوازیکارەکان کە کوڕە دەهقانێکی (سەرپێڵی) بوو سەرکەشو بەخۆدا پەرموو بوو گەڕایەوە، کە دی هێشا لەناو حەوزەکە دایە، موغانەکە سەیری دەکا، خۆی رووت کردەوەو چووە ناو حەوزەکە، چەند ساتێکی کەمی نەخایاند، خۆی نەگرتو بە لەرزە لەرز هاتە دەرەوە، بۆ ئەوەی بەسەر خۆیدا نەشکێتەوە رووی کردە موغانەکەو ئەوانەی کە بۆ سەیر کردنی ئەو دووانە راوەستابوونو وتی:

- تا زووە گۆڕێك بۆ ئەو كوڕە لێدەن، ئەگەر تا ساتێكی تر ماو لاشەكەی نەكەوتەوە سەر ئاو وەرن هەر چوار پەلی من لە بنەوە ببڕن، ئاوی ئەم حەوزە ئاو نییەو تیغی ژەهراوییە،

بۆ سەیر كردنی هێشا دووبارە خەڵكێكی زۆر خر بوونەوە، هەموو پێیان وابوو ئاگاتە نیوەشەو رەق دەبێتەوەو دەبێتە پەندی خزمو خوێشان...

كەچی (ژیرڵەی مەڕێ) پێی وابوو ئەگەر بشمرێ دەبێتە لووتكەیەكی بڵندی شاخەكانی هەورامان، كەس‌و كاری زۆر لێی پاڕانەوە كە خۆی لەو هەڵدێرەی مردنە نەدا، ئەوان لێی دەپاڕانەوەو ئەویش هەردوو دەستی دەخستە سەر چاوانی‌و بە دڵێكی پڕ متمانەوە زەردەخەنەی بۆ دایك‌و باوكی دەكردو بە ئاماژە پێی دەوتن كە بڕۆنەوەو خەمیان نەبێ...

بەر لەوەی تاریك دابێ سیمیار هات‌و لە قەراغ حەوزەكەدا چپەیەكی بە گوێی هێشادا كردو رۆیشت، جگە لە هێشا كەس لە هاتنەكەی‌و لە رۆیشتنەكەی‌و چپەكەی حاڵی نەبوو...

بەبێ ئەوەی كەس بزانێ سیمیار بەرەو شاخەكەی ئەوبەر رۆیشت‌و لە دوورەوە، لەو قەدپاڵەیدا ئاگرێكی كردەوەو تابەیانی نەیهێشت بكوژێتەوە، دیاربوو بە هێشای وتبوو، مەترسە سەیری ئاگری ئەو لاپاڵە بكەو حەقت نەبێ...!.

موغانەكە لەو بەزمە سەری كاس ببوو، خەوی لێ زڕابوو ، جارویار دەهاتە دەرەوەو قسەی لەگەڵ ئێشكگرەكانی هێشا دەكردو پێی دەوتن هەركات كەوتە سەر ئاوەكە خەبەری بدەنێ، لە حەوزەكە نزیك دەبۆوەو رووی دەكردە هێشاو پێی دەوت:

- كورە ! ماوی؟

ئەویش لەسەرخۆ بە ئاسایی پێی دەوت:

- بەڵێ ماوم...خوا یار بێ هەردەمێنم..

ئەو مۆغانە پێی وابوو مردنی هێشا بێگومانە، بۆ ئەوەی بەیانی خەڵك بناشتی نەکەن، هەم بە نیازی ساردکردنەوەشی پێی وت:

_ کوڕم ئەوە شێت بووی وا بەخۆت دەکەی...؟!

لە ترس ئێشکگرەکان نەبوایە کە دەترسا بۆ نازەنینی بگێڕنەوە پێشی دەوت: بە قسەی ژنان هەڵخەلەتاوی، ژن کەی خاوەن قسەو پەیمانی خۆیان بوون)!....

ئەو شەوە دەگا وەك جاران خامۆش نەبوو خەڵکەکە لە خەم هێشادا خەو لە چاویان تۆرابوو، ماڵی باوکی وەك پوورەی هەنگ وابوو، دڵی باوكو دایکیان نەدایەوەو سات دوای سات خەبەریان وەردەگرت کە هێشا لە ناوەڕاستی حەوزەکە دایەو هیچی بەسەردا نەهاتووە..

(نۆشا) گویا بۆ دڵدانەوەی باوکی هێشا وەك ئەو هەموو خەڵکە چوو بۆ ماڵیان، هێشتا پاڵی نەدابووەوە وتی:

- بەهرۆز وامدەزانی پیاوێکی ژیری! ئەوە تۆ کوڕی خۆت دۆزیوەتەوە، یان دەتەوێ لە کۆڵت بێتەوە، کوڕە هەڵسە بڕۆ پەلی ڕاکێشە، تا نەمردووە، لە مردن ڕزگاری بکە..

بەهرۆز هاتنەکەی نۆشادی بە نەگبەتی زانی، ئەو چاکی دەناسی، چونکە مێشکی گەنیو بوو، زمانی جگە لە ژەهر بەولاوە شتێکی تری نەدەپڕژاند، بۆیە وایدەزانی قسەکانی ریخی رەشەولاغن‌و بە روومەتیدا نەدرێن، بۆیە تا ئەو دوا بێدەنگ بوو، ئەوانەش کە لەوێ بوون لە دڵەوە تفو لە پشتەوە چەمووڵەو پووکەلاویان بۆ ئاراستە دەکرد، دەیانزانی ئەو قسانەی لە دڵسۆزییەوە نییە،

بەڵکو لەوە دەترسا هێشا مەرجەکە بباتەوەو ببێ بە زاوای خواجەو هەنارخان ئەو کاتەش بچێتە سەر سامانی خواجە...

دایکی هێشا بە وتەکانی نۆشا گەلێ دڵی خۆش بوو، چونکە هاتە سەر ئەو بڕوایە کە ئەو کابرا بەدە هەستی کردووە هێشا سەردەکەوێ، بۆیە هاتووە هەوڵبدا بەڵکو لەنیوەی ڕێگادا ساردی بکاتەوە، کە کاتێ ڕۆیشت هەموو ئامادەبووان نەفرەتی ئەهریمەنیان بۆ ئەو ڕەوانە دەکرد.....

ئەو ئێوارە ماڵی خواجە کش‌ومات بوو کەس پرسیاری لەبارەی مەرجەکەوە نەدەکرد هەموو حەپەسابوون خواجەو هەنارخان دایان نابوو خۆیان لەو بوگارەی نازەنین بێدەنگ بکەن‌و چاوەڕوان بن سەری لە چییەوە دەردەچێ! لەگەڵ ئەوەشدا بە چەند نۆکەرێکیان راسپاردبوو کە سات نا سات هەواڵی مان‌و نەمانی هێشایان پێڕابگەیەنن.

لەگەڵ کازیوەی بەیانیدا خەڵکەکە ڕوویان کردە حەوشەی پەرستگاکەو لە موغان‌و ئێشکگرەکان هەواڵی مان‌و نەمانی هێشایان دەپرسی، بڕوایان نەدەکرد کە ماوە.... تا خۆیان لێیان دەپرسی:

– ئەرێ هێشا ماوی؟

– بەڵێ ماوم! ...

هێشا لە ڕوانیندا چاوی لە تروسکەی ئاگرەکەی ئەوبەر کلا نەدەکرد... هەندێ کەس هەستیان بەوە کردبوو کە ڕەق نەبوونەوەی هێشا دەگەڕێتەوە بۆ تروسکەی ئەو ئاگرە کە لە دوورەوە گەرمای بۆ دەنێرێ!.

هەندێکیش دەیانووت! ئەوەی خۆشەویستی ڕاستی لە دڵیدا جێگیر بووبێ، لەناو سەهۆڵبەندانیشدا ڕەق نابێتەوە..

ئەو ڕایەی کە دەیوت دەستێکی نهێنی هەیە هێشای ڕزگار کردبێت سێبەری بۆ هەموو ڕاکان کردبوو..

(نۆشا) کە زانی هێشا ماوەو نەمردووە لە حەشمەتدا خەریك بوو لەناو گۆمی ئەو کینەی خۆیدا بخنکێ‌و دنیای لێهاتەوە یەك، وەك زەردەواڵەی قانگدراو لە مال دەرپەڕی‌و چووە دەرەوە، کەدی هەموو خەڵکەکە هێشایان لابووە بە پاڵەوانێکی سەرکەوتوو، هەوڵیدا گومانێك بۆ ئەو سەرکەوتنە بدۆزێتەوە، کە تووشی هەر کەسێ دەبوو لەو بارەوە لێی دەپرسی، ئەوەی بیوتایە هێشا مەرجەکەی بردەوە یەکسەر بە روویدا دەتەقیەوەو دەیوت:

– ئەوە تۆش ئەوەندەی لێدەزانی، کوڕە هەمووی فرت‌و فێڵە، یەکێك کەم هۆشی تێبێ بڕوا ناکات... نا... نا... نەکەیت بەو قسانە بڕوا بکەیت گەلێ خۆی ماندوو کرد، بەڵام هەرچەندی کرد پێی نەکرا بەو چنگە ژاوە ژاوە قوڕاوییەی بەری ئەو هەنگاوەی راستییە بگرێ.

تا تیشکی خورەتاو ئەڕژایە ناو حەوشەکەی پەرستگاو وردە شەپۆلی حەوزەکەی رانەچڵەکاند، هێشا لەناو حەوزەکە نەهاتە دەرەوە.

کەس‌و کاری هێشاو ئێشکگرەکان بەر لەوەی هێشا بێتە دەرەوە لەبەر ماڵانی حەوشەکەی پەرستگاکەدا جێیان بۆ راخست‌و ئاگرێکی بەتینیان بەداری وشکی بەڕوو گوێزی زەنگەقلێش کردەوە، بە گۆڤای مۆغان‌و پیاوە دیندارەکانی مزگی هێشایان لە حەوزەکە هێنایە دەرەوە، زوو وشکیان کردەوەو دەستێ جلی گەرمیان لەبەر کردوو، لە ماڵی خوادادەوە شیری مەڕو چێشتی داندۆکیان بۆ هاورد.

کە لەبەر ئاگرەکەدا رایان کێشاو شیرو چێشتەکەیان دەرخوارد دا، ئەو تەزینەی کە لە لاق‌و دەستەکانیدا هەستی پێدەکرد دوای کەمێك نەمان‌و وەك

خۆیان لێهاتەوە، پەنجەکانی هەردوو دەستیو هەردوو پێی دوای ماوەیەك خوێنیان تێچووەوەو بەڵام نەیدەتوانی بیانجولێنێ....

بەناو دەگادا بلاوبووەوە کە هێشا هیچی لێنەهاتووەو لە گوێزی کوێر ساغترە....

خەلکەکە بە شاییو زەمزەمەوە هێشایان گەیاندەوە ماڵی خۆیان، ئەوەی خزمی نزیكو دۆستو برادەری هێشا بوون،لە سەر سەری راوەستان ئەو رۆژە خەڵك درەنگ چوونە سەر کار، دەستە دەستە دەچوونە لای هێشاو پیرۆزبایی ئەو سەرکەوتنەیان لێدەکرد، ئەویش بە دایکی وتبوو: ئەوەی دێتە لای پێیان بڵێ لەبارەی نازەنینو ماڵی خواجە بەهمەنەوە نقە نەکەن، باسی بردنەوەی مەرجەکە نەکەنە سەر باسی هاتنەکەیان.

لەبەر هێشا ئەو رۆژە سیمیاریش لەگەڵ مەڕو بزنەکانیدا نەرۆیشتە ناو پەرێزو پاوانەکان. بەڵکو خواداد لەجیاتی سیمیار کەوتە پێش ئاژەڵەکانیانەوە، وەسە دەقیان پێوە گرتبێ بە گوێیاندا خوێنرابێ وەها کەوتنە شوێن خوادادو بەرەو لەوەڕگاکەیان کۆڕیان بەستبوو یەکێك لە نەوەکانی بزنە (ژیوا) نەبێ یەك دوو جار باڕاندی ..

خواداد دەیزانی ئەو بزنە بێتاقەتی سیمیار دەکات بۆیە وا بە کوڵ دەبارێنێ، بە ئاستەم لە پشتی داو وتی خەمت نەبێ، پاش نیوەڕۆ دێت شمشاڵت بۆ دەژەنێ .. سیمیار چووە لای هێشاو ئەملاو ئەولای ماچ کردو هەندێ وردە نزای بەسەردا خوێند، ئەو لای کەس نەی وتبوو کە پەنجەی هەردوو قاچەکانی مردوونو بۆی ناجولێن، بە ئاستەم بە گوێی سیمیاردا چپانی و لەو راستییە تێی گەیاند ئەو ڕاستیەی ئەویش تا گەیشتە سەر پەنجەکانی پێی دەستی بە سەر

ەردوو لاقیدا هێناو یەکە یەکە پەنجەکانی پێی راکێشان‌و داوای لێکرد کە یانجولێنیٚ

لەگەڵ شێلان‌و دەس هێنانەکەی سیمیاردا خوێن گەڕایەوە ناو پەنجەکانی‌و جی ئازارو دەغزێکیش لە لەشیدا هەبوو رەوینەوە، پەنجەکانی هەردوو پێی وەك خۆیان لێهاتەوە...

هێشا کە هەستی کرد ئێش لە لەشیدا نەما، هەردوو دەستی سیمیاری ماچ کردو وتی:

- پیرۆزە!...

سیمیار زەردەخەنەیەکی کردو وتی:

- لە خۆت پیرۆزە...

داخوازیکاران هەر ئەو بەیانییە کە زانیان هێشا نەمردووەو ماوە، سەریان سوڕمابوو، نەیاندەزانی چی بە خۆیان بڵێن‌و چۆن نەیارای خۆیان پینە بکەن، بۆ سەکەوتنەکەی هێشاش چ برو بەهانەیەکی بۆ بدۆزنەوە... هەر ئەوەندەیان پێکرا جریان پێچایەوەو بەرەو وڵاتی خۆیان گەڕانەوە... بۆ ئەوەی بە دڵشکاوی نەگەڕێنەوەو گلەیی خۆیان بەجێبێڵن، خواجە بەهمەن هەر یەکەو دیارییەکی پێبەخشین‌و تا لە دەڤەری هەورامان بە سەلامەتی دەرچن، بۆ رەوانە کردنەوەیان هەر یەك چەند زەلامێکی لەگەڵدا ناردن....

هەواڵ کە بە ماڵی خواجە درا کە هێشا نەمردووە، خەم‌و پەژارەکانی ئەو بەزمەی نازەنین ئەوەندەی تر هەناوی خواجەیان دادەپاند، چی کوێرە رێی دەرچوون لەو خەمە هەبوون بوون بە ژێر ئەو راستییەوە کە کەوتبووە ناو دەستی هێشاو بە پەنجەی هەموو خەڵکی دەگا نیشانەی پێوەنرابوو...

هێشا تا ئێستا قەتارچی ئەوان بوو، وا لە شەوو ڕۆژێکدا هەموو کەڵەپیاوانی بەزاندوو لەسەر تەختو تەلاری ئایندەی خواجە بەهەمەن دانیشتو باڵی بەسەر نازەنیندا کێشاو وەك پاشایەکی نەچووە سەر تەختی لێهاتووە..

جا وەرە خواجە لەم سەمەرەیە سەرت سووڕ نەمێنێ؟! وای بە خۆی دەوتو جاروبار بە ڕووی خۆیدا دەتەقییەوەو دەیوت:

_ چۆن دەبێ کچی خواجە شوو بە یەکێك بکات کاروانچی بێو لە ژیانیدا تێر سکی نانی ماڵێ باوکی نەخواردبێ!.. جگە لە خواجە کێ ئەو پەندەی بە خۆی داوە؟! کچێ دەسەڵات لە باوکی بسێنێو بە مەرج شوو بکات ئەوە ئەنجامەکەیەتی...

لەلایەکی تریشەوە کە لەو کارە ڕادەما و هەڵگێڕو وەرگێڕی دەکرد، دڵی خۆی ئەدایەوەو دەیوت: سەیرە ئەو کوڕە چەند ساڵە شتێکی وام لێوە نەدیوە، کە نیازی بۆ نازەنین بڕوا... ئەی ئەگەر وانییە چۆن بەو ئاسانییە خۆی خستە ناو ئەو دەمی عەزیای مەرگەوە، تۆ بڵێی لەبەر ئەو نەبێ حەزی نەکردووە نازەنین شوو بە لایدە بکات؟ واش بێ باشە...

خەڵك قسەیان لەسەر سیمیاری هورمزیار دەکرد، هەنارخانیش ئەو مەیلەی هەبوو، بەڵام ئەو نا! وەشڵەی هەر سیمیار بوایە، خۆ هیچ نەبێ هەرزەکارێکی سەنگینو بە سەوادە... خوا هەڵناگرێ خوادادی مامۆی پیاوی ناو پیاوانەو دیارەو بەشی خۆی ماڵو موڵکی هەیە...

ئا بەم جۆرە خواجە چەمچەی لە هۆشی شلەقاوی خۆی دەداو لە ئاست مەرج بردنەوەکەی هێشادا دەسەوسان ڕادەوستا، بۆ دڵدانەوەی خۆی بڕێ شتی تیا دەدۆزییەوە خۆی پێ تەفرە دەدا...

هەنارخانیش وەك خواجە، بە دەست نازەنینەوە دەستەپاچە ببوو، نەیدەزانی چی بکاتو چی بڵێت، بە هەواڵی بردنەوەی مەرجەکەی هێشا هەموو دەرەکانی خێگیرانو بەرامبەر بەو راستییە زمانی کول ببوو...

سەبارەت بەو راستییە هیچی بۆ نەمایەوە ئەو دەیزانی نازەنینی کچی لە ملەیەکدا شەن دەکات...نە ئەوان دەیگەنێ و نەپێیان قبوولێ دەکرێ...

بۆ ئەوەی پاشەرۆکی ئەو خەونو خەیاڵانەی جاران کە بۆ نازەنینی دانابوو، لە هۆشیدا هەڵیکەنێ دەیوت:

– ئەگەر سەر لێشێواندن هەبێ ئەوەی ئێمەیە، خۆ ئەگەر بە یەکێکی لایدە شووی بکردایە کچەکەمان لە دەست دەردەچوو، بە ئۆجاخ کوێری دەماینەوە... شوو بە لایدە نەکات ئەی شوو بە کێ بکات؟ دبێ شوو بە قەتارچییەکی خۆمان بکات! تۆزێ راوەستاو دەنگی هەڵبڕی....!

_ توخوا نازەنین ئەمە کار بوو کردت؟!.

نازەنین گوێی لە وڕێنەکانی دایکی بوو، کە بێدەنگ بوو لێی هاتە پێشەوەو وتی:

_ ئەو کارە شای کارانەوپیاو ئاوا دەدۆزرێتەوە..

_ پیاو هەر پیاوە...

_ نا، پیاو هەر پیاو نییە، پیاو ئەوەیە خۆی بە دەستی خۆی پێکهێنابێ، نەك قەرەمێك بێو جلیپیاوانی بە بەردا کرابێ.. خۆ بۆتان دەرکەوت پیاو چۆن نەدۆزرێتەوە؟ ! من ئەو پیاوەم دەوێ بتوانێ لە هیچەوە خۆی کردبێ بە پیاو، بە مرۆڤ...

خواجە لە دوورەوە دانیشتبوو گوێی لە قسەکانی هەنارخان بوو، هاتە پێشەوەو رووی کردە هەنارخانو وتی:

- تۆ دەڵێی پیاو هەر پیاوە... توخوا هێشا دەبەیتە ڕێزی ئەو پیاوە ناودارانەوە کە بە دڵشکاوی گەڕانەوە؟!

نازەنین بە توندی لە ڕووی باوکیدا ڕاوەستاو وتی:

- توخوا تۆ پیاوێکی دنیادیدەی؟ هێشا دەبەیتە ڕێزی ئەو پیاوانەوە کە بەرامبەر بەو هەموو ملیان کەچ کردو بە ڕێی خۆیاندا ڕۆیشتن...حەیف ! تۆ بۆ ناو دەگەڕێی وەڵێ من بە شوێن کەسێکدا دەگەڕێم کە پیاو بێ... لەگەڵماندا ژیابێ، خەڵك لە سایەیدا بژی، نەك لەسەر ئاخوڕی خەڵك بلەوەڕێ... لە خەڵکی دەگاکەت بپرسە بزانە چیت پێدەڵێن...

من هێشاو ئەوانەی وەك هێشان ناهێنمە ریزی پاشەڵ بە کەوێڵانەوە کە یەکێ سەد سەراوو دەروایان کردووەو پێیان تەڕ نەبووە، هێشاو ئەوانەی وەك ئەو بە هەوڵی خۆیان بوون بەو پیاوە، چەند ساڵە کاروان بۆ تۆ دەکات بە دەسپاکی دەڕواو بە دەسپاکی دێتەوە، توخوا ئەوە پیاوە یان ئەوانەی کە کەسانی وەك هێشا کردوونی بە پیاوو کەش‌و فش دەکەن؟

خواجە تێگەیشت نازەنین قسە بۆ کوی دەهاوێ بۆیە وتی:

- یانی ئێمە خواجەی هەورامانین خەڵك ئێمەی پێگەیاندووە؟

نازەنین بە ئەسپایی وتی:

- تاتەگیان من نەمویست وابڵێم، بەڵام وا خۆت خەریکە هەستی پێدەکەی خۆ جارێ من هێشام هەڵنەبژاردووە، هێشا مەرجێکی تری لەبەردەمدا ماوە، خۆ ئەگەر شووی پێبکەم مافی خۆیەتی، من مەرجم داناوە، جگە لەویش کەسیتر خۆی لە مەرجەکە نەداوە، کەواتە شایستەی ئەوەیە ببێ بە هاوسەرم، خۆ ئەگەر مەرجەکەی تری هێنایەدی بە گەواهی یەزدان‌و ئەو هەموو ئافەریدەی خوایە دەبێتە هاوسەرم، ئەگەر بیەوێ بەڵام جارێ خۆ هیچ ڕووی نەداوە کێ دەڵێ منی

دەوێ؟ سەرەڕای ئەوەش ئەوەت لەبەر چاو نەگرتووە کە تۆ ماڵ‌و موڵکێکی فرەت هەیە... کێ ناڵێ ئەوانە بە بیانۆی نازەنینەوە بۆ شتێکی تر نەهاتوون! وێڕای ئەوەش کێ دەڵێ خەڵکی دەگا بەوانە رازی دەبوون؟

خواجە دەیویست خۆی لە نازەنین تووڕە بکات، بەڵام وتەکانی هەندێ ساردیان کردەوە، هەر ئەوەندە هاتەدەم وتی:

_ خەڵکی دەگا پەیوەندییان بە شووکردنی کچی منەوە چییە؟

نازەنین لەسەرخۆ پێی وت:

_ من کچی خواجە بەهمەنی دەگای هەورامانم، لەم دەگایەدا گەورە بووم، کچی ئەم دەگایەم، مولکەکانی تۆش بەشێکن لەم دەگایە، سبەی رۆژ بیانییەك بێتە سەر موڵکەکان ئەو خەڵکە رازی نابن.... ئێستا لە مەبەستەکانم حاڵی بوی؟!

خواجە سەری داخست‌و هەندێ راماو وتی:

- حاڵیم... حاڵیم!...

نازەنین ویستی چاك باوکی لەم رووەوە دڵنیا بکات بۆیە درێژەی بە بابەتەکەداو وتی:

- گریمان شووم بە یەکێکی لایەە کرد ئەو کاتە وەك مێردەزمە بە دەستی خۆمان دەیخەینە سەر سینگی ئەم دەگایە، خۆ ئەگەر هاتوو شووم بە یەکێکی وەك ئەم هێشایە کرد ئەو کات چی دەبێ؟.... موڵك هی خۆم، دەگا هی خۆم، خۆم‌و مێردم هی خۆم، خەڵکیش پێش مردن‌و پاش مردنی خواجە بەهمەن هەر رەحمەتی بۆ دەنێرن، ئەو دوو شتە کامیان راستە؟! پێم ناڵێن مرۆڤی دەسکورت نەنگی لە چیاییە؟ گوایا ئەو لە قووڕی رەش دروست کراوە! ئەوەش هەیبێ لە زێڕو گەوهەر؟!

من خۆم دڵنیام ئەوەی مەرجەکەم بەجێ دێنێ ئەوە گەوهەرێکی پاڵفتەی بێ خاشاکە... یان دەتانەوێ لە خۆم پەشیمان ببمەوەو شەرمی خۆمان و دەگاکەم ببەم! فەرموو پێم بڵێن؟

خواجە بەهمەن هەر ئەوەندەی پێوترا:

- ئەمە کێ ئەم قسانەت فێر دەکا؟ خوا دەزانێ ئەهریمەنیش لێت ناباتەوە...!

هەنارخان باش گوێی بۆ قسەکانی نازەنین و باوکی راگرتبوو، بەبێ دەنگی سەیرێکی خواجە بەهمەنی کردوو بەلای نازەنیندا رووی وەرچەرخان، هێمای خۆبەدەستەوەدانی بۆ وتەکانی نازەنینداو بێدەنگ بوو...

نازەنین و دایك و باوکی هێشتا لەو بگرەو بەردەیە نەبووبوونەوە، گوڵنازی کارەکەر هاتە ژوورەوەو رووی کردە خواجەو هەنارخان و وتی:

- گەورەم... خانم! دایکی هێشا هاتووە، دەڵێ راسپاردەی هێشام پێیە، دەمەوێ بە هەنارخانی بگەیەنم، کە خواجە گوێی لەو قسەیە بوو خۆی پێنەگیراو وتی:

- وەریبگرە خواجە! دەك پیرۆزت بێ هەنارخان! لەمەولا ماڵە خەزورانی هێشایەو بمگرەو هاتم، سەوسەن هاودەمی هەنارخانەو ... بەخ تەواومان کرد...

هەنارخان بە قسەو تەشەرەکانی خواجە، نارەحەت بوو، داتەپی و شتێکی بۆ نەهات بیڵێ، لێوی خۆی کرۆژتەوەو سەری خۆی بادا...

نازەنین کە گوێی لە قسەکانی باوکی بوو، لە باوکی چووە پێشەوەو پێی وت:

_ تاتە! ئانە چێش ماچی؟!

خواجە وەك تەریق بێتەوە، دەنگی نەکرد، نازەنین لەسەر قسەکانی خۆی رۆیشت و وتی:

_ خۆ ئەگەر سەوسەن بە دەس‌و دیارییەکی قورسەوە بهاتبایە دەتانوت فەرموو! وایە؟

خواجە بەهمەن بە تەوسەوە وتی:

_ ئێستاش بە دیارییەوە هاتووە، هێشای هێناوە، زاوایە؟!...

نازەنین ویستی شتێکی تر بە باوکی بڵێ بەڵام سەوسەن بەبێ پرس هاتە ژوورەوە، لەسەرخۆ شانشینییەکی لێکردن...

نازەنین بە ڕووێکی گەشەوە وەڵامی دایەوە.. کەچی خواجەو هەنارخان دەمیان وەک تەڵەی تەقیوی لێهات....

سەوسەن ئافرەتێکی قسەزان‌و لەروو بوو بە دەمێکی پاراوو ڕووێکی گەشەوە ڕووی کردە خواجەو هەنارخان‌و وتی:

_ هێشا منی نارد، وتی بە خواجەو هەنارخان بڵێ: من هەر قەتارچییەکەی جارانم... ئەوەم بۆیە کردووە تا خەڵکی نەڵێن لە دەگای هەوراماندا پیاو کەم هەڵکەوتووە تا بۆ خەڵکی دەرکەوێ خواجە بەهمەن نۆکەری وەهای هەیە... نازەنین خان بە چارەنووسی خۆیەوە بەستراوە، تا ماوە گەورەو سەروەری دەگایە..

سەوسەن وای وت‌و بە نەزاکەتەوە پایدۆستی لێکردو بەرەو دوا گەڕایەوە..

خواجە بەهمەن‌و هەنارخان سەیری یەکتریان دەکردو تێنەدەگەیشتن مەبەستی هێشا لەو پەیغامە چی بوو؟!... نازەنین ڕووی کردە هەردووکیان‌و وتی:

_ گوێتان لێبوو؟ ئەوەیە دایك‌و ئەوەیە کوڕی مەردو ئازا!!..

خۆ ئەگەر یەکێك لەوانە کە هاتبوون لە جێی هێشادا بوایە، مەرجەکەی بە دەست بوایە ئەمڕۆ لەبەرچاو ئێوەو خەڵکی دەگاوە منیان پەلکێش دەکردو

سواری پاشکۆی خۆیان دەکردمو دەیانڕفاندم، ئێوەش دەبوایە هەر لە چۆکی خۆتان بدەن.. وایە؟

خواجەو هەنارخان ورتە لە دەمیانەوە دەرنەهات ئەوەندە نەبێ دوای ماوەیەك بێدەنگی خواجە وتی:

_ تێنەگەیشتم! ئەو ژنە چی وتو بۆچی هاتبوو؟!

نازەنین بە شێوەی سەرزەنشت پێی وت:

- تاتە گیان خوا ینت هەبێ تێدەگەی... لەمەولا تێدەگەی !...

## ( ٥ )

دەگای هەورامان وەك جاران نەمابوو جاران دەگایەكی داخراوی نەبزوت و مەند حوی وەك ماستی مەییوی مەڕ لەرەی نەدەهات، كارو كاسبییەكان دەقیان بە خۆیانەوە گرتبوو، نەدەگۆڕان...

خەڵكەكەش نەیاندەجولاندن، چۆن لە پێشیانەوە هاتبوون وا بۆ نەوەی نوێ حگوێزرانەوە، ئەوەی فێری هەر پیشەیەك دەبوو چۆن بووە هەروەها فێری دەبوو، ئیتر شتێكی نوێی نەدەخرایە سەری، هەر تیرەیەك بە جۆرە پیشەیەكەوە حەتاسران و خەریك دەبوون، هەر كەس وەك مێرولەی دەقدراو بەدەم كاری خۆیەوە دەچوو، سامەگەر ناچاری یا پێویستیەكی گرنگ یەكێكی وا لێبكردایە دەس لە كاری یەكێكی تر بدات، دەنا كەس لاقەی بەكەسەوە نەبوو، هەموو دارا و خاوەن را و جابوون رۆژەكانی تەمەنیان بە كارو رۆزی پەیدا كردنەوە پڕ دەكردنەوە، هەموو كاتیان كاسەی پڕ لە هەرمان بوو، ئەوانەیان كە لەناو باخ و كێڵگەكان یان لەگەڵ ئاژەڵ و چوون هەوارو ماڵداری و تەشی ڕێسان و تەون و جۆلایی و جاجم تانەوەو كارو پیشەكانی ترەوە خەریك بوون هەر فریای ئەو كارانە دەكەوتن كە دەبوو ئەنجامیان بدەن، ئیتر كاتێكی تر نەدەمایەوە گلی بدەنەوە بۆ رازو نیازو تاڵوو گۆڕی بیرسازی و میشك چاخكردنەوە، بە تایبەتی لە وەرزی بەهارو هاویندا، كەس پێی نەدەكرا سەری خۆیشی بكلاشێ....

دیوەخانی خواجە بەهەمەنیش لەو وەرزانەدا دەبوو بە ئاسیاوی ئاوکەوتە... لە زستانیشدا هەر خێزانەو لە ماڵ خۆیدا بە تەسەلی پاڵی بە دەرامەتی هاوردەی رەنجی وەرزەکانی ترەوە دەداو لەبەر ئاگردانی گەرمدا دەستی ماندوویان لەسەر سکی تێر دادەنا...

داستان‌و ئەفسانەو بەیازو رازەکانیان ساڵەهای ساڵ وەك خۆیان دەهێشتنەوەو لە پاڵ شەوچەرەی شەوانی کپ‌و ماتی زستاندا دەپاراست‌و لەو کاتەدا دەیانهێنا پێشەوەو کۆڕی بەرئاگردانیان پێ گەرمتر دەکرد، ئیتر ساڵەهای ساڵ ئەوە تیلمەی ژیان بوو، ژیانێکی مەست‌و راوەستاو، ئیدی شتێکی وا رووی نەدەدا، کە لەناو هۆش‌و مێشکیاندا رێ بەوەی رابردوو لەق بکات‌و جێی خۆی بکاتەوەو ببێتە یادەوەرییەکی وەها لەبیر نەچێتەوەوتا بیخەنە سەر دیرۆکەکانی ترو کۆڕی شەوانی پێ چاخ بکەنەوە...

بەڵام رۆژی جاڕدانی مەرجەکەی نازەنین‌و هاتنی ئەو هەموو سەردارو بەگزادەو ئاغایەو گەڕانەوەیان بە نائومێدی، رووداوێك بوو دەگای لە ناخەوە هەژاندبوو، ساڵ گەڕایەوەو گۆرانبێژەکان ئاوازی جوان‌و گۆرانی تازە بابەتیان لێهەڵدەهێنجا، ژنانی دنیادیدەو بەیازخوانیش لەناو چیرۆکەکانیاندا یادەوەری ئەو رۆژەیان تۆمار کردو نازەنینیان کردە شای سەوسەن خاڵان، لە چەمکێکی بەیازەکانیشدا هێشا پاڵەوانی دەگای هەورامان بوو...

ئیتر لەو ساڵەوە گۆرانبێژەکان شتی تازەبابەتیان هێنایە ناو ئاوازو وشەکانیانەوەو شتی نوێ فێر بوون، هەرزەکارەکان کلاوی قیتیان لەسەر دەناو دەسماڵی ئاوریشمینیان لە مل دەئاڵاندو فەرەنجی پەراوێزداری رەنگاو رەنگیان لەبەر دەرکرد، هەندێکیان یەك قۆڵیان تیا هەڵدەکێشاو بە فیزەوە خۆیان بادەدا، لەسەر بانە بەرزەکانەوە قوتەیان دەکردو کلاویان لار دەناو بە وردە گۆرانی

هەرزەکارانە سۆزیان دەکرد، لە هەندێ شوێنیشدا چەند هەرزەکارێك گلێر حبوونەوەو قاچیان بەسەر پاسەوانەی خانووەکاندا شۆڕ دەکردەوە، یان لە سەر کەنەکێکی سەر رێی کانی ژناندا دادەنیشتن‌و دەسیان دەنایە بن گوێیان‌و چەندچرینی‌گۆرانی بەکۆمەڵیان لەسەر بەزمی ( کاڵە بەی) بۆ یەکتری حسەندەوە...

لەو ساڵەوە دەگا جۆرە گۆڕاندنێکی بەسەردا هاتبوو، لەناو خێرو خۆشیدا مەست ببوو، ئەڤینداری باڵی بەسەر هەمووواندا کێشابوو، نازەنین لە جیاتی هوکی‌و دایکی سەرداری دەگا بوو، هەموو خۆشیان دەویست لە کاتی کارو فرماندا سەری لێدەدان، بۆ شەونشینی ئێواران سەری لێدەدان‌و خۆشی‌و کامەرانی دەخستە ناو دڵیانەوە... نازو فیزی بەسەردا نەدەکردن، هەمووی وەك یەك تەماشا دەکردن، گوێی لە گۆرانبێژو شمشاڵ ژەنەکان دەگرت، ببوو بە مایەی شانازی‌و سەرفرازی خەڵکی دەگا...

مەسەلەی مەرج‌و شووکردنەکەی پەردەپۆش کردبوو، نە ئەو دەیهێشت باسی شووکردنەکەی بکرێ نە هێشاش بە خەیاڵیدا دەهات کە مەرجەکەی ئەوی هێنابووەدی، نەکەس‌و کاریشی باسی وایان دەکرد، بۆنی ئەوەی لێوەبێ!.

سەیر بوو هێشا وەك جاران کاروان‌و کەڵەك بۆ ماڵی خواجە دەکات‌و هیچ نەگۆڕدراوە، ئەوانیش هەر وەك جاران تەماشایان دەکرد...

لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکەکە لەوە دڵنیا بوون کە بەزمی مەرجەکەو نەبەردی هێشا پایەو ساییەکی بڵندیان بۆ دەگای هەورامان رەخساند... رووی هەموو دەڤەرەکانی تری دەورەبەری بەلای خۆیدا وەرچەرخاند.. دووری بۆ مەرۆ ئەو دەڤەرانە چەندان رازو بەیازی دڵداری‌و ئەڤینیان بەسەر شای سەوسەن خاڵاندا

(نازەنین) هەلبەستبێ، جگە لە خۆی‌و هێشا کەس سەری لەو مەسەلەیە بەرنەدەچوو...

موغانی دەگا کەوا ئەجیای لێدەکرا.. کە نهێنی نییە، لە دەستیدا هەڵنەیە، گرێ نییە بە ئاماژەی یەك پەنجەی ئەو خاو نەبێتەوە، کەچی ئەو لە خەڵکەکە فرەتر سەری لەو گرێکوێرەیە دەرنەدەچوو، هەر جۆر بێ گومانی دەکرد کە شتێك هەیەو لەژێر سەری سیمیار دایەو ئەویش وەك سندوقی کلۆمکراو وابوو، بە کەس نەدەکرایەوە، راستە ئەو مەسەلەیە خەفە کرابوو وەلێ لە بنەوە لە هەڵچووندا بوو، ئەوانەی مەبەستیان بوو بە نهێنی‌و هەندێ جاریش بە ئاشکرا ئەو مەسەلەیان دەجولاندو قسەیان لەسەر دەکرد، هەر قسەیەك دەیان قسەی تری بە شوێن خۆیدا دەهێناو لە کۆتاییدا خەڵکەکە لەناویاندا سەرگەردان دەبوون، ئیدی کەس بە راستی پەی نەدەبرد مەسەلەی نازەنین‌و هێشا بۆ کوێ سەر دەکێشێ‌و نازەنین بە تەمای چییەو ئەو بەزمەی‌لە پێناو چیا ئایەوە؟

ئەو ورده پرسیارانە هۆش‌و بیری دەگای بە تەواوی ماندوو کردبوو، تا گەیشتبووە رادەیەك خەڵك وا ئەجیا بکات ئەو بەزمە کایەیەك بوو نازەنین نایەوە بۆ ئەوەی لە دەست داخوازیکاران رزگار ببێ...!!

هەنارخان لە سەرەتاوە لە هەموو کەس زیاتر دڵی لەو کێشەیە کرمێ ببوو ئەوەندەی لە ناخ خۆیدا هەڵگێڕو وەرگێڕ پێکردبوو لێی هەراسان ببوو، ئەو بەو نزیکییەی لە نازەنینەوە لێی سەرگەردان ببوو، ئیدی لە داخاندا ئومێدی دابووە دەست ئاییندەو خوالکرد...

لەم دوایەشدا خەریك بوو رەحمی بچێتە سەر هێشا، چەند لێی ورد دەبووەوە یەك نەنگی لێنەدەدۆزییەوە، ئەوەی هەبوو هەر ئەوە بوو لەوە دەترسا سبەی رۆژ خەڵك بڵێ زاواکەیان کاروانچییە! هەر خۆی بە خۆی دەوت: با کاروانچی بێ خۆ

حریخست لەوانەی هاتنە مەیدان ئازاو نەبەردتر بوو   وای بە خۆی دەوت، وا
ـنی خۆی دەدایەوە دەی ووت:

_ خۆ ئەگەر هێشا دەستێ جلی بەگزادانەی لەبەر بکەیتو بیبەی بۆ شوێنێ کەس نەیناسێ ڕەنگە بڵێن ئەوە پاشازادەیە .. لە دەستپاکیو ئازایەتیو هۆش سافیشدا دەڵێی ئەو ئەدگاری بەسەر خەڵکدا دابەش کردووەو بەشی پاشازادەکانیشی لێداوە ..

هەنار خان لە پەناوە چاودێری نازەنینی دەکرد تا بزانێ کە چاوی بە هێشا دەکەوێ دەمو چاوی چی دەردەخات، هێمای ئەوە دەدات کە بە دەزگیرانی خۆی بزانێ ..؟.

بۆی دەرکەوت هەر وەکو جاران دەکەوتە بەرچاوی، نە لە نازەنیندا نە لە هێشادا، هەستی بەوە نەدەکرد ئەوانە سۆزبەندیو دەزگیرانی لە نێوانیاندا هەیە

باشە ئەوە بۆ ساڵو نیوێك دەڕوا هێشا مەرجەکەی هێنایە دی، ئەی بۆ ئەوساوە بێدەنگ بووەو داوای مەرجەکەی تر ناکات؟! . ئەوە ئەو وا! ئەی نازەنین بۆ سەری ئەو مەسەلەیەی ناوەتەوەو بەرەبینی توند بەستووەو هەناسە نادات؟. بۆ؟! ..

جگە لەوەش هەنار خان بە نهێنی چەند جار ئافرەتی ناردبوون بۆ ماڵی هێشا تا بزانێ مانای ئەو ڕاسپاردەیە کە سەوسەن دایکی هێشا گەیاندی چی بوو!؟. کەچی لەو بارەوە شتێکی بۆ ساغ نەبووەوە!.

لە لایەکی ترەوە بە دزیەوە بەیانیان سەیری نازەنینی دەکرد لە کاتو ساتی هاتنە دەرەوەی سیمیاردا لە پەنجەرەکەوە وەك جاران بۆی دەڕوانیو زەردەخەنەی لەیەك حاڵی بوونیان دەگۆڕییەوە   لەمەشدا هەمدیسان سەری لێشێوا نەیدەزانی

ئەو وردە خەنینەی نێوانیان بۆ ئەوەیە چونکە سیمیار ئەوی چاك کردۆتەوە؟! یان لە ناخدا شتێکی تر هەیەو ئەو سێ کەسە -سیمیار- نازەنین- هێشا- لە خەڵکی دەشارنەوە!.

نازەنینیش وەك سیمیار لەو بارەوە خۆی کردبوو بە کتێبێکی لۆغزاویو مەتەڵۆك نە بەدایکی نە بەکەس نەدەخوێنرایەوە، ڕای خۆی دەربارەی هەموو کاروبارێك دەردەبڕی کەچی لە بارەی خۆیەوە هیچی نەدەدرکان، وای پیشاندەدا بەردی لەسەر ملۆی خۆی داناوەو خەمی نەماوە ..

خواجە بەهمەن هەموو کاروبارێکی خۆیو دەگای دابووە هەنارخان، ئەویش هەموو ڕاو تەگبیرێکی لای نازەنین بوو، جاران خواجە دیوەخانی خۆی بە باسو خواسی ڕاووشکار کردن گەرم دەکرد، وا ئێستا بە فەرمانی نازەنین لێی قەدەغەکراوە نەك هەر لەو بەڵکو کوشتنی کەڵو بزنە کێویو کەوو هەموو باڵندەو زیندەوەرەێکی بێ زەرەری لە خەڵکی دەگا .. قەدەغە کردووە بەتایبەتی لە وەرزی بەهاردا.

سیمیاریش مۆغانی مامۆستای ڕازی کردبوو، کە بە پێی گاتاکانی ئاوێستا خەڵك لە بڕینی دارو درەخت سوتاندن بترسێنێ نازەنین بڕیاری لەسەر هەر شتێ بدایە خواجە دەیزانی ئەنجامەکەی بە لای چاکیدا دەشکێتەوە، ئەو لەوە دڵنیا ببوو کە نازەنین هەستو سۆزی ناسکی ژنانو ژیریو حیکمەتی پڕ بەهای پیاوانی تیا جەمە ..

خواجە بەهمەن ئەستێرەی نگینی کەوتبووە درەوشانەوە، وەك سەردارێکی دەسەڵاتدارو پیاوێکی دامەزراوو بە نموودی ناوی ڕۆیشتبوو، چەند ساڵێك بوو فەڕو دەرامەتێکی فراوان بەسەر دەگاکەیو دەوروبەریدا ڕژابوو، خەڵك لە هەموو

لایەکەوە ڕوویان تێدەکرد، ئەو ئافەتو نەهامەتییەی کە زۆر شوێنی گرتبووەوە
ـەوان بەدەر بوو ئەوانەی کە بۆ داخوازی نازەنین هاتنو بەنائومێدی گەڕانەوە.

چاویان بەرایی بە ناوداری خواجە بەهمەن نەدەهات، لە چروکیو نابووتی خۆیانەوە حەزیان دەکرد داوێکی بۆ بنێنەوەو پێوەی کەن، ئەوەبوو هەندێ لە بەگەکانی ڕۆژهەلاتی هەورامان هاتنە لایو داوای هاریکاریان لێکرد کە دژ بە تورانیەکان بە ناردنی چەند زەلامێك یارمەتیان بدات!.

خواجە هەر بڕیارێکی بدایە ڕاوو تەگبیری نازەنینی وەردەگرت ئەوجا دوا بڕیاری دەدا، بۆیە بەوانە هەڵنەخەڵەتاو بە نائومێدی چۆن هاتبوون وا گەڕانەوە ..

ڕاکەی نازەنین خان یەکاو یەك بوو! ئەوانەی کە بە هاندانی پارسەکان چونە ناو ئەو شەڕەوە هەردوو لا بە پاشەڵی خوێناوییەوە گەڕانەوەو جگە لە کوشتنو ماڵ وێرانی بەولاوە هیچیان نەچاندوو مایە پووچ بوون.

مەبەستی ئەوانە ڕاکێشانی چەند گەنجێك بوو، وەك سیمیارو هێشا بۆ ناو کورخانی جەنگی کەسانی نەدیتەو نەناسراو، تا مەیدان بۆ داخوازیکارانی نازەنین چۆڵ ببێ

کە پرسیان بە نازەنین کرد، خۆی ڕووبەڕووی ئەوانە کە بۆ ئەو مەبەستە هاتبوون ڕاوەستاو پێی وتن:

– ئەگەر شەڕ بەسەرتانا هاتووەو یەخەتان بەرنادات، من ئامادەم، خۆم بێم بڕۆمە لای دوژمنەکانتان یەخەتان بەردەن، ئەگەر ئێوەش شەڕیان پێ دەفرۆشن، ئێمە ئامادە نین ببین بە سەرە چڵۆسکی ئاگرنانەوەی شەڕ ..

نازەنین بە متمانەوە وای پێدەوتن، بەدڵ لەو یەقینە دابوو کەدەتوانێ ئەوانەی کە شەڕانگێزی دەکەن بڕوا پەشیمانیان بکاتەوە ..

ئەوانەی گوایە پەنایان بۆ لای خواجە بەهمەن هێنا بوو، نازەنین بە ژێرانە ڕایی کردن و لە دواییشدا دەرکەوت کە ڕاکەی ئەو ڕاستە، ئیدی نەکەسیان لێکۆڵراو نە کەسیان کردە دوژمنی خۆیان، ئیتر لەو ڕۆژەوە نازەنین ببووە بریکاری خواجەو هەموو کارەکان خۆی ڕای دەپەڕاندن، خواجە خەمی ئەوەی لا نەمابوو کە کوڕی نێرینەی نییەو ئۆجاخی بەتاڵە .. لەوەش دڵنیا ببوو ئەوەی نازەنین بڕیاری لەسەر دەدا ڕاستەو دەڵێی سرۆشێکی یەزدانی ڕاوێژکاریەتی ..

*　　　　*　　　　*

ئەو کەمە زانیارییە ئاینییە کە مۆغانەکەی دەگا دەیزانی و پێی ببوو بە مۆغان. کۆمەڵە بنەمایەکی لێکدراوی پچڕ پچڕو بێ سەروبەر بوون، خۆیشی ئەو ڕاستییەی دەزانی، بۆیە لەوە دەترسا یەکێکی وەك سیمیار پەرە بەو کەمە خوێندنەی کە لای ئەو فێری ببوو بداتو پێبگاتو کۆڵێتەی مۆغانیەتی لێ تێك بدات، یان هیچ نەبێ ماڵی خواجە بەلای خۆیدا ڕاکێشێ، بۆیە گەلێ جار لەناو خەڵکی دەگادا خۆی هەڵدەکێشاو دەیووت:

_ ئەوەی دەیەوێ وەك من زانا بێ، دەشێ شارەو شارو دەڤەرەو دەڤەر شوێن بە شوێن بە دوای گەورە مۆغانەکاندا بگەڕێو زانیاریان لێوەربگرێ ..

ئەوەی دەوتو نەیدەزانی لە پەنادا ئەو وتەیە کار دەکاتە سەر سیمیارو، ڕێی گەڕان بۆ فێربوونی زێدە زانیاری پیشان دەدات، هۆشو بیری دەکاتەوە کە زانیاری شوێنکەوتنی دەوێ هەر لەو وتانەوە بوو سیمیار ماخۆلانی ئەوەی لا دروست بوو، بڕوا تا ئەو زانیارییەی کە هەیە فێری نەبێ نەگەڕێتەوە دەگا..

خۆ ئەگەر کابرای مۆغان بیزانیایە ئەو جۆرە وتانەی بەو جۆرە کاری خۆیان لە ..یشکی ئەودا دەکەن و هەڵی دەنێن بۆ باڵ فڕبوون نەیدەکردن، چونکە لەوە دڵنیا ..بو ئەگەر یەکێك هەبووایە هەموو (گات)و (وەندیدات)و (یاسنا)کانی ئاوێستای .. سیمیار فێرکردبایە بە ئاسانی هەموویان لە دەفەی سنگیدا جیّی دەکردنەوەو .. ئاسانی لەبەری دەکردن

کابرای مۆغان وای دەزانی سیمیاری شاگردی لەبەر بزن و مەڕ بەخێوکردن و ..مشالژەندن و کۆڵکێشی ناپەڕژێتە سەر ئەوەی بیر لەو جۆرە شتانە بکاتەوە ..یدەزانی ماوەیەکە کەڵکەڵەی گەڕان بەشوێن زانستدا لە هۆشیدا چەسپاوەو بووە .. نەخشەیەك دەسبەرداری نابیّ و هەر خەریکیەتی..

لەوەش ئاگادار نەبوو کە هێشای برادەری کە دەچووە کاروان و دەگەڕایەوە لە ..ەردوو سەرەوە تا چاوی بە سیمیار نەکەوتایە هەنگاوی نەدەناو لە گەڕانەوەشدا ..ەوەی دیبووی، کردبووی، سەرگوزەشتە ئاسا بۆی دەگێڕایەوە ..لە چووندا لێی ..پرسی چۆن دەڕواو بەرەو کویّ ڕوودەنیّ؟ لە گەڕانەوەشدا بەکوێدا هاتووەتەوە چی دیووەو چی بیستووە؟ .. هەمووی بۆ دەگێڕایەوە، ئەویش گشت ئەو شتانەی ..لای خۆی سازدەدان و دەیکردنە دەستەبەری نەخشەی ئاراگیلێکی درێژخایەن بۆ خۆ ئاملاندن و وەرگرتنی زێدە زانیاری..

ئاڵوگۆڕ کردن بەو شتانەی کە هێشا بە کاروان دەیبردن و ئەو شتانەی کە لەو شوێنانەوە دەی هێنانەوە شارەزاییەکی زەینی پتەویان لەلای سیمیار دروست کردبوو.

جگە لەوەش لە دەست جووینەوەی وتەو دواندنەکانی مۆغانی مامۆستایشی گەڵ بێزارو هەراسان بوو، وتەیەکی تازەی نەدەخستە سەر وتەکانی ڕۆژانەی، چۆنی بیستبوون، هەروەها بۆ خەڵکی دەجووینەوە، گوێی لەوە نەبوو ئەوانەی کە

گوێیان بۆ رادەگرن چەند جار ئەو شتانەیان لێوە بیستبوو، بابەتەکان هەموو کۆن‌و رزیو بوون‌و پەیوەندییان بە کاروباری خەڵکەوە نەبوو، هەندێ شتیان تیابوو خەڵکیان سارد دەکردەوە، کە ئەوەندە تەکان نەدەن‌و باوەش بۆ دنیا نەکەنەوە، سیمیار گەلێ جار دەیدایە بەر هزری خۆی کە ئایا ئەمرۆمەزدا هەر ئەوەندەی لا هەبووە، پێی باش بووە وا بوترێ‌و بوترێتەوە؟! یان هەر ئەوەندەی بە شایستەی ئافەریدەی خۆی زانیوە؟ ئەو هەراسانیەو ئەو وردە قسە پەنانەکیانەی موغانەکەو ئەو کاروان‌و کەڵکەی هێشا بوون بە ئارەزوویەك پاڵنەرێك کە سیمیار لەبەر خۆیەوە بڕیاری گەڕان بە شوێن راستی‌و زێدە فێربووندا بدات‌و بە زووترین کات روو لە دەڤەرەکانی تر بکات‌و لە کوی زێدە زانیارییەك دەست بدات بە شوێنیدا بگەڕێت‌و خۆی حەزو داب‌و نەریت‌و زانین‌و زانیاری لە هەر شوێنێکدا هەبێ فێری ببێ‌و ئەو ئارەزووەی کە لای دروست ببوو تەسەلی بکات‌و خۆی لەو جغزەی کە موغانەکەی تێکەوتبوو نەکەوێتە ناوی...

ئەو ئەوەی بۆ دەرکەوتبوو کە سروشتی خەڵك لە هەر قالبێك دڕا رادێت لەسەری، لەگەڵ ئەوەشدا هەوەسی خۆتازەکردنەوەی ئارام ناگرێت‌و دبزوێت... ئەوەتا هەست دەکرێ شتی خۆماڵی چەند بە تین‌و توانا بێ ئەو شەوق‌و نموودەی تیا نییە، وەك ئەوەی لە دەرەوە دێت‌و وارس دەبێ، یان لە جیهانی دوورەوە هاتبێ هەر لەبەر ئەوەش بوو سیمیار ئەوەندە تێکەڵاوی خەڵك نەدەبوو، هەمیشە ئەو پەردەیە کە لە نێوان ئەوو خەڵکدا هەبوو لای نە دەدایەوە، بۆیە خەڵك رێزیان لێوەردەگرت‌و تامەزرۆی بینینی بوون، وتەکانی (ژێرلەی‌مەرێ)ی دەکردنە شایەت، بۆ وتەکانی خۆی و ئەوانیشی لە قاڵبی پەندو زادەی تاقیکردنەوەی رووداوێك ئەژمار دەکرد،کەچی لە دەرەوەی دەگادا بەقسەی نەستەق و سەرتۆپی

یەنو مۆر کەری بگرەو بەردەکان بوون و دەبوونە شاهیدی بۆچوونی راستیەکانی حەنە

دیارە سروشتی مرۆڤ وای پێخۆشە لە گوم بوونەوە بەهای دەردەکەوێ! نەك یەک دەفرێك هەمیشە لەبەر دەستتدا کەوتبێ‌و لەبەر چاو بێ، بە تاقیکردنەوەی کەسی خۆی ئەو راستییەی بۆ دەرکەوتبوو...ئەوەتا لەچاو پەسندی مامۆژنیدا یەک بەردەستێك یان وەروێرکێك تەماشا دەکرێ، کەچی هەنارخان بەو هەموو سەلارییەوە، نازەنین بەو هەموو نازداری‌و شۆخ‌و شەنگییەوە، خواجە بەهمەن بەو هەموو سام‌و سەیبەت‌و خۆبەزل زانینەوە، ئاواتیان بوو جارێك بچێتە میومخانیان، لە نزیکەوە بیبینن، تا بزانن ئەوەی خەڵك دەربارەی ئەو دەیڵێ راستە؟ یان نا؟

## (٦)

ساڵ بەرەو کۆتایی وەرزی پاییز هەڵدەکشا، چی پیت و فەڕی خۆی هەبوو لە کۆش خەڵکی کردبوو. کەس نەمابوو لە بۆم و بەرامەی ئەو ساڵە پڕ بە پیتە مەست نەبووبێ، پاشەکەوتی زیاد لە پێویستی رۆزی و بژێوی تا سەر ساڵی نوێی لە عەمبارو کەندوو نەئاخنیبێ... هیچ گلەییەك لە ساڵەکە نەدەکرا، ئەوە گلەیی دەهاتە سەر، کەئەو کەسەبوو کە هەوڵی نەدابێ پاشەکەوتی فرە بخات و کەندوو عەمبارو کادان بە بەرهەمی هەمەچەشنە مشەبڕ نەکات، کار بۆ هەمووان رەخسابوو، لەناو ئەو وەرزەدا هەر کەس رۆزی ساڵانەی خۆی ئەمبار دەکردو ئەوەی لە پێویستی ساڵانە زیاد بووایە بۆ فرۆشتن و کاروان وەلا دەنرا، ئەو پێداویستیانە کە لەوێ نەبوون و پێویست بوو هەبن کاروانیان بۆ رێکدەخراو ئەو شتانەی کە زیاد لە پێویستی خۆیان بوون دەبران و ئەوەی کە نەبوو دەکڕدران، یان شت بە شت دەگۆڕدرانەوە، ئیتر بۆ ئەو مەبەستە هەموو ساڵێ لەو وەرزەدا کاروانێکی سەرەکی رێکدەخرا، ئەوەی ولاغی بەگوڕو هەرزەکاری ئازاو یارای هەبوو بە خۆی و بارەوە دەکەوتە تەك کاروان و دەڕۆیشت، جگە لەوەی فێری کاروان و کەڵك دەبوو. شارەزایی لە رێ و شوێنی رەویەو کارو کردەی خەڵکیشدا پەیدا دەکردو ئەوەی بگونجایە کە دەهاتەوە... تێکەڵاو بە خوو خدەی دەگای دەکرد، جگە لەوەش فێربوونی کڕین و فرۆتن و هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ خەڵکدا،

بێ قازانج و زەرەر لێك جیاکردنەوەو کاڵاو بەبرەوو بافتی نێو خەڵك زانینی ئەمانە مرۆی قاڵ دەکردو بۆ دوارۆژ رایدەهێنا...

هەموو ساڵێ کاروانێکی وا بە کۆمەڵ رێکدەخرا، خواجە بەهمەن پیاوێکی شارەزاو دەهەندو یارای دەکردە سەر قەتاری کاروان، ئەمساڵیش وەکو پار خواجە بەهمەن هێشای بۆ ئەو کارە دەسنیشان کرد..

ئەو شتمەکە پوخت و پاکیزە درێژخایەن و دوور لە خراپ بوونانە بە کاروان دەبران و بە کاڵای پێویست دەگۆڕدرانەوە، ئەوانە کە شتمەکی درێژخایەن و بەهادارلریان نەبوو یان هەبوو وەلێ حەزیان وابوو خۆیان بە تاکە کەس یان بە جووت لەگەڵ یەکێکی تردا بیبەن و بە شتی پێویستی بگۆڕنەوەو بگەڕێنەوە...

خەڵکی ناو دەگا بە تێکڕایی دەکران بە دوو بەشەوە، ئەوانەی کاروان و کەلەکیان پێدەکراو ئەوانەی پێیان نەدەکرا، ئەوانەی پێیان نەدەکرا پیاوی پیرو ئافرەت و منداڵ بوون، بەڵام هیچیان بێکار نەبوون، پیاوەکان تا کەنفت دەبوون بە پیشەی جوڵایی و خەراتی و دارتاشی و تەون و کڵاشکردن و چاودێری ماڵ و منداڵ و ورده کاروباری ماڵەوەو ناو باخ و کێڵگەکانەوە خەریك دەبوون و ئێوارانیش دەچوون دیوەخانی خواجە. ژنەکانیش بە تەشی رێسان و هەڵاوەو جاجمنانەوەو دروومان و تەون کردن و بەرماڵ و لۆرگ و گۆرەوەچنین و گۆشەو گلێنە دروست کردن و مەشکەژەندن و کەشك و بۆم و بەرامە وشك کردنەوەو قەزوان چنین و بەخێو کردنی منداڵەوە خەریك دەبوون... تەنانەت خانمی ناو کۆشکیش بێکار دانەدەنیشت، ئەو گوڕەو پوزەوانانەی هەنارخان و نازەنین دەیانچنی هیچ دەست رەنگینێکی تر نەختینەی وەهای دروست نەدەکرد.. ئەو چۆغەو رانکە مەرەزەی بە پەنجەی نازەنین دەڕێسرا خواجە بەهمەنی باوکی لەناو خەڵکدا خۆی پێ هەڵدەکێشا...

خواجە بەهمەنیش تا نازەنین پێنەگەیشتبوو برا گەورەو سەرەکاری دەگا بوو نەیدەهێشت دوو کەس دڵیان لە یەکتری برەنجێ... موغانەکەش سەرەڕای سەرپەرشتی کردنی کاروباری ئاییني و چاودێری ئەو باخ و رەزانەی دەکرد کە بۆ پەرستگا تەرخان کرابوون، لە پایزدا لیژنەدارو کۆتەرە بەڕووی قڵێشاوی بۆ ئاگر گەرم کردنەوەی پەرستگا هەڵدەچنی و منداڵی فێری خوێندن دەکردن، بەلام لەبەر کارو هەرمان تا ئەو کاتە جگە لە سیمیار کەس نەچووبووە لای داوای فێربوونی شتی لێ بکات...

ئاوابوو دەگا، کلووره هەنگ بوو، خەڵکەکەی بەختەوەر بوون، لە کارو جووڵە نەدەکەوتن..

ئەو بەرهەمانەی کە لە پێویستی دەگا زیاتر بوون بە کاروان دەیانبردون و قازانجێکی فرەیان دەهێنایەوە، بەرهەمەکان لەم شتانە بوون، کەشك و هەنگوین و گوێز، بادەم و قەزوان و لەتکە شێلانەو هەرمێ و هەڵوەژەی وشك کراوەو مێوژو رۆنی زەنگ و تۆراخ و جەوی و سرێش و سرکەهەنارو دۆشاوی توو، لەپۆرتە هەنجیرو هەڵیزە تووی هاڕدراوو جاجم و مەوج و گۆرەوی و پوزەوانەی گوڵچن و کلاش و کەوشی داکوتراوو بەرماڵ و لۆنگ و پشتێنی تەوەنچن و چەمچەو کاسەو کۆچەڵەو تەشی و سندوقی هەزار پێشەو بلوێری منداڵان و خەنەو دیملەشۆرەی ژنان و شانەو کلتووری چاوڕشتن و کیسڵە مێخەك و سملی و ملوانکەی لە کیسەڵە هەڵبستراوی پڕ لە چنوورو هاڕاوەی گوڵەباخ و سووژن و دەرزی و گۆچەوەن و چەندان شتی تر...

هێشا شارەزا بوودەیزانی چی بافت و رەواجی هەیە، ئەوەی بار دەکرد، دەیزانی ئاغاو سەرداری ئەو شوێنانەش کە کاروانەکە رووی تێدەکرد حەزیان لە چییە، بەناوی خواجەوەبە دیاری بۆی دەبردن، لەوەوە ئاشنایەتی و دۆستایەتی

ەکەنیاندا بەستبوو، ئیتر بەبێ ترس‌و بیم لە دەڤەرەکەیاندا بازرگانی خۆی
دەکردو کەس دەستی نەدەهێنایە رێی...

وا ئەمساڵیش سەرقافڵەی کاروان هێشایە لەناو کاروانچییەکانی دەگادا رێزو
ـیمو پایەیەکی وای بەدەستهێنابوو، وەك سەرکردەیەکی خۆیان تەماشایان
دەکرد، بەتایبەتی لەو کاتەوە کە چقەی ئازایەتی نایە سەر لووتکەکانی دەگاو
ـوەندەی تر بەرزی کردنەوەو مەرجەکەی نازەنینی بۆیان گل دایەوەو هەموو
ـونەی بەزاند کە سنگی خۆیان لە دەگادا دەرپەڕاندبوو، لە فیزەوە چاویان
ـرپێیانی نەدەدی...

دەگا جەمەی دەهات چەندان ئێسترو ولاغی چەمووش‌و بارەبەر ئامادە کرابوون،
جەوالان پڕ لە شمەك کران‌و توێشەی رێی دوورو نزیکی کاروان پێچرایەوەو وا
هێشا رەشووی ئێسترە شێی گرتووەو لە پیش کاروانەوە راوەستاوەو چاوڕوانە،
ـە خواجە بەهمەن‌و هەنارخان هێمای بەڕێکەوتنی نەدەنێ ناجووڵێ.. ژاوەژاوی
ـتەلان‌و بگرەو بەردەی ژنان‌و نزاخوازی پیاوماقوولان لەبەردەم ماڵی خواجەدا
ـوپەڕی دایەوە... هەموو چاوەڕوانن موغانەکەی دەگا بۆ جمانی کاروان
ـگرێکی خەست لە پەرستگادا بکاتەوە، دووکەڵەکەی لەسەر بانەوە بەرەو بەرزایی
ـوورە بکات‌و چاوی بەدکاران‌و نەگریسان کوێر بکات‌و خێوو گۆمەتەکان راو
ـنێ...

خواجە وەك پاشای ئاریان زەمین لە تەك هەنارخان‌و نازەنیندا لەسەر بانێژەی
ـلارەکەدا راوەستاون، چاوێکیان لە هێشایەو ئەویتریان لە پەرستگایە...

لەمە دووکەڵی پەرستگا بەرز بووەوە خواجە دەسەسڕەکەی بەرکەمەری
ـرهێناو هێمای جمانی کاروانی دا...

هێشا بە گورجی ڕەشووی ئێسترەکەی بە ملیەوە بەستو بەریداو کاروان کەوتەڕێ...

سیمیار خۆی لە زووەوە ئامادە کردبوو، کە ئەمساڵ لەگەڵ کاروانەکەی هێشا بەرەو هەندەران بەڕێبکەوێ تا کوێ ڕێی ئارەزوو درێژەی هەبێ بڕوات، سەردانی مۆغانەکانی ئەو دەڤەرانە دەکەونە بەر ڕێی بکات، چی دەزانن لێیانەوە فێر ببێ. هێشا لە زووەوە ئاگاداری ئەو نەخشەیە بوو، پۆشاکو سەرو کڵاوێکی موغان ئاسای لەبەر کردو پشتێنێکی قەیاسەچنی چوون زەنناری سپی لە قەد خۆی بەستو هەگبەکەی هەندێ شتمەکی خوێندنی تێناو لەشانی کرد، توێشەیەك کولێرەی هەرزنو هەڕشتەی لە پشت بەست، هێشتا تاریكو لێلی بەیانیان بوو، ماموژنیو دوو منداڵەکەی (لاسو سانا)ی هەڵساندنو تێر ماچی کردنو مۆڵەتی لە ماموژنی وەرگرتو پەیمانی دایە کە زوو دەگەڕێتەوە لایان، پەسەند تا ئەو کاتە نەیزانیبوو کە ئایا ئەو بارەی ئەوان کە خرابووە تەك کاروانی ئەو ساڵە کێ دەکەوێتە تەکیان؟ خودادادا؟ یان سیمیار؟ یان هێشا خۆیبۆیاندەفرۆشێ وبۆیاندەهێنێتەوە؟..

سیمیار لەگەڵ مامیدا وارێکەوتبوو کە ئەو بارەکان بار بکاتو لەگەڵ کارواندا تا ئەودیوی دەگا بڕوات ئەویش لەوێ چاوەڕوانی بکات...

خوداداد کە چاوی بە سیمیار کەوت بەو جۆرە جلوبەرگەوە سامی لێنیشت،وای دەزانی هرمزیاری برایەتیو لە فیردەوسەوە هاتووەتە خوارەوە سامو سەیبەتێکی هەبوو قەت بەو جۆرە نەیدیبوو، حەپەساو ویستی قسە بکات وەلێ بۆی نەهات، وای بە باش زانی دەنگ نەکات..

ئەو لەو رۆژەوە کە خەونەکەی بە هرمزیاری برایەوە دیو ئەو شتە سەیرانەی بە چاوی خۆی لە سیمیارەوە بینیبوون، هەر شتێکی بکردایە پرسیاری لێنەدەکرد لەبەر چی؟.

چونکە ئەو وەك کەسانێکی ئاسایی نەبوو قسەی بۆ جێی خۆی دەکرد، هەنگاوی لە خۆوە نەدەنا... هەموو خەڵکی دەگاش دەیانزانی سیمیار نیشانەی خۆشیو نگینیانەو وەك کەسی تر نییە...

نازەنین هەستی بە شتێ کردبوو، لەناو کاروانچییەکاندا خوادادی بەدی کردو چاوی لێ کلا نەدەکرد، پێی سەیر بوو نەخواحافیزی کرد نە دەرو دیمەنی لە کاروانچییان دەچوو، ئەی بۆ کەوتۆتە تەکیان؟ چاوەڕوانی وەڵامی ئەو پرسیارەی لەخۆی دەکرد، لە دڵ خۆیدا هێشتییەوەو دایە بەر خەمی وەڵام...

کاروانچییەکان کە چاویان بە سیمیار کەوت هەموو گەشانەوەو وایان زانی چاویان بە خدری زیندە کەوتووەو هاتووە رێنماییان دەکاتو ورەیان بەرز بووەو پێشبینی چوونو هاتنەوەیەکی پڕ بە فەڕو خۆشیان بۆ خۆیانو کاروانەکەیان دەکردو متمانەیان لا بەتین بوو، کە بە باری پڕو قازانجێکی فرەوە دەگەڕێنەوە...

هێشا کە چاوی بە سیمیار کەوت لەسەر وڵاغەکەی کە بۆ سوارbوونی سەرقافڵەی کاروان تەرخان بوو، هاتە خوارەوەو لەگەڵ سیمیاردا راموسانیان کردو پاش دەست لە مل کردنو خواحافیزی لەگەڵ خوادادی مامیدا، هێشاو سیمیار لە پێش کاروانەوە شان بەشانی یەکتری هەنگاویان نا...

هێشا هەوساری وڵاغەکەی دایە دەست پێشڕەوی کاروانەکە کە ناوی (جووڵە) بوو، ئەم (جووڵە)یە پیاوێکی باڵابەرزو قیت رەوو بە قەڵافەت بوو، هەرکات هێشا بە کاروان بڕۆیشتایە ئەوی لەگەڵ خۆی دەبردو دەیکردە پێشڕەوی کاروان، بەو بۆنەوە شارەزاییەکی باشی لە رێگە هەڵکردندا پەیدا کردبوو، جووڵە تێنەگەیشت

بۆچی هێشا لە ولاغەکەی دابەزیو بەپێ لەگەڵ سیمیاردا بە یەکەوە دەڕۆن، شەرمی دەکرد بڵێ: ئەگەر ئێوە سوار نابن، با من سواری ئەم ولاغە بێبارە بم! ولاغەکە بۆ ئەوە بوو سەرقەتار سواری ببێ، یان ئەگەر یەکێك لە کاروانچییەکان پەکی کەوت سواری ببێ...

هەر ئەوەندە گوێی لێبوو سیمیار وتی:

_کەی پێویستی کرد ئەو کاتە  سوار دەبین، هێشاش شەرمی دەکرد ئەو بە پێ بڕوات‌و خۆی سوار ببێ... ئیتر بە درێژایی ڕۆیشتنی ئەو ڕۆژە کەسیان سوار نەبوون..

*　　　*　　　*

لەگەڵ زەردەپەڕی ئێوارەدا کاروان گەیشتە زارگەرووی (دەربەندی دالاش) دەربەندەکە ناو گەرووی دوو ریزە شاخی بەرزو قوچی دەکرد بە دوولەتەوە، ڕێگەیەکی تەسکی هەزار بەهەزاری جنۆکاوی هەبوو، ئەوەی یەکدوو جارێ پیایدا تێپەڕی نەکردبایە نەیدەزانی ڕێی دەرچوونی تیا هەیە، ئەو سەری ڕێگاکە دەچووە سەر توولە ڕێیەکی قەدپاڵی چیایەکی هەڵمۆت‌و لەو دیویەوە کۆتایی دەهات، ناو گەرووەکە بە تلی گەورەو تاشەبەردی زل‌و درەختی چڕو پڕ تەنرا بوو، ئەگەر دارەبەنە بریندارە کۆچەڵە لێدراوەکان نەبوونایەن سوێندت دەخوارد ئەو ناوە پێی ئادەمیزادی لێنەکەوتووە، پیاو تیایدا بە ڕۆژی نیوەڕۆ زاڵەترەك دەبوو، سەختی ناوچەکە لە هەندێ شوێندا تافگەی بڵند ئاوەکەی وا دەهەژاندوو

هەپرۆون هەپرۆونی دەکرد، لە هەندێ شوێنی تردا لەبن تاشەبەردە بەسەریەك کەوتووەکاندا دەخنکاو چەمو چۆخرە ژەنگلەدارەکەش دەیپەنگاندەوە....

لە زارگەرووی ئەو دەربەندە سامناکەدا بە فەرمانی هێشا کاروان راوەستاو بار خراو ئاگرکرایەوەو هەندێ لە کاروانچییەکان کوندەو جەوەندەو کولەکەیان ئامادە کردو ویستیان برۆن لە چەمەکەدا ئاو بێنن... هێشا ئاگاداری کردنەوە کە وریابن، ورچو پڵنگو دەعبا پەلاماریان نەدا، لەمە هەستیان بە شتێ کرد، زوو بگەڕێنەوە لای ئاگرەکە... ئاگر کرایەوەو شاخەکانی ئەمبەرو ئەوبەری دەربەند لەناو تاریکدا توانەوە، ولاغەکان لەنزیك ئاگرەکەدا بەسرانەوە، گوێیان قولاغ دەکردەوەو جاروباریش سمکۆڵیان دەکرد، کاروانچییەکان دەیانزانی هەستیان بە بوونی دڕندە کردووە، بەلام رووناکی ئاگرەکەو کسپەی سووتاندنی وشکەدار بەسەر یەکدا کەوتوو دوڕندەو جانەوەرەکانی ئەو ناوەی تۆقاندبوو... لوورەی گورگو بۆڵەی ورچو زریکەی پڵنگو دەنگی دەعباکانی تریان لەنزیکەوەدەبیست، ئێسترەکان کەوتبوونە چرکە چرکو میز کردن لە کورکەو جوولە نەدەکەوتن، چونکە گەلێ جاری تر بەو شوێنەدا هاتبوون ئالوودە ببوون، گوێیان تاقمانەو جووتی دەکردو بۆ هەر خشەیەك کە نزیك دەبووەوەهەڵیان دەخستو دەسڵەمینەوە،بەلام کڵپەی ئاگرو مەشخەڵەدانیو چەڵەنگی کاروانچییەکان ترسیانی شکاندبوو، کاروانچییەکان بە تەگبیری هێشا بوون بە دوو بەشەوە، بەشێکیان دەنووستنو بەشەکەی تریان بە دەور ئاگرەکەدا دادەنیشتنو پەیتا پەیتا وشکەداریان دەخستە ناو گەرووی ئاگرەکەوە بە وتەو پێکەنینو گاڵەگاڵ ترسی ئەو ناوەیان لەخۆ دەردەکرد..

لەپڕ ئێستری سەرقافڵە گوێ ی قیت کردەوەو پرمەیەکی کردو لووشکاندی، لەپاش پرمەکەی چەند زەلامێکی دەمامکدارو نێزە بەدەست چواردەورەی

کاروانەکەیان گرتو ویستیان پەلامار بدەن، هێشا زوو هەڵساو تێیانی خوڕیو وتی:

- زەلامینە! ئەگەر نیازتان باشە، فەرموون وەرنە پێشەوە، ئەگەر نیازخراپن خۆتان دەرخەن... ئەوەیان کە سەرکردەیان بوو لەگەڵ دوو کەسی ترا، هاتە پێشەوەو وتی:

- چیتان پێیە بەجێی بێڵنو بڕۆن..

هێشا کە زانی ئەوانە جەردەن پێیانی وت:

_ کەواتە ئێوە جەردەن؟!

خۆی ئامادەکردو کاروانچییەکانی هاندا کە خۆ ئامادە بکەن، لەگەڵیاندا بجەنگن...

سیمیار پێشیان کەوتو داوای لێکردن دەس نەکەنەوە، جارێ دەرفەت بدەن لەگەڵیاندا قسە بکات...

هێشا قسەکەی سیمیاری نەشکاند دەرفەتیدا لەگەڵیاندا قسە بکات...

لەبەر تیشکی ئاگرەکەدا سیمیار بەبێ ئەوەی خۆی بشوێنێ چووە بەردەم سەرکردەی چەتەکانو بە نەرمو نیانی لەگەڵیاندا دوا:

- براینە چیتان لە ئێمە دەوێ؟ برسیتانە خواردنتان دەدەینێ، تێنوتانە ئاوتان بۆ دێنین، چیتان دەوێ ئامادەین!! ئیتر بۆ بە ناهەق بەرۆکمان دەگرن بۆ، بۆ شتێکی کەم خوێن لە نێوانماناندا بڕژێ، ئەوەی ئێمە هەمانەو ئەوەی ئێوە گەرەکتانە بایی یەك دڵۆپە خوێنی یەکێك لە ئێمەو یەکێك لە ئێوە نییە، ئەگەر دەتانەوێ بمانکوژن ئێمە بە ئێوە ناکوژرێین، فەرموو دانیشن با لە یەکتری حاڵی بین!! قسەکانی سیمیار لە ئاخەوە کاریان لە سەرکردەی جەردەکان کرد، یەکێك

لەو دوو کەسەی کە لە تەکیدا هاتبوونە پێشەوە خەنجەری هەڵکێشاو ویستی پەلاماری سیمیار بدات، بەڵام گەورەکەیان تێیخوڕی: کە نەکات، کابرا خۆی لە سیمیار هاتە پێشەوەو تا رووبەرووی بووەوەو دەستی دایە دەست سیمیارو ویستی پێچی بداو هێزی خۆی پێی بنوێنێ و سامی خۆی بخاتە سەری، لە کاتی پێچدانی دەستی سیمیاردا تەزووێکی بەتین و لەرزۆك لەناو دەستییەوە هات و رژایە ناو هەموو رەگ و دەمارەکانی لەشی و لە شوێن خۆیدا سڕی کرد، ناچار دەستی بەرداو بە دەسەکەی تری هەگبەکەی شانی لێڕفاند، کە دەستی تێوەرگێڕا نووکی ئەو قامیشەی کە شتی پێ دەنووسی، بەژێر نازەناخونیدا چەقاو لە حەزرەتی ئەو ئێشدا تا توانی هاواری کردو هەگبەکەی تووڕدا...

سیمیار لەسەرخۆ پێی وت:

– کاکەبرا بۆ خۆت سەخڵەت دەکەی... من دەڵێم چت دەوێ بتدەمێ! توخوا یەکێك بەبێ ماندوو بوون شتێکی دەسکەوێ خۆی بۆ ماندوو دەکات؟!

هێشاو کاروانچییەکان ویستیان پەلاماریان بدەن سیمیار زوو دەستی بۆ بەرز کردنەوەو وتی:

_ راوەستن تا بزانم تا چ رادەیەك دەستدرێژی دەکەن... ؟!

کابرا: سەرکردەی جەردەکان هەیبەتی سیمیار وای ترساند وەك داڵهۆیەك لە شوێن خۆی چەقی و نقەی لەدەم نەهاتە دەرەوە...

حاڵەتێکی سەیر هەموو گیان و جەستەی تەزاند دایوەشان و هێزی لەبەردا نەهێشت... بەرامبەر بە سیمیار لە لووتکەی خۆ بەزل زانین و فیزەوە، وەك چۆلەکەیەکی پەڕو باڵ رووتاوی بەر سەرمای زستانی لێهات...

سیمیار ئاماژەی بۆ بارەکانی خۆی کردو وتی:

– ئەوانە هی منن... وەرن بۆ خۆتان بیبەن و وازمان لێبێنن...!

لەو کاتەدا سیمیار قسەی بۆ سەرکردەی جەردەکان دەکرد، یەکێك لە جەردەکان دەرفەتی هێنابوو کەمێ تفاق‌و کەل‌وپەلی لێرفاندن‌و لێیان جیابووەوەو لە ناو تاریکی شەوە زەنگەکەدا خۆی مەلاس دا...

کابرای سەرۆك جەردەکان فەرمانی بە جەردەکانیدا بەرەو دوا بکشێنەوە.. لەگەڵ ئەوەشدا سیمیار پێی وتن:

– بەخوایشتی خۆمان چیتان دەوێ داوای بکەن، لە بارەکەی خۆی پریاسکەیەك رۆن‌و چەند مشتێك مێووژو خواردنی دانێ‌و بەرەودوا کشانەوە...

کاروانچییەکان لەو کارەی سیمیار سەریان سووڕما، خۆ ئەگەر ئەو وای نەکردایە بەو ئاسانییە وازیان نەدەهێنا، جەردەکانیش لە فەرماندانی گەوەرکەیان بۆ دواوە کشانەوەو سەریان سووڕما، ئەوان وایان دانابوو هەموویان بکوژن‌و کاروانەکە بە تالآن بەرن، ئەوان بە ژمارە گەلێ لەوان پتر بوون، بە چەکی شیرو تیرو نێزەوە چوبوونە سەریان...

هێشا لەوە سەری سووڕمابوو، چەند جارێکی تر بەناو ئەو دەربەندەدا تێپەڕیوەو شتی وا نەهاتووەتە رێی، ئەوەی هەیە گوێی لێ نەبووە لە دەڤەرەکانی دەوروبەری هەوراماندا جەردەو رێگر هەبووبن راستە بەگەکان سەرانەو سالآنەو لەواڕاندن‌و ئاوانەو پێڕەوانەیان دەسەند، بەلآم چەتەگەری‌و جەردەییان نەکردووە،بۆیە لەبەر خۆیەوە دەیوت:

_ تۆ بڵێی ئەم جەردانە لە کەیەوە داهاتبن؟

لە دڵەوە گومانی دەخستە سەر ئەوە کە ئەوانە جەردە نەبن‌و لەو کەسانە بن کە بۆ داخوازی نازەنین هاتن‌و بە دەستی بەتاڵ گەڕانەوە، کە نەیانتوانی مەرجەکەی نازەنین بهێننەدی پێیان وابووە سووکایەتیان پێکراوەو دەیانەوێ بەو جۆرە نالەبارە تۆڵەی خۆیان بکەنەوەو رێی کاروان کردنیان لێ قەدەغە بکەن...

هێشا وا ئەو ڕووداوەی لە دڵ خۆیدا لێکدەدایەوە..... ئەی کێ ناڵێ بۆ کوشتنی هێشا نەهاتبوون؟ وەڵێ سیمیار چاوی کوێر کردن و ئەوەی لەبیر بردنەوە؟!

(جووڵە) گەڵێ ژیرانەی کرد کە زوو ئاگرەکەی کز کرد، بەری ڕووناکی لە هێشا گرت و نەیهێشت وەك سیمیار لێیان نزیك بێتەوە، کارێکی باشی کرد، چونکە ئەگەر ڕێیان دەدا کە شتەکە وابێ یان وانەبێ... بەڵام ئەوەی کە بێگومان بێ ئەو ڕاستییە بوو کە لە ڕوو ڕاوەستانەکەی سیمیار گوریسی پلانەکەیانی لەبنەوە پساند و لێی کردنەوە بە ڕیس و بە شەرمەزارییەوە پاشەکشەیان کرد...

کە جەردەکان بەرەو دوا گەڕانەوە، کاروانچییەکان وڵاخەکانیان خڕ کردەوەو لەناو بارگەکەدا ڕاوەستان، سیمیار داوای لێکردن سەر لەنوی وڵاخەکان ببەستنەوەو ئاگرەکە بگەشێننەوەو بە ئاسوودەیی دانیشن.

ئاگرەکە سەر لەنوێ کرایەوە، کاروانچییەکان بە دەور ئاگرەکەدا بە ترێسەوە دانیشتنەوە، مەترسییەکە هەموویانی وا حەپەساندبوو، چەندان نیشانەی سەرسووڕمان و پرسیاری لەناو چاوانیاندا دەبریسکاندەوە، وەلێ کە سەیری سیمیاریان کرد لەسەرخۆو بە متمانەوە لە ڕۆخ ئاگرەکە دانیشت هاتنەوە سەرخۆیان و هەریەك خۆی تاو دابوو خۆهەڵکێشانی خۆی دەردەبڕی، کەچی لەسەرخۆبوونی هێشاو سیمیار هەموو شتێکی دامرکاندەوە...

لە هاتن و کشانەوەی ئەو جەردانە حاڵی نەبوون، دەمیان چووبووە کلیلەو چاوەڕوان بوون سیمیار یان هێشا لەو بارەوە شتێك بڵێن، ڕووداوێکی لەناکاوو سەیر بوو، بەری هەموو قسەو سوحبەتێکی شەوانەی بەر ئاگرو پشوودانی گرتبوو، لە ڕاستیدا هێشاش وەك کاروانچییەکانی تر لە ڕەفتاری ئەو جەردانە بە تەواوی حاڵی نەبوو بوو، بەڵام لەوە بێگومان بووو چاك دەیزانی ئەگەر سیمیاریان

لەگەڵ نەبوایە، دەبوو بە دەستی بە تاڵو دڵی پڕ بە خەمەوە بەرەو دەگا بگەڕێنەوەو لە چۆکی خۆیان بدەن، هێشا دەیهێناو دەیبرد لەوە بەدەر کە ئەوانە زانیویانە کە ئەو سەرقەتارەو بۆی هاتبوون، چیتری بە هۆشدا نەدەهات، بەڵام سیمیار وای رەتاندن ئەوەی بۆی هاتبوون لەبیریان بچێتەوە....

هەموو مات بوونو چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد یەکێکیان بە بای هەناسەیەکی خۆش ئەو مات بوونە لابدا، کە جوولە زانی ئەو گۆمە بێدەنگییە پێویستە بشڵەقێ... وتی:

- گوێ مەدەنێ!.. ئەوە کاروانەو رێی سامناکە.. گەلێ شتی تیادا روودەدا، گرنگ ئەوەیە مرۆڤ رێ بەرنەداو واز نەهێنێ، بەو خوایە کە ئەم ئاگرەی بە خەڵات بە ئێمە بەخشیوەو ئەو ئاسمانەی بە ئەستێرە گەشە رازاندۆتەوەو بێ چلەو هەسوون رایگرتووە، لەبەر خاتری کاکە سیمیارو هێشا نەبووایە هەموویانم وەك سەگ سنك دەکردن، بە گوریس هەڵمدەواسینو دەمکردن بە پەندی دەوران...گوێی مەدەنێ هەر وادەبێ..!

پاش قسەکەی، هەندێ خۆی گیف کردەوەو دەستی بە سمێڵە درێژەکانیدا هێناو مڕەیەکی کردو پاشکۆیەکی بۆ وتەکانی هێنایەوەو وتی:

- چی دەڵێن بکەومە شوێنیانو لە پشتەوە کلکیان ببڕم..! قسەکانی جوولە زەردەخەنەیەکی رۆشنی لەسەر لێوی هەمووان بە تیشکی ئاگر نەخشانو یەکێك لە کاروانچییەکان بە تەشەرەوە وتی:

- ئافەرین... رۆڵەی بەرئاگردان کون لە جەرگیدا نییە، جوولە لە هاویشتەی تەشەرەکە نەگەیشتو وتی:

- ئەی چۆن! دیارە هێشتا منتان نەناسیووە، با ئەوجارە بێنەوە...

وای دەوت و دەیڕوانییە دەم و چاوی هێشا، تا بزانێ زەردەخەنەکەی ئەو چی دەگەیەنێ؟ ڕاستبێژی بۆ دەردەبڕێ یان نا؟..

بەو وردە قسانە خۆیان دامرکاندەوەو لە دەور ئاگرەکە ڕاکشان وەلێ کەس خەو نە چاوانی نەکەوتەوە،داریان لە ئاگرەکە دەوروژاندو لەبەر گڕو ڕووناکییەکەیدا هەڵگێڕو وەرگێڕیان دەکرد، هێشاش وەك ئەوان سەرە بزۆتێکی درێژی بە دەستەوە گرتبوو، پەیتا پەیتا سکڵی ئاگرەکەی دەجووڵاندو لە گڕەکەی ڕادەما... سیمیاریش داوای لە هەمووان کرد، نەهێڵن ئاگرەکە خەفە بێ و هەر شتێك ڕوویدا خۆیان نەشڵەژێنن....

*　　　*　　　*

لەناکاو دەنگێك لەناو قووڵایی تاریکییەکە دەبیسترا دەیووت:

– هۆ کاروانچییەکان ئاگادار بن ئێمە دوو کەسین وا دێینە لاتان...

کاروانچییەکان کە گوێیان لە دەنگەکە بوو خۆیان وریا کردەوەو ویستیان ئاگرەکە کز بکەن، ئەو دەنگە لەوە ناچێ دەنگی کەسانی نیاز خراپ بن...

هەموو کەوتنەخۆ، بە تایبەتی جووڵە پەشۆکاو ئامادەباشی خۆی تەیار کردو وتی:

– تۆ بڵێی نیازخراپ نەبن...؟

هێشا کە زانی جووڵە ترسی لێنیشتووە پێی وت:

– گوێت لێنەبوو سیمیار چی وت؟!

دەنگەکە تا دەهات نزیك دەبووەوە...

هەموو خۆیان ئامادە کرد دوو پیاوی چاپوك‌و شان و باڵ قایم، تاریکی دەوروبەر ئاگەرکەیان بڕی‌و هاتنە پێشەوەو یەکێیان وتی:

- کامەیە پیاو چاکەکەتان؟!...

جووڵە زوو هاتەدەم‌و وتی:

- هەموومان پیاوچاکین... چیت گەرەکە زوو بیڵێ..

کابرا بە پاڕانەوە وتی:

- براینە ئێمە لەوانە بووین کە ئەم ئێوارە بەسەر ئێوەماندادا. وا ئێستا گەورەمان ...کە برای خۆمە، ئەو دەسەی کە بەناو هەگبەکەی پیاوچاکەکەی ئێوەدا کردبووی، ئاوساوەو رەش بووەتەوە ئاوسانەکەی خەریکە هەموو لەشی بگرێتەوە... ئەوانەش کە شتەکانی ئێوەی رفاند، کە خواردیان تووشی سکچوون‌و رشانەوە بوون، بیکەن بە خاتری خوا فریامان کەون، کوا پیاوچاکەکەتان؟ کامتانن بابێت برام رزگار بکات... وایوت‌و کاروانچییەکان سەیری یەکتریان دەکردو نەیاندەزانی بڕوای پێبکەن یان بەو فێڵە دەیانەوێ بە تەڵەیانەوە بکەن؟!

هێشا لێی چووە پێشەوەو وتی:

- کابرا چیت دەوێ راستی بڵێ....

کابرا وەك بپاڕێتەوە وتی:

- راستی ئەوە بوو وتم... ئاغامان کە برا گەورەی منە، گیرۆدە بووە، ئەو شتەی کە لەناو هەگبەکەی پیاوچاکەکەتاندا هەبوو بەژێر نازەناخونیدا چەقیبوو، ئێستاش شوێنەکەی ئاوساوەو رەش هەڵگەڕاوەو هەموو لەشی تەنیوەتەوە، ئەو شتانەش کە بردمان لێمان خواردو هەموومانی تووشی رشانەوەو سکچوون کردوە...

هێشا بە توندی لە رووی راوەستاو وتی:

– راست ناکەی، ئەی تۆ بۆ تووش نەبووی؟!

کابرا وتی:

– بەو خوایە کە ئێوە دەیپەرستن راست دەکەم، ئێمە دواکەوتین نەمانخوارد.. بۆیە تووش نەبووین، ئەوەتان لەم دیوو ئەو شاخەوە بارەگامان لەوێیە......

کابرا تیرو کەوانو خەنجەرەکەی لە خۆیو ئەوەی لەگەڵیدا بوو کردەوەو لەبەردەم هێشادا دانانو خۆیان چەك کردو وتی:

– وەك بارمتەیەك خۆم دەخەمە بەردەستان: کابرا روانیە سیمیارو هێشا، کامتان پیاوچاکەکەن لەرێی خوادا فریامان کەون.

هێشا روانییە نێو چاوانی سیمیار بزانێ چی دەگەیەنێ؟ کە دی دیمەنی وەك ئاگرەکەی بەردەستیان پرە لە بڕواو یەقین ئەو بڕواو یەقینە لەدڵی ئەویشدا تریفەی دایەوە بەوا زانی ئەوانەخراپەکارنین:

سیمیار نێوچاوانی خۆی لەگەڵ خەندەیەکی مژدە بەخشی بۆ هێشا گەشاندەوەو سەرێکی راوەشاندو هەردوو دەستی بەئاگرەکە گەرم کردنەوەو بەرووەتی خۆییدا سوینی و ئەوجا رووی کردە هێشاو وتی

– بڵێ با هەندێ تۆراخ و سیراژم بۆ ئامادەبکەن .

سیمیار کۆچەڵەیەکی ئاوخواردنەوەی تایبەتی خۆی هەبوو لەناو هەگبەکەیدا دەری هێنا.

هێشا لەداواکردنی ئەو شتانەو دەرهێنانی ئەو کۆچەڵەیە تێگەیشت کە دەیەوێ چی بکات. تۆراخ و سیراژەکەی بۆ ئامادە کرا، خۆی پێچایەوەو ئەو شتانەی بۆخرانە دەفرەوە.

کاروانچییەکان کە زانییان سیمیار بۆ لای جەردەکان دەچێ لەناو خۆیاندا شڵەژان و نارەزایان لەسەر چوونەکە دەربڕی ،هێشا دایمرکاندنەوەو دڵنیای کردن کە چ رووناداـ خۆشی لەگەڵیدا دەچێ

کابرای دووەمیان پێش خۆیان داو ئەوەی کە دەیوت من برای سەرەکی جەردەکانم وەك بارمتە لەوێ گل درایەوە.

لەبەر دەرگای ئەشکەوتێکی وراقدا ئاگرێك بەئاستەم دەسوتاو سەرەکی جەردەکان نزیك ئاگرەکە بەبێ ئۆقرە بەسەر خۆیدا دەتلایەوەو وەك گا دەیبۆڕاندو هاواری دەکرد.

– فریام کەون. هەی هاوار فریام کەون.

جەردەکان یەکدووێکیان نەبێ ئەوانی تر بە لارەلار لە ئاگرەکە دووردەکەوتنەوەو دەهاتنەوەو دەستیان لە دووخێنەکەیان بەرنەدەدا، کابرای سەرەك جەردە هەردوو دەستی خراپ ئاوسابوون بەتایبەتی ئەو دەستەی کەبەناو هەگبەکەی سیمیاردا کردبووی، هەر پەنجەیەکی بەقەد ئاروێکی لێهاتبوو، هەردوو چاویشی لەناو روومەتیدا رووچووبوون، لەمە چاوی بەسیمیار کەوت پەلاماری دا کە دەستی ماچ بکات و ووتی:

– گەورەم. من کردبێتم تۆ نەیکەی دەخیلتم فریام کەوە.. پەشیمانم بێنە کەوشەکانت ماچ بکەم.

سیمیار داوای لە هێشا کرد لەنزیك ئاگرەکەدا راوەستێ و دەست لە هیچ نەدات.

هەروەها داوای لەوانە کرد کە هێشتا تووش نەبووبوون زوو بەکوندەو جەوەندە ئاو بێنن کۆچەڵەکەی ئامادە کردوو ووتی:

– رامەوەستن بەپەلە بەو کۆچەڵەیە زوو زوو ئاوبکەن بەدەمیانەوە.

یەکێك لەجەردەکان لەسەرەکەکەیان نزیك بووەوەو پێ ی ڕاگەیاندو وتی:

– گەورەم (گژەتیکە مردووە)..

کابرای سەرەك بەدەنگێکی ماندووی بێ هێز وتی:

– مرد..؟ گۆڕ بەگۆڕ بێ.. ئەو نەبوایە ئێمە وامان بەسەر نەدەهات:

گژەتیکەئەوجەردەیە بوو کە لەپەناوە بەبێ پرسی سەرۆکەکەی گەلێ شتی ـەکاروانەکە دزیبوو:

سیمیار تۆراخەکەی دەرهێناو تێی گەیاندن تا دەتوانن لێی بخۆن:

بەفرمانی سیمیار کابرای سەرەکیان لە ئاگرەکە نزیك کردەوەو تانزیك ناوکی ـڕوتیان کردەوە، هەندێ تۆراخیان دەرخوارد

داوبە سیراژەکە هەموو لەشیپێناوی، لەگەڵ ناوینی لەشی دا بەم جۆرە ـولندی:

– وادیارە ئەمە یەکەم جارتە جەردەیی دەکەی؟!.

– بە قوربانی ئەو دەستە پیرۆزانەت بم.. چۆن دەزانی؟!.

– دیارە پیاو ئەگەر بەتەواوەتی ویژدانی رەش نەبووبێتەوە وای لێ نایەت!.

– گەورەم من سەردارو بەگزادەی ئەم ناوچەیەم، تا ئێستا پێم شەرم بووە کاری وا بکەم، رێشم بە کەس نەداوە لە دەڤەری مندا کاری وا بکات، ئەمەش کە کردم ئەهریمەن ئیرەتی جولاندم وا بکەم..

سیمیار روانییە هێشاو بە کابرای وت:

– ئیرەت؟!.

– بەلێ ئیرەت چاوی پیاو کوێر دەکات.

سیمیار دەسە ئاوساوەکەی کابرای بەرز کردەوە و پەنجەکانی خستە سەر تەوێلی و وتی:

– ئەی نازانی ئەمانە بۆچی دروست کراون؟!

کابرا زوو لە مەبەستی قسەکەی سیمیار حاڵی بوو، بە قورگی پڕ لە هەنسکەوە وتی:

– ئەی چۆن نازانم!..

– ئەم دەسانە بۆ ئەوەن کاسپییان پێ بکەی، ئەو سەرەش بۆ ئەوەی بیری چاکی پێ بکەیتەوە، ئەو چاوانەش بەر پێی خۆتی پێ ببینی.. ئەی نازانی دەسێ کە درێژی بکەی و ڕۆزی و پارووی منداڵانی پێ تاڵان بکەی دادەوەشێ و بە ئاگری دۆزەخ نەبێ پاك نابێتەوە؟!.

– گەورەم لێم ببوورە.. ئەوەی کردم جارێکی تر نایکەمەوە تۆبە.

– ئەگەر وەك جارانت لێهاتەوە تۆبە دەکەی؟!.

– دەبم بە دەروێشی تۆ.. هەتا ماوم ئاڵقە لە گوێی چاکەت دەبم، کەمەندی خوا پەرستی لە مل دەکەم.

سیمیار داوای کۆچەڵەکەی خۆی کرد، کە بۆیان هێنا بە نووکی چڵۆسکێکی درێژیان کردو دایە بەر گڕی ئاگرەکە، تا تەڕایی تیا نەماو گەرم داهات، بە دەستی خۆی لەو کوندە ئاوەی کە بۆیان هێنا پڕی کردو کردی بە دەمی کابرای سەرەك جەردەدا.. چی خواردن و خۆراکیان هەبوو هەمووی سووتان و داوای لە وانی تر کرد هەر ئاو بخۆنەوە.. ئەوجا رووی بەلای سەرەك جەردەکاندا کردو وتی:

– ئێستا چۆنی؟..

کابرا هەندێ سەیری پەنجەو دەسەکانی خۆی کردوو وتی:

– ئەی پیاو خاسی خوا.. سڕیوونەکەی دەستم خەریکە نەمێنێ، ئەوەتانێ بە ئاسانی پەنجەکانی دەستم دەجووڵێنم..

– چاك دەبیتەوە.

– هەمووومان؟..

– هەمووتان بە مەرجێك..

– سەرم لە رێتە.. چاوم لەبن پێتە.. بفەرموو..

– لەمەو دوا رێ کەس نەگری.. ئەوەی لێرەوە تێپەڕی مێوانی ئێوەیە، ئەگەر دیارییەکیان دانێ وەری بگرە.. دەنا نەکەی کاری وا بکەی ئەگەر پەیمانم نەدەیتێ وابی، ئەوە تووش نابێتەوە.. دەنا ئەم دەردەی تووشی بووی بەرت نادات.

_پەیمان بێ..

سیمیار کۆچەڵەکەی خۆی بە دەست بۆی بەرز کردەوە و وتی:

_ئەم کۆچەڵەیەت دیووە؟.

_بەڵێ..

_ئەمە ئەمانەتە.. بالات بێ، هەرکات ئەهریمەن هەڵی نای کارێکی وەها بکەی رەوا نەبێ، یان هەر کات هەستت بە ئازار کرد، پڕ ئەم کۆچەڵەکەبە ئاوی پاك بخۆرەوە

_کابرا کۆچەڵەکەی لێوەرگرت و نایە سەر سەری و دووجار ماچی کرد. سیمیار بەر لەوەی هەڵسێ و لەگەڵ مێشادا بگەڕێتەوە هەندێ ئامۆژگاری کابرای سەرەك جەردەکانی کردو وتی:

_خوا ئەو چاوانەی بۆ داوییتی؟ بۆ دیتن.. ئەو دوو دەسە؟

بۆ کارکردن، ئەو لاقانە؟ بۆ رۆیشتن.. ئەو گوێیانە بۆ بیستن؟ ئەو دەمە بۆ قسەی باشکردن و خواردن و شتی تر وایە؟

_وایە..

_ئەوەی تۆ هەتە خەڵکی تریش هەر ئەوەیان هەیە، ئەوە ئیتر چ رەوایە رەنج و ماندووبوونی خەڵك بۆ خۆت دەبەی.

_گەورەم تۆبەیە..

- ئەوەی خوا بە خەڵکی داوە هەر ئەوەندەشی بە تۆ داوە چەند شت لە دەرەوەی لەشی خۆتدا دەبینی پتر لەوانەش شتی نادیاری لەناو لەشماندا دروست کردووە بۆ ئەوەی بیانخەینە کارو خۆمانی پێ بژێنین.. هەر کەس بەو شتانە سایەو پایەو خۆراك دەس نەخات یان نەیانخاتە لای خوا گوناهبارە، ئەگەر ئەو شتانە پەکدات و بەکاریان نەهێنێ و بیەوێ لەسەر خەڵکی تر بژی ئەوە ستەمکارەو خوا گیرۆدەی دەکات، لەناو لەشی ئێمەدا چەند ئامێر هەیە تا بۆ ژیان بیانخەیتە کار بگرە لەناو ئەم زەوییەی بەرپێشماندا ئەوەندە و پتریش فەڕ هەیە بۆ بەرهەمهێنانیان چاوەروانی کارکردنی ئێمە دەکەن، هەمووی گەنجینەیە چەند لێی دەربێنی کەم ناکات.. بەچی ئەو گەنجینە دەردەدرێ؟ بە هۆش کە لەناو سەرماندا هەیە، بە دەست بە لاشەمانەوە بەستراوە چەند لەو گەنجینەی پێدەربێنی فرە ترگەشە دەکات چەند بیانخەینەکار یاراو قاڵتر دەبن.

جا ئەگەر مرۆڤ ئەوەی پێی دراوەو لەناو لەشیایەتی لە کاری باشدا نەی خاتەکارو ئەو گەنجینەی لەبەر پێدا کە هەیە پێی دەنەهێنێ و خۆی بەختیار نەکات؟ ئەوەی وا نەکات گومڕایە، هەر کەس سکی خۆی بدا بەشانیداو بەتەمای رفاندنی رۆزی خەڵك بێ هەمدیسان ئەوە گومڕایە لای یەزدانی مەزن بەدو بەدکارە و نەفرەتی لێ دەکرێ، ئەو کەسانە سەر بە گرۆی تاریکین و چاویان بە روناکی ناکەوێت، نە خوا لێیان دەبوورێ نە زەردەشت ئاوڕیان لێ دەداتەوە تۆ سەیری تاریکی ئەو شەوەبکەکە هەمووومان دادەپۆشێ بۆ هەمووومانە ئەو ئاگرە کە تیشکی

حهاویْ بۆ هەموومانە کە بەیانی ڕۆژ هەڵدیْ خۆر تەنها لەسەر تۆو ناوچەکەی تۆ هەڵنایە بۆ هەموومانە.. وایە..؟

لەو کاتەدا کە سیمیار ئەو قسانەی دەکرد سەرەك جەردەکان هەستی دەکرد کە باری لەشی سووك دەبیْ و نووری یەزدانی لە جەری ناو سنگی رادەماڵی.

جەردەکانی تریش وردە وردە بە ئاو خواردنەوەو سیراژو تۆراخەکە چوونە سەر پێشاوەکەیان کەم دەبوونەوە. کابرا لە وتەکانی سیمیار حاڵی دەبوو ئەوهەر شتێکی دەوت ئەم وایدەزانی هەموو رەفتارە رابردووەکانی ئەمی داوەتە بەر تەقەڵی وتەکانی خۆی و بۆ ئەوان قسە دەهاویْ ئیدی وشەکانی پیر لەناو دەروونی کابرادا کسپەیان دەداو وەك چرایەك لەناو تاریکستانی ژوورەوەیدا هەڵدەواسران.. ئەو کە وای دەوت ئەمیش وردی نێونیگای ئەم دەبووەو هەستی دەکرد لە نێوچاوانیدا راستی و یەقین بریسکەیان دەدا، لە ئاست شەتاوەی ئەو نووری ناوچاوانەدا نەی دەزانی چۆن زاری بکاتەوە هەر ئەوەندەی پیْ وترا:

–بە قوربانت بم.. حەز دەکەم بە خۆت و کاروانەکەتەوە بێنە دەگای ئێمە خۆم و ئەو دێهاتانەی کەسەر بە منن بالآگەردانت دەبین، من خۆم دەکەمە پایەندازت لە ئەمرۆ بە دواوە من ئاڵقە لە گوێی تۆم، حەز دەکەم چەند رۆژێك میوانی من بن.

–نا تۆ چاکەت لەگەڵ ئێمەدا نەنواند با لەو سەرەوە بێینەوە، ئەگەر پێمان کرا دێینە لات بەو مەرجەی پەیمانەکەت نەشکاندبیْ جارێکی تر کاری وا بکەی خراپ گیرۆردە دەبی.

_پەنا بە خوا

سیمیار هەڵساو سەیرێکی ئاسمانی کردو روانییە هێشاو وتی:

_با بڕۆین ..

کابرا بەتەواوەتی هەستی بە چاك بوونەوە کرد،کەزانی سیمیار دەڕوا،وەك نەخۆش نەبووبێ‌هەڵسایەوە سەرپێ و تکای لێکرد کەبیانکەن خزمەتکاری خۆیان ..یان لەگەڵ خۆیان دا بیبەن، یان لابدەنەدەگاکەیان

سیمیار ئاوڕی لێدایەوەو پێ‌ی‌وت:

- چیم وت وابکە ..ئەودەربەندە ئەمانەتە لەئەستۆی تۆدا ڕێ‌ی کاروان و ڕێبوارانە ،نەکەی یەك ڕێبواری تیا ئەزیەت بدەی. دەنابەر نەفرەت دەکەوی!..

- قوربان ئەو دەربەندە ناوی(دەربەند دالأش)ەلەمەودوا ناوی دەبێتە(دەربەندی شاهۆ) تۆ شاهۆی، فریشتەی،ئەوینی، یاری زەردەشتی..

کەسیمیارو هێشا گەڕانەوە دوو زەلامی ئەوانیش بۆ گەیاندنەوەیان تابارەگاکەیان لەتەکیاندا چوون..

* * *

تێپەربوون بەناو ئەو دەربەندەدا بۆ کاروانێکی وەها کارێکی ئاسان نەبوو ولأغەکانی ئەو کاروانە چەندان جار بەبێ بارو بەتاك و بەجوت پییایدا تێپەڕیبوون و شارەزاییان تیادا پەیداکردبوو، بۆیە هێشا دڵنیابوو ئەگەر بە پارێزەوەهەریەك پێش ولأغی خۆی بکەوێ و هەنگاوبنێ تووشی گرفت نابن و بەئاسانی تێدەپەڕن...سەڵتە زەلام دەبوو وریا بێ و هەموو بیرو هۆشی بخاتە سەر شوێن هەنگاوەکانی و ئەوجاپێ بهاوێ، ترس و چاو کلا نەکردن دەستەبەری قوتاربوون، بوون لەو دەربەندو شاخە هەڵمووتەی بەرامبەردا، ئەوەی پێ‌ی بخلیسکایە یان ولاغێك چۆترمێکی هەڵەی بدایە،خەرەندەکەی خوارەوە قووتی

حدلو دەبوو بە خۆراکی قەلٚ و دالٚ، کاروانچییەکان ولأغەکانیان وا ئاملأندبوون کەیەك لەدوای یەك بەباری قورسەوە بەناو ئەو تەنگەبەرو شوێنە هەلٚدێرو ەطمووتەدا وەك بزنەکێوی‌ی ئاوس بەئاسپایی‌و لەسەرخۆ تێپەڕن..تائەو حریەندەیان بڕی و لەو شاخە سەرکەشەی بەرامبەر دەربەندەکە ئاو دیوو بوون، کاتێکی زۆروماندووبوونێکی پڕبەدڵخورپەی خەیلی نارەحەتیان چەشت کەگەیشتنە پێدەشتەکەی ئەودیو ، لەسەرکانی و میر غوازارێك باریان خست و حەوانەوە..

دەشتەکەی بەردەمیان بەمەودای بڕکردنی چاو ڕێگای هەمەلایەنی لەبەردەم ڕێبوارو کەسی ناشارەزادا رادەخست، لات وابوو خوانێکی تەختەو لەبەردەم شکۆمەندی ئەم شاخە سنگ دەرپەریوەدا راخراوە، رووبارەکەی نێوانیان قەیتانە مرواریی ئەو پەیمانە ئەزەلییەی نێوانیان بوو کەبەیەکییەوەبەستبوون، بەیەکتر حتاسران، لەم دانی ئاوی گیان و لەوبەرهەمدانی ژیان ..

ئەو تەپۆڵکە سەرقیتانەش وردە زارۆڵەی هەردووکیان بوون لەئامێزی حشتەکەدا بۆ کایەی خۆ نواندن لێرەو لەوێ پژابوون، لەچاو ئەو شاخ و دەشتەدا وابوون، لەچاو سیمیاردا ئەو دەشتەبەرینەو ئەوشاخە سەرکەشەو لەگەلٚ ئەو زوورگ و تەپۆڵکە قیتانەدا لەترازووی ئافەریدەبوونیدا ناگەنە ئاستی مرۆڤێك کەداریٚ دەچێنیٚ،ئاگرێك دەکاتەوە، ئاژەلٚێك دەلەوەڕێنیٚ،گۆرانییەك دەچڕیٚ، شمشالٚێك لیٚ دەدا، ڕێنموونی نابەلٚەدیك دەکات،یان کەسێك فێری شتیٚ دەکات..

هێشا هەستی کردبوو کە سیمیار لەو شوێنەدا لێیان جیا دەبێتەوە، ئەو شارەزا و بەلٚەد بوو لەوێوە دەشیٚ کاروان دەستی راست بگرێتە بەر چونکە ڕێگەی دەسی چەپ و ناوەراست بەرەو ئەو شارو گوندانە درێژەی هەیە کە ئەوەی کاروان پێیەتی لەو شوێنانەدا زۆرە و نافرۆشریٚ، کەچی لە دەڤەری مایەدەشتدا برەوی

هەیەو دانیسقەیە، ئەوەش کاروان دەیەوێ هەر لەوێ دەست دەکەوێ بۆیە دەبوو رێگەی لای دەستە راست بگرێن، سیمیاریش لە نزیکترین شوێنەوە دەست بە ئەراگێڵی بە شوێن زانیندا دەکات، کەواتە دەستی چەپ دەگرێت و لەوێدا جیا دەبنەوە.. هێشا لە غایلەی ئەو جیا بوونەوەدا بوو سیمیار چووە تەنیشتی و لێی پرسی:

– هێشا!.. برادەری ئازیز ئێستا ئێمە بەرەو کوێ روو دەنێین؟. ئەو دەشتە چۆن دەگریتە بەر؟..

پرسیارەکەی سیمیار هێشای بەرامبەر وتنی راستییەکی تاڵی وا راگرت، وتنی دەبووە مایەی لە یەکتری جیا بوونەوە ئەو دەیەوێ لە نزیکترین ئاوەدانییەوە دەست پێ بکات، ئەمانیش بە شوێن کڕین و فرۆشتندا دەگەڕێن دەبوو بۆ ئەو شوێنانە بڕۆن کە تیایدا قازانج دەکەن.. بۆیە هێشا زوو وەرامەکەی نەدایەوە بەڵکو بەرەو سەرو خواری دەشتەکە چاوی گێڕاو سەیرێکی پڕ مانای سیمیاری کردو وتی؟..

–ئەو دەشتە؟!.

–بەڵێ ئەو دەشتە.

دەستی لە مل سیمیار کردوو چاوی پڕ لە فرمێسك بوون، کە دەستی لێ بەردا سیمیار لەسەر پرسیارەکەی خۆی مکوڕ بوو، دەستی بۆ لای سەرەوەی دەشتەکە درێژ کرد وتی:

–ئاوا بڕۆین دەگەینە کوێ؟ دەستی بۆ لای خواروو ئاوەراست راکێشا..ئەی ئەگەر ئاوا بڕۆین دەگەینە کوێ؟.

-بەرەو سەرەوە بڕۆی چەندان شارو دێهات تووش دەبیٚ تا دەگەیتە تووران و شاری ختا، دەستی بۆ لای خوارەوە کێشا، لێرە شەودەرۆی زۆر دەرۆی تا دەگەیتە مایەدەشت و بێستوون زەمین و ئیلام.

-کاروان رووی لەکوێیە؟

-رووی کاروان بەرەو بێستوون زەمینە.

-کەواتە لێرەدا جیا دەبینەوە!

وتەی (لێرەدا جیا دەبینەوە)ی سیمیار کسپەی نەشتەرێکی تیژ بوو ناو هەناوی هێشای کوناو دەرکرد، تا ئەوکاتە نەیزانیبوو جیاوبوونەوەی ئازیزان ئەوەندە سەخت و جەرگبڕە..تائەو کاتە بەو جۆرە هەستەوە خۆی نەدیتبوو کەئەو کاروانە لەئەستۆی ئەودایە، هەروەها تائەوکاتە هەستی بەگرینگی دوور کەوتنەوەی کاروانەکەی لەدەگای هەورامان نەکردبوو،وائێستا دەزانی چ بارێکی گەورەی دەگای لەئەستۆ دایە نەبوونی سیمیار لەگەڵیانداچ بەو شاییەکی سامناکیان بۆ دروست دەکات، هێشاخراپ پەشۆکا ، هەرئەوەندەی بۆ هات بڵێ :

_ئەی ناکرێ لەگەڵماندا بێی ؟ لەکوێ ویستت جیادەبینەوە ..

_نزیکترین ئاوەدانی لێرەوە کوێیە؟ لای راستە یان لای چەپە؟.

_لای چەپە..

_من لەنزیکترین ئاوەدانییەوە دەست پێ دەکەم، کەواتە ئالێرەدا جیا دەبینەوە.. کاری ئێوە زوو پێك دێت و دەگەڕێنەوە..کەگەڕانەوە لەمنەوەپەیغام بدە:من دڵم لای هەمووانە، خوایاربێ هەموومان دەگەڕێینەوە، تۆ زوو، من درەنگ،تۆ بەباری قورسەوە من بەهەگبەی پڕەوە ..

هێشا دڵی پڕ بوو، قوڕگی تاساو هیچی پێ نەوترا ، چونکە دەیزانی هەرقسەیەك بکات سەر ناگرێت..ئەوەی ئەو دەیزانی ئەم پەی پێنەدەبرد، بڕیارەکانیشی بواریان بۆ هەڵوەشانەوە نەدەهێشتەوە، هەرئەوەندەی پێ کرا بڵێ

_ئەی چۆن بەکاروانچییەکان بڵێم کەتۆ نیازت وایە ؟..

_با خڕببنەوە خۆم پێیان دەڵێم

کاروانچییەکان لەدەور سیمیار و هێشا خڕبوونەوە..

ئەوجا سیمیار رووی تێ کردن و وتی:

_ برا ینە ..ئێمە هەموومان رۆڵەی یەك دەگاین هەمووشمان بەرِوی یەك نەرەین،هەمووومان کاروانچین..کاروان دەکەین شت لەدە گاوە دەبەین، بۆ ئەوەی شتی بۆ بێنینەوە منیش کاروان چیم وەك ئێوە وەڵێ ئەوەی من بۆ دەگای بێنمەوە وەك ئەوەی ئێوە بە ئاسانی نایەتەدی، کاتی دەوێ،پشووی درێژی دەوێ، گەڕیان و دەر بەدەری دەوەێ..سەیری خۆتان بکەن هەرکەس ئەم شتانەی هەیە:سەری هەیە کەیاگەی هۆش و پەی بردنە بەچاکەو خراپە،هەروەها یاکەی ئاوەزوو و زانینە..دڵی هەیە ئارامگەی سۆزو خۆشەویستی و ئازارو غەمە..گەدەی هەیە جێگەی خۆراك و خواردن و خواردنەوەیە..مرۆڤ بەساچاندنی ئەو سێ شتەتەواوە..ئەم کاروانەی ئێمە ئەگەر ئەوسێ شتەی تیا نەبێ ناتوانێ بەئەنجام بگات..کاروان سەرقافلەی پێویستە، ئەمە سەرە، خۆشەویستی دەگاو ماڵ و منداڵ وای لێ کردووین کاروان بەشەوقەوە بکەین، ئەمەدڵی کاروانە، کاروان بۆ ئەوەی بەردەوام بێ و نەکەوێت دەبێ خۆراك و بژێوی پێ بێ ئەمەش سك و گەدەیە..

دەگا لە خۆراك و سۆزو ئەویندا کەمیان نییە،ئەوەی کە ئەو پێی بۆی ئازووقەی هۆش و داناییە، چەندی هەبێ هەرکەمە، من دەمەوێ ئەوەی کەخۆمان

هەمانە بە وڵاتاندا بیگێڕم، هی وڵاتانیش خڕ بکەمەوەو بیخەمە سەر یەك و بۆ دەگای بێنمەوە..دەڕۆم بزانم خەڵك چی دەزانن، چۆن خوا دەپەرستن، چۆن کاردەکەن، هەڵس وکەوتیان لەچییەوە دێ، چۆن گۆرانی دەڵێن، چۆن مۆسیقا دەژەنن چی دەکەن، چی ناکەن؟ خۆمی پی فێردەکەم و وەك ئێوە بەدەستی قورسەوە بۆ دەگا دەگەڕێمەوە..

ئێوە بەرەو خوار بۆ کاروانی خۆتان دەڕۆن، منیش بەرەو سەرەوە دەچم لەوێوە دەست پێدەکەم لەگەڵ ئێوەدا نایەم،ئالێرەدا جیادەبینەوە.. حەزدەکەم گەردنم ئازاد بکەن و منیش بەدڵ وگیان، قۆناغ بەقۆناغ لەگەڵتانم، کە گەرانەوە بەگەورەوبچوکی دەگا بڵێن: یادیان دەکەم..هەموو لەناو دڵمدان.. خوا یار بێ پێیان شاد دەبمەوە..کەوای وت: کاروانچییەکان دڵیان پڕبوو، تائەو کاتە وایان زانیبوو لەم سەرو لەوسەرەوەلەگەڵیاندایە

سیمیار رووی تێکردنەوەو وتی:

_ ئێوە زوو دەگەر ێنەوە،خەمی رێتان نەبێ، بەخەڵکی دەگا بڵێن:سیمیار یادی هەمووتان دەکات بۆ هەر شوێنی رووبنێم ئەوانم لەگەڵدایە، چونکەئەوان لەناو دڵمدان، بۆ ئەوان خۆم عەواڵ و وێڵ دەکەم، لەمە گەیشتمە مەبەست دەگەڕێمەوە..

کاروانچییەکان حەپەسابوون وەك شاخێك بەسەریاندا تەپیبێ وا مات بوون، نەیان دەزانی چی بڵێن:

هێشا هاتە دەم و وتی:

_براینە.. کاك سیمیار تا ئێرە هات ئێمەی بەرێ کرد، ئەو کارێکی پیرۆز تری لەبەرە.. دەزانن ئەگەر ئەومان لەگەڵدا نەبوایە بەو ئاسانییە لە دەست ئەو

جەردانەی دوێنێ ی دەربەندەکە دەرچوونمان نەبوو! دیارە دەزانی لەمەو دوا ترس نەما، چوون و گەڕانەوەمان ئاسانە بۆیە لێمان جیا دەبێتەوە..

کاروانچییەکانیش وەك هێشا تا ئەو کاتە وایان دەزانی هەموو دەگای هەورامانیان لەگەڵە، وا لەمەو دوا لە دەگا دوور دەکەونەوە..

سیمیار دڵی دانەوەو وتی:

_بڕۆن لەئاسانەی خوادا بن، منیش دەڕۆم کە گەڕاینەوە خۆشی و خەنین دەخەینە سەر لێوی گەورەو بچووکی دەگاوە ئێوە بە نوقڵ و نەبات و دیارییەوە، منیش پڕ هەگبەکەم پەند و سەربوردەو بەیازو مەتەڵی خۆش و چیرۆکی منداڵان بۆ دەگا دەهێنمەوە..

هەموو مات بوون...

سیمیار شمشاڵەکەی بەر کەمەری دەرهێناو بەگەرمی بەزمی جیا بوونەوەی بۆ ژەندن و(هەی یار هەی یار) و سەرجەم گۆرانییەکانی منداڵی دەگای کرد بە ئاوازی ناسك و دڵرەفێن.. لەپاشدا شمشاڵەکەی کرد بە بەر کەمەری هێشاداو پێی وت:

– با ئەم شمشاڵەت پێبێ لەهەر شوێنێکدا تووشی تەنگانەو دڵتەنگی بووی فریات دەکەوێ..

کاروان بەرەو خوار کەوتە ڕێ و سیمیاریش بەرەو سەرووی دەستە چەپ ڕێی گرتە بەر لە پێدەشتەکەدا تا لەچاو ون بوون هەر ئاوڕیان لە یەکتری دەدایەوە.

* * *

# (٧)

سەرکردەی جەردەکان بەو جۆرە کە ئارەزووی خۆی بوو ئەو بەڵێنەی کە بە سیمیاری دابوو هێنایە دی!..

ئەوەی کە دەیویست دژ بە کاروانەکەی دەگای هەورامان بیکات وەلێ پێی نەکراو خۆی تووشی ئەو دەردە کرد کە ئەگەر سیمیار نەبوایە دەرچوونی لەو نەخۆشییە کوشندەیە کە گیرۆدەی خۆی و گرۆپەکەی بوو ئەستەم بوو، ئەوە بوو تۆبەی کردو پەیمانی دا جارێکی تر کاری وا نەکات، پاش ئەو رووداوەش ناوی خۆی نا(پیر وەسان بەگ) خۆی ناوی(وەسان بەگ) بوو، جل و بەرگێکی سپی وەك ئەوەکەی سیمیاری لەبەر کردوو زەنناری پیری لەقەد خۆی بەست و ریشی بەردایەوەو سەرو مێزەرێکی پیرانەی لەسەر نا.. داوای لە خەڵکی ناوچەکەی خۆی کرد کە بە(پیر وەسان بەگ) ناوی بێنن، گوایا بەسەر دەستی فریشتەی خوادا بووە بەو پیرەو وازی لە بەگایەتی هێناوەو لەمەو دوا رووی لەیەزدانە..

بە ماندوو بوون و ئارەقاوی ناوچەوانی ئەو خەڵکەی بەر دەستی بەدارو دەسەکی باخ و باخاتی ئەوان لە گوندەکەیدا پەرستگایەکی کردەوەو مۆغانێکی بۆ راگرت و جیرەی بۆ بڕینەوە، بۆ ئەوەی هەر قسەیەك کە بیکات یان هەر فەرمانێك بدات یان هەر خەونێك ببینێ، مۆغانەکە بەدان لە گەردنی خۆی راستسازی بۆ بێژێ و پینەیەکی ئاینی بۆ بکات و سەربووردەو بەیازەکانی باپیرەی بۆ بخاتە ناو

قاڵبێکی گاتا ئاسای ئاسمانییەوە و مۆرکێکی ئاینی بەسەرو بنیانەوە بنێ و ئەوەی نوکلی لێ بکات بە گومڕای بداتە قەڵەم.. ناوی دەربەند دالآشی کرد بە(دەربەند شاهۆ) لە زارکی ئەم دیووەی دەربەندەکە دا کێڵێکی دروست کردوو چەند کەسێك و یەکدوو کوولەکەی ئاوکێشان و کوندەیەکی ئاوخواردنەوەی دانابۆ ئەوەی هەر کاروانێك یان ڕێبوارێك لەوێوەتێپەڕیایە بتوانێ لەوێ بحەوێتەوە، ئەگەر دیارییەك یان شتێکی بدایە بەناوی پیرەوە یان بەناوی پەرستگاوە وەك دیاری لێی وەردەگیرا، یان ناچار دەکرا کە دەبوو شتێك بدات تا وای لێهاتبوو ئەوەی لەوێوە ئەو دیو بوایە سەرانەو گومرگی لێ دەسەنرا..پیر وەسان بەگ بەر لەوەی تۆبە بکات لە خەڵکی ناوچەکەی خۆی سەرانەو پووشانەو وەنانەو لاسانەو خەرمانانەو لەوەڕانەو هەوارانەو مارە بڕینانەو نیوەی شیربایی و دایکانەی وەردەگرت. ئێستا پەرستگاو مۆغانی بۆ خۆی زیاد کردووە، بەگایەتیەکەی خۆی لە ئایین پێچاوەو پۆشاکێکی فریودانەی خوا پەرستانەی لێ ئاڵاندووە ئەرکی زۆر بووەو فرەی دەوێ، جاران خەڵکی دەڤەرەکە لە ترسدا سۆخرەیان بۆ دەکرد ئێستا بووەبە مارێکی دوو سەرەو بە هەردوو لاپێوە دەدا، هەموو ڕەوش و بارەیەکی خەڵکەکە لەناو ئەڵقەو پەپکەی ئەو مارەدایە لە هیچ لایەکەوە ناتوانێ بڵێ لەل.. چەندان کاسەلێسی هەبوون کاریان ئەوە بوو کە(پیر وەسان بەگ) وەك بت بپەرستن و خەون بە سایەو پایەی خوا پێداوییەوەببینن و بۆی بڵاو بکەنەوەکە ئەو هیچ شتێکی لێ پەنهان نییەو لەمە چاوی نا بەیەکدا دەزانێ لەژێر لێفەی نووستندا خەڵك چی دەکەن و نیازیان چییە! وایان بۆ دەسازان و خۆیشی وای لێهاتبوو کە بڕوا بە وانە بکات کە تەکەڵە بازی بۆ دەکەن.. گەلێ جار پیاوەکانی لە دیوەخان و پەرستگاکەیدا ڕوو داوەکەی ئەویان وەك مۆدزەیەك بۆ مریدەکانی دەگێڕایەوە، کە گوایا پیر وەسان بەگ خوا

ویستوویەتی تاقی بکاتەوە تووشی بەڵایەکی ناگەهانی کردووەو لەبەر ئەوە لە ژێر باری ئەو بەڵایەدا خواپینی کردووە ددانی بەخۆیدا گرتووە خوا فریشتەیەکی خۆی ناردووەتە لای و لەو بەڵایە رزگاری کردووەو تۆبەی داداوەو ئەوجا وەك پیرێك،یان فرستادەیەك پیر وەسانی بۆ سەر خەڵکی ئەو دەڤەرەی خۆی رەوانە کردووەتەوە کە رێنماییان بکات.. کۆچەڵەکەی سیمیاری کردبوو بە نیشانەی فرستادەیی و مۆدزەکانی، بۆیە لە زیوی پاڵفتەی گرتبوووەك کەشکۆڵ دوو ئاڵقەی هەڵواسینی تێی خستبوو، ئەوەی نەخۆش دەکەوت دوو کەس بەرێزەوەدەیانبردە سەری و هەندێ ئاویان تێ دەکردو بە دەمی مردووەکەیانەوە نەدا یان چاك دەبووەوە یان دەمرد چاك بوونەوەکە لە سایەی فەڕو پیرۆزی کۆچەڵەکەوە بوو مردنەکەشی رووسووری بوو بۆ چوونە ناو ئاپندەوە! لەوێ بەمەبەست دەگەیشت و بە زمانی پاراوەوە چووە بارەگای یەزدان و زمانی بەیەکدا نەدەهات..

کۆچەڵەی لە دیوەخاندا لە پشت سەری خۆی هەڵی واسیبوو، ئەوەی کە نەهاتە ژوورەوە دەبوو سەربۆ پیرو کۆچەڵەکە دانەوێنێ، کە دەچووە دەریشەوە نەبوو بە پشتاو پشت بگەڕێتەوە، هەموو دەردو بەڵایەکی تریشیان بەو کۆچەڵەیە چارەسەر دەکردورۆژی چوارشەممانیش دەیانبردە پەرستگاو لەسەر سەکۆیەکی بەقوماشی سەوز داپۆشراو نزیك بە ئایرگاکەی پەرستگا دایان دەنا، بۆ ئەوەی ژن و پیاو زیارەتی بکەن ئەو کۆچەڵە ببوو بە سەرماییەکی وا تا ئەمرۆش هۆزی پیر وەسان بەگ شانازی پێوە دەکەن.

کە لە پیر وەسان بەگیان دەپرسی ئەرێ ئەوە چۆن بوو خوا بەو پایەی گەیاندی و ئەو خەڵاتەی پێدایت؟.

– دەیووت:

(یەزدان کە یەکێکی خۆش بوێ تاقی دەکاتەوەو ئەوجا کاری بۆ ساز دەدا، کارێکی وەها کەبەخەیاڵیدا نەهاتبێ من بۆ کابرایەك دانیشتبووم کە دەرسی دادەم ئەوەندە پێی خۆی رانەکێشێ ئەو تەختەیە کە دەیویست بۆ خۆی بیتاشێ و لافی لەسەر لێ بدا، خۆی بکاتە بە دێوزمە بەسەرمانەوە لە ژێریدا دەریبێنم و تەمێی بکەم تومەز ئەو کابرایە لای خوا شتێکی ترە ئەوەش منی خستبووە سەر ئەو فیکرە دیاربوو دەسیسەی ئەهریمەن بووە، ئیتر کە دەستم دایە کارەکە خوا تووشی کارەساتێکی وای کردم مەگەر هەر خۆم بزانم چتۆ کارەسات بوو، چونکە لە ژێر باری کارەساتەکەدا خۆم گرت و ستایشمەند بووم، لەدڵ خۆمدا وتم: خوایە لەم بەلآیە رزگارم بکە تا دەمێنم لەتۆ غافڵ نابم.

وام وت و نەمزانی ئەو فریشتەیە لە کوێوە و هات فریامان کەوت و ئامۆژگاری خۆی دامێ کە چۆن بم و چی بکەم تاقیکردنەوەیەك بوو خوا کردی و تیایدا سەرکەوتوو بووم، لەوە هەمووی سەیرتر ئەو کەسەی کە من دەمویست تەمێی بکەم لەگەڵ ئەو فریشتەدا هاتبوو، لە دوورەوە راوەستا بوو وا دیار بوو ئەویش کەمەند بەندی ئەو فریشتەیە بوو، رەنگە ئەو منی ناسیبێ وەلێ من تا نەگەڕامەوەماڵ خۆم ئەوم لەبیر نەبوو، لە دوایدا بۆم دەرکەوت ئەوە ئەو کەسە بوو! خواش دەزانێ کێ ناڵێ ئەوە تارمایی ئەو نەبووە. خوا خۆی بەندەی خۆی دەناسێ و دەزانێ کێ بکات بە فرستادەی خۆی..).

کەس لێی نەدەپرسی ئەو کەسە کێ بوو خەڵکی کوێیە؟ ئەگەر پرسیاری واشی بکردایە خۆی ئامادە کردبوو بە خەڵك بڵێ:هەندێ پرسیار هەیە دەستدانە لە کاری خواو نهێنییەکانی نابێ بووترێ و پرسیاری لێ بکرێ. کە سەر بووردەکەی بۆ خەڵگ دەگێڕایەوەهەندێ پیشی دەخواردەوەو مۆن دەبوو، دەسێکی ستایشبێژی بە دەم و چاو و ریشە تەنکەکەیدا دەهێنا. ئەوانەش کە گوێیان بۆ سەر بوردەکەی

ڕا دەگرت ئاواتیان دەخواست کە ئەوانیش یەکێك بوونایە لەوانەی کە لە تەکیدا بوون. سەربووردەکەی ئەوەندە وترا بووە، ئەوەندەدەماو دەمی پێ کرابوو ببوو بە یەقین و کەس یارای نوکلی لێ کردنی نەبوو!..خەڵکی دەڤەرەکە کەوتنە ژێر باری سەربووردەکەی پیر وەسان بەگەوە،سەرباری(پیر وەسان بەگ) خرایە سەر بارە قورسەکەی(وەسان بەگ)..لەگەڵ ئەوەشدا خوا وای پێ خۆش بوو وابێ، پاداشتی ئەو کلۆڵی و ئێش و ئازارو بار قورسییە ئۆمێدی ئایندەو دوارۆژ بوو! دەنا ئەوبارە قورسەی (پیر وەسان بەگ)ە بەکەس هەڵ نەدەگیرا، ئیتر خەڵکەکە بەئارەزووی خۆیان شانیان بۆ بارکێشان شلّ کردبوو،لەبارتەقایدا سەربووردەکەیان دەگێڕایەوەو دەنگیان نەدەکرد!..

* * *

کاروان گەڕایەوە، بەڵام بەو ڕێگەیەدا نا کە پیر وەسان بەگ ناوی نا(دەربەندی شاهۆ)..هەواڵ بەدەگا درا کەکاروان بەر لە ئاوابوونی ڕۆژ دەگاتە بەرەوە، خەندەو پێکەنین کەوتە سەرلێوانەوە،هاتنەوەی کاروان لەدەگادا دەنگی دایەوە، خەڵك بۆ پێشوازی کردنی کەوتنە خۆ، ئیتر زوو دەستیان لەکار بەرداو بەتاك و جووت ڕوویان کردە ماڵی خواجە بەهمەن، بۆ ئەوەی بزانن کاروان کەی دەگاتە بەرەوە بۆ ئەوەش پێشوازی بکەن، وردە زارۆڵە هەر لەزووەوە لەدەگا دەرچووبوون و بەگۆرانی و چەپڵە ڕێزان سەر ڕێگای کاروانیان گرتبوو، چاوەروان بوون..

نۆشاو کوڕە گێڕە چەتوونەکەی، بەئاواتەوە بوون کاروان تووشی جەردەو ڕێگران بووبن و بەخۆشی نەگەڕێنەوە! کەگەڕانەوەی کاروان لەدەگادا دەنگی

دایەوەو خەڵکەکە لە خۆشیان خرۆشان ئەژدەر گێرە گێر بەناو خەڵکەکەدا دەگەڕاوپڕو پاگەندەی بڵاو دەکردەوە کەگوایا بیستوویەتی کاروان تاڵان کراوەو هەندێ لەکاروانچییەکانیش کوژراون و هێشا بەدەستی بەتاڵ و باری سووکەوە گەڕاوەتەوە!..

ئەو قسە تاڵانە یەك تۆزقاڵە کاریان لە خۆشی خەڵکەکە نەکرد چونکە دەیانزانی کینە لە دڵان ئەو قسانە دروست دەکەن،و دەیانووت جا ئەگەر وابووایە کاروان لە کوێوە ڕۆیشتووە زوو لەوێوە دەگەڕایەوە..

هەنارخان وەك جاران نەمابوو کە سەرو بەری دەگای لە دەستا بێ و هەموو کارو فەرمانەکان وەك دەستە بەنێك لە دەست خۆی بکات و نەهێڵێ خێڵی نۆشا ببنە زیوانی ناو گەنم شیرینی لە خەڵك تاڵ بکەن. لەو ڕۆژەوە نازەنین مەرجی شووکردنی داهێنا هەنارخان تووشی جۆرە سەرکاسیەك ببوو چونکە هێشا مەرجەکەی بردبوەوە کەچی ئەو دڵی بۆ لایەکی تر لێی دەدا. جا ئەگەر لایدەیەك ئەو مەرجەی ببردایەتەوە چی دەکرد؟. ئەو جۆرە ختوورانە ببوونەسەراسیێ و وەر بوو بوونە ناو مێشکی و هێزی جارانی تیا نەمابوو وا ئێستاش لە غایلەی ئەوە دایە داخۆ ئەمرۆ هێشا کە دەگەڕێتەوە نازەنین چۆن پێشوازی لێ دەکات وەك کچە سەردارێك یان وەك دەسگیرانێك؟.خۆ ئەگەر ئەو کورە لەو کاروانەیدا بە سەرکەوتوویی گەرابێتەوە شایستەی هەموو شتێکە، کەچی خۆ سازدانی نازەنین ئەوە ناگەیەنی..

خواجە بەهمەن کە دی خەڵکەکە ئۆقرەیان نەگرت و بەرەو پێشوازی کاروان ملیان ناو چوون وای پێ پەسند بوو نازەنین وەك ئەو خەڵکە ئاسا پێش ئەو دایك و خوشکانەبکەوێ کەبۆ پێشوازی کورو براو کەسییان دەچوون، هەنار خانیش قسەی خۆی خستە سەر راکەی خواجەو داوای لە نازەنین کرد پێش ئەو ئافرەتانە

بکەوێت و پێشوازی کاروانەکە بەر لەوەی شاخەکەی ئەو بەر تیشکی ڕۆژئاوابوونەکەپایدۆستی لێ بکات.(جووڵە)کە پێشڕەوی کاروان بوو لە کەلەوە دەرکەوت و منداڵان کردیانە قریووەو گاڵەو گۆرانی وتن و هاواریان دەکرد، کاروان گەیشت جووڵە یەك بە یەك منداڵەکانی ماچ کردن و نوقڵ ونەباتی بەسەریاندا دابەش کرد.

کە زانی نازەنین خان پێشوازیان دەکات زوو خۆی گەیاندێ و مژدەی سەرکەوتن و سەلامەتی هەموو کاروانچییەکانی پێ ڕاگەیاند.

نازەنین لێی پرسی:

– هەموو ساغن؟.

– هەموو ساغین.. ئەم کاروانەمان لە کاروانی هەموو ساڵەکانی تر بەرەواج تر بوو، بارو بارخانەی پڕو کاڵای هەمەچەشنەمان هێناوە..

نازەنین بەو پرسیارەی دەیویست جووڵە بۆ شتێکی تر هەڵ بنێ کەچی ئەو لە وەرامەکەیدا بۆ لایەکی تر چوو، بۆیە پرسیاری لێ کردەوە:

– هەمووتان هاتوونەتەوە؟..

هێشتا نازەنین پرسیارەکەی تەواو نەکردبوو دایکی جووڵە دەستی لەمل ئاڵاندو پرسیارەکەی نازەنینی لە نیوەدا پچڕاند، هەموو خەڵکەکە بە گەورەو بچووکەوە لە جووڵە خڕبوونەوە، هەر یەك دەیویست هەواڵی کەس و کاروانچی خۆی لێی بپرسێت. ئەویش ڕووی لە هەموان کردو وتی:

– براینە خوشکینە دایکینە دڵنیا بن مژدەتان دەدەمێ هەموو ساغین بە باری پڕو قازانجێکی فرەوە و مشەمەرەوە گەڕاوینەتەوە. خواینتان هەبێ هەر ئێستا کاروان دەگات و کاکە هێشا هەموو شتێکیان پێ دەڵێ، وتەی(هەموو شتێکتان پێ دەڵێ) دڵی نازەنینی ڕاچڵەکاند یانی چی هەموو شتیکیان پێ دەڵێ؟ دیارە شتێك

هەیە مافی وتنی بەو نەدراوە. جوولە هەستی کرد نازەنین بە قسەکەی مات بوو.. بۆیە دیسان رووی تیٚ کردەوەو وتی:

– خانمی گەورەم دڵتان هیچ غایلە نەکات هەموومان ساغین و ئا..! دڵی نازەنین مینای بیٚگەرد بوو هەر وتەیەك بۆنی شتیٚکی لیٚ هاتبایە، لەسەر پەردەی دڵی ئەو دەبووە گەردو مانای خۆی دەدرایەوە، ئەوەتانیٚ جوولە وتی:

هەموومان ساغین و ئا..! ئەم (ئا) یە گەردی وتەکەیە، لەبەر ئەوە نازەنین لە زووەوە دڵی خەبەری بە شتیٚك دابوو وەلیٚ پەی پیٚ نەبردبوو، دەشی زانی تا کاروان نەگاتە بەرەو ئەو شتە نازانریٚ لەبەر ئەوە دڵی بە پیٚشوازییەکەی خۆی خۆش نەبوو، ئەوانەی لە دەوری بوون کە دەیاندی ناو جەمینی نا درۆشیٚتەوە و غەم دەردەدا، غەمەکەی کەوتە ناو خۆشییەکەی ئەوانەوەتۆزیٚ تەڵخی کرد..

جوولە وای وت خەڵکەکە لیٚی خڕبوونەوە هەر یەك دەیویست هەواڵی کەس وکاروانچی خۆی لیٚی بپرسیٚ ئەویش هەمدیسانەوە وتی:

– خەڵکینە مژدەتان بدەمیٚ هەموو ساغین و بەباری پڕو قازانجیٚکی فرەوە گەڕاوینەتەوە.

ئەوانە کە گوێیان لەو قسەیەی جوولە بوو لە پشت نازەنین راوەستا بوون بەتەمای ئەوە بوون پیٚیان بلیٚ شایی و هەڵپەرکیٚ بکەن بەڵام ئەو دەنگی نەکردو ئەوانیش بەبیٚ ئیزنی ئەو دەسیان نەگرت. دوای کەمیٚك چاوەروانی پیٚشەنگی کاروان دەرکەوت. هیٚشا وەك خورشیدی خاوەر سواری ئیٚسترە شیٚ ببوو لە پیٚشەوە دەرۆیشت، سەرو کڵاوێکی قیت و پۆشاکیٚکی رەنگینی سوپا سالارانەی لەبەر کرد بوو، ئیٚسترەکەی ژیٚری بەسەرجلی رەنگاو رەنگی گوڵەنگدار رازاندبووەوە وەك سەرکردەیەکی سەرکەوتووی جەنگ پر بە متمانەو لەسەرخۆ ریٚی دەبڕی و کاروانەکەش وەك پۆلە قولینگیٚك بە دریٚژایی ریٚ بە دوای کەوتبوو،

که هەستی کرد نازەنین لەگەڵ پێشوازیکاراندا هاتووە لە ولاغەکەی دابەزی و بەرەو نازەنین هات و رێزو نەوازشی وەك خزمەتکارێك بۆ نواند، ژنان‌و کناچان و زرۆڵە لە خۆشیاندا قریواندیان و نەیان دەزانی ئایا سەیری هێشاو نازەنین بکەن! یان بۆ هاتنە بەرەوەی یەکە یەکەی بارە کاروانەکان بڕوانن. ئەوەی ئەوان بیریان لێ دەکردەوە لای ئەوان ئەوە نەبوو ژوانی دۆست و دەستگیران نەبوو، لە دیداری نێوان سەرقافڵەی کاروانچییان و خانمێکی پایەدار دەرچوو. هەر کەس کەسی خۆی و کاروانچی خۆی و بارو ولاغی خۆی بەسەر کردەوەو کەوتە تەکیان. دوو ولاغەکەی ماڵ خواداد لە ژێر باری قورسدا نقەیان دەهات گوێیان قوت کرد بووەوە وەك بڵێی چاویان بۆ خاوەنی خۆیان دەگێرا، لاس و سانا مندالّ بوون ئاوەزوویێکی وایان نەبوو پێشیان کەون، هیچ کاروانچییەکیش ماچی نەکردن. نەیان دەزانی بۆ؟.

هەردوو ولاغەکەلەسەر خۆ و بێ پێچ و پەنا بێ ئەوەی کەس لێیان خوڕێ، یان رەشوویان بگرێ و پێشیان کەوێ گەیشتنەوە ناو حەوشەکەی خواداد کە پەسەند دی هەر دوو بارەکە کەسییان لەگەڵدا نیە، قیژاندی:

– ئەیەرۆ؟ کوا سیمیار؟ کۆسی کەوتەم، کوا سیمیار؟.

قیژەی پەسەند هەموو گەرەکی هروژاند بەسنگی رووت و پێی پەتیەوە بە قیژەو هاوار بەرەو ماڵی خواجە بەهمەن هەڵهات بۆ ئەوەی هێشا ببینێ و بزانێ بۆ سیمیار دیار نییە!. کە خەڵکەکە پەسندیان بەو رەوشەوە دی دەیقیژان:

– کوا سیمیار؟.

هەموو دەرپەڕین و بەرەو ماڵی خواجە بە شوێنی کەوتن خواداد لەگەڵ خواجە بەهمەن و پیاو ماقوڵندا خەریکی بەخێر هاتنەوەی هێشاو کاروانچییەکان بوون کە

گوێی لە قیژەی پەسەندی ژنی بوو هەوڵیدا دایمرکێنێتەوە بەڵام سوودی نەبوو هەر دەیووت:

- لێم گەڕێن بزانم سیمیار چی لێهات؟ هێشا چی لە سیمیار کردووە؟ سیمیار هەموو کاروانە هەموو دەگایە. هێشا کە گوێی لە هاتوو هاواری پەسەند بوو بۆی دەرکەوت هەڵەیەکی گەورەی کردووە، دەبوو خۆی هەردوو بارەکەی ماڵ خوادادی ببردبایەتە ماڵەوەو تێیانی بگەیەنێ کە سیمیار چی لێهات و بۆ کوێ چوو بەڵام ئاپوورەی خەڵکەکەو پێشوازیکارەکان ئەوەی لە بیر بردەوە وا بکات. بەر لەوەی پەسند دڕن بە ئاپوورەی خەڵکەکە بدات هێشا خۆی گەیاندێ و هەردوو قۆڵی ماچ کردو وتی:

- پورە پەسەند دڵنیا بە سیمیار لەمن و تۆ ساغترە پەسند کە هێشای وا دی، پۆشتەو پەرداخە ئەوەندەی تر سۆزی نەهاتنەوەی سیمیار ئاگری بەردایە هەناوی و هاواری کرد:

- راستیم پێ بڵێ.. راستیم پێ نەڵێی ئێستا خۆم لەم قوری بەردەرگایە وەردەدەم. هێشاو چەند کەسانێکی تر ویستیان دایمرکێننەوە بەڵام تا دەهات گەرمتر دەبوو، هەموو دەگا دەیزانی هێشا یاگەی هەموو نهێنی و رازو نیازێکی سیمیار بوو جگە لەوەش هەموو سەرکەوتنێکی هەموو هێزوتینێکی خۆی لە سیمیارەوە وەردەگرت.

لە راستیدا لە ناوەوە دەکوڵاو دڵی بەو خۆشییەی دەگا نەدەکرایەوە کە سیمیاری تیا نەبوو، کێ لەناو دڵی ئەودا بوو تا بزانێ چی لەدڵیا هەیە ئەو لای وابوو دەگای هەورامان بەوەوە دەگایە.. کەس وەکو ئەو لەو بڕوایەدا نەبوو کە ئەو لەهەر شوێنێ بێ دەگای هەورامان لەسەر شانیەتی، لەناو زاریایەتی لەناو ئاوازو بەزمی شمشاڵەکەیایەتی کێ ئاگای لە ناوەوەی سنگی ئەو هەیە؟. کەدی وا

ـپەسند بەكوڵ دەگری ئەویش لەناوەوە كوڵاو خەریك بوو قوڕگی لەناو هەنسكدا ـتاسیێ بەڵام لەبەر پەسند خۆی گرت دەم و چاوی خۆی گەشاندەوەو وتی:

– پوورە پەسند سیمیار ئێمەی فێری راستی كردووە ئەوەی راست نەبێ پێت ـڵێم ئەم كاروانە چوون و هاتنەوەی بە فەڕی ئەوە، ئێمەی بە سەركەوتووی ـردووەتەوە خۆیشی دێتەوە خواپینت هەبێ، كاروانی ئەو جودایە ئەو لە ژێر سێبەری یەزداندایەو پەیامبەری ئەوە هیچی بەسەر نەهاتووە و دڵنیابە.

خڕبوونەوەی خەڵكەكەو پەرۆش بوونیان بۆ سیمیار ئەوەندەی تر پەسندیان شلگیر كرد كە یەخەی هێشا بەرنەدات تا خواداد رووی كردە پەسندو بە توندی پێی وت كە دڵنیا بێ سیمیار هیچی لێنەهاتووە. پەسند لە قیژان و سنگ كوتاندن بوو یان بە قسەی هێشاو خودادی مێردی بوو، دەنگی گیراو كەوت.

خەڵكەكەش چەند بە پەرۆش بوون كە بزانن سیمیار چی لێهات ئەوەندەش هەڵوێستەكەی پەسند كاری تێكردن و بەیەك دەنگ دەیانووت دەمانەوێ بزانین سیمیار چی لێهات. یەكێك لەناو هەمووواندا دەنگی هەڵبڕی و وتی:

– كەس بار نەخات كەس زاركی جەواڵ و تێرو تلمیتی كاروان نەكاتەوە تا نەزانن سیمیار چی لێهاتووە ؟.

ئەوانەی كە دەنگیان هەڵدەبڕی و بۆ سیمیار پەشێو بوون بە قەد هەنارخان و نازەنین و ماڵی خواجە پەشێو نەبوون. بەتایبەتی نازەنین كە پێش كاروان گەیشتەوە ماڵ خۆی لە هۆدەكەی خۆی حەشار داو وەك دەسو پەیوەندی ماڵی خواجە ئامادەی رێورەسمی بەخێر هاتنەوەی كاروانەكە نەبوو. هێشا داوای لە هەموو كاروانچییەكان كرد خڕ ببنەوە، هەتا بە هەموویانەوە خەڵكەكە تێبگەیەنن كە سیمیار چی لێهات. كە هەموو كۆ بوونەوە هێشا رووی كردە خەڵكەكەو وتی:

– براینە.. خوشکینە.. کاک سیمیار بۆ ئەوە نەهاتبوو لە لەگ ئێمەدا کاروان بکات بۆیە هاتبوو تا لە تەنگانە رزگارمان بکات بۆ ئەوە هاتبوو ئێمە بخاتە سەر رێگەی بە سەلامەتی چوون و هاتنەوە (رووی کردە کاروانچییەکان) ئەو برایانە دەزانن تووشی چ بەڵایەکی ناکاو بووین و چۆنیش بەهۆی ئەوەوە رزگار بووین. دوای ئەوە لە ئێمە جیا بووەوە، نەمانتوانی نەهێڵین بڕوا بەر لەوەی لێمان جیا بێتەوە پێی وتین:

(براینە ئێمە هەموومان رۆڵەی یەك دەگاین، بە رووی یەك نەرەین، ئارووی برکێکین، هەمووشمان کاروانچین، ئێوە بە جۆرێك منیش بە جۆرێکی تر ئەوەی من بۆی دەچم وەك ئەوەی ئێوە نییە بە ئاسانی بێتە دی، کاتی دەویٚ پشووی درێژی دەویٚ گەڕیان و نامۆیی دەویٚ، من کاروان بۆ فێر بوون دەکەم فێربوونیش وەك ئاوی ژیان وایە، دەبیٚ بە شوێنیدا بگەڕی و خوایین و عەزیمەتی دەویٚ..).

وتی: ئەم کاروانی ئێمە بۆ بژێوییە، بژێوی بۆ لەشە کاروانی من بۆ بیر سازی و هۆشە دەبیٚ خۆراکی هۆشیشمان هەبیٚ نەبادا لەشمان تووشی دەڵبی ببیٚ و هۆشمان لە شوێن خۆی بمەییٚ.

وتی: دەرم سبەی دەگەڕێمەوە چەند بیرو هۆشی خۆمان هەیە دیبەم، ئەوەندەو پتر لەوەندەش لەگەڵ خۆمدا دێنمەوە. گەلیٚ لەو جۆرە قسانەی بۆ کردین گەلیٚ ئامۆژگاری کردین پێی راسپاردم کە بە گەورەو بچوکتان بێژم، ئێوە لەناو دلٚ ئەو دان.

لەو کاتەدا کە هێشا ئەو قسانەی دەکرد خواداد مامی سیمیار نزیك خواجە بەهمەن راوەستا بوو سەری بۆ راستبێژی وتەکانی هێشا دەلەقاند کە بەدەم سیمیارەوە بیستبوونی. هەنار خان مات بوو، نازەنین لە هۆدەکەی خۆیدا گوێی بۆ قسەکانی هێشا راگرتبوو. هەنار خان بیٚ دەنگی خوادادی وا لێك دەدایەوە بەر

ـوەی سیمیار دەست بەو ئاراگێڵییەی بکات خوادادی ئاگادار کردووەتەوە دەنا ـەر چی وابێدەنگەو لێی ناپرسی؟ تۆ بڵێی بۆ ئەوە نەبێ تا مەیدان بۆ هێشا چۆڵ بکات مەرجی دووەم بهێنێتە دی؟. گومان وا باڵی بەسەر هۆشیدا کێشا بوو ـ ڵەوە وای دەوت:

– خەمی کچی خۆمە وەك کۆترێکی وێڵ کەوتووەتە نێوان دوو هەڵۆوە گەمەی ـێ دەکەن. ئەو وای ئەجییای دەکرد کەچی خواجە بەهمەن بە جۆرێکی تر بیری لێ ـکردەوە پێی وابوو نازەنین گەمە بە هەردووکیان دەکات، سیمیار بۆیە خوی ـەرگێڵ کرد تا لەناو ئەو گەمەیە بچێتە دەرەوە و دڵی نازەنین یەکلا ببێتەوە. خوداد پەسندی خێزانی پێش خۆی داو بەمات و مەلوولی بەرەو ماڵی خۆیان گەڕانەوە، تا گەیشتنەوە حەوشەکەی خۆیان.

نازەنین لە هۆدەکەی خۆی هاتە دەرەوەو بە شوێن خوادادو پەسندا دەیڕوانی و لە دڵ خۆیدا دەیووت:

– شوورەی نەبوایە لە گەڵیاندا دەچووم.

خەڵکەکەش بە نیوە دڵنیاییەوە بلاوەیان لێ کردو هەر کەس بەرەو ماڵی خۆی ـووی نا. کەس وەکو نۆشاو ئەژدەری کوڕی دلارا نەبوون. بە گوێی خەڵکەکەدا ـیان چپان:

– ئا نەمان وت کێ بڕوا بەو کابرایە دەکات؟ خوا دەزانێ لە کوێ سیمیاری لە کۆڵ خۆی کردووەتەوە.مەیدانی بۆ خۆی چۆڵ کردووە ئەوانە کە بڕوا بە قسەی ئەو کابرایە دەکەن ساوان

* * *

ئەو ئێوارەیە دەگا وەك جاران زوو لەناو شەودا خامۆش نەبوو، ترووسکەی روناکیماڵەکان تا درنگێک هەر مایەوە... لەبەرچی بوو؟!.

لەخۆشی هاتنەوەی کارواندا بوو؟ یان لەخەمی نەهاتنەوەی سیمیاردا؟.

خواجە بەهمەن و هەنارخان و نازەنین هەرسێکیان بە یەکەوە دانیشتبوون چاوەروانی هێشایان دەکرد بێت و بەتەسەلی باسی چوون و هاتنەوەی کارونیانەکەیان بۆ بکات... گەلێ بەتاسەوەی ئەوە بوون باسی ئەو بەلآیەی کە تووشیان بووەو گەر سیمیار نەبوایە رزگاریان نە دەبوو!. بۆیان بگێڕێتەوە.

هێشا خۆی بە شاگردی سیمیار دەزانی، چەند سەرکەوتنی بەدەس بهێنایە لەخۆی بایی نەدەبوو، پتر فێری پەندو حیکمەتی دەبوو... کەهاتە دیوەخان هەر وەك قەتارچییەکەی جاران خۆی مرماند، بەروێکی گەش و رێزەوە رووی کردە خواجەو وردو درشتی چوون و هاتنەوەکەی بۆ گێرایەوە، بەتایبەتی کارەساتی جەردەکانی دەربەند دالآش... کە چۆن لەناکاو پەلاماریان دان و لە دواییشدا.

گیرۆدەی دەردێکی وەها بوون، بوون بە رموونن، ئەگەر سیمیار نەبوایە نەکاروان لەدەستیان دەردەچوو، نەجەردەکانیش لەو دەردە دەخلیسان.. هەروەها بە جوانی باسی ئەوەی بۆ کردن کە سەرەکی جەردەکان تۆبەی بەسەر دەستی سیمیاردا کردووە پەیمانی داوەتێ کە جارێکی تر کاری وانەکات.

خواجە لەو رووداوە سەری سوورماو بۆی دەرکەوت کە دیارە پەروەردەگار نیازێکی پیرۆزەو گەورەی بە دەگای هەورامان هەیەو دەیەوێ بەسەری کاتەوە، بۆیە ئەو گەنجە نازدارو دانایەی بە دەگا بەخشیوە .. ئەوەتا رۆژ بە رۆژ خەڵك شتی سەیرو سوڕهێنەری لێ دەگێرنەوە....

ئەوی ئەوە نەبوو نازەنینی چاك كردەوە!... ئەی ئەوە نەبوو چەند رۆژێك

ـەوبەر پیاوێك وارسی دیوەخانیان بوو، دەیوت(وەسمان بەگ)ی ناوچەی دالآش

ـچاوی خۆی مۆدزەیەكی دیووە، پاش ئەو مۆزدەیە تۆبەی كردووەو رووی

كردووەتە قاپی خواو ناوی خۆی كردووە بە (پیرەوسان بەگ)!...

گێرانەوەی ئەو بەلأیە كە لە رێدا تووشی كاروانەكەیان بووە و لەگەڵ ئەو

ـەواڵەی كابرایە سەبارەت بە وەسان بەگی دالآش لە هۆشی خواجەدا گرێبەند

ـبوون و بوون بە یەقینێك گەورەیی دەگاو هەڵكەوتەیی سیمیاریان لەناو هۆشیدا

چەسپاند، بۆیە لێوی پەشیمانی دەگەزێتەوە كە چۆن ئەوەندە بایەخی بەو كوڕە

جوانخاسە سیمیار نەدا ئەوجا زانی ئەو گەنجە لای خوا پایەیەكی بەرزی هەیەو

ـگینی دەگای هەورامانە دەنگێك لە ناخییەوە دەهاتو دەیووت:

- (ئەی ئەوە ئەو نەبوو كچەكەتی چاك كردەوە)؟.

هێشا دەسماڵێكی دێبای گوڵداری بە دیاری بۆ نازەنین كڕیبوو، وای پێ باش

بوو بە ئامادەبوونی خواجەو هەنارخان دیارییەكە بە ناوی سیمیارەوە پێشكەشی

بكات. دەسماڵەكەی لە بەركی دەرهێناو رووی كردە نازەنین و وتی:

- خانم ئەمە دەسماڵە دیاری سیمیارە لە باتی ئەو كڕیوومەو پێشكەشتی

دەكەم. نازەنین سەیرێكی هێشای كردو وتی:

- بە زەڕی خۆت كڕیوتە، یان بەهی ئەو؟.

- بەهی ئەو.

نازەنین دەسماڵەكەی وەرگرت وبۆنی كردو سەیرێكی تری سەرسورمانەی

هێشای كردەوەو وتی:

- نا نەهی ئەوە نە بە زەڕی ئەو كڕدراوە.

هێشا سەری سورماو بەو جۆرە نەوازشێكەوە وتی:

– خانم ئەو وای بە من وت.

– نا ئەو وای نەوتووە، ئەمە دیاری خۆتە.

– قەیدی چییە؟ دیاری منیش هی ئەوە

– وایە وەلیٚ لە بارەی منەوە تۆ هێشایی و ئەو سیمیار دیاری تۆ هی تۆیە هی ئەو جیایە. هێشا تا ئەو کاتە بە تەواودتی بۆی دەرنەکەوتبوو کە نازەنینیش لە ژیری و هەوڵکەوتەیدا هاوتای سیمیارە.

*　　*　　*

ئێوارە دووەمی پاش گەڕانەوەی کاروان، پیاو ماقوڵان و ریش سپیەکانی دەگا لە دیووەخانی خواجە بەهمەن کۆ بوونەوە، بۆ ئەوەی گویٚ لە هێشاو کاروانچییەکان بگرن چوون و هاتنەوەی خۆیان بۆ بگێرنەوە، دیوەخان گەرم بوو چاوەروانی مۆغانەکەی دەگایان دەکرد بگات کەچی هەر نەهات.هێشا لەسەرخۆ وەك حیکایەتخوانێك لە رۆژی دەرچونیانەوە تا رۆژی هاتنەوەیان بە وردی بۆی گێڕانەوە.هەموو بە تاسەوە بوون باسی رێگری ئەو جەردانەیان بۆ بکات چۆن بوو چۆن بەسەریاندا دان و چۆن لێیان رزگار بوون هەروەها مەبەستیان بوولە هێشاوە بزانن، سیمیار بۆچی لەگەڵیاندا چوو؟ بۆچی لێیان جیا بووەوە؟. بۆ کویٚ چوو؟.

هێشا بەتێرو تەسەلی باسی جەردەکان و ئەو دەردەی کەلە ئەنجامی ئەو کارە بە دەیاندا تووشیان بوو، چۆن پەنایان بۆ سیمیار هێنا چۆن فریایان کەوت لە دوایشدا چۆن بەسەر دەستی ئەودا تۆبەیان کرد کە جارێکی تر کاری وا نەکەن. هەمووی بۆ باسکردن لە دوایشدا لە کویٚ لێیان جیا بووەوە و چی پیٚ وتن و چ

ـسپاردەیەکی پێ ناردنەوە هەمووی بۆ گێرانەوە. ئەوجا هەموو داوایان لە هێشا کرد کە بۆیان باس بکات بەرای ئەو نیازی سیمیار لەو ئاراگێڵەیدا چییەو چی مەبەستە!.

ئەویش رووی کردە هەمووان و وتی:

– دڵ لە دڵ مەدەن سیمیار هەر هەنگاوێکی نابێ سرۆشێك جێ پێی روناك کردوەتەوە کاری بێ حیکمەتی نەکردووە ئەو کارە بچوکانەی کە ئێمە لەوەوە حماندین هەنگاوێکی بچوك بوون بۆ کارێکی گەورە، هەموو دانانی چراوگەی ‌رناك کەرەوەی رێگەیەکی دوورو درێژ بوون، جیا بوونەوەی لە ئێمە سەرەتای ئەو رێگەیە بوو کە لەو سەرەوە بە پان و بەرینی دەیگەیەنێتەوە دەگای هەورامان. جگە لەمام خواداد بڕوا ناکەم کەس هەبێ وەك من لە سیمیارەوە نزیك بێ و کونجێکی ناو دڵی بۆم کردبێتەوە، ناو دەروونی ئەو لاوە وەك بیابانێکی بێ سنوور وابوو، من ئەو کونجەم دەزانی ئەویتری خۆی و خوای خۆی دەیزانی چی تیایە..

ئەوەی من بیزانم یەزدان بەهرەیەکی گەورەی پێ بەخشیوە ئەو بەهرەیە لەو دەشتە برینەی ناو سنگی دا، نەبێ جێی نابێتەوە.. بڕواتان هەبێ نەمزانیایە ئەو کوڕە لای دەستێکی نهێنی یەزدانییەوە پارێزراوە، یان نەمزانیایە هەر کارێ کە دەیکا ئەنجامەکەی فەڕو خێرە بۆ هەموومان نەم دەهێشت بە تاق خۆی ئەو رێیە بگرێتە بەر. هێشا تۆزێ راوەستاو ئەوجا لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو.

– بڕواتان هەبێ ئەوەی من کردوومە ئازایەتی خۆم نەبووە بەڵکو تین و توانام لەوەوە وەرگرتووە، ئەو فێری دەکردم چۆن رەفتاری چاك بکەم، چۆن لەپێناو دەگادا کار بکەم، دەستی راستی درێژ کردو پەنجەکانی کردنەوەو لەسەر وتەکانی بەردەوام بوو چۆن ئەم پەنجانەم لەبەر چاومن، ئاواش شەو رۆژ ئەوم لەبەر چاوە،

ئەویش ئاوا هەمە دەم ئێوەی لەبەر چاوە. ئەوەی من لەوەوە دیومە، نازانم چۆنی بۆتانی بگێڕمەوە..

(ژیرلەی مەریٚ) یەکێك لەوانە بوو کە گوێی لە وتەکانی هێشا راگرتبوو سەیری هێشای کردو چاوێکی بە دانیشتواندا گێڕاو وتی:

– دەزانن ئەو کابرا جەردەیە، لە جەردە خراپتر بووە.دانیشتوان سەیری یەکتریان کردو مات بوون هێشا هاتە وەڵام و وتی:

– بەڵێ زانیمان، کوێیان دیٚشی بۆیە خۆیان کردە جەردەو هاتنە سەرمان هەر بۆیە کاکە سیمیار سەفەرەکەی خۆی لەگەڵ ئێمەدا کرد، تا لە گێچەڵی ئەو ریٚگرانە رزگارمان بکات. خواجە بەهمەن رووی کردە هێشاو وتی:

– سەرەك جەردەکانت نەناسی؟.

– ئەو کاتە نا چونکە هەموو دەمامکیان هەڵدابوو.

کاتێکیش پەنای بۆمان هێنا لەگەڵ سیمیاردا چوینە سەری دەم و وا ئاوسابوو دەتووت فوو دراوە من نەمناسی.

ژیرلە هەڵیدایەو وتی:

– خۆ ئێستا زانیت کێیە؟.

– بەڵێ زانیم..

– خۆ زانیت لەبەر چی بوو؟.

– بەڵێ زانیم.

یەکێك لە دانیشتوان رووی کردە هێشاو وتی:

– ئەی بۆ نایڵێن تا بزانین کێیە؟

هێشا رووی تێکرد.

– نا نایڵێم!.. کابرا تۆبەی کرد سیمیاریش داوای لێ کردم ناوی نەهێنم ھەڵەیەك بوو کردی و تۆبەی لێ کرد. خواجە بەھمەن و ھەنارخان و نازەنین لە ھاویشتنی مەبەستی قسەکانی ژیرلەو هێشا چاك حاڵی بوون و زانییان ئەو چرایە لە دەڤەری ھەوراماندا ھەڵگرساوە لەو دیوی شاخەکانیەوە شەوارەی بە ناحەزان کردووە.ئەوانەی لەوێ بوون زۆربەیان حاڵی نەبوون بۆ نەگەڕاوەتەوە، بۆیە روویان کردە خوادادی مامی و وتیان:

– داخۆ سیمیار بۆ سەری خۆی ھەڵگرتووە؟. پرسیارەکە وەك بەردێکی رەق وەھا بوو بە گوێی خوادادا درا، بۆیە بەتووندی بەر چەرچی بەم وەرامە دانەوە.

سیمیار سەری خۆی ھەڵ نەگرتووە بەڵکو رۆیشتووەو دەگای ھەورامانی بە کۆڵ خۆیدا داوە، بردوویەتی بۆ ئەوەی گەورە تری بکات بردوویەتی لە ھەگبەکەی بن کەشیایەتی کە گەرایەوە لە چەند ھەگبەیەکدا دەبێتە کاروانێك و دەیهێنێتەوە.ھەنارخان و نازەنین بە وەرامدانەوەکەی خواداد گەشانەوە.. (ژیرلەی مەرێ) بە وتە پڕ ماناو خەستەکەی خواداد دلارا بوو خۆی پێ رانەگیراو و رووی کردە ئەوانە کە هێشتا حاڵی نەبوو بوون و وتی:

– چووە سەری ئێمەی بردووە پڕی بکات و لەو سەرەوە کە گەڕایەوە بە پڕی بیهێنێتەوە، کە گەڕایەوە ئەوجا شایی گەورە بوونی دەگای ھەورامان دەکەین.. ئەوانەی کە هێشتا حاڵی نەبوو بوون لە ترس ئەوەی بەگێلیان نەزانن، بێ دەنگ بوون. نازەنین و هێشا چاك لە مەبەستە دوورەکانی وتەکانی خوادادو ژیرلە حاڵی بوون. شەو درەنگی بەسەردا ھات لە ھەموو روێکەوە باسی کاروان و نەھاتنەوەی سیمیار کرا، مۆغانەکەی دەگا ھەر نەھات، لەو رۆژەوە زانیبوی سیمیار رۆیشتووەو لەگەڵ کارواندا نەگەڕاوەتەوەو رێی فێر بوونی گرتووەتە بەر وای دەزانی پەرستگاکەی بووە بە ھەرەسی خەم بەسەریدا تەپیوە، ھەر ئەو خەمە بوو

لێی بوو بە نەخۆشییەك و ساڵی بەسەردا نەسووڕایەوە مردو پەرستگاکە بەبێ مۆغان مایەوە.

* * * *

## ( ٨ )

چەند ساڵێك هاتن و چوون، سیمیار چ هەواڵێكی نەبوو، دەگای هەورامان لە دایكێك دەچوو كوڕە تاقانەكەی ڕێی هات و نەهاتی دابێتە بەرو سۆراخی نەبێ، ئەویش دەستە ئەژنۆ بەدڵێكی پڕ بەخەمەوە لەبەر دەرگادا دانیشتبێ‌و چاوی لەرێی گەڕانەوەیدا ئەبڵەق بووبێ. لە چاو خوادادو نازەنین و هێشادا دەگا ئەو دایكە داماوە بوو، نە خوڕەی ئاو و نە خرمەی باران و نە ترپەی بەربوونەوەی كڵۆ بەفرو نە ئاوازی هۆزارو نە قاسپەی كەو و نە جوانی بەهارو نە قریوەی شوان و نە گۆرانی منداڵانی دەگا وەك جاران هەستی ئەوانەو ئەو كەسانەی كە سیمیاریان دەناسی نەدەبزواند، دەگا ئاشێكی ئاو لێ كەوتوو بوو، خواداد و نازەنین دەیانزانی دەگا جەستەیەكی بێ گیانەو هیچ شتێك ناگەیەنێ، نازەنین پێی وابوو دەگا بێ سیمیار پنتێكی فڕێ دراوی بێ مانای ئەم گەردوونەیە، هێشا وای دەزانی دارێكی رووتی بێ گەڵایە، یان لەشكرێكی تێكشكاوی بێ فەرماندەیە..
دوو كوڕەكەی خواداد (لاس و سانا) گەورە بوون دایكیان پەسەند دەیویست سیمیار ئاسا رەفتار بكەن، ئێوارەو بەیانیان مەڕو بزنەكانیان پێش خۆیان دەداو دەیانبردنە ناو پەرێزو پاوەنەكانی خۆیان و ئێواران دەیانهێنانەوە، لە كاتی بردن و هێنانەوەیاندا بارە باڕو سەركەشیان دەكرد،نازەنین بە دەنگدانی ئەو دوو كوڕە و باڕەی ئاژەڵەكان لەو ساتەدا بە یادی هاتوو چووەكەی سیمیارەوە لە

پەنجەرەکەوە وشکە سەیرێکی دەکردن و یادی ڕۆژانی ڕابردووی ئەو پەنجەرەو ڕوانین و زەردەخەنە جاویدانییەکەی جارانی سیمیار هۆشی دەبردەوە و ڕادەما..

خواداد چەند بەرەو تەمەن هەڵدەکشا بە ماریفەت و مەندوو بە ویقار تر دەبوو. لە ماوەی ئەو چەند ساڵەدا لە دڵەوە ئەوەندە خەمی دووری سیمیاری خواردبوو سەرو ریشی وەك ماش و برنجی لێهاتبوو، ئەوەی بیدیایە لە ئاستیدا ڕادەوەستاو شەرمی لێ دەکرد، خەڵکی دەگا گەلێ ڕێزیان لێ وەردەگرت و گوێ ڕایەڵی ڕاو تەگبیرەکانی دەبوون، دوای ئەوەی مۆغانی دەگا مرد ئەو سەرو کاری پەرستگاکەی دەکرد. خواجە بەهمەن بەتەمەندا چوو بوو، وەك جاران ئەوەندە خۆی بەکارو باری دەگاوە خەریك نەدەکرد، کاروباری ناو ماڵەوە هەنارخان سەرو کاری دەکرد، کاروباری دەگاش کەوتبووە سەر ئەستۆی نازەنین. شووکردن و شوونەکردنی لە دوولاوە نازەنینی تووشی خەم کردبوو ئەو شەوق و جوانی و گەشییەی کە هەیبوو ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو کزی و سیس بوون دەچوون.

نازەنین وەك فەرماندەیەکی کارامە لە جیاتی باوکی کاروباری دەگای بەڕێوە دەبرد، خەڵك بە شانازییەوە ملیان بۆ ڕاو تەگبیرەکانی کەچ دەکرد، هەمەدەم پرس و ڕای بە پیاو ماقوڵان و (مەرێگا) دەکرد، لەبەر ئەوەی خۆی فەرماندە بوو، لە ژن هێنان و شوکردندا پرس بەو و بە دایکی و خواجە دەکرا، ئیتر کەس خۆی لە بواری نازەنین نەدەدا. هێشاش ئەوەی بە خەیاڵیدا نەدەهات مەرجەکە بوو، خۆی بە خاوەنی نەدەزانی خەڵکیش ئەوەیان لا ڕەچاو ببوو کە شووکردنی نازەنین بەستراوە بە هاتنەوەی سیمیارەوە. چونکە هێشا هەر خۆی بە کاروانچییەکەی جاران دەدایە قەڵەم.. سیمیاریش وێڵەو خوا دەزانێ دەگەڕێتەوە یان نا؟.

نازەنینیش سنگی خۆی کلۆم کردووەو بۆ کەسی ناکاتەوە، خواجە بەهمەنیش قڕو قاپی لێ کردبوو نقەی لێوە نەدەهات. هیچ نەبێ بڵێ:

- ئەریّ مەرجەکەی نازەنین و هێشا چی لیّ هات؟.

دەگاش لەو باوەرەوە چاوی لەدەم خواجەو هەنارخان ونازەنین و هێشا بوو، وەك لەناو کوپەڵەی خەفەبووندا سەری نرابێتەوە وابوو.

هەنار خان ئاواتی ئەوە بوو زاوایەکی وای هەبیّ کارسازی خواجەو جوانی و سەلاری خۆی و ماریفەت زانی نازەنینی تیا بەدی بکریّ. لە هەموو دەگاو حقەرەکەدا ئەوەی ئەو نیشانانەی تیا بەدی بکرایە تەنها سیمیار بوو ئەوجا هێشا، ئەوانیش چەند نزیك بوون هەر بە دوور دەبینران. ئیتر خەم باری هەنار خانی قورس کرد بوو، هەستی دەکرد وەك جاران نەماوە بە سووك و ئاسانی خۆی بەسەر پێوە ناگریّ، هەردوو لاقی قورس ببون بە ئاسانی بۆی نەدەجوولاّن، بەتایبەتی لاقی راستی، شەپلّەیەکی سووك لیّی دابوو، وەك جاران نەی دەتوانی پێشوازی مێوانەکانیان بکات و لە دیوەخاندا لەگەلّیاندا دانیشێت و گویّ لە رازو نیازەکانیان بگریّ،چەندان حەکیم و داو و دەرمان چارە سەریان نەکردبوو، ئەو رەوشەی مالّی خواجە وای کردبوو حەز بکات نازەنین شووی بکردایە، تا بتوانیّ بە ئاسانی کارو باری مالّ و دەگا بەرِێوە ببات.

تازە بەتازە خواجە بیری لە مەرجەکەی نازەنین دەکردەوە کە کارێکی ئێجگار راستی کرد شووی بە کەسێکی لایدە نەدەکرد.

- ژیرلەی مەریّ - گەورە ریش سپی و خەمخواری دەگا بوو، دەیزانی هەنارخان بۆیە گرفتاری ئەو دەردە بووە، ئەو دوو دلّیە وای لیّ کردووە کە بەتەواوەتی بۆی ساغ نەبووەتەوە بەکام لەم دووانە شوو دەکات، سییمیار؟ یان هێشا؟.

ژیرلەی مەریّ بۆ دەرفەتیّ دەگەرا ئەومەسەلەیە یەکلا بکاتەوە، هەم هەنارخان لەو دلّەراوکێیە رزگار دەبیّ، هەم خەلّکی دەگاش ئەستێرەی بەختی سەر کەلوی

نازەنین دەسنیشان دەکەن. ئەوهاتبووە سەر ئەو بڕوایە  ئەو یەکلا نەکردنەوەی نازەنینە بووەتە هۆی سەرەکی کە هەنارخانی تووشی ئەو گرفتە کردووە.

ژیرلە بۆ ئایندەی دەڕوانی چونکە لەوە دڵنیا بوو ئەوەی دەبێتە هاوسەری نازەنین ئەو کەسەیە کە دەبێتە سەرداری دەگاو جەڵەوی هەموو دەڤەرەکەی دەدرێتە دەست، بۆیە حەزی نەدەکرد هاوسەری نازەنین یەکێکی لایدە بێ و لە خۆیان نەبێ، ئەوەشی دەزانی دەگای هەورامان وەك ئەو دەگایە نەمابوو کە جاران خواجە بەهمەن بە ئاسانی سەروکاری دەکرد،بەڵکو بە هێشاو نازەنینەوە گەورە بووە، داخۆ کە سیمیار بگەڕێتەوە چەندی تر گەورە دەبێ، رەنگە وای لێ ببێ ببێتە ئەستێرە گەشەی ئاسمانی هەورامان.

*          *          *

خواجە بە تەکبیری نازەنینی کچی ناردی بە شوێن پیاو ماقوڵانی دەگادا کە ئێوارە لە دیوەخان کۆببنەوە.ژیرلەی مەرێ ئەو کۆبوونەوەی بە هەل زانی، ویستی خۆی و خەڵکی تر لە شووکردنەکەی نازەنین دڵنیا بکات. پشتێنێکی سپی کە بۆ ئەندامانی مەرێگا دروست دەکرا لە دەسماڵێکی سپی پێچاو لە باخەڵی خۆی نا..دیوەخان گەرم بوو، جمەی دەهات هەنارخان دەبوو لە دانیشتندا پێی راکێشێ، پێی جوان نەبوو وا لە دیوەخاندا دابنیشێ، خۆی نازەنینی نارد کە لەگەڵ باوکیدا سەبارەت بە مەبەستەکانی ئەو کۆبوونەوە راو تەگبیری ئامادەبووان وەربگرێ، خەڵکی دەگا وا راهاتبوون لە کۆبوونەوەکانی دیوەخاندا گوێ لە راو تەگبیری هەنارخان رابگرێ، کە خواجەو نازەنین ئامادەی دانیشتنەکە بوون،

خەڵکەکە چاوەڕوانی هەنارخانیان دەکرد بێت تا تین و توانا بە دانیشتنەکە ببەخشێ، تا گەڕانەوە ماڵێ هەواڵەکانی دیوەخان بە نیوە چڵی نەبەنەوە، خۆ نازەنین گەلێ لە دایکی بەبیرو هۆشیار تر بوو، کەچی خەڵکەکە لەسەر راو تەگبیرەکانی هەنارخان دەقیان گرتبوو، جگە لەوەش ئەو دایکی هەمووان بوو، دانیشتنی دیوەخان بەبێ ئەو جاری وا دەبوو دەبووە گەڕەلاوژێی مندالآن لە کاتێکیدا کە ئەو دادەنیشت بە نۆبەو لە سەرخۆ بە گوێ رایەڵی قسەیان دەکرد.

خواجە بەهمەن دەسکردی هەنارخان بوو، هەر ئەو دەیتوانی سەری هەموو تەگبیرێك یەکلا و بەرەبین بکات.

(ژیرلەی مەری)ێش بەبێ هەنارخان قەریحەی نەدەکرایەوە، کە خواجە ویستی قسە بکات ژیرلە وتەکەی راگرت و وتی:

– ئەریێ خانمی گەورەمان کوا؟.

ئەو لێپرسینەوەی ژیرلە کسپەیەك بوو هەناوی خواجەی هاژاندو رووی کردە نازەنین و وتی:

– نازەنین لە هەنارخان تێیان بگەیەنە.

رووەمەتی نازەنین لەبەر تروسکەی گڕی ئاگرەکەدا دەدرەوشایەوە کە ژیرلەی مەریێ ئەو پرسیارەی لێ کرد هەلآوێکی خەماوی لە ناخیەوە هات و سەر گۆنای رژکان، بە حەزمەتەوە رووی کردە ژیرلەو وتی:

– لالۆ هەواس.. هەنارخان لەبەر پێی ناتوانێت بێت، حەز ناکات لە ئاسنەی ئێوەدا پا راکێشێ، من لە باتی ئەو بەخێر هاتنتان دەکەم. ژیرلە کە گوێی لە وتەکەی نازەنین بوو گەلێ پەرۆش بوو بۆیە وتی:

– ئەو نایەت ئێمە دەچینە لای.. ئەی ئەو دایکی هەموومان نییە. (رووی کردە دانیشتوان و وتی):

- چی دەڵێن؟.

هەموو بە جارێ:

- وایە ئەو نایە ئێمە دەچینە لای، هەر فەرمانێك رای ئەوی لە گەڵدا نەبێ وەك داری بێ بەر دەبێ. ژیرلە رووی کردە نازەنین لە دەوری خڕ دەبینەوە یان ئەو دێتە لامان قاچی دەخاتە سەر چاومان.

نازەنین وتی:

- لالۆ.. من لە جیاتی ئەو ..

- نا تۆ لەجیاتی خۆت سەروەری کناچانی هەورامانی، ئەو هەورامانە سەروەری گەورەو بچوکمانە، بەبێ ئەو گوێ لە قسەی کەس ناگرین ..

خواجە بەهەمەن بەوتەکەی ژیرلەی مەرێ بە رواڵەت گەشایەوە، لەناویشەوە بۆ ئەو رێزو پایەی هەنارخان لەلای خەڵك خەریك بوو لەخۆشیاندا گریان بەسەریا زاڵ بێ .. دەمی بەیەکدا هات و هەرئەوەندەی بۆ وترا:

- ئەی من ؟!..فت؟!.

ژیرلە وتی:

- ناگەورەم، تۆ کۆڵەکەی دیوەخانی، دیوەخان پشت و پەنای دەگای هەورامانە.. ئێمە وافێر نەبووین دیوەخان بەبێ خانمی گەورە گەرم بکەین.. قسەلەسەر هەرشتێ بکەین خانمی دەگاقسەی لێوەنەکات وەك توێشەی سەفەرییەك وایە نانی تیا نەبێ ..

دانیشتوان وتەکانی ژیرلەیان گەلێ لا پەسەند بوو، هێشاو نۆکەرەکانی تر بۆ هەنار خان خەریك بوو دەست بەگریان بکەن..

خواجە کەزانی خەڵکەکە زۆر بەهەنارخان پەرۆشن، فەرمانی بەنازەنین دا کەهەنار خان بێنن.. کەوەختێ هێنانیان دووکەنیزەك چووبوونە بن کەشی و

گلۆکێکی خەڕاتیلەدارگوێز تاشراوی بەدەستی راستییەوە درابوو، کەخەڵکەکەبەوجۆرە چاویان پێ کەوت لەبەری هەڵسانەوەو ئەوەندەی نەمابوو ـلیکە ڕۆی بۆ نەکەن.. هەندێکیان خۆیان پێ رانەگیرا بەخوڕفرمێسک بەچاویاندا ـحاتە خوارەوەو قۆڵیان ماچ دەکردو دەکشانەوە، ئەویش دڵی دەدانەوەو ـدەیووت:

- هیچ نییە.. خوا یار بێ بەم زووانە چاك دەبمەوە.. ئەگەر چاکیش ـنەبوومەوە، ئێوەو ماڵ و منداڵتان، خۆتان دەگای هەورامان سەلامەت. وای وتوو ـهەموویان دڵیان پڕ بوو..

((تۆ خوا ئەگەر دڵی خۆتان سەخڵەت بکەن ))..

هەنار خان کەدانیشت هەردوو کەنیزەکەکە لەبەر چۆکیدا دانیشتن، ئەویش لاقەکانی لەسەر کۆشی یەکێکیان درێژ کرد، ئەوی تریان خۆی کرد بەپەنای چۆکەکانی و لەتەنیشت نازەنین دانیشت و ئەوجار بەخێر هاتنی یەکەیەکەی پیاوەکانی هێناو ئەوانیش دەستی ڕێزلێنانیان بەسنگیانەوە بۆ گرت.. ئەو هەر ـدەیووت:

- تۆ خوا شەرمەزارم مەکەن بەخوا من باشم، بەچاو پێ کەوتنی ئێوە چاك بوومەوە!..

ژیرلە لەهەموو کات فرەتر شکۆمەندی هەنار خانی بۆ دەرکەوت وای دەزانی هەنارخان یەکێکە لەهەشت فریشتەکەی ئەمرۆمەزدا کەگەردوونیان لەسەرشانە..

ژیر لە بەروویەکی خەماوییە روانییە هەنار خان و وتی:

- خۆزگا ئەمرۆ مەزدا ئەودەردەی تۆی دەخستە سەر من..

- تۆ خوا وا مەڵێ.. هەڵبەتە شایستەی ئەوەم وام لێ بێ

- جا ئەگەر تۆ شایستەی ئەوەبی! دەبێ ئێمەبین بە کۆتەرە ..

- هەرکەسەو بەشی خۆی، رازیم بەبەشی خۆم .. خەم مەخۆن چاك دەبمەوە.. بەچاوپێکەوتنی ئێوە هەست دەکەم ئازارەکانم سووك دەبن.

هێشاو چەند گەنجێکی تر بەپێوە راوەستابوون..

هەنار خان رووی تێکردن و داوای لێ کردن بەپێوەرانەوەستن و دانیشتن بەڵام لەبەرشکۆمەندی ئەو و گورەیی‌دانیشتوان هەر بەپێوە مانەوە..هەنار خان کەزانی هەموو بەنەخۆشییەکەی ئەو تاساون و چاوەروانی خواجە دەکەن بە وتەیەك بێدەنگییەکە بشکێنێ ئەوجا رووی کردە هەمووان و وتی:

- دەی فەرموون بزانین باسی چیتان دەکرد؟!.

خواداد لەجیاتی هەمووان وتی :

- چاوەروانی تۆمان دەکرد وەشڵەی وەها تۆمان نەدیبایە..

- نا..هەروا دەبێ..دنیاوایە، من دەڕۆم یەکێکی تر دێ..

- خوا نەکات..

- کێ دەزانێ سبەی چی دەبێ دنیا دەوران، دەورانە، خەم ناخۆم ((ئاردێم وتێو سووریم متێ)) تەنها خەم بۆ ئەو ئاواتانە دەخۆم کەتاماوم بۆم نەیەنەدی..خواداد لەو مەبەستانەی کەهەنارخان لەناو ئاوەتەکانیدا حەشاری دابوون باش حاڵی بوو، بۆیە بەدڵێکی گەشەوە وتی:

- خوا یار بێ ئەویش دێتە دی..

کەس لە وتەکەی(ئەویش دێتە دی)یەکەی خواداد وەك هەنارخان و نازەنین و هێشا تێنەگەیشت. هەنارخان لەوە زیاتر نەدوا، هەلی بێدەنگی بۆ خواجە رەخسان بۆ ئەوەی قسە بکات.

خواجە کە زانی دانیشتنەکە بێدەنگی بەسەردا کشاوە و هەموو رووی دەمیان لەو کردووە، چاوێکی بە هەموویاندا خشان و بەخێر هاتنی هێنان و وتی:

– ماوەیەکە بەم جۆرە چاومان بە یەکتری نەکەوتووە، حەز دەکەم چی هەیە بەیەکەوە قسەی لەسەر بکەین. چی شك دەبرد کە بیڵێ لەناو مێشکیدا خڕی کردەوەو هەندێ بێ دەنگ بوو تا هەناسەیەك وەربگرێ، ئەوجا لەسەر قسەکەی ڕۆیی و وتی:

– با لەلالۆ هەواسەوە دەست پێ بکەین، چونکە ئەو لە هەموومان بەتەمەنترو دنیا دیدەیە. ژیرلە هاتە دەم و وتی:

– من داوام لە ئێوە نەکردووە کۆ ببنەوە تا ئەوەی لامە بیخەمە بەر دەستان، فەرموو ئێوە چیتان گەرەکە بیڕژنی، ئەوسا منیچ ئەوەی دەیزانم دەیخەمە روو. خواجە رووی کردە خواداد ئەی تۆ چی یەژی؟.

– منیچ رام وەك رای لالۆ هەواسە، بابزانین ئێوە چی دەفەرموون ئەوجا ئیمەیچ ئەگەر شتێکمان لا هەبێ دەیخەینە سەر شتەکان. خواجە رووی کردە هەنارخان و وتی:

– تۆ چی دەڵێی؟.

– من لام پەسندە (روانییە پیاوەکان) لەوێوە دەست پێ بکەین.

– لە کوێووە؟.

– لە ریش سپیەکانەوە.

نازەنین هاتە دەم و وتی:

– منیچ هەر وام لاپەسندە.

خواجە چاوێکی بەهەمووواندا گێڕاو وتی:

– ئێوە چی دەڵێن؟.

ریش سپییەك هاتە دەم وتی:

- ئێمەیچ وەك خواجەو خانمی گەورە وتەنی، دەڵێین لە گەورە ریش سپییانەوە دەست پێ بکەین. خواجە رووی کردە لالۆ هەواس و وتی:

- هەموو لەگەڵ دەنگی خانم دان. هەموو روویان کردە ژیرلەو هەستیان راگرت کە قسە بکات. ژیرلە پیاوێکی کەم دوو بوو، لەکاتی پێویستیدا نەبوایە قسەی نەدەکرد، کەدەشی کرد وەك خۆی وتەنی شتی بن بەرەی دەخستە سەر بەرە..

- کە وای لێهات من دووشتم گەرەکە، یەك گەڕان بەشوێن حەکیمێکدا بێت خانمی گەورەمان بۆ چاك بکاتەوە. دوو دانانی یەکێك سەروکاری پەرستگاکەمان بۆ بکات، نەهێڵێ ئایری ئۆجاخمان دامرکێتەوە تا مۆغانێکی دانای بۆ دادەنێین.

خواجە بە دوو پێشنیارەکەی ژیرلە دڵشاد بوو وەك هەتاوێك لە ناخییەوە هەڵهات و شەوقی لەسەر دەم و چاوی دایەوە، رووی کردە هەمووان و وتی:

- ئێوە چی دەڵێن؟.

هەندێ لەبەر خۆیانەوە دەنگیان هەڵبڕی:

- ئێمە ئەوە دەڵێین کە لالۆ هەواس وتی:

خواجە رووی کردە خواداد:

- تۆ چی دەڵێی؟..

- ئەوەی لالۆ هەواس وتی، سەرتۆپی هەموو شتەکانە دەڵێی بەناو دڵی هەمووماندا گەڕاوەو جگە لەوەشتی تری تیا نەدۆزیوەتەوە، ئەی ئێوە چی دەڵێن؟.

خواجە وای دەزانی لالۆ هەواس پەردەی نهێنیەکانی ئەوانی لا داوەتەوە ئەوانیش هەر ئەو نیازەیان هەبوو کەوا بڵێن چونکە یەکەم شت کە ژیرلە وتی پەیوەندی بەوانەوە هەبوو حەزیان نەکرد بە دەم خۆیان بیڵێن. هەر چەند نەریتی

ـیوەخان وەها بوو گەورەو ریش سپی هەموویان دەرگای باس و خواز بکاتەوە.

خواجە بەهمەن رووی کردە هەنارخان:

– نازانم هەنار چی دەڵێ؟.

هەنارخان کە هەستی بە خۆی کرد بە شکۆمەندی ئەو خەڵکە دەورە دراوە لە خۆشیدا خەریك وەك پەرییەك باڵ بگرێتەوە و ئێش لە لەشیدا نەمێنێ بۆیە وتی:

– توخوا خەمی منتان نەبێ. ئەی نەموت بەم زوانە چاك دەبمەوە.. حەزناکەم خۆتان بۆ من بڕەنجێنن من بە قوربانی هەمووتانم، هەمووتان هێزو بینایی منن، کە دەتان بینم باڵای پێ دەکەم.. من بچوکی هەمووتانم. خواجە رووی کردە هەمووان:

– با جارێ لەشتی دووەمەوە دەست پێبکەین خۆتان دەزانن لەو رۆژەوە مۆغانەکەمان فەرمانی خوای بەگاهێنا تا ئەمرۆ هەر خواداد سەروکاری پەرستگاکەمان دەکات و ئاگای لێیەتی، من شتێ دەڵێم حەزدەکەم رای ئێوەش بزانم.

– چی دەڵێن خواداد خۆی بکەین بەسەر پەرشتیاری پەرستگاکە؟.

لەمە ناوی خواداد هات(نۆشا) وەك مارێك لەسەر ژیلەمووی ژەهر بێ وا پەپکەی خۆی تێکداو رك و کینەی خۆی پژان و وتی:

– پەرستگا ئایرڤانی هەیە، ئیتر ئەو و ئەمی بۆ چییە؟ جگە لەوەش پەرستگا یەکێکی سەواد داری دەوێ، بزانێ(یەسنا) لەسەر مردووەکان بخوێنێ، ژنان مارە بکات و مردووان ئەسپەردە بکات.. هەنارخان خۆی لێ مۆن کردو بە نیگەرانییەوە دەیروانییە لەپ و لەوسی نۆشا..

دانیشتوانیش لە وتەکانی پەست بوون و بۆ یەکتریان دەڕوانی و چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد کە خواجە وتەکانی بە دەم و فلێتیا بداتەوە. خواجە زڕ برای خۆی

بوو، چاکی دەناسی، دەیزانی بە کەڵکی دانیشتنی دیوەخان نایەت و لە تێکدان بەو لاوە شتی تری لێ ناوەشێتەوە، خەریك بوو لە پێستی خۆی بێتەدەرەوەو لێی توورە بێ، بەڵام لەبەر دانیشتوان خۆی گرت و بە ئەسپایی وتی:

– بزانین دانیشتوان چی دەڵێن!..

لالۆ هەواس، ویستی وا بکا کەکەس بایەخ بە وتەکەی نۆشا نەدات وبخرێتە پشت گوێ، بۆیە وتی:

– منیش رام لەگەڵ رای تۆیە، خوا دەزانێ تۆ وات نە وتایە من هانام بەرز دەکردەوەو دەمووت:

– خواداد لە هەموومان فرەتر شارەزایی لە ئایین و کاروباری پەرستگادا هەیە.. روانییە هەمووان.. بۆ خوا بڵێن جگە لە خواداد کامان ئاورێکی وامان لەو پەرستگایە داوەتەوە؟!. خواجە رووی کردە هەمووان وتی:

– ئێوە چی دەڵێن؟ جگە لە خواداد کەسێ تر هەیە شایەنی ئەوە بێ پەرستگای دەگا بخرێتە سەر ئەستۆی؟!.

هەندێك لە دانیشتوان دەنگیان بەرز کردەوە:

– بابزانین خانمی گەورە و نازەنین خان چی دەفەرموون؟.

هەنارخان وێڕای ئەو سوچەی کە نۆشای تیا دانیشتبوو روانییە هەمووان و وتی:

– جا ئەگەر خواداد ئەوەمان لێ قبوڵ بکات، دەشێ هەموومان دەستی گەورەیی بە سنگەوە بۆ بگرین..

کە هەنارخان وای وت، هەموو دانیشتوان لەسەر راکەی گەرم بوون، ریش سپییەکیان هاتە قسەو وتی:

- بڕوا ناکەم لە دەگادا یەکێکی تر خوا پەرست و دانا هەبێ بگاتە خواداد، بۆ مەوادو خوێندنیش پەرستگا پەکی نەکەوتووە. چەند ساڵە موغانمان نییە، خواداد ئەی هێشتووە پەکی بکەوێ، مردووەکان ئەو ئەسپەردەی کردوون و لە عزیەر یەسنای لەسەر خوێندوون.. ئەگەر نۆشا بەو رازی نییە، هەرکات - خولنەکردە- خوا بردیەوە، ئەو کاتە مۆغان نەبڕاوە، لەکێوی قافیش بووە من حرۆم بۆی دێنم لە سەری بخوێنێ وناهێڵین بەبێ(یەسنا) سەر بنێتەوە و بەجێمان بێڵێ..

نۆشا بە قسەکانی کابرا زۆر نارەحەت بوو کە زانی وتەکەی خۆی بێ جێ بوو، قسەکەی ئەو کابرایەی کردە بەهانەو تووڕە بوو:

- یانی دەتانەوێ بمرم ؟! کە مردم لە جیاتی(یەسنا) خوێندن گو بە گۆرمدا کەن! باشە؟!.

وای وتوو لە شوێن خۆی وەك خووگ پیشی خواردەوەو خۆی گرمۆڵە کردەوەو ویستی دەرپەرێتە دەرەوە، بەڵام لەو کاتەدا ئامۆژگاری ژنەکەی(کاڵێ) هاتەوە یادی کە کاتێ هاتبووپێی وتبوو، لە خۆیەوە قسە فرێ نەداو دڵی هەنارخان و خواجە نەرەنجێنێ.. بەس گوێ بگرێ و دەمی نەکاتەوە! بۆیە بە هەموو هێزێکیەوە خۆی رکێف داو، سەری لە کۆش خۆی نا..

خواداد هاتە قسەو وتی:

- من بچوکی هەمووتانم، من خۆم بە زێرگەوانی پەرستگا نازانم، حەز دەکەم ئەو لونگە بە شانی مندا نەدەن!.

ژیرلەی مەرێ وتی:

- یەکێکمان بۆ بدۆزەرەوە لە خۆت ئایندار ترو شارەزا تر بێ، تا ئەو بەرماڵە بە شانی تۆدا نەدەین..

خواجە رووی لە خواداد ناو وتی:

- جگە لەتۆ بڕوا ناکەم کەس هەبێ شایستەی ئەوە بێ بەرماڵی(پیر)ی بەشاندا بدرێ.

- ئێوە چی دەڵێن؟!.

هەموو بەیەك دەنگ..

- پیرۆزە.. ئەو لۆنگە، ئەو نازناوە پیرۆزە، پیرۆز..

نۆشا خۆی پێرا نەگیرا، وەك بەرووی ناو ژیلەموی گەرم پیشاو لە قابلۆغەکەی خۆی قڵیشاند و دەرپەری..

لەتا نەگریسی خۆیدا تاکێ لە چەکمەکانی لەپێ کردو ئەویتریانی لەبەرچاو تەنگی خۆی پێی نەدۆزرایەوەو لێی بزر بوو. کە گەیشتە دەم دەرگای دەرەوە، بیری لە ژنەکەی کردەوە چی پێ وتبوو پەشیمان بووەوە، گەلێ لە دەرەوە گێچەکەی کردو نەی دەزانی چی بکات، کەسیش نەرۆیشت رووی لێ بنێ پەشیمانی کاتەوەو بگەڕێتەوە بیری کردەوە،خۆی دەچێتەوە دیوەخان نابێ، بۆ ماڵەوە بە تاکێ چکمەجەوە دەگەڕێتەوە هەر نابێ، وای بریار دا بگەڕێتەوە ماڵەوە لە گەوڕی ولاغەکاندا خۆی تا درەنگێ حەشار بدا، ئەوجا خۆی پیشانی ژنەکەی بدات، ئەگەر وتی: کوا تاکە چەکمەکەی ترت؟. بڵێ: لێم گوم بووە، بەیانی کە رۆژ بووەوە بۆم دەدۆزنەوە.

هەنارخان بە تێزەوە ئەم پلارەی تێوەشان.

- با بڕوا! وای دەزانی ئەو دار گوێزە بڵندە، بەو شەنەکورتەی ئەو دادەتەکێ!..

ژیرلەی مەرێ نەی هێشت وتە بەو لایەدا بڕوا، بۆیە رووی کردە نازەنین و وتی:

– دا لۆنگێکم بۆ بێنن.

نازەنین لە زووەوە بەرماڵێکی بۆ خۆی بە کردن دابوو، بۆ ئەوەی بیکاتە دیاری ـو کەسەی کە دەبێتە هاوسەری، چوو هێنای و دایە دەست ژیرلەی مەرێ.. ـویش هەڵساو بەناوی خواجەو مەرێگاو خەڵکی دەگاوە خستییە سەر شانی خولادادو پیرۆزبایی لێ کردو وتی:

–لەم ساتەوە تۆ (پیرخواداد)ت ناوە.

هەموو ئامادە بووان ئەو کارەی ژیرلەیان بە شتێکی پیرۆز زانی. خواجە ـحەمەن هەڵساو راموسانی لەگەڵ کردو، بەناوی هەموو دەگاوە پیرۆزبایی لێ کرد.

پیر خوادادیش هەڵسا هەردوو سەر شانی هەنارخانی ماچ کرد، نازەنینیش ـەردوو قۆڵی پیر خوادادی ماچ کرد،وەك لە قولآیی هەردوو دیدی پیر خواداد دا ـیمیاری بەدی کردبێ وا سەرنجێکی ئاراستەی ناوچاوانی کردو پێی وت:

– پیروزە..

پیر خواداد زانی پیرۆزباییەکەی نازەنین لە پیرۆزباییەکانی تر جیایە، بۆیە وتی:

– پیرۆزە لە تۆش..

ئەو وەرامدانەوەی پیر خواداد دڵی نازەنینی لە ناخەوە راچڵەکان پێی وابوو ـەنگی سیمیارەو لە دوور ولآتانەوە وەرامی دایەوە. دانیشتوان یەکەیەکە پیرۆزییان لە خواداد کردو راموسانیان لە تەکدا کردو لە شوێن خۆیاندا دانیشتنەوە. خواجە کە زانی ئەو کێشەیە بە پیرۆزبایی کۆتایی هات. خۆی لە گێلی داو رووی کردە ژیرلەی مەرێ و بزواندی و وتی:

– ئەمەمان وا پیرۆز کرا.. ئەی ئەویتر چی بوو؟.

ژیرلە زوو هاتە دەم:

- ئەویتر چارەسەری نە خۆشییەکەی خانمی گەورەمانە..

هەنارخان لە رووی بێلاقییەوە هاتە دەم:

- تۆ خوا ئەوەیان واز لێ بێنن.

سێ چوار دانیشتوان زوو هاتنە دەم و وتیان:

- نا.. واز لە خۆمان بێنین واز لە وەیان ناهێنین.

خواجە رووی دەمی کردە ژێرلەی مەرێ:

- لالۆ هەواس چی دەڵێی؟.

- ئەوەی وتیان هەر ئەوە دەڵێم.. نابێ لەم دیوە خانە بچینە دەرەوە تا تەگبیرێك بۆ ئەو نەخۆشییەی هەنارخان نەکەین. خواجە رووی کردە پیرخواداد:

- ئەی پیر خواداد چی دەڵێی؟.

خواداد دەیزانی ئەو پزیشکەی کە چارەسەری ئەو جۆرە نەخۆشیانەی پێ بکرێ کێیە؟ بەلاّم دەرفەتی بۆ دانیشتوان هێشتەوەو وتی:

- بە من بێ بگەڕێم ئەو پزیشکەی کە چارەسەری ئەو نەخۆشییەی پێ دەکرێ حەوت پێلاّوی ئاسنینی گەڕانی بۆ بدڕم تا دەیدۆزمەوە.. دانیشتوان بە تێکرا کەوتنە ناو مشووری کردنەوە.. هەر کەسەو لەبەر خۆیەوە دەرمانی دەنواندو ناوی حەکیمان و پزیشکانی ولاّتانیان دەهێناو وردە سەرگوزشتەی ئەم لاو ئەو لایان دەکردنە نموونە.. ژێرلەی مەرێ سەری لە بن سنگی خۆی نابوو، گوێی بۆ وردو درشتی پێشنیازەکان گرتبوو، دەیزانی هەموویان لەو راستییەی کە هەیە دوورن و شتی نزیك بەدی ناکەن!. نازەنینیش هەمان هەستی ژێرلەی مەرێ ی تیا جەم ببوو. لە دڵەوە دەیووت: خەڵکی ئێمە بۆ وا بۆ دوور دەڕۆن و کەچی حەکیمی ئەو هەموو حەکیمانە لە خۆیان هەڵکەوتووە!. ئەو هەستەی کە لەناو هۆشی نازەنیندا پرشی دەهاوی هەما هەست بوو کە لەلای هەنارخان و خواجە و هێشاو خواداد

كەوتبووە ماخۆلان.. رەنگە ژیرلە بۆیە خۆی مات کرد بوو، هەستی راگرتبوو تا بۆی دەرکەوێ پۆختەی راو تەگبیرەکان لەسەر چی سەقامگیر دەبن، ئەوجا نێردی خۆی بهاوێ..

پیر خوادادیش پەلەی نەکرد چونکە لەوە دڵنیا بوو یەکێك هەر دەبێ ناوی سیمیار بخاتەوە یاد.. ئەو نەی وت نەبادا بە خۆبردنە پێشەوە و خۆ هەڵکێشان بۆی بدرێتە قەڵەم. هێشا ئادکاری وا بوو تا داوای لێ نەکرابا لە خۆیەوە خۆی نەدەخستە ناو گێژاوی قسانەوە، بە تایبەتی لەو جۆرە دانیشتنانەدا دەستە نەزەری مێوانەکان دادەنیشت و خۆی بە شایستەی ئەوە نەدەزانی لە حزووری ئەوانەدا قسە بکات و خۆی وەك پیاوێکی کارامەو ریش سپی بنوێنێ. هەر چەند بنەماڵەی خواجەو بگرە زۆربەی دانیشتوانیش ئەوەیان دەزانی کە ژیری بە گەورەو بچوکی نییە..

خەڵك لە دیتن و ئاخافتنی هێشادا سیمیاریان وە بیر دەکەوتەوە ژیرلە وای بۆ دەچوو: کۆبوونەوەی ئەو پیاو ماقوڵانە ئەگەر بەراوێژی ئازەنین نە بووبێ، لە هێشاوە بە دوور نییە، کەسیش وەك هێشا بۆ دوور وڵاتی سیمیار نە سووتابوو، لە بردنەوەی مەرجەکەی ئازەنینیشدا لەناو زەینی خەڵکدا هێشاو سیمیار لەیەك جیا نەدەکرانەوە، هەردووکیان سەری دەگای هەورامانیان بەرز کردبووەوە نەیان هێشت دەروازەی ئەو بە کەلاوەی خەڵکانی ترەوە بنرێ..

تەگبیر کردن بۆ نەخۆشییەکەی هەنارخان گەلێ لق و پۆپی لێ بووەوە، بە هەموویانەوە ئەوەی دەگەیاند: بەدڵ و بە گیان، بە ماڵ و سامان هەوڵ بدەن ئەو ئافرەتەی کە گشت خەڵکی دەگا بە دایە گەورەی خۆیان دەزانی لەو دەردە رزگاری بکەن.

ژیرله پیاوێکی به خوایێن و سنگ فراوان و خۆ ڕاگربوو، دنیای بەسەردا بڕمایه دەنگی لێوه نەدەهات لەگەڵ ئەوەشدا خەریك بوو حەوسەڵەی نەمێنێ! له دڵ خۆیدا دەیووت: ئەم کەسانی منه چ خەڵکی سەیرن! ئەوه له کەیەوه وایان لێ هاتووه؟ بۆ؟! بۆ دوور دەڕوانن و نزیکتان لێ بووه به تاریکستان!..

ئەی نازەنین چەند ساڵ بوو زمانی نەگیرابوو! کێ چاکی کردەوه؟!. ئەی خۆ سەربووردەی کاروانەکەی هێشا دوێنێ بوو، ئەوه بۆ له بیرتان چوو؟! ئەی سەرکردەی چەردەکان تووش بوو لەپاشدا چاك بووەوه، ئەو کەسه کێ بوو چاکی کردەوه؟.ئەی هاوار ئەوه بۆ قوڕ بەدەم هەموویاندا دراوه!..

هەندێ مات بوو.. له ناخەوه ڕووی له خۆی کردەوەو دەیووت:

تۆ بڵێی ئەوان له من ژیر تر نەبن؟ بیانەوێ باسی هەموو داو و دەرمان و حەکیمێك بکەن، ئەوجا بێن دەسته گوڵی خۆیان لێ بدەن؟!.. جارو بار له بنەوه تیلایی چاوێکی ئاراستەی هێشا دەکرد، هەستی پێ دەکرد وەك خۆی ئامادە کردبێ شتێ بڵێ.. ئەی بۆ نایدرکێنێ؟. هەروەها له کاتی ناوهێنانی حەکیمەکاندا سەیری خواجەو هەنارخان و نازەنینی دەکرد، تا بزانێ له نێو چاوانی ئەواندا چی دەخوێنرێتەوه.

ئەوان هەر سەریان بۆ قسەکان دەلەقان و چاوەڕوان بوون تا بزانن بەرەو کوێ دەگەن. نه ئەرێیان بۆ قسەکان دەکرد نه نەرێ.دیار بوو به تەمای وتنی ئەو ڕاستییەیان دەکرد که دەرگای یەقینی پێدەکرایەوه.

هێشا هاته دەم و ڕووی کرده هەمووان:

– خوایش دەخوازم.. ماوەم بدەن قسەیەك هەیه دەیکەم؟. هەموو به خواستەکەی هێشا گەشانەوه، ژیرله سەری بەرزکردەوه، وەسه بزانێ چی دەڵێ دەسی دلارامی به ریشیا هێناو ڕووی تێکرد.

خواجه چاوێکی خێرای به دانیشتواندا گێڕا که زانی هەموو رووی ڕەزامەندیان بەلای هێشادا وەچەرخان، وتی:

– فەرموو بڵێ:

هێشا لەسەرخۆ و به دڵێکی پڕ یەقینەوە دەستی راستی دایه بەرەو روناکی ئاگرەکەو وتی:

– کارێك به پەنجەی ئەم دەسته بکرێ، پێویست ناکات بگەڕێی به شاراندا و بڵێی: ئەو قامکانەم کامەن که کارم بۆ دەکەن؟!.

وتەکەی هێشا دەمی هەموویانی کردە تەڵەی تەقیو، ژیرلەو پیر خوادادو تازەنینی لێدەرکه ئەوانی تر تێنەگەیشتن مەبەستی هێشا چییه!..

ژیرله خەریك بوو هەڵسێتەوە سەر پێ و بڵێ:

– من وتەی وام دەوێ.. باش بیدرکێنه با هەموو تێبگەن. هەی به باوکەوە له نەورت گەڕێم، شیرت پاکه.

وتەکەی ژیرله هانی هێشای دا کەبڵێ:

– سیمیار! ئەوە سیمیارتان له بیر نەماوە؟.

ژیرله خۆشیاندا خۆی پێرانەگیراو وتی:

– بەڵێ سیمیار.. ئەی له بیرتان چوو چی حەکیمی دنیا هەبوون چارەسەری نەخۆشییەکەی ئەم دەگایەی پێنەکرا، به یەك نەوای شمشاڵەکەی گەردەلوولی ئەو نەردەی تێشکاند، ئەی سەربووردەی سەرەك جەردەکان؟.. تۆ خوا من نویشتەیەك به سنگمەوە هەبێ بۆ به شوێن نویشته بازاندا خۆم وێڵ بکەم ( روانییه هەنارخان ) هەی له بابەکەی منت نەکەوێ تۆ حەکیمی خۆت هەیه!..

هەنارخان وەك له زووەوە بیری لەوە کردبێتەوە، وتی:

- جا بە من چی؟!.

یەکێك لە ریش سپییەکان هاتە دەم:

- چۆن بە تۆ چی؟!. ئەی ئەو رۆڵەی ئەم دەگایە نییە؟.

دەشێ لە ئاسمان بووە یان لە ژێر زەمین بە دوایدا برۆین، هەم سۆراخێکی بکەین هەم هەواڵی نەخۆشییەکەی پێ بگەیەنین(روانییە خواداد) داخۆ پیر خواداد چی دەڵێ:

پیر خواداد وتی:

- سیمیار برازای منەو رۆڵەی دەگایە، خۆزگا دەمزانی لە چ شارو وڵاتێکە لە ئەم شەو زووتر نییە بە شوێنیدا دەچووم.

هێشا رووی کردە پیر خواداد:

- فەرمان بدەن، چوون بە شوێنیدا ئاسانە.

خواجە لەبەر خۆیەوە وتی:

- نەدەبوو ئێمە بەجێ بێڵێ..

- پیر خواداد وتی:

- گەورەم ئێمەی بەجێ نەهێشتووە، بەڵکو بۆ ئێمە چووە لە هێشا بپرسە، ئەو دەزانێ بۆچی چووە.

هێشا رووی کردە دانیشتوان:

- نازانم بۆ ئێمەشتی خۆمان وەك خۆی نابینین.. ئەگەر بڵێم، ئەو پەیامبەرێکە خوا بە ئێمەی بەخشیوە دووری بۆ مەرۆن.. ئەو بۆ ئێمە ئەو رێگە سەختەی گرتە بەر کە ئەو سەری دیار نییە بۆ ئەوەی لە وڵاتانی تر چی هەیە وەری بگرێ و بۆ دەگای بێنێتەوە، چونکە دەیزانی ئەوەی دەگا هەیەتی هەر لەناو دەگادایە و بەشی ناکاو کەمە، دیارە بە گەڕیان بە شوێن فێربووندا دەگا تازە دەکاتەوە و

هۆشکاری تیادا فراوان دەکات. بۆم گێڕانەوە لە کاروانی ئەم دوایەمدا ئەگەر ئەو نەبوایە دەستم بە حەوتەوانە شەوە بگرتایە، رووت دەبوومەوەو بە خۆم و کاروانچییەکانمەوە چوون بەردی بن گۆمی لیتاوی گوم دەبوین.. ئافەرین پیاو چۆنت زانی ئەو داوە گەورەمان بۆ نراوەتەوە؟! هات لە گەڵماندا رزگاری کردین.. خوا راستەو راستی دەویٚ، لەبەر کاروانەکە نەبوایە هەگبەکەیم لەمل دەکردو دەبوومە شاگردی، خۆم دەکردە سێبەری بەر رێگای دڵنیام ئەو مەبەستەی بۆی چووە لەمە هێنایە دی دەگەڕێتەوە. هەنارخان بە ئاستەم وتی:

– دڵنیام ئەگەر بیزانیایە من وام لێهاتووە یەکسەر دەگەڕایەوە.

ژیرلە دەسی بە ریشە تەنکەکەیدا هێنایەوەو وتی:

– قسە هەزارەو دوانی بەکارە، ئێمە دەمانەویٚ حەکیمێك بۆ هەنارخان پەیدابکەین چاکی بکاتەوە.. حەکیم هەبیٚ سیمیارە. ئێستا من رۆڵەیەکم گەرەکە لە هەر شوێنیٚ هەیە بڕوات هەواڵی نەخۆشییەکەی هەنارخانی بداتیٚ. هەندیٚ گەنج سنگیان دەرپەراندو وتیان:

– هەموومان بەسەرو بە گیان ئامادەین.. فەرمان لە ئێوە و کار لە ئێمە.

خواجە وەك بیەویٚ گەنجەکان تاقی بکاتەوە وتی:

– جا چۆن ویژدانم رێم دەدا ئەو ئەرکە سەختە بخەمە بەر رۆڵەکانمان!.

هێشا بە دڵێکی گەرم و رێزەوە وتی:

– ئەو ئەرکە سەختە خەڵاتە بۆ هەموومان.

ژیرلە رووی کردە نازەنین:

– بۆ شتیٚ نەکەین؟!.

نازەنین بە روێکی گەش و درخشانەوە:

– لالۆ هەواس چی دەفەرمووێ وایە.. فەرموو بێژە.

ژیرلە روانییە هێشاو رووی کردەوە نازەنین.

– گەرەکم بوو شتێ بێژم وا نەمووت.

– هەرچی پەژی بێژە.. فەرموودەی ئێوە روناکی گیانە. ژیرلە بیری کردەوە ئەوەی ویستی بە نازەنینی بڵێ باش تەتڵەی نەکردبوو، زوو ئەوەی بە بیرد نەهاتبوو کە ئەوەی نیازی بوو بیڵێ تایبەت بە نازەنین خۆی بوو، بۆیە سەرێکی بۆ هەستەکانی ناوەوەی خۆی لەقاندو وتەکەی لای خۆی هێشتەوە.. بۆ ئەوەی پەردە پۆشی بکات وبیشارێتەوە، زوو رووی کردە دانیشتوان و وتی:

– وا زانیمان حەکیمی خۆمان سەرداری هەموو حەکیمانە وەڵێ نەمزانی کێ ئامادەیە بڕوا بە شوێنیدا؟.

کۆمەڵە گەنجەکە هەمدیسان بە یەك دەنگ وتیانەوە:

– هەموومان ئامادەین.

هێشا بە ئاستەم و بە دڵێکی پڕ بە متمانەوە رووی کردەوە هەمووان و وتی:

– گەورەو سەرومرانم.. من لەو باوەڕەدام فەرمان بە هەر گەنجێکی دەگا بدەن نەك بەپێ، لەسەر سەر دەڕوا، وەڵێ ئایا ئەو گەنجانە دەگەنە مەبەست؟ دەتوانن شارەو شارو دەقەرەو دەقەر بگەڕێن شوێن پێی سیمیار هەڵکەن و بەبێ ئەوەی تووشی نەمان و دەردی سەری نەبن؟!. دەبێ ئەو کارە بە شانی یەکێکدا بدەن شایستەی بێ، شایستەی سایەو پایەی سیمیاریش بێ.. من پێم وایە: ئەگەر فەرمانی خۆتان وەك خەڵات بە بەندە ببەخشن، تا ماوم شانازی بەو فەرمانەوە دەکەم.. نەمویست بەبێ پرس و رای ئێوە بچم، دەنا لە زووەوە نیازم هەبوو خۆم عەودالێ کەم و شوێن پێی بگرم و بە خزمەتی شاد ببمەوە.. هەر لەمە بزانم بەرێزتان دەست ناهێننە رێم، بڕۆم لە بەیانی زووتر نییە دەرۆیشتم، من و رۆیشتن رێگاو رێبوارین..

دانیشتوان له دڵەوه وایان لێکدەدایەوه ئەو چوونه ئەگەر به هێشا رابسپێدرێ حیبێته مەرجی دووەمی بەهاوسەر بوونی نازەنین.

نازەنین ئاوەزووی به نیازەکەی ژیرلەی مەرێ و لێکدانەوه خەفەبووەکەی خەڵکەکه شکا. بۆیه وتی:

– ئەوەی شایستەی ئەو کاره بێ هێشایه.. رادەپەرمووم ئەو بتوانێ لەهەر شوێن هەیه بیگاتێی و پێکەوه بگەڕێنەوه.. من که هێشا پەسەند دەکەم بەو نیازەوه نا که لالۆ هەواس گەرەکی بوو بیڵێی و نەیووت.

ژیرلەی مەرێ بیر تیژی نازەنینی بۆ دەرکەوت و بۆی روانی و زەردەخەنەیەکی ئەفسوناوی پەخش کردو سەرێکی بۆ لەقاند، لەدڵ خۆیدا دەیووت:

ئافەرین.. چۆن له هەناسەی وتەکانی من تێگەیشت؟ بەراستی شاژنه.

هێشا یەکسەر هەستی بەو نیازه کردو رووی کرده ژیرلەو وتی:

– حەزم کرد ئەو نیازەت هەبوو بەڵام نەتدرکاند. حەز دەکەم راستییەك هەیه هەموو ئاگاداری بن:

من پەپولەیەکی بێ باڵی ناو تاریکی بووم، روناکی سیمیار چاوی کردمەوەو باڵی لێ رواندم.. هەتا ماوم شەیدای ئەو روناکییەم . ئەوەی من کردبێتم به روناکی ئەو بووه، ئەوەی بەناوی منەوه بووه کردەی ئەو بووه، ئەوەی ئێوه بیری لێدەکەنەوەو بەهی منی مەزانن، هی ئەوه..

ژیرلەی مەرێ به وتەکانی هێشا فرەتر گەشایەوەو وتی:

– من شانازی به دەگای هەورامانەوه دەکەم که رۆڵەی وەك تۆو سیمیاری هەیه.

نازەنین ویستی ئەوەی لەوان خەیاڵه، له هۆشیاندا رایماڵێ بۆیه وتی:

– ئەوەی ئەو سەفەرە دەگرێتە بەر، بڕوا ناکەم جگە لە گەیشتن بە سیمیار ﷺ نیازو مەرجێکی تری لە پاڵدا هەبێ. ژیرلێ کە زانی دانیشتوان هەموو بیریان بۆ مەرجەکەی نازەنین چووە، ویستی بە تەواوەتی پەردەی لەسەر لابدرێتەوە ئەوەی بن بەرەیە بێتە سەر بەرە، هەر بۆ تاقیکردنەوەش وتی:

– بۆ چاکردنەوەی هەنارخان نەکەین بە مەرجی دووەم؟

هەنارخان بە تووندی وتی:

– نا.. نا.. لالۆ هەواس.. من شیربایی کچی خۆم وەرناگرم.

– ئەوە شیربایی نییە..

– با لەوە دەچێ.

هەنارخان وای وتوو بێدەنگ بوو.. لە بێدەنگی ئەو و بێدەنگی ژیرلە. نازەنین هاتە دەم:

– وابێ یان وا نەبێ.. ئەوە نابێتە مەرج.. ئەوەی دەروا ئەگەر نیازی وای هەیە با نەڕوا. بڕواش ناکەم سیمیار بەو نیازەوە بگەڕێتەوە..

هێشا بەشەرمەوە وتی:

– من خۆم بە خاوەن مەرج نەزانییوەو نازانم. نازەنین خان خۆی دەزانێ کێ خاوەن مەرجەکەیە؟.

من خزمەتکاری ئەو کەسەم کە ئەو هێزەی بە من داو توانیم لەناو ئەو حەوزە رەچاوەدا خۆم ڕاگرم..

دانیشتوان سەرەرای خواجە و هەنارخان هەموو بە وتەکانی هێشا گەشانەوە چونکە بە وتەکانی ئەو مەسەلەی ئەو و نازەنینیان بۆ یەکلا بووەوە، ئەوجا زانیان دەگای هەورامان چەندان کەسی وەك هێشای تیا هەڵکەوتوون کە مایەی شانازی بن. ژیرلە لە پێشەوە خۆی بەهەڵە زانی کە مەرجەکەی خستەروو، وەلێ کە بەلای

پاکتاو بووندا شکاییەوەو هێشا لەبەردەم خواجەو هەنارخان و لیٚ ی هاتە نەرەوە، بەهی سیمیاری زانیگەلیٚ دڵی خۆش بوو، یەکەم لای هەموو دانیشتوان یەکلا بووەوە، دووەم بەیانیش بۆ خەڵکی دەگا دەردەکەویٚ کە ئەوەی بە شویٚن سیمیاردا دەڕوا بۆ هێنانەدی مەرجی دووەم نییە، ئەگەر ئەو، ئەو قسەیەی نەکردایە لەوانەبوو لە دەگادا شتێکی تر بلاّو دەبووەوە.. بۆیە ژیرلە بە روویەکی گەشەوە رووی کردەوە خەڵکەکەو وتی:

– خەڵکینە خۆ زانیتان ئێمە لای ئەهرۆمەزدا چەند پایە دارین؟. کە رۆڵەی وەك سیمیارو هێشاو نازەنینی پێبەخشیوین.خۆ دیتان هێشا چ رۆڵەیەکی لە خۆ بووردەو دڵسۆزی هاوڕێی خۆیە. سوپاس بۆ ئەو یەزدانەی کە ئەو نەزاکەتەی نەربارەمان نواندووە.. ئەوجا رووی کردە هێشا و وتی:

– بڕۆ ئەهرۆمەزدا ریٚبەرت بیٚ، زەردەشت و پیرانی هەورامان ریٚ نیشاندەرت بن. من بەناوی هەموو جفاتی مەریٚ و پیاو ماقەلاّنی هەورامانەوە ئەو کارە بە هێشا را دەسپێرم، هەر کەسێکی تر دەکەوێتە تەکی ئەوا خواجەو هەنارخان خۆیان دیاری دەکەن. لە پڕ کورێکی شۆخی جاحێل هاتە پێشەوەو وتی:

– من هۆزام منیش دەڕۆم.. ئەگەر نەمنێرن، دەچم لە بان کام باڵەخانە بەرزە خۆم دەخەمە خوارەوە. چەندان گەنجی تریش هاتنە پێشەوەو هەمان وتەیان کرد. خواجە رووی تێکردن و وتی:

– ئافەرین.. خوا بۆ ئێمەتان بهێڵیٚ، ئێمەتان منەتبار کرد.. ئەوەی دەڕواو ئەوەی ناڕوا هەموویان بە رۆڵەی خۆمانی دەزانین. ئەریٚ ئێوە هەنارخانتان خۆش دەویٚ؟!. هەموویان بەیەك دەنگ:

– دایکی گەورەمانە، دایکی هەموو هەورامانە، ئێمە زارۆڵە وچکلەی ئەوین، بە دڵ و بە گیان خۆشمان دەویٚ..

– دەی کەوابوو نابێ لە قسەی دەربچن، ئەو کێی دانا با هەر ئەوە لەگەڵ هێشادا بچێ. هەریەك لە گەنجەکان هاواری دەکرد:

– ئەوە منم..

هەر یەك ناوی خۆی هەڵدەدا بۆ ئەوەی هەنارخان گوێی لە ناوەکەی بێ.

ژیرلە خەڵکەکەی بێدەنگ کردو وتی:

– راکەی خواجە پەسندەو قسە نەما.

ژیرلە داوای لە هێشا کرد بێتە بەر دەمی، کە هات بازی بەندێکی لە بەرکی خۆیدا دەرهێنا، داواشی لە خواجە کرد لێی نزیك بێتەوە، بازی بەندەکەی دایە دەست خواجە بەهمەن بۆ ئەوەی لە قۆڵی راستی هێشای ببەستێ، کە لە قۆڵی بەست ئەو پەتە سپییەی کە هێنابووی داوای لە سێ پیاوی ریش سپی و خواجەو هەنارخان کرد کە هەریەك گرێیەکی لێبدەن، تا لەگەڵ گرێکەی ئەو سەرو ئەمسەریدا ببن بە حەوت گرێ..

بەخشینی ئەم پشتێنە نیشانەی دیاری کردن و هەڵبژاردنی ئەندامێکی نوێی(کۆمەڵەی مەرێیان) بوو، بە یەکێك دەبەخشرا کە سەری دەگای بەرز کردبێتەوە و نە بەردو لەخۆ بوردە بوایە..

دوای گرێدانی پەتەکە، ژیرلە لە پشتی هێشای بەست و وتی:

– پیرۆزە.. خوا پایەدارترت کا.. تۆ ئەو کەسەی کە دەگای هەورامان شانازیت پێوە دەکات، هەر کات بویت بە خاوەن خێزان و چویتە ماڵی خۆت تۆ یەکێکی لە ئەندامانی(مەرێگای هەورامان).

هەموو ئامادەبوان ئەو هەڵبژاردنەیان لا پەسند بوو گشتیان راموسانیان لەگەڵدا کردو نزای چوون و هاتنەوەی ئەو سەفەرەیان بۆ کرد..

نازەنین خان هەڵسایەوە ئەو دەسماڵەی کە لە سەرو ملی خۆی پێچابووی کردیەوەو لە ملی هێشای گرێداو وتی:

– تۆ مایەی شانازی دەگایت و کوڕی گەورەی خواجەو برای ئازیزی منی.. بە پێی داب و نەریت، بە پێچانی ئەو دەسماڵە نازەنین و هێشا وەك براو خوشکیان لێدێ و بۆ یەکتری ناشێن.

* * * *

# (٩)

ریش سپی و پیاو ماقوڵانی دەگا کە داواکران ئەو ئێوارە لە دیوەخانی خواجە کۆببنەوە، خەڵکەکە پێیان وا بوو بۆ ئەوەیە نازەنین خان دەیەوێ مەرجی دووەمی شووکردنەکەی جاڕبدا، کەچی دوای تەواو بوونی کۆبوونەوەکە دەنگوباس بە جۆرێکی تر بلاّو بووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەگا ئەو شەوە بە خەوو خەیاڵی مەسەلەکەی نازەنینەوە چوو بووە ناو نوێن!..

ماڵی خواجەش هەتا بەرە بەیانی ئەو شەوە خەریکی تەدارك رێکخستنی ئەو سەفەرەی هێشا بوون، هەر خەریکی راوێژ بوون کە چۆن یەکێکی تری وا هەڵبژێرن کە هاوشانی هێشا و رۆڵەی تەنگانەو رێ بێ..

ئەو گەنجانەی کە سنگی خۆیان دەردەپەڕان و داوای خۆی بە تەکخستنی هێشایان لە خواجەو هەنارخان دەکرد کەوتبوونە تەقەوەو ئیتر ئێرەتییەیان هەڵی نا بوون کە واز لە داواکەیان نەهێنن. خەڵکەکە بلاّوەیان لێکردو هەر کەس بەرەو ماڵی خۆی گەڕایەوە، کەچی ئەوان هەر لە حەوشەدا مانەوەو هاواریان دەکرد:

– بمانێرن و نەمانێرن، هەر دەڕۆین..

هەنارخان کە زانی ئەوانە لەسەر داواکەیان موکڕن و لەوانەیە بە قسەی ئەو سارد ببنەوە، داوای لە نازەنین کرد کە ئەوانە بانگ بکاتە ژوورەوەی دیوەخان، بۆ

ـەوەی لەگەڵیاندا ڕوو بە ڕوو مۆژیارییان بکات.. جگە لە هۆزا هەموو هاتنە ژوورەوە بەرامبەر هەنارخان دانیشتن و پێی وتن:

– ڕۆڵەکانم.. چوون بە شوێن سیمیاردا کارێکی ئاسان نییە، ڕێگەی گەیشتن بە ئەو بە گوڵ و گوڵزار نەچێنراوە ئەوەی کارامەو شارەزای وڵاتان نەبێ ناتوانێ سۆراخی بکات. ئێوە نازانن بۆ کوێ و بۆ چ وڵاتێك چووە؟!. بۆ ئێرانە؟ بۆ توورانە؟ بۆ ڕۆمانە؟ بۆ کوێ؟!.

گریمان ئێوەمان نارد.. بۆ چ وڵاتێ ڕوو دەنێن؟.

جگە لەوەش ئێمە تەنیا دوو کەس دەنێرین هێشاو یەکێکی تر، دەبێ ئەو یەکەش جێی متمانەی هێشا بێ و بەرگەی دەردی سەری ڕێگا بگرێ.. لە ڕێدا پیاو خراپ‌و جەردەو ڕێگر هەن، مارو دەعباو دڕندە زۆرن، نەخۆشییە، دەردەو ئازارە، گرتن و بڕینە، چوزانم شتی زۆر نا هەموار هەن. ئەگەر هاتوو ئێوەم نارد تووشی بەڵایەکی ناگەهان بوون، من چی بکەم؟ چی بەدایك و باوکتان بڵێم؟.. باشە ئێمە بۆ ئەوانە بە شوێن سیمیاردا دەنێرین؟. بۆ ئەوەیە بێتەوە ئەگەر پێی بکرێ من چاك بکاتەوە، وایە؟..

جا ئەگەر یەکێکتان چوون و شتێکی بەسەرهات؟ کەواتە سوودی ڕۆیشتنەکەتان چی بوو؟ دەتانەوێ خەڵك پێمان بڵێ بۆ چاککردنەوەی پیرەژنێك چەند گەنجێك فەوتان؟ جا ئەوە بۆ من چەندی بە چەندە؟!.

کوڕەکانم ئەگەر منتان خۆش دەوێ و حەز ناکەن نازەنین لێتان زویر بێ هەر ئێستا دەچنەوە ماڵی خۆتان.. ئەگەر نەچنەوە مانای وایە منتان خۆش ناوێ و منیش تا ماوم لێتان نیگەران دەبم.. بۆ خۆتان چاوەڕوان بن کەی وتیان وا سیمیار نزیکە بێتەوە ئەو کاتە وەرنەلام، کارێکی تایبەتیم پێتان هەیە، ئەو کات دەردەکەوێ کێ دڵسۆزی دایە گەورەیەتی؟!. باشە؟.

هەموو خاو بوونەوە یەکێکیان خۆی لە هەموویان دڵسۆزتر دەنواند، وتی:

- باشە ئەگەر هۆزا نەڕۆیشت، ئەوا ئێمەیش ناڕۆین. هەنارخان خۆی لە گێلیدا:

- هۆزا کێیە؟!.

- هۆزای زاما کوری ئەختەر.

- خاتر جەم بن، هۆزا ناتوانێ بڕوا بشڕوا بەشی ڕۆژە ڕێیەك ناکات.. دەکەوێ دەشێ لاشەکەی گورگ و چەقەڵ و قەل و داڵ بیخوا.. بە گوێی دایکی خۆتان بکەن من کەسی تر جگە لەهێشا هەڵنابژێرم، وەڵێ ئەگەر هێشا هاورێیەکی بۆ خۆی هەڵبژارد، ئەوە خۆی دەزانێ.

گەنجەکان بەو خۆ نواندنەیان کە بەخزمەت هەنارخانی گەیاندن گەلێ دڵخۆش بوون خۆیان بەسەر کەوتوو دەزانی، ئەو لوتف و نەزاکەتەی ئەوە، ئەو ڕوو بە ڕوو بوونەوە لە گەڵیدا ئەو پەیمانەی کە پێیانیدا- گوا بەر لە هاتنەوەی سیمیار کاری پێیان هەیە،بالآی بەلاوییەتیان کرد.. ئەوجا دڵنیا بوون، ڕاستە هەنارخان دایە گەورەی دەگایە یەکە یەکە لە ناویان و ناوی دایك و باوکیانی پرسی و نزای تەمەن درێژی بۆ کردن، ئیتر بە ئاستەم هەڵسان و بۆ ماڵەوە گەڕانەوە..

هۆزا بەوە دڵشاد بوو کە وەك گەنجەکانی تر نەچووە لای هەنارخان، چونکە دەیزانی ئەوانە پەشیمان دەکاتەوەو ئیتر ڕێ بۆ خۆی چۆڵ دەبێ، وای دانا بوو ئەگەر هێشا لە تەك خۆیدا نەیبا خۆی بە دزییەوە قۆناخ بە قۆناخ بە دوی دەکەوێت، تا دەگاتە ڕاددەیەك گەڕانەوەی لە بردنی ئاسانتر نەبێ، لەبەر ئەوە کە دی هەموو گەنجەکان بەرەو ماڵ خۆیان گەڕانەوە خۆی حەشار داو چی گەڕان بە شوێنیدا خۆی بەدەستەوە نەدا، شەو بەدزی دایکیەوە چووە ماڵەوەو چەند نانێکی لە پشت خۆی بەست و گۆچانێکی بەدەستەوە گرت و بەو شەوە لەو ڕێوە

که هێشا پیا دەچوو تێی تەقاندو ڕۆیشت، چێشتینگاوێکی درەنگ بوو لە کەنار ێدا خۆی مات داو چاوەڕوانی گەیشتنی هێشای دەکرد، چۆنی دانابوو زۆری ـخایاند هێشاو یەکێکی تر لەوێوە تێپەڕین و بەخێرا ڕێگەیان دەبڕی و دەچوون.

*　　*　　*

هێشا (واران)ی کوڕی (لالۆ وەزەن)ی هەڵبژارد بۆ ئەوەی لەو سەفەرەدا ـەگەڵیدا بێ، باوکی واران کابرایەکی شاخەوان و ڕاو و شکارچی بووە، لەوەتەی واران چاوی کرابووەوەو خۆی ناسیبوو باوکی هەر خەریکی گەڕان بەشوێن کوورە ـەنگی ناو شاخان بووە. جارێکیان لە هەڵەموو تێکی هەڵدێری تووشدا بە شوێن کلووره هەنگوێندا دەگەڕێ تووشی مادەڕە ورچێك دەبێت، دەسیان لە مل یەکتری گیر دەبێ، هەردووکیان لە هەڵەمووتەکەدا دەکەونە خوارەوە هەپرون هەپرون ـەبن. واران بۆ تۆڵە سەندنەوەی باوکی خۆی دژ بە ئاژەڵی سرك و دڕندە ڕاهێنابوو، تا وای لێهاتبوو سەرە قۆچانێی لەگەڵ سابرین و بەرانی شاخدارو ئێستری چەمووش و نۆیەنەی نەمووچراودا دەکردو دەیبەزاندن، ورچ لە هەر شوێنێ هەبوایە بۆی دەڕۆیشت ئەگەر دەڕ بوایە دەرفەتی لێدەهێناو لە پشتەوە ـلرێکی تێی دەئاخنێ، ئەگەر نێرەش بوایە، هەر لە پشتەوە هەردوو گونی جەڕ ـەداو دەیخوسان..

ئەوەندە لەو مەیدانەدا خۆی ڕاهێنابوو پێی شەرم بوو وەك خەڵکی تر ئاگر دژیان بەکار بهێنێ..

وەکی تریش کە سەیری ئەم(واران)ەت بکردایە، بە هەرزەکارێکی نەرم و نیان و لەسەر خۆو پەلە نەکەر دەهاتە پێش چاو، کەس وەکو ئەو لە هەڵپەرکێدا نەی دەزانی سەرچۆپی بکێشێ و لەنجە بکات. شمشاڵیشی دەژەندو کەمێ دەنگی خۆش بوو، تا ئەو کاتە ژنی نەهێنابوو رقیشی لەو کەسانە بوو دڵداری نا بەجێ دەکەن. چەند جار لەگەڵ هێشادا کاروانی کردبوو، ژیرو هزر ساف بوو، گەلێ جار کاروانی لە تووشبوونی گیرو گرفت رزگار کردبوو،

کە هەنارخان دەسەلاّتی هەڵبژاردنی هاورێیەکی دا بە هێشا ئەویش یەکسەر(واران)ی دانا.

کە پێیان وت هێشا تۆی بە هاورێی ئەو سەفەرە هەڵبژاردووە) ئەو شەوە لە خۆشیاندا خەوی لە چاو خۆی تۆراندورکی لەو شەوە تاریکە دەبووەوە کە وەك دەڵە ورچی رەش سنگی بە سنگ شاخەکانەوە نابوو، لانەدەکەوت.. چاوەروانی کازێوەی بەیانی دەکرد کە بیرەوێنێتەوە، بۆ ئەوەی پێکەوە لەگەڵ هێشا بکەونە رێ و خوا حافیزی لە خواجەو هەنارخان ونازەنین بکەن.

بەیانی هێشا خۆی پێچایەوەو پۆشاکێکی مۆغان ئامێزی وەك ئەوەکەی سیمیاری لەبەر کردو قەیاسە حەوت گرێکەی(مەرێگا)ی دایە دەست دایکی.. ئەو شمشاڵەی کە سیمیار دابویە بەبەر پشتێنەکەیدا کرد. هەروەها دەسێکی بەسەرو پۆتەلاّکی واران دا هێناو دەفێکی بە کۆڵیدا داو لەسەر شێوەی دوو کەسی عاشقی یەزدانی و عەودالّی رێی زانین و فێربوون کەوتنە رێ، هەر یەکە توێشویەکیان لە پشت خۆ بەست، بەر لەوەی کات تیشکی رۆژ بڕژێنێتە ناو دەگاوە ئەوان ئاو دیوی ئەو دیو شاخەکان بوون و بەرەو دەڤەری(پیر وەسان بەگ) روویان نا..

ئەوان رێیان بەخێرا دەبڕی و هۆزاش دووراو دوور وەك سەگی تۆراو لە خاوەنەکەی بە شوێنیاندا دەرۆیشت، ئێوارەی ئەو رۆژە گەیشتنە

دەربەندی(شاهۆ) بۆ حەواندنەوەو شەو بە رۆژ کردنەوە لایان دایە ئەو کێڵەی کە پیر وەسان بەگ لەو ساوە کە ناوی لە دەربەند دالأشەوە کردبوو بە دەربەند شاهۆ، ئەو کێڵەی دروست کردبوو، گوایا بۆ خێرو رێنموونی رێبواران بوو، کەچی ببوو بە شوێن باج لێسەندن لە رێبواران و سەرانە وەرگرتن لە وانەی گەرمیان و کوێستانیان دەکردو ئاژەڵدارو رەوەند بوون و بە شوێن لەوەڕدا دەگەڕان. ئەو شەوە لەوێ لای ئێشکگرەکانی ئەو دەربەندە شەویان بردە سەر، خۆیان وا دایە قەڵەم کە کەمەند بەندوو دەروێشی پیر وەسان بەگن، هێشا بە دەف و شمشاڵەکەی و واران بە دەنگە خۆشەکەی گەڵێ بەزمی بە سۆزی سۆفی ئامێزو ئاینییان بۆ ساز دان، بەقسەی خۆش و باسکردنی لە شکری ئاسمان و فەرموودەکانی زەردەشت خۆیان لە گەڵیاندا ساچان و لە باج و سەرانە خۆیان دەرباز کرد..

هێشا لە زووەوە دەیزانی (پیر وەسان بەگ) بە دوو لا خەڵکی ناوچەکەی خۆی رکێف کردووە، لە ژێر پەردەی ئایین و زەبرو زەنگی بەگایەتیدا هەرچی دەکرد بۆی دەلوا..

بۆیە هێشا خۆی گۆڕی و وەك دەروێشێك خۆی نواند. هۆزا ئەو شەوە لە دوورەوە دەیڕوانییە تروسکەی ئاگری ئەو کێڵە کە لە هەیوانەکەیدا هێشاو واران لەگەڵ ئێشکگرەکاندا لە دەوری دانیشتبوون و شمشاڵ و دەفیان لێدەدا، تا بەیانی سەگەکان ئارامیان نەبوو لێی دەوەرین و هەستیان پێ کردبوو، ئێشکگرەکان جارو بار لە کێڵەکەوە دەچوونە دەرەوەو هانیان دەدان و دەیانووت:

- بێت و نەبێت یان دەڵە ورچەکەیە یان کەمتیارە لە دوورەوە خۆیان پیشان دەدات.

بەیانی ئەو شەوە خوا حافیزیان کردو ملیان بە دۆڵەکەوە ناو شاخە سەختە مل پانەکە روو بە دەربەنەیان بڕیوو، ئاودیوو بوون.

هۆزاش به شوێنیاندا دەڕۆیشت و له ترس ئەوەی نەبادا هێشا ڕەوانەی دواوەی بکاتەوە خۆی لێیان ئاشکرا نەدەکرد..

لەو شوێنەدا که له دوا کارواندا هێشاو سیمیار له یەك جیا بوونەوە دانیشتن‌و حەوانەوە، له پاشدا ملیان لەو ڕێگەیە نا که سیمیار گرتیه بەرو ئەوسەری دیار نەبوو..ئەو ڕۆژە زۆر به گوڕ ڕۆیشتن بێ پەروا ڕێیان دەبڕی، بەر له زەردەپەڕی ئێوارە ترۆپکێکی بازنەیی قەڵا ئاسا له بناری زنجیرە شاخێکدا بەهۆی لێدانی خورە تاوەکەی ئێوارانەوە که لێی دەدا به دییان کرد. بەوا زانینیان که له ئاوەدانی نزیك بوونەتەوە، پەلەیان له خۆ کرد بۆ ئەوەی بەر لەوەی تاریك دابێ بگەنە ئەو شوێنە ترۆپکەکە وردە وردە لەناو تاریکی ئێوارە وەختەکەدا نقوم دەبوو.. دیار بوو کۆنە پەرستگایەکی لەسەر بوو، وادیاربو له دێرین ڕۆژگاردا ئەو ترۆپکە شوورای لەسەر بووە، قەڵایەکی سەخت بووە وەك داگیرکەرێکی دڵرەق نغروی کردبێ وا به بەسەر یەکدا کەوتبوو، له کەلێنێکی شوورا ڕوخاوەکەوە چوونە سەرو خۆیان گەیاندە پەرستگاکە که له ڕووی ئەو دیوەوە دەیڕوانییە ناو شارۆچکەیەك،لەبەر دەروازەی پەرستگاکەدا چاویان گێڕا کەسیان نەدی، وایان بە باش زانی دەنگی خۆیان هەڵبڕن بەڵکو یەکێك گوێی له دەنگیان بێ‌و دەرگایان بۆ بکاتەوە، دەیانووت:((ڕێبوارین‌و شەومان بەسەردا هاتووە، ئامۆین عەوداڵی ڕێی خوا پەرستین.. ئەرێ کەسی‌گوێی لێمان نییە پەنامان بدات)).

دەروازەکە لەم سەرەوە لەسەر داڵانێکی درێژ پێوە درا بوو، لاشیپێکی دەروازەکە گێژەنەی نەمابوو، هەروا هەڵسپێدرابوو، تەقەی زۆریان لێدا دوای ماوەیەك گوێیان له جیڕەی دەرگایەك بوو له ناوەراستی داڵانەکەدا که کرایەوە شوڵەی ئاگرێکی به داڵانەکەدا پەرت کرد، پیاوێکی باریکی پرچن هات و له ئەو دیوو دەروازەکەوە وتی:

- ئێوه کێن چ کارەن؟.

- هێشا وەرامی دایەوە.

- ئێمە عەودالین.. دەروێشین خەڵکی ئەم وڵاتە نین.

پیاوەکە چوو چراوگەیەکی هێناو لە درزی دەروازەکەوە روناکی خستە سەریان، کە زانی رێبوارن لا ساغەکەی دەروازەکەی بۆ واز کردن و بە دەنگێکی نەرم تێی گەیاندن کە بێنە ژوورەوە تا ئەو سەری دالآنەکە بەبێ دەنگی پێشیان کەوت، لەسەر سەکۆکەی ئەو سەری دالآنەکە داینان لە تەنیشتی ئەو سەکۆیەدا ژوورێکی داخراو هەبوو، پیاوەکە خۆی چووەوە ناو ئەو ژوورەی کە لێی هاتە دەرەوە، دالآنەکە لەناو بۆنی گنخ و تەڕە شوع و کەڕەکێفی رۆژگاردا خنکابوو، بن میچی دیوارەکانی بە تەنی و داوی جاڵجالۆکە تەنرابوو، رۆژگار ئەوەندە باری خەماوی بەسەردا تەپاندبوو هێزی خۆراگرتنی کەنفت ببوو، کە تەماشات دەکرد وات دەزانی هەر ئێستا بەسەرتا دەروخێ..

لەوێ خەیلێ دانیشتن، جارو بار ئارەزووی تەسەلکردنی‌زانین و هەوەسی پشکنین وای لێدەکردن لە درزی دەرگاکەی تەنیشتیانەوە سەیری ژوورەکەیان دەکرد،دەیاندی پیاوێکی پرچنی ریشپان و کەللە زل لە ژوورەوە بەرامبەر بە ئاگردانێك لەسەر چووك دانیشتووە، بە دەنگێکی نەرم خەریکی خوێندنەوەی تۆمارێکی درێژە، لەگەڵ خوێندنەوەی هەر قەفێکی تۆمارەکەدا رادەوەستێ و فووی گەش بوونەوە بە ئاگرەکەدا دەکات و لێی رادەمێنێ، پیاوە باریکەکەش لە نێوان هۆدەکەی خۆی و ئەوەی نزیك دەروازەکە لە هات و چۆدا بوو، هەندێ کاسەو کۆچەڵەو چەمچەی بە دەستەوە دەبینران، دیار بوو خەریکی ئامادەکردنی خواردنی شێوان بوو.. دوای ماوەیەك چووە ژووری مۆغانەکەو بە ئاستەم لە تەکیدا دواو، تۆمارەکەی بۆ لوول دایەوەو لەسەر رەفەیەك دای ناو، یارمەتی

هەڵسانەوەی داو، پاشی کەوت و هاتنە دەرەوە مۆغانەکە لە بەر تیشکی چراوگەکەی دەسی پیاوەکەی تردا سەیرێکی هێشای کردو دەسی لەناو دەسی ناو بۆ ناو هۆدەکەی تر رای کێشا.. کە دانیشتن سەرنجێکی سەیری هێشاو وارانی داو رووی کردە پیاوەکە کە وا دیار بوو زیرگەوانی ببێ، وتی:

– ئەم مێوانانە کەی هاتن؟.

– دەمێکە هاتوون.. دیارە خەڵکی ئەم وڵاتە نین.

هێشا وەك بیەوێ خۆی پێیان بناسێنێ..

– بەڵێ! رێبوارین لە دوورەوە هاتووین..

مۆغانەکە سەیرێکی نێو چاوانی هێشای کرد، کە دی ناوچاوانی و ناو تەوێڵیان وەك ئاگرەکەی بەردەمیان دەدرۆشایەوە، بە زەردەخەنەیەکی ئاستەمی ئەفسوناوی دڵی پڕ ئارام کردن، مووی سمێڵە درێژەکانی بەو زەردە خەنەیە لە خۆشیدا بزیان دەکرد.. وتی:

– لە هەورامانەوە هاتوون؟.

– بەڵێ قوربان لە هەورامانەوە هاتووین..

– گەلێ بەخێر هاتن.. باش بوو هاتنە ئێرە.

– لەمە چاوم پێتان کەوت زانیم خزمی پیر سیمیارن. هێشا کە ناوی سیمیاری بیست لە خۆشیدا خەریك بووباڵ بگرێتەوە.. لە دڵ خۆیدا دەیووت: ئەم مۆغانە وا دەیناسێ واش دەزانێ بەرەو کوێ رووی ناوە.. بە تایبەتی بەوە دڵشاد بوو کە ئەو مۆغانە بەو هەموو تەمەنەوە نازناوی((پیر))ی بۆ سیمیار بەکارهێنا بۆیە وتی:

– قوربان دیارە پیر سیمیار دەناسن؟.

– بەڵێ.. ئەوەی نەیناسێ نازانی چ بلیمەتێکە.. هەناسەیەکی هەڵکێشاو سەرێکی لەقان.

– ئێستا لە کوێیە؟!. ئێمە بەشوێن ئەودا هاتووین !.

– جارێ نانەکەتان بخۆن، لە دوورەوە هاتوون، ماندوون، ئەوجا شەو باسی هەریشتان بۆ دەکەم.. فەرموون، فەرموون.

هێشتا پاروێکیان لە دەم خۆ نەنابوو، زەرمەیەکی گەورە لە دەروازەکەوە هات، خگرڤانەکە دەرپەڕیە دەرەوەو وتی:

– دەروازەکەیە هەمدیسان کەوتەوە داخۆ چی بووە؟!.چوو دوای کەمێك گەڕایەوە و وتی:

– لاشیپی دەروازەکەیە، دەڵێی بەسەر زەلامێکدا کەوتووە تاریك بوو چاوم چاك نەی بینی.

وای وت و مۆغانەکەو هێشاو واران دەرپەڕین، دییان لاشیپەرانی دەروازە بێ گێژەنەکە بەسەر زەلامێکدارماوەو بووە بە ژێریەوە.. دایانە بەر تیشکی روناکی چرلوگەکە هێشا کەسەیری کرد وتی:

– ئەوە هۆزای ئەختەرە؟!.

لاشیپی دەروازەکەی لەگەڵ واران دا لەسەر لابردو باوشی پیاکردو وتی:

– هۆزا؟! هۆزا؟!. ئەوە بۆ وات لێهاتووە؟ ئەوە چۆن گەیشتیتە ئێرە. مۆغانەکە پێی سەیر بوو کە هێشا دەیناسێ و وتی:

– ئەمەتان لەگەڵ بوو؟!.

– قوربان؟!.

مۆغانە کە زانی کاتی ئەو قسانە نییەو فریاکەوتنی گرینگە. لە ژوورەکەی نزیك دەروازەکەدا رایان کێشاو لێدانی هەناسەیان وەرگرت ، دڵنیا بوون ماوە نەمردووە. مۆغانەکە لەبەر خۆیەوە وتی:

– قورسی لاشیپی دەروازەکەو ماندووبوون لە هۆشی بردووە. هۆزا دوای ماوەیەك چاوی کردەوە و روانییە هێشاو چاوی نوقاندەوە.هێشا زۆر پەرۆش بوو بانگی لێ کرد:

– هۆزا! ئەوە منم من هێشام چاو بکەوە، پێم بڵێ بۆ هاتی؟!.

لەسەر داوای مۆغانەکە هۆزایان داپۆشی و وازیان لێهێنا تا خەوی پیا بکەوێ و بحەوێتەوە جارو باریش لێدانی دەماری دەسی چەپی دەگرت و لە مانیدڵنیایی دەکردن..

خواردنەکە بە باشی نەچووە گەروویان، هێشاو واران لەبەر پەژارەی هۆزا مۆغان و ئاگرڤانەکەش لە ختوورەی ئەوەدا بوون: داخۆ ئەو دوو کەسە بۆ لەگەڵ خۆیاندا ئەویتریان نەهێنابووە ژوورەوە؟.

خورپەی دڵی هێشا وای بە پەردەی دڵیدا دەچرپان کە ئەم مۆغانە گەلێ شت لەبارەی سیمیارەوە دەزانێ و خەریك بوو پێیان بڵێ، وەلێ رووداوەکەی هۆزای هات بەسەردا لێ تێك دان کە مۆغانەکە وتی ئەو بێهۆشییە هی ماندوو بوون و شەکەت بوونی رێگایە، هێشا لەناوەوە بۆ هۆزا برژا.. چونکە لەوە دڵنیا بوو ئەو بەسەزمانە قۆناغ بە قۆناغ بە شوێنیاندا هاتووەو هەر بە شوێنیانەوە بووە بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆیاندا بیبەن، تا لای هەنارخان و خەڵکی دەگا دەرخات کە دڵسۆزەو وەك کەسانی تر بۆ کارو فەرمان سەری پێوە نییە.. لە دڵ خۆیدا وای دانابوو کە ئەگەر مۆغانەکە لێی پرسی: ئەی بۆ ئەویان نەهێنابووە ژوورەوە؟ پێی بڵێ: لە خۆی بپرسێ:

زیرگەوانەکە دڵی لە هێشاو هۆزا کرمێ بوو، لە دڵ خۆیدا وای لێك دەدایەوە بێ مەلامەت نەبووە ئەو دوانە برادەرەکەی خۆیان لەگەڵ خۆیاندا نەهێنابووە

ژوورەوە! مۆغانەکە وەك ناسییاویان بیٚ وا رووی دەدانیٚ و بە تەنگەوەی هۆزاوە چوو:

لەپڕ ئەم پرسیارەی ئاراستەی هیٚشا کرد:

– ئەم کوڕە ناوی هۆزایە؟!.

– بەڵیٚ..

ئەی بۆ لەگەڵ خۆتاندا نەتان هیٚنابووە ژوورەوە؟!.

– قوربان پرسیارت لەسەر سەرمە.. حەز دەکەم کە خۆی بەئاگا هاتەوە لە خۆی بپرسی..

– لە خۆشی دەپرسم.. حەز دەکەم بەر لەو شتیٚ لە تۆوە بزانم..

– قوربان شت لەتۆ ناشارمەوە.. ئیٚمە لە لایەن مەرزگای هەورامان و خانمی گەورەوە کە هاوسەری سەردارمانە رەوانە کراوین بۆ ئەوەی لەهەر شویٚنیٚ بووە پیر سیمیار بدۆزینەوەو راسپاردەی ئەوانی پیٚ رابگەیەنین کەبگەڕیٚتەوە ..ئەم کوڕەو چەند کوڕیٚکی تر لەبەر دلۆڤانی خانمی گەورە دەیانویست لەگەڵماندا بیٚن، بەڵام ئەوانی تریان خانم پەشیمانی کردنەوە، دیارە ئەم لەسەر کەوتنە شویٚنی ئیٚمە موکڕ بووەو هاتووە، ئیٚمە لەریٚدا نەمان دیووە، ئیتر نازانم چۆن شویٚنی ئیٚمەی هەڵکرتووە وگەیشتووەتە ئیٚرە !..

– چەند رۆژە بەریٚوەن !

– ئەمشەو دووشەوودوورۆژە..

– هەی بەسەزمان..دیارە هەر بەشویٚنتانەوە بووە!.. مۆغانەکە وەك لەزوووەوە هیٚشای ناسیبیٚ چی دەوت بڕوای پیٚ دەکرد..

ئەو شەوە تادرەنگی بەدیار هۆزاوە دانیشتن، ئەو پرسیاری لێ دەکردو هێشاش لەبارەی دەگای هەورامان و مە رێگا و هەنار خان و نازەنین.. قسەی بۆ دەکرد..

هێشا بۆی دەرکەوت کەسیمیار پتر لەسالێك لای ئەم موغانە بووەو زانیاریان لەیەکتری وەرگرتووە سیپارە کۆنە پەرپووتەکانی ئەو پەرستگایەی سەر لەنوێ بەخەتە خۆشەکەی خۆی روونووسکردونەتەوەو، ئەوجا لەوێوەوەبەرەو ئیلام رێ گرتووە ئەوێی بەجێ هێشتووە..هەروەها بەقسەی موغانەکەدا بۆی دەرکەوت، کەکچی سەرداری ئەوێ، هەولێ داوە سیمیار بخاتە ناو داوی عیشقی خۆیەوە، کەسیمیار ئەوە دەزانێ بەناوی سەردانی ولاتی خۆی، ئەوێبەجێ دێلێ و بەرەو ئیلام دەکەوێتە رێ، ئەم موغانەش، رۆژە رێیەك رەوانەی دەکات..لەپاش یەکتری ناسین، موغانەکە بەگوێی هێشادا دەچپێنێ کە ناوی خۆی لای زیرگەوانەکە نەلێ!..

هۆزا دوای ئەوەی ماندوویەتی بەری دەدات و دەحەوێتەوە بەئاگا دیتەوەو گوێی لەو ئامۆژگاریەی موغانە کە دەبێ کە بەهێشا دەلێ (باشتر وایە لەگەڵ خۆتان بیبەن، دیارە یەزدانی مەزن ئێوەی خۆش ویستووە کە ئەو کوڕەی بەدوادا هێناون، بۆ ئەوەی ببێ بە هاودەمتان.. ئەی نازانن زەردەشت فەرموویەتی((یەك کەمە، دووخەمە، سێ خاتر جەمە..)) ریگای دوور بەیەك و دوو درەنگ تەی دەبێ بەسێ خۆی راناگرێ..)

لەو کاتەدا کەموغانەکەئامۆژ گاری هێشای دەکردئاگر ڤان و واران لەناو خەوێکی قوڵدا نووقم بووبوون. هۆزا بەتەواوەتی هەستی کرایەوە، سەرەرای ئێشی جمگەکانی لەشی و کاسبوونی سەری، تینویەتی و برسییەتی قورگی وشك و گەدەی بێ ئارامکردبوو.. وەلێ قسەکانی مۆغانەکە کەدلنیای کرد، ئەو دەبێتە

کەسی سێیەمی ئەو سەفەرە، ئیتر لە خۆشیان هەموو شتێکی تری وەلاوەنا   لە ڕووەوەبەئاگا بوو، خۆی بەو شوێنەوە کەتیایدا ڕاکشابوو،نووساندبوو، چاوەڕوانی یەکێکی دەکرد بڕواتە سەری‌و هەڵی سێنێ..واران چووە سەری‌و پێ‌ی وت:

– هۆزا ! خۆت مات مەکە، هەڵسە، خۆت پەڕاندەوە، هەڵسە!..

هۆزا خۆی لەگێلی داو وتی:

– من لەکوێم؟!. ماوم یان مردووم!.

– ماوی،نەمردووی ..

موغانەکەو هێشا چوونە سەری، ئەویش چاوی خۆی هەڵدەپرووکاندو ویستی دڵی خۆی پڕ کات هێشاپێ‌ی‌وت:

– بۆ هاتی ؟!.

– نازانم! خۆشم نازانم ..

– دەی بۆ مەولای گەورەی  بگێرەوە،بۆچی هاتی؟.

هۆزا سەری داخست و خۆی سەخڵەت نەکرد..

– نازانم ..حەزدەکەم، لەکەڵ خۆتاندا بمبەن..مۆغانەکە ڕووی تێ کردو وتی:

– هەڵسە..دەزانم حەزدەکەی خۆت بکەیتە پیاو..هەڵسە وامن داوام لێیان کردووە بتبەن..هێشا بۆ ئەوەی دڵنیای بکات کەدەیبەن وتی:

– خوا بەقوربانی پێلاوەکانی مەولات بکات ..

موغانەکە هاتە دەم و ووتی:

– نا ..وامەڵێن   هەڵبەتە ویستی یەزدان وابووە بیبەن ..کەهۆزا گوێ‌ی لەو وتانە بوو، لەخۆشیاندا  ئازارلە لەشیدا نەما، پەلاماری دا دەستی مۆغانەکە و هێشا ماچ بکاتن وەڵێ مۆغانەکە نەی هێشت . ڕووی کردە ئاگر ڤانەکەو وتی:

– زوو خواردن بۆ ئەو کوڕە ئامادەبکەن

هۆزا خواردنێکی باشی دەرخوارد درا، ناو هەناوە وشکەو بووەکەی خووسایەوەو، هاتەوە سەر خۆی، بۆ ئەوەی پتر بەزەی پیا هاتنەوەی هێشاو موغانەکە بەلای خۆیدا راکێشێ دەی نکاندو، لەرۆیشتندا لەنگەیەکی شەلانەی بۆ دەکرد، کەرۆژ بووەوە چاوی بەلاشیپی دەرگاکە کەوت کە چەند گەورەوقورس بوو، پێ‌ی سەیربوو چۆن نەی کوشتووە!. ئەو بەزەیی پیاهاتنەوەو ناز هەڵگرتنەی کەموغانەکەو هێشابۆیان دەنواند دەبردەوە سەر ئەوەی کەبەو دەرگایە نەمردووەو ببێتە گوناحێك ئاگر بەرداتە ویژدانیان ..

* * *

لەسەر بریاری موٚغانەکە ئەو رۆژە کە لە پەرستگا کەدا مانەوە، بە ناویدا گەڕان،دەستنووسەکانی سیمیار کەبۆ مۆ غانەکەی بەجێ هێشتبوون، ئەوشوێنانەی کەتیادا دانیشتبوو، یان هاتوو چووی تیا کردبوو پیشانی دان.. ئەوان چەند بە تاسەوەی بوون سۆراخی بکەن، موٚغانەکەش بەناو هێنانی و باسکردنی یادەوەریەکانی خۆی نوێ دەکردنەوەو دەگەڕایەوە سەر ئەو ماوە خۆشەی کە ئەو لەگەڵ سیمیاردا لەو پەرستگایەدا بەسەری بردبوو هێشا هەرچەند سەوادی نەبوو کەچی بەدیتنی دەسنووسەکانی سیمیاروای دەزانی ئەو خەتانە دەس و پەنجەی سیمیارن بەخێر هاتنی لێ دەکەن و پێی دەلێن رێ بەرمەدەو برۆ سیمیار چاوەروانت دەکات ..

مۆغانەکە زیر گەوانەکەی ناردە ناو شارۆ چکەکە تابزانێ چ رۆژێك کاروانی حەفتانە دەکەوێتە رێ، بۆ ئەوەی هێشایان لەگەڵدا رەوانە بکات..لەدڵیشەوە خەمی‌ئەوەی لێ نیشتبوو ئەو زیر گەوانە، بۆ خۆ بردنە پێشەوە بڕواتە ماڵی سەرداری شارۆچکەکەو لە هێشا ئاگاداریان بکاتەوە، چونکە ناوی هێشا وەك ناوی نازەنین لەزۆر دەڤەردا بڵاو بووبووەو، خەڵك خۆشیان دەویست، وەلێ ئاغاو سەردارەکان رکییان لێی دەبووەوە..

موغانەکە چۆن بیری لەزیر گەوانەکە کردەوە وادەرچوو، بەر لەوەی بچێتە ناو دێ و هەواڵی بەڕێ کەوتنی کاروانەکە بپرسێت یەکسەر بەرەو کۆشکی سەردار تێی تەقاند، خواو راسا لەگەڵ دەرگەوانی ماڵی سەردار دا لە سەر پەلەکردن بۆ چوونە ژوورەوە بوو بەدەمەقاڵەیان و کابرای دەرگەوان نەی هێشت بچێتە ژوورەوە، ئەویش تۆراو ئەوەی لەناو نانێکی گەرمدا بۆکابرای دەرگەوان هەڵگرت..لە دڵەوە پاساوی بۆ خۆی دەهێنایەوەو دەیووت ((باشت کرد گەڕایتەوەو ئەو کارەت نەکرد و مۆغانی مەولات لە خۆت نەرەنجان، لێی گەرێ رۆژێك دەبێ شتەکە ئاشکرا دەبێ ئەوکاتە منیش دەرۆم ئەو راستییە بە سەردار دەلێم و ئەو کابرایە بەدەرکردن دەدەم!))

دەرگاوانەکەش لەبەر خۆیەوە دەیووت((وای دەزانی من گێلم نازانم بە بۆنەی کارەوە بۆچی دەچێتە حەرەم سەرا! دەتەوێ دیدەنی لەگەڵ کارەکەرەکەیاندا بکەیت.. هەی نەی خۆیت!)).

لەگەڵ ئەوەشدا ختوورەی ئەوەش لەدڵی نیشتبوو کەلە وانەبێ ئەو زیر گەوانە کارێکی نهێنی گرینکی بەسەردار هەبووبێ، کەنەی هێشت بڕواتەلای سبەی رۆژ بیکات بەبەهانەو بەدەرکردنی بدات و ئەوجا دەرگای چوونە ژوورەوەی بۆ واز ببێ..دیار بووکارەکەرەکەش دڵداری هەردووکیان بوو..

بەیانی مۆغانەکە پێش هێشاو واران و هۆزا کەوت و تا بەسەر قافڵەی کاروانەکەی نەسپاردن نەگەرانەوە..

وایان دانابوو کاروان تاکوێ بڕیکات لەتەکیدا بڕوات، لەهەر شوێنێکیش لایدا لەوێ سۆراغی سیمیار بکەن و ئەو ڕێگەیە بگرن و تـا نەگەنەلای بەری نەدەن ..

ئەو ڕۆژە تانزیکەی نیوەڕۆ لەتەك کارواندا بەگوڕ ڕێیان بڕی، پاش نیوەڕۆ لەپاڵ ئەو زورگانەدا کەپشتیان لەدەشتێکی پان کردبوو بۆ پشوودان باریان خست پاش بار کردنەوە، هێشتا لەبارەگاکەدا نەترازابوون، دییان چەند راوچییەکیسوارە، سەگ و تاژییان لەرێوییەکی لەڕی رەقەڵەبەرداوەو بەهەراو زەنا بەدویدا غار دەدەن و سەگەکانیان تێ بەرداوە..

رێوییەکە وەك پەنا بەرێك خۆی بەناو کاروانەکەدا کرد ، سەگ و راوچییەکان، دەوری کاروانەکەیان دا رێوی بێ چارە بەدەور هێشا دا دەسوڕایەوەو بەنوزە نوز کلکە لەقێی بۆ دەکردو بەروانینی چاوە زەردە داماوەکانی گڕی بەزەیی لای هێشا تاو دا.. کەدیتی سەگەکان بەگەڤی خاوەنەکانیان دەیانەوێ پەلاماری بدەن، هێشا زوو لەتوێشە بەرەکەیدا ئەو خواردنەی کەهەیبوو فڕێی دایە بەردەمیان، لەبەر برسیەتی پەلاماری نان و خواردنەکەیان داو وازیان لە رێویەکە هێنا ،رێویەکەش ئەوەندەی تر خۆی خستە خاك و پای هێشا راوچییەکان ویستیان لێی بدەن، ئەویش توانی بەرگری لەخۆیورێوییەکە بکات، هەر قامچییەکیان بۆ رادەوەشان زوو زەندی کابرای دەگرت.

سەرۆکی راوچییەکان دیاربوو کابرایەکی جەربەزەبوو، بەرکەوە قامچی رادەوەشان وهێرشی بردە سەرهێشاو ویستی پەلاماری بدات، ئەسپەکەی وەك خۆی دەپیر ماندوو بەدەوریا دەیسوڕاندەوەهێشا هەردوو دەستی دەخاڵەتی بۆ بەرز کردەوەو پێی وت:

– گەورەم، خۆت نارەحەت مەکەو گوێ لەبرایبچوکی خۆت بگرە.. ئەم ڕێوییە ـەنای بۆ ئێمە هێناوە، ئەگەر بۆی بڕوانی و ناو چاوانی بخوێنێتەوە ڕاوی ـکمیت.. وێڕای ئەوەش وادیارە بێچووی وردەڵەی هەیە، بۆیە لەکونی خۆی ـاتووەتە دەرەوە بۆ ئەوەی خواردنی پەیدا بکات و بیکات بەشیر بۆ بێچووەکانی، ـڕحمێ بەو بێچوانەی بکەن، وازی لێ بێنن.. کابرای سەرەك ڕاوچییان لەوابوو ـسەکەی هێشا بەگوێیدا بچێ.. کەچی لە پشتەوە یەکێك لە خۆیان پێی وت:

– ئاغام!. گوێت لەو قسانەی نەبێ. ئەوە فێڵبازە دەیەوێ ڕێوییەکە بۆ خۆی ـبات..

هێشا وتی:

– چی داوا دەکەن ئامادەم، مەیکوژن .. پەنای بۆلای ئێمە هێناوە..

کابرای سەرەك هەندێ شێوازی هەڕەشەکانی نەرم بوون و وتی:

– ئیمە ڕاوچین، گوێمان لەوە نییە بێچوی هەیە یان نا..

کابرای پشتەوە تەکی بەهێشا هەڵچنی، ئەوەندەی نەمابوو قامچییەك لەگازرای پشتی هێشا قایم بکات.. لەو کاتەدا هۆزا لەپەناوە بەبەردەقانێکەی بەردیکی لە ـەسپەکەی سرەواندو کابرا لەسەری کەوتە خوارەوە، کابرای سەرەك کەدی ـرادەرەکەی بریندار بوو، ئەویش بەتووندی یەك قامچی بۆ ناوچاوانی ڕاوەشاند، هێشا خۆی دایە بەری و لەناوەڕاستدا لەدەستی خۆی پێچای، کەرای تەکاند کابرا ـەسەر ئەسپەکەی لار بووەو لەترسی کەوتندا قامچییەکەی بەرداو تاوی دایە ـەسپەکەی واران دەس بەجێ چووە بن ئەسپەکەی هەردوونی گوونی فشارداو ـعینەوە هەڵی تەکاندن و بەسەرکابردا گلا..

هێشا کەزانی ئەسپەکە خراپ بەسەریا کەوت، نەبادا ئەسپەکە ڕاست بێتەوەو ـاچی ئەویش لەناو وێزەنگیەکەدا گیر ببێ و بەهەڵسانەوەی ئەسپەکە بشکێ زوو

فریای کەوت، لەژێر ئەسپەکە دەری هێنا، دی کابرا بێهۆش کەوتووە، لەسەر پشت رای کشاندوو زوو هەندێ ئاوی بەدەمەوەکرد..

کاروانچییەکان پەشۆکا بوون، نەیان دەزانی لەو هەڵوێستەدا چی بکەن؟. چی بڵێن باشە؟ بڵێن ئەوانە لە ئێمەنین، تاخۆیان لەو بەڵایە دوور خەنەوە، یان نوکلیان لێ نەکەن چی دەبی با ببێ!. گەڵێ دەنگ بەرزبوونەوە کە ئەوان کاروانی نین. وەڵێ کەس گوێی نەدانێ کەسیش ئەو دەنگانەی نەبیستن.. گەردەشێك بوو جێی تێگەیاندنی تیا نەدەبووەوە!.

ئەسپ سوارەکان لەولاغەکانیان دابەزین بەهەموویانەوە وارانیان گرت و دایانە بەرشەق و لەق.. کاروانچییەکان بەهەرحاڵ بوو لێیان خڕبوونەوە وارانیان لەبەر لەقان دەرهێنا. هێشا کەبۆی دەرکەوت ویزەنگی ئەسپەکە بەسەر قاچی چەپی کابرادا کەوتووەو شکاندوویەتی، زوو هەوڵی دا بەگەرمی بیباتەوەشوێن خۆی، چەند پارچە دارێکیان بۆ هێنا، بە چەقۆکەی بەرکەمەری تۆزێ سافی کردن و دەسەسرێکی لەباخەڵی دەرهێناو توووند پێچای، راوچییەکان کەزانییان سەرەکەکەیان بەکەوتنی لاقی شکاوەو هێشا خەریکی فریاکەوتنیەتی، لەدەوری کۆ بوونەوەو بەردەستی هێشایان کرد، وەڵێ توووند بارانیان گرت، دەیانویست شتێکی لێ بکەن، ئەگەر سەردارەکەیان چاك نەبێتەوە، دوای ماوەیەك کەهۆشی بەخۆیدا هاتەوە، دی هێشا خەریکیەتی و واران دەورە دراوە وتی:

– لێیان گەرێن خەتای ئێمە بوو..

لەو کاتە دا کە ئەو جەنگی مەغلوبەیە بەرپابوو، رێوییەکە چووبووە، سەرباری ئێسترێك خۆی مات دابوو، لەبنەوە سەیری رووداوەکانی دەکرد و هەناسەی لەخۆی بڕیبوو، سەگ و تاژییەکانیش بەدەور ئێسترەکاندا دەسوران و گەڤیان دەکرد..

بەتەگبیری هێشا کابرای لاق شکاویان لەبەردەم یەکێك لە برادەرە ـ وچییەکانیدا سوار کرد، بەهەموویانەوە کاروانەکەیان راپێچ داو بەرەو شاری ـ وچییەکان کەوتنە رێ.. رێوییەکەش کەزانی کەس ئاگای لەو نەماوە ـشوێنێکی چەم و چۆخڕدا فیتی خۆی قۆزتەوەو رۆی..

کابرای لاق شکاو هەرچەند لەکاتی فریاکەوتنیدا جۆرە نەرمییەکی دەربارەی باران و هێشا نواند، کەچی لەراستیدا پیاوێکی دڵرەق و نەگریس بوو، لای خەڵکی لای خۆیان ئەوەندە پیاوێکی پەسەند نەبوو، هەرجار کەبۆ راوو شکار ـەردەچوو خەڵکی ئەویٚ ئاواتیان بوو بە ئەستۆ شکاوی بگەرێتەوە، برا گەورەی ـەهقانی ئەو شارەبوو، هەرچەند بەتەمەندا چووبوو کەچی وەك هەرزەیەکی چەتوون هەلسووکەوتی دەکرد، کەگەیشتەوە ناو شارو خەڵکەکە بەرووداوەکەیان زانی، نزایان دەکرد بەو لاق شکاندنە راست نەبێتەوە. کەچی هێشا فریای کەوت ـەی هێشت برینەکەی تەشەنە بکات تەختەی بۆ برینەکەی تاشی و پوخت پێچایی و داوای لیٚ کرد کە تاسیٚ حەفتە نەی جولێنیٚ..

دەهقانی برای کابرا بڕیاری دا تا چاك نەبێتەوە هێشاو واران لەگرتووخانەدا بن، کاروانەکەش لەو شارەدا نەشتی پیٚ بفرۆشریٚ نەشتی لێبکردریٚ هێشا بەرگرییەکی جوانی لەبەردەم دەهقاندا لە خۆی و کاروانەکە کردو تیٚگەیاند، کە ئەو کاروانە چ جۆرە پەیوەندیەکی لەو مەسەلەدا نەبووە، ئەمان لەبەر ناشارەزایی خۆیان خستۆتە تەك ئەو کاروانە، نەئەوان ئەمان دەناسن، نەئەمان دەزانن ئەوانە کێن.. ئێدی دەهقان بڕوای بەوتەکانی هێشا هات و حوکمەکەی لەسەر کاروانەکە هەڵگرت و کاروان رۆی..

کەکابرای لاق شکاو زانی خەتای خۆی بووەو هێشایش بەنەرم و نیانی و دڵسۆزیەوەوەك حەکیمێك فریای کەوت، داوای لەدەهقانی برای کرد کە

حەکمەکەی لەحەپسەوە بۆ بکات بەمانەوەی لەو شارەدا، تا چاکی نەکاتەوە رێ لەدەرچوونی لەو شارەدا پێ نەدرێ

حوکمەکە وای لێ کرا، هێشا بووبە حەکیمیکابرا، واران لەحەپسدا مایەوە..

هۆزا بەرامبەر بەو رووداوە ژێریینواند، لای دەست و پەیوەندی ئەو کابرایە وای پیشان دا کەبرای سەرقافڵەی کاروانەکەیەو بۆ بەر دەستی کردنی هێشا بەجێیاز هێشتووە مەبەستیشی ئەوەبوو ئەگەر ئەوان تووشی تەگەرەیەك بوون ئەو رێگەی گەیشتن بەسیمیار بەرنەدات..

بەپێی حوکمەکەی دەهقان هێشاو واران لەو شارەدا بۆ ماوەی سی مانگ دەسبەسەر کران، یان کران بەبارمتەی چاك بوونەوەی ئەو کابرایە..

هۆزا ببووە پردی نێوان هێشاو واران ، ئەو راوتەگبیرانە کەدەکران بە یەکتری دەگەیاندن..دوا تەگبیریان هاتە سەر ئەوەکە هۆزا رێ بەر نەداو شارەو شار و دێهاتەو دێهات شوێن رۆیشتنی سیمیار هەڵکات و بگاتە لای هێشایش ونبوونی هۆزا والێ بکات کە گوائەو کورە بێتاقەت بووەو بە شوێن قافڵەکەی خۆیاندا چووە..

* * *

با بگەرێینەوە ناو دەگای هەورامان بزانین پاش دەرچوونی هێشاو واران لەدەگا دا چ باسە..

نۆشا دوای ئەوەی لەدیوەخان لەخۆی تێکداو بەو جۆرە لەناو نەنگیەکانی خۆیدا چەقی و بەخۆی و پاشەڵی شکستەوە بەرەو ماڵگەرایەوە، ئەوەندەی تر

کینەو رك سنگیان داوەشاند، بەرچاوی بەژەهری ناو هەناوی تاریك هەڵگەڕا، ـەمەمووی ناخۆشتر تانەو تەشەرەکانی کاڵی ی ژنی ، ئەو دۆڵە بەرینەی دەگاو مەورامانی لێکردبوو بەپاچاڵی جۆلاّ ،نەی دەزانی چلۆن پێ ی تیا راکێشێ..

کاڵێ ناحەقی نەبوو رۆژی روناکی لیّ بکات بەتاریکە ستان.کابرا بۆ ئەوەی عەیبەکانی خۆی تیا ون بکات، لەم لاو لەولا، بەدزیو بە ئاشکرا بلاّوی دەکردەوە کە نازەنین و هەنارخان بۆیە هێشا یان بە شوێن سیمیاردا نارد تا لە رێدا تووشی تەگەرەیەك ببیّ و سەر نەهێنێنەوە، ئەو کاتە نازەنین بە ئارەزووی خۆی شوو بەپیاوێکی ناو دار بکات، هۆزاشیان بۆیە سەر نوگم کردووە، چونکە نهێنی ئەو زلو تەگبیرانەی زانیوە، نەبادا لای خەڵکی بیدرکێنێ، بۆیە بەو دەردەیان بردووە! وا پڕوپاگەندەی بلاّودەکردنەوە..

کاڵێ ی ژنی نۆشا بۆی دەرکەوت لە دیوخان، لەبەردەم (مەرێگا)ی پیراندا حەیای چووە، ئیتر دابویە بەر تانەو تەشەری جەرگبڕ وەك ئافرەتێك بە گلار کۆی پێتاوەی چڵکن بیشواتەوە وەها بە قسەی رەق دابویە بەر تیرو تانەوە پێ ی دەوت:

– ماڵ کاول، لەوە زیاتر حەیامان مەبە، چارێکی خۆت بۆ ناکەیت! بۆلە دەگادا کەس ماوە ددانی خەیرت پیابنێ، جکە لەوەش خەڵك خۆیان لێت لادەدەن!. دەڵێن چاوێکی چڵکنی وای پێوەیە وەك تیر یەکاو یەك دەپێکێ و سەرکردنی نییە.. کەس ناتوانێ یەك سات بارت هەڵگرێ من نەبی.. بزانە چارەیەکی خۆت بکە.. پیرێك، مۆغانێك، پیاو چاکێك، نویشتەیەك!..بەڵکو خوا بەزەیی پیاتا بێتەوە..

کە ئەو تانەو تەشەرانەی لەکاڵی ی ژنیەوە دەبیست ئەوکاتە ئەوندەی تر قینی دەجوولاو وەك دووپشکی بەئاگر دەورە دراو جزەی پەست بوونی راست دەبووەو هەموو گیانی دەبوو بەژەنگ کەدەهاتە سەرخۆیو خۆی دەدایە بەرهەزری خۆی

وتەكانی كاڵێ ی پی راستبوون و بەخۆی دەوت: ئەری بۆ چارەیەكی خۆت ناكەیت ؟

خەڵكی دەگا دڵ و دەروونیان وەك پەڕەی گوڵی سپی وەهابوو، ئەو پرو پاگەندانەی نۆشا نەی دەژاكاند، بەڵام جۆرە گەردێكی دەخستە سەری، گومبوونی هۆزا خاڵێكی دیتراوی ناو ئەو گەردە بوو..

چەند رۆژێك پاش دەرچوونی هێشاو واران، باسی هۆزا هاتە پێشەوە، كەس نەی دەزانی ماوە مردووە؟ چی بەسەر هاتووە؟ گەلێ بەشوێنیدا گەڕان دیار نەبوو. لەو بارەوە دڵی خەڵكەكە كرمێ بوو! ئەختەری دایكی كە گوێ ی لەو قسە تاڵانە دەبوودڵە خورپێ ی گومان هۆشی لەق دەكرد ، وەلێ كەلێكی دەدایەوە بڕوای بەو پڕو پاگەندانە نەدەهێنا دەیزانی كوڕی نۆكەری نازەنین بووەو لەو ناوەشێتەوە كاری وابكات، ئەویش خەیلێ بەو بزر بوونەی پەرۆش ببوو، گەلێ خەڵكی بەم لاوبەولادا ناردبوون كەسۆراخی بكەن..ئەختەری دایكی دڵی بەوە خۆش بوو نیشانەی بەسەفەر چوونی لەدوا بەجی مابوو.. بەڵام نەی دەزانی بۆ كوێ چووە؟ بە دووی هێشا كەوتووە؟ یان بۆ لایەكی تر چووە؟ یان تۆراوە؟ چونكە ئەو ئێوارەیە كەبەیانییەكەی ئەوی تیا بزربوو پڕدۆڵەكەیان نانی پەچیبوو، بەیانی جگە لەیەك دوونان چیتری تیا نەمابوو، گلێمی توێشە بەرەكەش نەمابوو، كەوابوو نانەكە ئەو بردوویەتی و لەگلێمەكەی ناوەو لە پشتی بەستووەو ڕۆیشتووە..

كە نازەنین ئاگادار كرایەوە، قسەی وەها لەناو دەگادابڵاو بوونەتەوە، ناردی بەشوێن ئەختەردا و پێ ی وت:

– گوێت لەقسەی ناحەزان نەبێ .. دڵنیابە هۆزا شوێن هێشا كەوتووە ..

كەئەختەر ئەوەی لەنازەنینەوە بیست، دڵی وەك دۆڵەی نانەكەی ئەو ئێوارەیەی كەبەیانییەكەی هۆزای تیا بزربوو، پڕبوو لەیەقین و گومانی تیا نەما

کەوتەکەی نازەنین تەواوە.. ئەو هەمووانەو تویشەبەرەیە خۆ بۆ ئاسمان دەفریوون، دیارە لەپشتی ئەو بەسراون، ئەمەو وتەکەی نازەنین بوون بە نۆرەنانێك لەپشتی ئەویەقینە بەستران و بەنزاکردن کەوتە شوێن هۆزا..

هەنار خانیش بانگی کردە لای خۆی و دڵی دایەوەو پی‌ی وت:

– ئەو شەوە کەبڕیاردرا هێشاو یەکێکی تر بەشوێن سیمیاردا بڕۆن، ئەو رکی گرت، دەیویست ئەو لەگەڵ هێشادا بنێرین کەزانی هێشا ئەو نابات، رکی گرت، دەهاتە لام ئامۆژگاری بکەم.. وەك بۆم دەرکەوتووە لەتەکیانداچووە..

ئەختەریش هەر ئەوەندەی وت:

– نەك هۆزا ، دایکی هۆزاش بەقوربانی تۆیە..

*　　　*　　　*

هێشا خۆشەویستی گەورەو بچوکی دەگا بوو، کەچی نۆشا لەئاستیا چاوی بەرای نەدەداو لێی ببوو بەگرێیەکی سەختی ناو هەناوی خۆی! خەنجەرێکت لێ بدایە بە قەد ئەوەی پێی گران نەبوو کەناوی هێشات لەکنی ببردایە، لەبەر ئەوەی خۆی چەند ئێسك قورس بوو ئەوەندەی تر خەڵك نەفرەتیان لێ دەکردو لێی دوور دەکەوتنەوە، خۆیشی چاك دەیزانی کەخەڵك حەز لەچارەی ناکەن ، وەك قەلە رەشی ناو گروپی کۆتری سپی لێ هاتبوو، جاران وا هەستی دەکرد ئەوەی ئەو دەیکات راستەو خەڵك لێی تێ ناگەن، کەچی وردە وردە بۆی دەرکەوت هەموو خەڵکی لەلایەکن ئەو بەتاك لەلایەکی ترە، لەبەر ئەوەی پیاوێکی چەتوون و نەگریس بوو ئەگەر زبرای خواجە بەهەمەن نەبووایە لەناو دەگای هەورامان دا

جێی نەدەبووەوە، لەبەر ئەوە جگە لەکالێ ی ژنی‌کەس پێی نەدەوت: واز لەو بەد خوویەت بێنە..

لەم دوایەدا هەستی بە بەد خوویی خۆی کردبوو، فێر ببوو سەرزەنشتی خۆی دەکردو دەیووت((باشە بۆ من کەلەگەڵ خەڵکدا دادەنیشم خۆم پێ ڕاناگیری؟!.. سنگی خۆم دەردەپەڕێنم لەناو تاریکدا شەڕە بەرد دەکەم !؟ باشە ئەگەر خەلك خراپن و من باشم، ئەی بۆچی لەگەڵ ماڵی خۆمدا وەهام!))

بەو خۆ دواندنەدا بۆی دەرکەوتبوو کەجۆرە خدەیەکی تێدا هەیە، ناهێلی بحەوێتەوە، ئەی چۆن چارەی بۆ بدۆزێتەوە؟!

وای بەباش زانی بەگوێی کالێی ژنی بکات.. پیرێك؟ مۆغانێك ؟ پیاو چاکێك ؟.. ئەگەر پیاوێکی دیندار بدۆزێتەوەو تۆبەی بەسەر دەستدا بکات و بەرماڵێك بەشانی خۆیدا بدات و دەمی خەڵکی پێ قاپات بکات و ناو هەناوی پاكژ بکاتەوە. کارێکی خراپ نەبوو.. بەلام کوا لای کێ؟. پیرانی شارەزوورو هەمەدان و ئاریان نشین و میدیا نشین و گەرمەسێر بەخەیاڵیدا هاتن، ئەوانەی بیستبوون وەلێ نەی دەزانی دوورن نزیکن؟. بۆ ئەو مەبەستە پرسی بەکەس نە دەکردو خۆیشی نەیدەزانی کورترین ڕێگەی ئەو مەبەستە کامەیە.. لەدواییدا بیری لە سەر ئەو پیرە سەقامگیر بوو کەناوی پیر وەسان بەگەو لەم دواییەدا ناوی دەرکردبوو، کەپیرێکی دەست ڕۆیشتووە، خاوەن دەسەلات و پایەدارە..

لای کالێی ژنی درکاندی کەنیازێکی وەهای هەیە کە: دەیەوی پیاوێکی پیرو دیندار بکاتە دەسگیری خۆی تۆبەی لای بکات و ئیتر تێکەلی کەس نەبێ و ریشێك بەرداتەوەو رووبکاتە خواوەندو بەرماڵێك بەشانی خۆیدابدات..

کالێ گەلێ بەو نیازەی کەنۆشا درکاندی دڵشاد بوو، لای وابوو لەو دۆزەخەی کەچەندان ساڵە تێی کەوتووە رزگار دەبێ، بۆیە پێی ووت:

- هاتیتە سەر ڕای من! چەند ساڵە وات پێ ناڵێم؟!.

نوکلی لەراکەی کاڵێ کردو وتی:

- رای تۆ ؟! جا تۆ چیت تا رات هەبێ !..

کاڵێ نەی ویست بیهروژێنێ، زوو وتی :

- باشە، باوابێ!!

*　　　*　　　*

نۆشا بەرەو دەڤەری پیر وەسان بەگ ڕێی گرتە بەر، بەبێ ئەوەی لای کەس بڵێ بەرەو کوێ دەڕواو نیازی لەو ڕۆیشتنەیدا چییە؟!. وای خەیاڵ دەکرد لەمە گەیشتە ئەوێ پێشوازی دەکەن و ڕێزی لێوەر دەگرن، ئەو ڕۆژە کە ئەو گەیشتە ئەوێ ڕێکەت وابوو پیر وەسان بەگ بۆ سەردان و رابەری کردن لەئاسانەکەی خۆی دەرچووبوو، دوورڕۆژی پێ چوو ئەوجا گەرایەوە، لەماوەی ئەو دوورڕۆژەدا کەس ئاورێکی وەهای لە نۆشا نەدایەوە، وابێزار ببوو تفی لەخۆیو لەو شتەی دەکرد کە بۆی هاتووە.. ناحەقی نەبوو ئەوەی ئەو بیری لێدەکردەوەو ئەوەی بەچاوی خۆی لەوێ پێچەوانەی یەك بوون.. کەچاوی بەپیر وەسان کەوت وەك کەسێکی جەربەزەو نارەحەت هاتە پێش چاوی، کەچووە لای لەجیاتی ئەوەی خۆی لەبەردەمیدا کز بکات، سنگی خۆی دەرپەراندو پێی وت:

- (گەورەم، من خەڵکی دەڤەری هەورامانم)..

پیر وەسان کەناوی ئەوێی لێوە بیست بەچاوێکی تر تەماشای کردو گەلێ شتی لەبارەی هەورامانەوە لێ پرسی.

نۆشا ئەو مەبەستەی کەبۆی هاتبوو لەبیری چوو! کەوتە سەر باسی هەورامان و نازەنین و هێشا، نەیتوانی لغاوی خۆی بگرێو ئەوەی کەلەناخیدا چوون خاشاك گلێر بووبووەوە بیشارێتەوە وتی:

– ئەو پیاوەی کەمەرجەکەی نازەنینی بردەوە ناوی هێشایە، ئێستا لەپێستی خۆی دەرچووەو رابردووی خۆی ناناسێتەوەو نازەنینیش لێی پەشیمانەو نازانێ چۆن لەدەستی قوتار ببێ، خۆ ئەگەر ئەوی لەکۆڵ ببێتەوەو پیاوێکی رەسەن زادەی بۆ هەڵکەوێ لەوانەیە بەبێ مەرج شووی پێ بکات!.

ئەو قسانەی کەدەکرد وا خۆی دەنواند ئەو بۆ ئەوە هاتووە ئەو هەواڵەی بداتێ.. هەروەها تێی گەیاند کەسیمیار دیار نییەو هێشا بەشوێنیدا وێڵەو لەوانەیەبەو زووانە بگەڕێتەوە.. ئەگەر ئەو حەزی لێیە داخوازی نازەنینی بۆ دەکات! چاکتریش وایە کەهێشا دەگەڕێتەوە چەند کەسێك رێی لێ بگرنو سەر نوگمی بکەن.کەوای وت، وەك دارێك لەبن گۆمێکی پڕ لەشەخەڵ و خەوش و خاردا بگێری وەها مەگێزەکۆنەکانی پیر وەسان دێویانو کەوتنەوە سەر گۆمەکە، بەڵام زوو سەرکوتی کردن و بەجۆرێکی تر خۆی بۆ نۆشا نواندو لێی توورە بوو، ئەوەندەی نەمابووبیکاتە دەرەوە!..

نۆشا کەزانی کارێکی خراپی لەدەست چوو، بەپارانەوەوتی:

– گەورەم.. من کەسێکی گومڕام هاتووم، رێم پیشان بدەی، هاتووم بتکەم بەدەسگیری خۆم..

– تۆ بۆمن دەست نادەیت چونکە بیر لەشتی خراپ دەکەیتەوە، ئەی نازانی لە هەوراماندا پیر سیمیاری لێ دەرکەی هێشا لەهەموو کەس گەورەو بزرگترە..

سەری نۆشا بەقسەکەی پیر وەسان زرنگایەوە، ئەوە یەکەم جاربوو گوێی لە وشەی (پیر سیمیار) بێ! دەیویست شتێکیش دژ بەو بڵێ، بەڵام نازناوی پیر

سیمیار سڵەماندییەوە، قسەی تریش وا دەهاتنە پێشەوە بەڵام وشەی پیر سیمیار نەرفەتەیان لێخەسار دا..کەزانی پیر وەسان بەبێزەوە گوێ بۆ قسەکانی دەگرێ، کەوتە نووزەنووزو پاڕانەوەو وتی:

- قوربان بم بەخشە مەبەستم ئەوەنەبوو تۆ واتێبگەی !

- ئەی مەبەستت چی بوو ؟ هاتووی تاقیمان بکەیتەوە !؟

- قوربان هاتووم تۆبە بەسەر دەستی تۆدا بکەم

- نا .. تۆ ئەو کەسە نیت تۆبە هەڵبگری ..

نۆشا خۆی خستە بەر خاك و پای و تکای لێ کرد ، تۆبەی لێ قبوول بکات ..

ووتەکانی نۆشا ، بیرێکی باشیان بۆ پیر وەسان هێنایە پێشەوە ، لە دلەوە وای بە خۆی دەوت:-

- خۆ ئەگەر هێشا ببێتە زاوای خواجە بەهمەن و نازەنین بکاتە هاوسەری خۆی لەوانەیە هەموو دەڤەری هەورامان و دەورووبەری بکەوێتە ژێر دەستی. بیرۆکەیکی خراپ نەبوو ، وەلێ بوونی سیمیار سەرو بەری بیرۆکەکەی لێ تیکدا. هەرجۆربێ ئەوی دایە دەست رۆژگارو داهات..ئەوجا رووی کردە نۆشا و ووتی :

- من تۆبە بەکەسێك دا نادەم نیازی خراپی لە دڵدا حەشار دابێ !!برۆ خۆت پاك بکەرەوە، ئەوجا سالێکی تر وەك ئەمرۆ وەرەوە، کە هاتیتەوە تەماشای دەروونت دەکەم..

نۆشا بە پارانەوە..

- قوربان من..

پیر وەسان نەی هێشت قسە بکات:

- یەك قسەیەو، نابێ بەدووان..ساڵێکی تر ..

نۆشا بەدڵشکستی هاتە دەرەوە، ڕەنگی لەبەر نەمابوو، پاشاڵی ڕەفتارە بەدەکانی خۆی بەدوای خۆیدا رادەکێشا، مۆتەکەی سروشتە بەد خووەکانی وەك دارە مەیتێکی قورس بەشانی خۆیدا بداو، دووکەڵی هەناسەی نائومێدی وای هەڵدەکێشان بەری ئاسمانەکەیان لێ تەڵخ کردبوو..

نەگریسی پیر وەسانیش هێڵنجی رشانەوەی زەرداوێکی کوشندە بوو..کە گەڕایەوە لەرێدا هەر تفی لە چارەی خۆیو پیر وەسان و کاڵێ ی ژنی دەکرد کە ئەویان خستە سەر ئەو رێگەیە!. هەر ئەو دەمە ڕێی گەرانەوەی بەرەو دەگای هەورامان گرتەوە بەر ..

پیر وەسان بەگ دوو لەچڵکاو خۆرەکانی خۆی بە دوایدا نارد کەلە دەرەوەی دەڤەری خۆیاندا و نزیك دەگای هەورامان بیکوژن و لاشەکەی بۆ قەل و داڵ بەجێ بێڵن!.. بۆ ئەوەی بە ئاسانی بتوانێ ئاسەواری ئەو نیازە گلاوەی کە لە دەروونیداگینگڵەی دەدا سەر نوگم بکات ..

دوو کەسیشی لەدەربەند شاهۆ دا دانان بۆ ئەوەی کە هێشا گەڕایەوە بیکوژن و سەرنوگمی بکەن..

* * *

هەر ئەو بەیانیە کەنۆشا سەفەری کرد، کاڵێی ژنی لە کانی ژنان بلاوی کردەوە کە نۆشا خوا لەدڵی ناوەو بە سەفەر چووە پیرێك بدۆزێتەوە، بیکات بەدەسگیری ڕێی خوا پەرستی.. خەڵکەکە گەلێ دڵ خۆش بوون کەنۆشا چووبێتە لای پیرێك تۆبە بکات، ئیدی لەگێچەلەکانی رزگار دەبن، بەڵکو خوابخاتە دڵییەوە،

ئەو زەوی‌و پاوەن و باخانە کەبەناحەق داگیری کردبوون بیانداتەوە بەخاوەنەکانیان، یان هیچ نەبێ ئەو پشێوینەییەی کە لەبەر ئەوەی زڕبرای خواجەبوو دەیکرد نەمێنێ..کالێ‌ی ژنی خەونی بەو ڕۆژەوە دەدی کەنۆشا واز لەو سروشتەی بێنێ و ببێ بە خاوەن بەرماڵ و ریشێکی ماش و برنج بەرداتەوەو ڕووبکاتە خواو تۆزێ حورمەت لەماڵ و منداڵی خۆی بنێ.. کەچوو، بۆ ماوەیەك دیار نەبو، تا ڕۆژێك خەڵکی دەگا دییان داڵی گەورە بەتاك و جووت بەسەر دەگاداو لەبەرزێکەوە بەگوڕ بەرەو خوار دەفڕن! خەڵکی دەگا دەیان زانی ئەو داڵانە لەمەو دای چەندان فەرسەخدا بۆنی ئاژەڵی تۆپیو دەکەن و بۆ سەر لاکەکەی دەکشێن.. ئەوەندەی پێ نەچوو یەکدوو کەسێکی دەگا هەواڵیان بەدەگا گەیاند، کەگوایا لەناو چەم و چوخرەکەی چەمی چەقەلأندا لاکێکیان دیووەو قەڵ و داڵ سەریان تێ کردووە.. کەچوونە سەری دوولاقە زەلامیان بەرچاو کەوتن، ئیتر نەیان وێراوە لێ‌ی نزیك ببنەوە!.

پیاوانی ناو دەگا، ئەوانەیان کەگوێیان لەو هەواڵە بوو یەکسەر بەپەلە بەرەو ئەو چەمە کشان، خۆیان گەیاندە ئەو شوێنەی کەداڵەکان لێی دەنیشتنەوە، دییان لاشەکە کەڵکی نەماوە، بەڵام دوو لاقی بە پووزەوانە پێچراوو کڵاو فەرەنجی و پشتوێنێکی لەخوێن گەوزاو لەوێن.

پیاوەکان کەللە سەروو ئەو پارچانە لەوێ مابوون لەداڵەکانیان سەندن و خڕیان کردنەوەو لەژێر خڕە کەڵە کێکدا شاردییانەوە، پوزەوانەو پشتوێن و فەرەنجیەکەیان بۆ دەگا هێنانەوەو لە حەوشەی پەرستگادا دایان نان، ئەوەی کەسی بەسەفەر چووبوو، نەگەڕابووەوە دەهات سەیری دەکردن.

کالێ لەمە چاوی بە فەرەنجی و پووزەوانەکان کەوت دایە قیژەی گریان و وتی:

– نۆشایە!.

خواجە بەهمەن دوای چەند رۆژێکی پرسە داوای کرد ئەو کەڵەکەی کە کەلو پاچەکەی هێشای لەبندا شاردرا بووەوە، شوورایەکی لەدەوری بکرێو دار بەرووی تیا بچێندرێ، کەڵەکەکە بە پەرۆ ی رە نگاو رەنگ ئالاّ نیشان بکرێ تاوا پیشان بدا کە ئەوە گۆری پیاوێکی ئاراگێلی رێی خوا پەرستیە ..

گۆرەکەی بووە بە ئیشکچی ئەو چەمە، هەر رێبوارێك بەو شوێنە سامناکەدا گوزەر بکات ، بڕواو خەمی نەبێ. نیازی دێتە دی!..

کاڵێی ژنیشی لەترس تەشەری خەڵك کراسەکەی بەری بۆ شین کردو تا حەفتەیەك (ئاغام رۆ و خوا شوکر)ی بۆکرد ئیتر لەو رۆژەوە مەرێگای دەگا بریاری دا لەترس دەعباو جرو جانەوەر کەس بەتاك نەچێتە سەفەر..

ئەو مۆرکە تەڵغە کەنێو چاوانی دەگای شێواندبوو، نەماو بوویە پاسەوانی چەمی چەقەلاّن!..

# (١٠)

هۆزا؟ سادەی خۆت بنوێنەو ئەگەر ئازای، ئازایەتی خۆت دەرخە! تۆ لە هەنارخان و نازەنین یاغی بووی! بە چ ڕوێکەوە دەگەڕێتەوە دیوەخان ئەگەر کارێکی وەهات نەکردبێ مافی ئەوەت پێبدا هەنارخان ڕووت بداتێ و نازەنین وەرت بگرێتەوە، دایکیشت پێت ڕوو سوور بێ! دەی بتبینین؟. ئەو ڕێگەیە کە لەبەر خۆت نا، کەمی ڕۆییوەو زۆری ماوە، تاك خۆتی و ڕێگە سەختەو هات و نەهاتەو بەرو پشتت بەتاڵە... ڕەوکردن لەتەك هێشاو واران دا کارێکی سانا بوو، وا ئێستا ڕابەرت نەماو ئەو پەڕی ڕێگەیش دیار نییە، هێشاو واران تا سێ مانگی تر لەم شارۆچکەدا دەس بەسەرن... هەنووکەش لەدەگادا هەنارخان و نازەنین و خواجە و دایکت و سەرجەم خەڵکەکە زانیویانە: کە تۆ کەوتویتە تەك هێشاو واران و باست دەکەن... داخۆ چی بڵێن؟!.

ئەوەتا کەوتویتە ناو وڵاتێکەوە بە خەونیش نەت دیووە، دەبێ تاك، خۆت! هەوڵ بدەی سیمیار سۆزراخ بکەیت و بەر لەهەموو شتێ هەواڵی هێشاو وارانی پێ ڕابگەیەنێ... باشە بۆ چ لایەك دەڕۆیی؟!. کام ڕێ دەگری و چۆن شارەو شار دەگەڕێی؟ چۆن؟. هۆزا ئاوا لە دڵ خۆیدا و لەگەڵ خۆیدا قسەی دەکرد... لەگەڵ ئەوەشدا دڵنیا بوو دەتوانێ سیمیار بدۆزێتەوە، ئەو کاتەش ئەو زوو فریای هێشاو واران دەکەوێ... ئەگەر ئەو ئاواتەی بۆ بێتە دی، سبەی ڕۆژ لە هەموو

دەقەری هەورامانندا دەبێتە وێردی سەر زمانی هەمووان، لەوانەشە وەك هێشا ناو دەر بکات و هەنارخان و نازەنین هەزار ئافەرینی بەسەردا ببارێنن...

دەی با بزانین هۆزا چی دەکات؟!.

رۆژێك بەر لەوەی هەنگاو بهاوێ، بە دزییەوە چووە لای هێشاو واران و پێیانی وت:

– بڕیاری داوە تاك خۆی بڕوا سۆراخی سیمیار بکات، لەو بەسەرهاتانەی کە بەسەریاندا هات تێ ی بگەیەنێ، داوای ئامۆژگاری و رێنمایی لێ کردن، چۆن و بەرەو کوێ رێی بەرەو گەیشتن بە سیمیار بگرێتە بەر؟!.

هێشا لەو تەگبیرەی کە لەگەڵ هۆزادا کردبووی لێ ی کەوتبووە مەترسییەوە خەمی ئەوەی بوو ئەویشیان لە دە ست بچێ، بۆیە هەوڵی لەگەڵدا کە واز لەو نیازەی بێنێ، چونکە گەنجێکی بێ ئەزموون بوو، رێگەی گرتنە بەری شاران بە تاکە کەس جێ ی مەترسییە... بەڵام کەزانی سوورە لەسەر رۆیشتن پێ ی ووت:

من بە تۆ ناڵێم بڕۆ... بەڵام ئەوەی دەیەوێ سۆراخی سیمیار بکات با بەرەو ئیلام بڕوات، هەر شارۆچکەیەك هەر دێیەك دێتە بەری یەکسەر بچێتە پەرستگاکەی و لە مۆغانەکان بپرسێ و بڵێ: من شاگردی سیمیارم... ئەو پرسیارە لە کەسێك دەکرێ کە بەر لە پرسیارەکە بزانرێ ئەو کەسە سیمیاری خۆش دەوێ یان نا... کە زانی وایە داوای لێ بکات لەگەڵ رێبوارێکی ناسیاو یان لەگەڵ کاروانێکدا رێ ی ئەوێ بگرێتە بەر...

هۆزا لەدوا سەردانییدا بۆ لای هێشاو واران خواحافیزی لێ کردن و پێ ی راگەیاندن کە ئەگەر سەری خۆی لەو رێیەدا داناوە هەر دەڕوا...

بەیانی بوو، خۆی گەیاندە ئەوپەڕی خوارەوەی شارۆچکەکەو لەسەر چەقی رێگەکەدا راوەستا، بەو ئومێدەی بەڵکو یەکێك یان رێبوارێك بەرەو ئیلام بڕوات و

خۆی بخاتە تەکی، گەلیٚ چاوەڕوانی کرد، نەی دەزانیی ئەو ڕێیە بەرەو کوێی نەبا، دەنا دەیگرت و بەری نەدەدا...

خواو ڕاسا، سوارێك و پیاوێکی پیادە لە دوورەوە دەرکەوتن، سوارەکە پیاوێکی بە تەمەندا چوو بوو سەرو پۆتەلاکی پێچڕا بوو، تووند خۆی بەو ئێسترەوە کەسواری ببوو گرتبوو، کوڕێکی گەنجی لەتەمەن هۆزادا لەگەڵ بوو، نەبادا پیاوەکە لەسەر ئێسترەکە بەر بێتەوە تووند قۆڵی گرتبوو، کە لیٚ ی نزیك بوونەوە بەخێرهاتنیکردن، کابرای سوار نەخۆش دیار بوو بەلاچاوێکی پڕلە ماندوو بوون و شەکەتەوە سەیرێکی کردو قسەی نەکرد... بە شێوە زاری و جلەکانیدا زانی خەڵکی ئەو ناوچەیە نییە...

هۆزا بە نەزاکەتەوە پیٚ ی وت:

- خاڵە دەمەویٚ بەرەو ئیلام بڕۆم و بە ڵەد نیم... ئایا ئەم ڕێیە بەرەو ئەویٚ دەچیٚ؟!.

کابرای نەخۆشە دەسێکی بەرەو درێژی ڕێگەکەی بەردەمیان ئاراستە کرد... واتا بیگرەو بەری مەدە...

- دەی کەواتە تاکویٚ ئێوە بڕ دەکەن لەگەڵتاندا دێم... هۆزا کەوتە تەکیان... کابرا بەدەست ئاماژەی بە پرسیارێك دا، واتە: بۆ دەڕۆی؟.

هۆزا وەرامی دایەوە!

- دایکم نەخۆشەو برام بۆ خوێندن و فێر بوونی ئاوێستا ریٚ ی خوێندنی وەبەر خۆی ناوەو چەندساڵێکە دیارنیە، دەمەویٚ سۆراخی بکەم...

- پیاوە نەخۆشەکە قسەی پیٚ نەدەکرا... کوڕە گەنجەکە کە پیٚ ی وت: ئێمە بۆ سەرچاکێك دەچین کە چەند کەوشەنێك لێرەوە دوورە..

هۆزاش وتی:

– من تا ئەویّ لەگەڵتان دیٚم، بەڵکو لەویٚشەوە ریٚبواریٚك کەسیٚك ریٚك بکەویّ لە تەکیا بچم...

کابرای نەخۆش دەسی بۆ دریٚژ کردو بە ئاماژە حاڵی کرد کە دەست بخاتە ناو دەستی، کە وای کرد تیّ ی گەیاند کەپیٚش کەویّ ، کەچی هۆزا پیٚشی نەکەوت بەڵکو وەك کورەکەی خۆی قۆڵی گرت و پیّ ی ووت: کە ئەو پیٚش بکەویّ....

هۆزا دەیویست پیٚیان بسەلمیٚنیّ ئەگەر وەك هاوریٚیەك وەری بگرن هاوریٚیەکی مەردو دڵسۆز دەبیّ، خۆی کرد بە کوڕی دووەمی کابرای نەخۆش، لەگەڵ کوڕە هەرزەکارەکەدا وەك دوو هاوریّ ی ناسیاو زوو ئالوودەی یەکتری بوون، لەریٚدا هەر گرفتیٚك دەهاتە ریٚیان پیٚکەوە بە ئاسانی بەسەریدا زاڵ دەبوون، خۆی وەك کوڕەکەی کابرا لیّ کردبوو، لەریٚدا نۆبەی لە گەڵدا دەگرت، ماوەیەك ئەو قۆڵی نەخۆشەکەی دەگرت ماوەیەك ئەم، هەر کانیاویٚك بهاتیایە ریٚیان یارمەتی دابەزینی کابرای نەخۆشی دەداو ئاوی بەدەمیەوە دەکردو لەناو گژوگیای ئەو شویٚنەدا ئیٚسترەکەی دەلەوەڕاند... تا نیوەڕۆ دوا ئەو هەموو ریٚیەیان بڕی نە گوندی نە ئاوەدانییەك نەهاتە ریٚیان...

دۆڵاو دۆڵ دەرۆیشتن لە دۆڵیٚکدا دوو زەلام دەرکەوتن، ژن و پیاویٚك بوون، پیاوەکە لە پیٚشەوە بوو، ژنە چەند هەنگاویٚك بە دوایەوە، منداڵیٚکی بە کۆڵەوە بوو، دیار بوو ئەوانیش بۆ سەر ئەو چاکە رۆیشتبوون و دەگەڕانەوە، هۆزا لەمە منداڵەکەی دی زەرد هەڵگەرا بوو، ملی وەك لاسکی گوڵیٚکی لە بندا هەڵکنراوی سیس شۆڕ بوو بووەوە، رووی کردە ژنەکەو وتی:

– مەتی! ئاگات لەو منداڵە نییە؟..

ژنەکە راچڵەکا...

هۆزا زوو لیّ ی نزیك بووەوەو سەری منداڵەکەی راست کردەوەو سەرنجی داو وتی:

– ئەو منداڵە پار مردووە نەك ئەمساڵ!..

– مردنی ئەو منداڵە لەو چۆڵەوارییەدا، بۆ ئەو دایك و باوکە جگەر سووتاوە کارێکی ئاسان نەبوو، هۆزا یارمەتی دان، منداڵەکەی لە کۆڵی ژنەکە کردەوەو دی هەر دوو مەچەکی دەستی پەڕۆی شینی لیّ بەستراوە، بەوا زانی ئەم منداڵە براوەتە سەر ئەو چاکەی کە ئەو پیاوە نەخۆشەو کوڕەکەی دەچنە سەری و داوای چاك بوونەوەی لیّ دەکەن!. ئەوان بە دەردی خۆیانەوە کەوتبوون، چەند لەمەزاری ئەو چاکە نزیك دەبوونەوە، تارمایی مردنیان لەخۆ دوور دەخستەوەو بەرەو تەماهی نۆشداری نزیك دەبوونەوە... کەچی مردنی ئەو منداڵە بێگوناحە لەو شوێنەدا شتەکەی لیّ بەرواژی کردنەوە... نوقڵانەی بەخێر نەبوو لەو شوێنەدا تووشی ئەو خەمە بوون، ئەوان لەریّ بڕینی خۆیان نەوەستان، لەبەر هۆزا نەبوایە ئاوریشیان لیّ نەدەدایەوە!.

هۆزا پرسیاری لە ژن و مێردەکەی کرد کە ئایا ئەو پیاو چاکەی بۆ سەری رۆیشتبوون دوورە؟!. تێیان گەیاند کە لەو دیو ئەو دوڵەدایە کە ئەوانی تیا بوون...

هۆزا منداڵە مردووەکەی لەباوەش کردو پێیانی وت:

– زووکەن بەرەو مەزاری چاکەکە بگەڕێنەوە...

ژن و مێردە بەبیّ دەسەڵاتانە، بە گویّ ی هۆزایان کردو، بە شوێن پیاوە نەخۆشەو کورەکەی کەوتن... رۆیشتن تا گەیشتنە سەرکانیاو و سەیی و سەحەندێك، ئاوێکی روون لە کانیەکە دەردەهات، یەکدوو هەنگاو لە خوارەوە ئاوەکە پلوورەی دەکردو دەڕژایە ناو دارو درەختێکی چڕ، لە تەنیشت

کانیاوەکەوە کەڵەکێکی لاکێشەیی بە ئەندازەی نیوگەز بڵند دەورەی درابوو، کێڵێکی بە قەد بە ژن و باڵای زەلامێکی کەڵەگەت قیت کرابووەوەو بەردێکی سپی هێڵەساوی لە سەری دانرابوو، لەدوورەوە سەیرت بکردایە بە تارمایی زەلامێکی کەڵەگەت دەچوو...

هۆزا منداڵە مردووەکەی لەسەر ئەو تەختە بەردانەی کەلە گویّ ی کانیاوەکەدا بوون دانا، دی پیاوە نەخۆشەکە دەیەویّ یەکسەر بێن بە ئاوەکەوە بنیّ، هۆزا ئاماژەی دایە کەجاریّ دەست لەئاو نەداو بەکانیاوەکەوە نەلکیّ!.

تیّ ی گەیاند کە بەتینویەتی لەلای کەڵەکی گۆڕەکە راوەستیّ، چاوی بکاتەوە نەی بزوێنیّ و روو بکاتە رۆژ، هۆزا چی وت، کابرا وای کرد، ئەوجا بردیە خوارەوە بەرامبەر بە پلوورەی ئاوەکە رایگرت و داوای لیّ کرد بە وردی سەیری پلوورەی ئاوەکە بکات، هۆزا خۆیشی وەك ئەو لە تەنیشتی راوەستاو ئەو وردە یاسنایانە کە لەمنازەنێن خانەوە فێریان ببوو خوێندنی، کە تەواو بوو کابرای لەسەر تەختە بەردەکان دانیشاندو پیّ ی وت بە کۆچەڵەی کانیاوەکە تا حەوت کۆچەڵە ئاو بخواتەوەو، ئەوجا سەر بەسەر کانیاوەکەدا شۆڕ بکاتەوەو بەوردی سەیری زیخ و چەوی ناو ئاوەکە بکات و بیر لە هیچ نەکاتەوە...

کە هۆزا ئەو دەستوورەی بەو پیاوە نەخۆشەکە راگەیاند، ژن و پیاوە جگەر سووتاوەکە فرمێسکی گەرمیان بە گوڕ بە سەر سنگی هەڵقرچاویاندا دەباران...

پیاوەکە لەدڵ خۆیدا دەیووت: هەی دەسی شکاوم ئەو خدری زیندەیە بۆ وا فریای من نەکەوت! ئەی ئێمە بۆ عەقڵمان بەوە نەشکا تێر ئاو بە گەرووی وشکی ئەو کوڕە ناسك و نازدارەماندا بکەین؟!.

دایکەکەش نووکی بەسەر لاشەی کوڕەکەیدا هێشتبوو، بە ئاستەم سۆزی بۆ دەکردو دەیووت: ئەی خوایا نەدەبوو ئەم کوڕەم نەبەیتەوە! ئەو هەموو رنێیەم بڕی

به پیراتەوە هاتم، بۆ پێمت داو بۆ بردتەوە؟! خۆ لە گەنجینەت کەم نەدەبووە پێمت ببەخشایە... (دەیڕوانییە کابرای نەخۆش و کوڕەکەی خۆی) کابرایەکی تەمەن رابردووی وا دێڵیتەوەو منداڵێکی وەك پەڕەی گوڵ وا لێ دەکەیت!!.

هۆزا لەو شوێنەدا هەر لە خۆیەوە، رەفتاری وەك فریشتەی فریاکەوتە دەکرد، ئەوانیش بەبێ ئەوەی نقە بکەن، چی دەوت بەگوێیان دەکرد.. هۆزا لەو هەلوێستەدا سەری لەخۆی و ئەوان سوڕما بوو... ئەو شتانەی لەخۆوە بۆی دەهاتن، ئەوانیش باوەڕیان پێ دەهات و دەیانکرد، ئەو شتانە جۆرە سروشێك بوون هزری هۆزایان دەخستە کارو دەبوونە رێنما بۆ هەردوولا...

– هەموو شتێکی خوا بە ترازووە، کاری بێ مەبەست ناکات، بەڵام ئێمە لێی تێناگەین... (رووی کردە پیاوە نەخۆشەکە) ئەو پیاوە چاك دەبێتەوە، ئەو منداڵە مرد، دیارە خوا هەر ئەوەندە ژیانیی بۆ دانا بوو، دایك و باوکی بەو مردنە ئازار دەچێژن، ئەگەر خواینیان لەسەر ئەو کۆسکەوتنەیان هەبێ، ئەوا ئەو کوڕە دەبێتە پەیوولەیەك، لەو دنیادا لەسەر (پردی چەنیوێت) چاوەڕوانی دایك و باوکی دەکات، کە گەیشتنە سەر ئەو پردەە، پێشیان دەکەوێت و بەئاسانی دەیانپەڕێنێتەوە...

هۆزا ئەوەی وت و داوای لەباوکی منداڵە مردووە کە کرد کە:

– دەبێ ئەو منداڵە ئەسپەردە بکرێ...

باوکەی کلۆڵەش بەکەساسییەوە وتی:

– تۆ چی دەڵێ ی وا دەکەین...

هەردوو کوڕە گەنجەکە، دەستوو بردیان کردو لەناو کەڵەکی چاکەکەدا چاڵێکیان هەڵ کەندو منداڵەکەیان تێناو بەپووش و پڵاش و خوڵی چاڵەکە

سەریان گرت و شاردیانەوە... کابرای نەخۆش بەمردنی ئەو منداڵە مردنی خۆی هاتە پێش چاو، لە دڵەوە دەیووت:

- خەریك بوو چاك ببمەوە، وەلێ مردنی ئەو منداڵە لێ ی تێك دام!.

- تۆ چاك دەبیتەوە، مردنی ئەو منداڵە بێ گوناحە لێدانی زەنگی ئاگادارییە بۆت، کە گەڕایتەوە، خۆت لەو گوناحانەی کە کردوتن پاکژ بکەرەوە...

دەرگای ئومێد بە وتەکەی هۆزا بۆ ئەو کابرا نەخۆشە کرایەوە... لەهەمان کاتدا لەناخەوە کابرای راوەشان و خستییەوە ناو چاڵی ئەو گوناحانەوە کە کردبوونی، یادەوەریەکانی لەتاق منداڵییەوە بیگرە تا ئەو وەختەی تووشی ئەو دەردە سەختە ببوو بە بەرچاوی بیرەوەرییەکانیدا دەهاتن... خۆی وەك درزێکی ناو کۆنە دیوارێکی رووخاوی پڕ چڕو چانەوەر دەهاتە پێش چاو... لەوەتەی ئاوەزووی کراوەتەوە خەڵك لە ئازاری دەم و دەستی قوتار نەبوون، هەر بە منداڵی خەریکی پشێوئەو تێکدانی یاری منداڵان هێلانەی چۆلەکەو زیندەوەران بووە، چەندان ئافرەتی دەسخەرۆ و فریودا بوون، لەو دوایەشدا ببوو بە گۆخڵی ئاغایەکی چاوچنۆکی ستەمکار، ئەو چەند فرمانی ستەمکردنی پێ رادەسپارد ئەم دوو ئەوەندەی دەخستە سەر، خەڵك بەدەستییەوە زەلالەتیان بووە! باشە چۆن لەو گوناحانە پاکژ دەبێتەوە؟!. کابرا رابردووی خۆی دەخستە سەر دەفەی یادەوەریەکانی و هەناسەی مەخابن و پەشیمانی بەسەردا دەکردن و دەیووت؟.

- باشە لەو هەموو بازەل و گوناحانە چۆن پاك دەبمەوە؟. سەیر بوو! کابرا بەو بەخۆدا چوونەوەو بەو خۆ هەڵتەکاندنە هەستی دەکرد زمانی دەکرێتەوەو سنگی ساف دەبێ...

هۆزا پەلەی رۆیشتنی بوو، کابرای نەخۆش حەزی دەکرد ئەو شەوەی داهات بەیەکەوە لەسەر ئەوچاکە بن، بەڵام ئەو لەسەر رۆیشتنی خۆی موکڕ بوو... رێگە لەوێوە بەسەر شانی زنجیرە زووڕگێکدا دەکشاو لەناو دەشتێکی بیٚ ئەو سەردا مەحف دەبووەوە...

پیاوە منداڵ مردووەکەو کوڕە گەنجەکە کەوتنە تەکی تا گەیشتنە سەر ملەی زوورگەکەی بەرامبەریان، لەویٚ ئەوان راوەستان و بەرەو ریٚ ی دەشتە پانەکەی ئەو دیوو راوەستان و پێیان وت:

– ئەو رێیە دەگری و بەری نادەی تا دەگەیتە چەند خێڵێك، مەترسە ئەوانە ئاژەڵدارن، دەست نابەنە ریٚ ی کەس، شەولای ئەوان دەمێنیٚ و بەیانی ئەوان رێگەت پیشان دەدەن، هەر ئاوا قۆناخ بە قۆناخ دەرۆی تا دەگەیتە ئەکباتانە، لەوێشەوە کوێت مەبەستە یەکێك دەبیٚ رێنماییت بکات...

ئەو بەگوڕ ریٚ ی گرتە بەرو ئەمانیش گەڕانەوە... پێیان سەیر بوو، ئەو هەموو رێیانەیان لەو سەرەوە چۆن وا بە سووك و ئاسانی بریبوو، کەچی لەگەڕانەوەدا ئەو رێگەیە هەر درێژ دەبووەو لەبەریان نەدەرۆیشت!! هەردوو زەلام کەوتبوونە سەر ئەم خەیاڵەو دەیانووت:

– تۆ بڵێ ی ئەو کوڕە شتیٚ نەبووبیٚ؟! تۆ بڵیٚ ی ئەوە فریارەسێکی خوایی نەبووبیٚ؟ گەر وانییە ئەی چۆن بەو تەمەنە بەتاکو تارا ئەو ریٚ سەختەی گرتووەتە بەر؟!.

کە گەیشتنەوە سەر کانیاوەکە کوڕە گەنجەکە بە باوکی خۆی وت:

– باوکە: ئەو کوڕە چی بوو؟! تۆ بڵیٚ ی شتێك نەبووبیٚ، بۆ لای ئێمە هاتبیٚ؟!.

باوکی کوڕەکە وتی:

– من لەمە دیم زانیم شتێکە، یەکەمجار کە دەستم گوشی هەستم بەشتیٚ کرد!.

کوڕەکە وتی:

– باوکە: لەمە لەئێمە ترازا مەحو بووەوە!.

کابرای کوڕ مردەش بە ژنەکەی خۆی دەوت:

– ئافرەت دەزانی ئەو کوڕە کێ بوو؟!.

– هەر کەسێ بێ، لە خوام داوایە جەرگی دایکی پێ ی نەسووتێ...

– ژنەکە ئەوە فریشتە بوو خوا ناردبووی!...

ژنەکە هەندێ راماو لەپڕ راپەری و وتی:

– زوو بەدوایدا بڕۆ و فریای کەوە!...

– بۆ؟!.

– داوای لێ بکە، بەڵکو خوا کوڕپەیەکمان لەبارتەقای ئەو کوڕەماندا بداتێ! ئەی داخی بەجەرگم بۆ خۆم پێم نەوت!. زوو بە شوێنیدا هەڕاکە زوو...

– ژنەکە! هەر ئەو ساتە لە ئێمە ترازا لەچاو ون بوو، وەك بەرق بەناو رێگەکەدا کشاو مەحف بووەوە... ئەی داخی بەجەرگم زوو بۆ نەت وت؟!.

– ئەی داخی بەجەرگم لەدەستم رووی!....

* * *

ئەو دەشتەی کە هۆزا سنگی پێوە نابوو، کوێرە رێگەکانی دابووە بەر هەنگاوە خێراکانی خۆی، لەوەدا نەبوو بە شەو و رۆژێك تەی بکرێ.

دوو زەلامەکە، کە رەوانەیان کرد وایان تێگەیاند کە زوو دەگاتە ئاوەدانی و ئەو سەری ساراکە نزیکە... کەچی باڵی بۆ هەنگاوەکانی دروست کردو رۆیشت،

تاریکی داهات ئەوپەڕی دەرنەکەوت، تاریکی چۆن ساراکەی قووتدا وەهاش ئەو حناویدا نقوم بوو...

ئەو لەناوچەی هەورامانداا گەورە ببوو، دەشتی وای نەدیبوو بەرگەی رۆژە ییەکی رۆیشتن بگریّ...

لەو شوێنەدا کە شەوەکە رێگەکەی بەردەمی دادەپۆشی، راوەستاو سەیرێکی ئەستێرەکانی کرد کە دەگەشانەوە، ناسینیەوە، بەڵام لەبەر بەرینی ئاسمانەکەی ئەویّ شوێنی هەڵهاتن و ئاوابونیانی پیّ دەستنیشان نەکرا... هەڵوەسەیەکی کرد، دەشتێکی کش و مات، هەستی کرد زۆر ماندو بووە، ئەگەر رێگەکەش پێشی کەویّ ئەو هێزەی نەماوە بە دوایدا بڕوا، گەرووی وشك ببوو تفی بۆ قووت نەدەدرایەوە، پاڵی بەتاشە بەردێکەوە داو، چاوی بەهەرچوار لای خۆیدا گێڕا، شۆڵەی ئاگرێکی کزی دی، جاروبار دەتروسکایەوە، هەوڵی دا، سارد نەبێتەوە نەبادا پەکی بکەویّ و خەوبیباتەوە، بەهەرجۆر بوو لە ئاگرەکە نزیك بووەوە.

لەپێشەوە وای دەزانی ئاگری ئەو هۆزە شوانکارانەیە کە دوو زەلامەکە ناویان هێنان، بەڵام کە نزیك بووەوە خۆی لێیان داگرت، دی سیّ زەلامن... ئەوەندە لێیان نزیك بووەوە گەر هاواری لیّ کردبان بە ئاسانی دەنگی دەیانگەیشتیّ. ئەو لەبەر روناکی ئاگرەکەدا، هەڵس و کەوتی ئەوانی دەدی، کەچی ئەوان لەبەر شەوارەکردنی ئاگرەکە ئەویان نەدەدی... سیّ زەلام بوون، دوانیان راکشابوون، یەکێکیان بەدیار ئاگرەکەوە بوو جاروبار پووش و پلاشی کۆ دەکردەوەو ئاگرەکەی پیّ خۆش دەکردن.

برسییەتی و تینێییەتی هەموو تینی لەشیان مژیبوو، بریاری‌دا خۆی لێیان ئاشکرا نەکات، ترسی ئەوەشی هەبوو جەردەبن و بیکوژن، خورپەی دڵیشی پیّی دەوت: گریمان جەردە بووون، بۆ دەمکوژن؟. چیم پێیە؟ کڵاوێك و پشتوێنێك و

چوخە و رانکێك و فەرنجییەکە!.. خۆ بەرووتی بەرەڵلام ناکەن، ئەگەر رێبواریش بن، یان لێ قەوماون، یان وەك من لەبرسا پەککەوتەن، هەرکامیان بن ئەوا وەك یەکمان لێ دێ و یارمەتی یەکتری دەدەین... چارەم نییە لەم چۆڵەوانییەدا وا دەخنکێم، پێویستم بە چوڕی ئاوە، ئەی کێ هەیە سبەی رێم پیشان بدا؟. وای لا پەسەند بوو، دەنگێك هەڵبڕێ تاقییان بکاتەوە... وەك چەقەڵی برسی لووراندی و کپی شەوەکەی هاژاند ...

کابرای بەرئاگرەکە، هەستی خۆی راگرت، پێ ی وابوو گوێ ی بە وشکەبای شەوەکە بوو لەرییەوە!..

دووەم جار دەنگی هەڵبرییەوە بەڵام ئەمجارەیان دەنگەکەی خۆی گۆڕی کردیە دەنگی مەڕە لاتەیەکی وێڵ...

کابرا زوو ئاگرەکەی کوژاندەوەو هەردوو زەلامەکەی تری بە پەرۆشەوە هەڵسان و پێ ی وتن.

_ گوێم لە دەنگێکە، نەمزانی چەقەڵە یان هی مەڕەلاتەیە! یان هی زەلامە!....

سێ کەسەکە کەووتنە خۆیان و ویستیان هەڕا بکەن و خۆیان بشارنەوە، هۆزا گوێ ی لەقسەکانیان هەبوو، ئەم جارە دەنگێکی تری هەڵبریەوە، وەك بوڵەی ورچ وەها بوو ، گوێ ی لێ بوو یەکێکیان دەیووت!.

_ با هەڕاکەین!...

یەکێکی تریان وتی:

– نەمووت با ئاگر نەکەینەوە!...

زوو خۆڵیان بەسەر ئاگرەکەدا کردوو دوور کەوتنەوە. هۆزا بەوا زانی ئەوانە رێبوارنین... ماوەیەك خۆی مات کردو دەنگ و رەنگێك نەبوو، وا دیار بوو دوور کەوتبوونەوە، ئەویش بەو نیازەووە، خواردنێك، ئاوێك بەڵکو لە شوێنەکەیاندا

دەسکەوێت، بە پارێزەوە خۆی گەیاندە شوێنەکەیان، دیار بوو سکڵی ئاگرەکە بە تەواوی بە خۆڵکە دا نەپۆشرا بوو، کە با هۆزەی شەوەکە لێ ی دا گەشایەوە، هۆزا لێ ی نزیك بووەوە، لەبەر خۆیەوە دەیووت:

– ئەی نیشانەی خواوەندو نووری پەیامبەران و ئارامگەی لێ قەوماوان، ئەی نموونەی ئەژیاری ناو گەردوون، وا خۆم خستەلات، لەم شوێنەدا لەتۆ دەسگیر تر شك نابەم، بە حەقی ئەوەی ئەو شەوقەی پێ داوی بمپارێزە، فریام کەوە... هەندێ پووش و پلاشی کۆکردەوە، پەنگرە گەشەکانیی لەیەکتری نزیك کردنەوە، کە فووی پیاکردن مەشخەڵی ئاگرەکە دووبارە ناو جەرگی تاریکییەکەی رووناك کردەوە...

سێ زەلامەکەش لە دوورەوە خۆیان پەنادابوو، کە دیێیان سەر لە نوێ ئاگرەکە کرایەوەو تارمایی زەلامێك لەبەریدا دیارە، راوەستان و بەسەرسوڕمان و ترسەوە سەیریان دەکرد..لەبەر خۆیانەوە دەیانووت:

– تۆ بڵێ ی ئەوە، ئەوانە نەبن کە کەوتوونە شوێنمان؟!. تەگبیریان هاتە سەر ئەوە کە یەکێکیان لێ ی نزیك بێتەوەو بزانێ ئەوە یەك زەلامە یان چەندان زەلامن!...

دڵی هۆزا لەسەر سەد لێ ی دەدا... لەوە دەترسا ئەوانە لە دوورەوە تیرێك یان بەردێکی تێگرن و خڵتانی خوێنی بکەن... ئەوانیش لەوە دەترسان، دەرکەوتنی تاکە زەلامێك فێڵ بێ و چەندان کەسی تر لەدوورەوە خۆیان راگرتبێ و بەو جۆرە بە داوەوە ببن!.

هۆزا تینویەتی پەکی دابوو، ناچار بوو لەو شوێنەدا هەر جۆر بووە دەخالەت بە ئاوەدانییەك یان فریاکەوتەیەك بکات، دەنا لەدەست مردن دەرچوونی نەمابوو..

خۆ مردن کەهات ئەگەری دەرچوون لە چنگی دەرباز نابیٚ، کەچی کەوتنە ناو مەترسییەوە دەیان ئەگەری دەرباز بوون تیایدا سەوز دەبن... هۆزا والێکی دایەوە، بۆیە لەبەرخۆیەوە دەنگی بەرزکردەوەو هاواری کرد:

– هۆ هۆ ئەوانەی کە لێرە بوون، ئەگەر ڕێبوارن، منیش ڕێبوارم، ئەگەر خۆتان بە شتێکی تر دەزانن من هەر ڕێبوارمو پێویستم بە کەسانێك هەیە فریام کەوێ. خۆ ئەگەر جنۆکەو خێویشن من بازیبەند لەقۆلٚم بەسراوەو دایکم سوژن و دەرزی لەیەخەم داوە، پیرانی هەورامان دەسیان بەسەرمدا هێناوە.. هەر کامێکیان هەن بگەڕێنەوە شوێن خۆتان وەرن با پێکەوە ئەم شەوە سامناکە ببەزێنین..

سێ پیاوەکە گوێیان لە بانگەوازەکەی بوو، بە تایبەتی ئەوەیان کەلێ ی نزیك بوو بووەوە، لە پێشەوە بانگەوازەکەی وەك قسەی جنۆکە هاتە بەرگوێی، چونکە دەربرینی دەنگەکان لەهی ئەو دەڤەرە نەدەچوون، بۆیە دڵنیا بوو، ئەوە ئەوانە نین کە ئەوان لێیان دەترسێن، هەندێ لێ ی نزیك بووەوەو لەبەر شەوقی ئاگرەکەدا سەرنجی لێدا، بە جل و بەرگ و فەرنجییەکەیدا بۆی دەرکەوت، ئەگەر جنۆکە نەبێ، خەڵکی ئەو دەڤەرەش نییە!. هەندێ تر لێ ی نزیك بووەوە، تێ ی خوڕی و وتی!.

– هۆ کابرا ڕاستی بێژە، ئەگەر کەسی ترت لەگەڵە منیش کەسی زۆرم لەگەڵدان، ئەگەر هەر خۆتی و ڕێبواری، ئێمە پەنات دەدەین...

هۆزا وتی:

– بەم ئاگرە.. من کەسێکی ڕێبوارم، ڕێم لێ گوم بووە، شەوم بەسەردا هاتووە، پەنام بۆ لای ئێوە هێناوە... (گۆچانەکەی بەرزکردەوە). لەم گۆچانە بەو لاوە هیچیکی تر شك نابەم... ئەگەر پێتانە فریام کەون هەندێ ئاوم بدەنێ...

– كه وای وت، كابرا پتر لیَ ی هاته پیَشەوەو لەبەر تیشكی ئاگرە كەدا لیَ ی ورد بووەو دی لیَوی باری گرتووەو وشكە، بانگی دوو زەلامەكەی تری كردو وتی:

هۆ: لاپان هۆ هامان! كوڕە وەرن ئەم زەلامە ڕیَبوارەو پەنای بۆ لای ئیَمە هیناوە...

لاپان لە دوورەوە لەناو تاریكییەكەدا چڕی:–

هۆ: سەپان؟ وریابە ئەوە داو نەبیَ بۆمان نرابیَتەوە!..

ئەوە نییە پەیتا پەیتا ئاگرەكە خۆش دەكات لەوانەیە كەسی تری لەگەڵدا بن و بەخۆشكردنی ئاگرەكە بانگیان بكات...

– سویَن بەم ئاگرەكە هەردووكمانی لەم تاریكە شەوەدا لەدەور خۆی كۆ كردووەتەوە، ئەوەی وتم هەر ئەوەیە... لەم گۆچانەی دەستم بەولاوە كەسی تر لەم شویَنەدا شك نابەم....

هۆزاو سەپان لەبەر ئاگرەكەدا دانیشتن و وردە وردە هوگری یەكتری بوون، سەپان كەزانیی ئەو كوڕە گەنجە تینویەتی ڕیَ ی لیَ گوم بووە، هانای بۆ لای لاپان بردو وتی:

– لاپان زوو ئەو جەوەندەم فریاخە، ئەم كوڕە لەتینویەتیدا خەریكە زمانی لەنگ دەبیَ..

– لاپان و هامان هەردووكیان هاتن، سەیریَكی هۆزایان كردو دەمی جەوەندەكەیان بەدەمەوە ناو ئاویان دایە، ئەویش ئەوەندەی نەخواردەوە تا بەتەواوەتی تەژنەی بشكیَ!. داوایان لیَ كرد تیَر بخواتەوە، بەڵام ئەو نەیویست جەوەندەكە چك بكات و بەخراپ لیَی تیَبگەن و پەكیان بۆ ئاو بكەویَ، دەنا ئەوەندە تینوی بوو ئەوەندەو ئەوەندەی تریش كەتیایدا بوو دەیخواردەوە، بەوا بۆیان دەركەوت ! ئەو كوڕە ڕیَبوارەو هیچ مەبەستیَكی خراپی لیَ بەدی ناكریَت...

هەرچوار پێکەوە لەدەور ئاگرەکەدا دانیشتن، لەیەکتری حاڵی بوون... هۆزا حکایەتی خۆی بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش کارەساتیی خۆیان بۆ ئەو گێڕایەوە: دەرکەوت هەرسێ بران و لەبەر ناموس لەدەستی دەهقانی ناوچەکەی خۆیان هەڵ هاتوون... دەهقانەکەیان سەرەرای ستەمکاری و خەڵك چەوساندنەوە، کردبووی بەخوو هەر کچێك کەلەیەکێك مارە دەبڕدرا دەبوو شەوی پەردەی بۆ خۆی بێ و خۆی کچێنییەکەی لاببا و بیکات بەژن، بەتایبەتی ئەو کچانەی کەجوان بوون، نەی دەهێشت مارە بکرێن تا ئەو مەرجانەیان پێ نەدابا...

دیار بوو ئەم سێ برایەو زاواکەیان پلانێکیان بۆ کوشتنی ئەو کابرایە داناوەو لەشەوی پەردەی خوشکەکەیاندا نەیان هێشتووە کابرای دەهقان بەئاوات بگات و دەرفەتیان لێ هێناوە، کوشتوویانەو هەڵ هاتوون، وەلێ زاواکەیان دەستگیر کراوەو لەوانەیە کوژرابێ (خوشکەکەشیان بێ سەرو شوێنە) دەست و پەیوەندی دەهقان و هی بەگەکانی ئەوێ بەشوێنیاندا دەگەڕێن تا بیانکوژن، ئێستا دەیانەوێ روو لەوڵاتی بکەن خۆیان تیایدا حەشار بدەن، هۆزا بەرەو ئەکباتانە دەڕوا، ئەمان دەتوانن یارمەتی بدەن و بەودا دوا هەواڵی خۆیان بۆ دایکیان بنێرنەوە...

کە هۆزا بۆی دەرکەوت ئەو سێ برایە گەرەکیانە روو بەرەو لایەك بنێن کە دووربن لەوەی ستەمکاریان بووە پێ ی وتن:

– من تەگبیرتان بۆ دەکەم....

تەگبیرەکەی ئەوە دەبێ: بەرەو بێستون زەمین بڕۆن و هێشاو واران بدۆزنەوەو هەواڵی هۆزایان پێ رابگەیەنن کە شوێنی سیمیاری هەڵ کردووەو رێیەکی زۆری بەرەو ئەکباتانە بڕیووە.

خەمیان نەبێ..

تەگبیری ئەوانیش بۆ هۆزا ئەوە دەبێ، بەرلەوەی بگاتە ئەکباتانە تووشی شارۆچکەیەك دەبێ، بەو ناونیشانەی کە پێ ی دەدرێ دەچێتە لای دایکیان و هەواڵی ئەوانی پێ رادەگەیەنێ... هەم خێری دەگاتێ هەم لەوانەشە بەهۆی دایکیانەوە لەمەبەست نزیك ببێتەوە.... ئەو شەوە پێکەوە بوون. هۆزا لەبەر ماندوو بوون خەوی پیاکەوت و خۆی دایە دەست چارەنووس و هات و نەهات....

ئەوانیش تا بەیانی بەنۆبە خەوتن و ختوورەی ناو هەناوی پڕ زاخاوی خۆیان بەهات و نەهاتەوە بەست...

بەیانی کەدنیا روناك بووەوەو لەخەو هەڵسان هەردوولا بەتەواوەتی یەکتریان ناسی و ئاشنای یەکتری بوون وەك چوار برای ولاّویای لێ قەوماو بوون، لاپاڵی گردۆکەیەکی ئەو دەشتە بەرینە لەئامێزی گرتبوون...

ئەوان رێیان بەو پیشان داو، ناونیشانیی دایکی خۆیان دایەو بەرێیان کرد، ئەویش ناونیشانی هێشاو وارانی دانێ و پێیانی وت:

– جگە لای هێشا لای کەسێکی تر حاڵی خۆتان باس نەکەن!...

لەیەك جیابوونەوە، ئەوان بەرەو سەرو ئەویش بەرەو خوارو...

* * *

هۆزا کەگەیشتە ئەو شارۆچکەیە کە کەوتبووە سەرووی شاری ئەکباتانەوە، بە پێی ناونیشانی سێ براکە وەك عەوداڵێك بۆ چنینەوەی توێشوی رێبوارانماڵەو ماڵ گەرا تا ئەو گەرەکەی کە ماڵی دایکی ئەوانی تیابوو دۆزییەو و دەیوت :

– خەیرو مەندینە ، من نە دەرۆزەکەرم ، نە لەتەچن ، رێبوارم و رێی دوورە لەبەرە

بەو جۆرە ماڵ بە ماڵ گەرا تا ماڵی ئەو سێ برایەی دۆزییەوە، دی لەبەردالآنی حەوشەی ماڵەکەدا ئافرەتێکی داماو کزوڵەی کردوە و بەسۆز دەگری و دەڵی

هۆ هۆ سەپانە

کاکی هامانم

هۆ ئازیزەکەم

جوانە لاپانم

هۆ بووکە جوانە

کیژەی تاقانەو

هۆ گوڵە گەشەی

دڵ و ئاسانەم

کزەی جەرگی من

لەهەر چوار لاوە

بـرژاوە بۆتان

ئاگری لەناوە

ئەی ئەمرۆمەزدای

بێ باك و نادیار

فریادە لەکوێ ی؟

هاوار سەد هاوار....

سۆزی ئافرەتەکە بەردی دەتواندەوە، ئافرەتێك كچێكی لە شەوی پەردەدا سەرنوگم بێ و لەشكرێك سێ كوڕی هەرزەكاری لەچۆڵەوارێدا راوبنێ و سۆرلخییان نەبێ، کە سۆزیان بۆ بکات دەبێ چی بڵێ؟!.

هۆزا تاقانەی دایکی خۆی بوو، کە ئەم رێ سەختەی گرتە بەر پرسی پێ نەکرد، بەو پرس پێ نەکردنەی وای دەزانی غەزەبی خوای بەسەر خۆیدا باراند بوو! هەرئەوە بوو بەشەوقەوە ئەو رێگەیەی دەبڕی تا بەسەرکەوتن، لێبووردنی دایکی مسوگەر بکات، هەر ئەو نیازە بوو لەو سۆزە پەنای دا، وا نەبوایە هەر لەوێدا بەو سۆزە دەبرژاو دەبوو بەدڵۆپێ فرمێسك و دەتوایەوە!...

ژنەکە کەسەری بەرز کردەوە دی زەلامێك لەنزیکەوە مات راماوە! راچڵەکاو وتی:

– ئەوە چ کەسە؟!.

– ئەوە منم!.

– تۆ کێ ی؟!.

– ئەوەم کە مژدەم بۆ هێناوی...

ژنەکە بە جل و پۆشاکەکەنیدا زانی عەودالەو خەڵکی ئەو وڵاتە نییە.

بۆیە پیا وڕماو سەیرێکی کردو وتیەوە:

– تۆ کێ ی؟!.

ئەویش دووبارەی کردەوەو وتی:

– من ئەوەم کە مژدەم بۆ هێناوی!...

– مژدە؟!.

وای وتوو چی ترس و ئومێدو ئاوات و ئارەزوو و توقینی هەبوون هەموو بوون بەگەردولوول و کەلافەیان بەست و لەناو تاریکەستانی دەروونیدا پەرت

بوون، جگە لەروناکی وشەی مژدەو تارمایی ئەو گەنجە کە لەنزیکەوە راوەستابوو هیچ شتێکی تر لەمەملەکەتی هۆشی ئەودا نەما، گەنجەکە لەو حەوشە تاریك بەسەردا هاتووەدا وەك کۆڵەکەی نوور راوەستابوو، هزری کەلەناو ئەو تاریکەستانەی دەروونیدا خۆی جەمدایەوە، یەکسەر پاڵی بەزمانیەوە ناو وتی:

- دوای ئەو جەرگ سووتان و چوار پارچەکراوەم مەگەر مژدە مردنم بیٚ!..

- نا... پووره رەخشان وامەڵێ!

کەوتی پووره رەخشان، ژنەکە لای وابوو فریشتەی ئەهرۆمەزدایەو هاتووەو دەیباتە لای سێ کوڕو کچەکەی! بۆیە وتی:

- فریشتەی ئەهرۆمەزدای؟!.

- نا:... من لای ئەوەوە نەهاتووم، لای سەپان و لاپان و هامانەوە هاتووم... برادەری ئەوانم... ئەی تۆ دایکی ئەوان نیت؟!.

- بەڵێ دایکی ئەوانم... ئەگەر فریشتەی فەرموو گیانم دەربێنەو ببەبە بۆ لای ئەوان... ئەگەر کەسانیی تریشی زوو پێم بێژە:...

- مەتی رەخشان... هیچ دەنگ بەرزۆ مەکەو گوێم لیٚ بگرە، من لای سەپان و هامانەوە هاتووم... مژدەت دەدەمێ هەر سێ ماون و سەلامەتن...

مەتی رەخشان دەسەداوێنێ هۆزا بوو، وەك بەنگایەکی توورە بشکێت وا هرووژاو ویستی خۆی بەسەر قول و قاچی هۆزادا بدا وتی:

- بەدەورت گەرێم... چا ماون؟!.

- ماون، لەمن ساغترن... بەرەو وڵاتێك چوون کەس دەسی نایانگاتیٚ...

پووره رەخشان لەخۆشیدا بوورایەوە، هۆزا کەوتە مەترسییەوە خەمی بوو بمریٚ و ئەویش تووشی مەترسێك ببیٚ... خواو راسا دوای کەمێك بەهۆش خۆیدا هاتەوە...

هۆزا لێ ی نزیك بووەوە پێ وت:

- پوورێ... گوێم بۆ رابگرە، چیت پێ دەڵێم وا بکە، لای کەسیش دەنگ مەکە... من بەرەو ئەکباتانە دەڕۆم، بەشوێن برایەکمدا وێڵم، سبەی دەڕۆم، ئەگەر سۆراخم کرد لەو سەرەوە دێمەوە لات و دەتبەمە لای کوڕەکانت.....

- وەی باڵاگەردانت بم... منیش لەتەکدا دێم دەبم بەدایکت...

- نا... نا... سبەی بەرەو ئەوێ دەڕۆم و زوو دەگەڕێمەوە. ئەو رۆژە هۆزا لەماڵێ پوورە رەخشان مایەوە، هەر سات نا ساتێ داوای لەهۆزا دەکرد کە چۆنیەتی دیتنی کوڕەکانی بۆ بگێڕێتەوە، ئەو چۆنی دیبوون و چییان وتبوو لەسەرەوە بۆی گێرایەوە، ئەویش رووداوی کوڕەکانی و کوشتنی دەهقانی وەك چۆن قەوما بوو بۆ هۆزای گێڕایەوە، بەڵام ئەو نەیزانیبوو کچ و زاواکەی چییان لێ هاتووە، لەوەوە زانی زاواکەی کەناموسی و خۆی و ئەو برایانەی پاراستبوو یەکسەر پاش کوشتنی دەهقان کوژراوەو تەرمەکەی فڕێ دراوە، کەچی لەبارەی کچەکەیەوە هیچی نەدەزانی! ماوە؟ کوژراوە؟ بەندە؟....

بەتەگبیری پوورە رەخشان، هۆزا چۆغە و رانکەکەی گۆڕی و پوورە رەخشان دەستێ جلی وەك دەستووری ئەوێ ی دایەو لەبەری کرد، بۆ ئەوەی بتوانێ بەئاسانی بە شوێن کارەکەیدا بڕوات...

کات نزیکەی ئێوارە بوو، هۆزا خۆی گەیاندە پەرستگاکەی ئەوێ لەقەراغ ئەو حەوزەی کەلەبەر دەمی پەرستگاکەدا بوو خۆی خەریك کرد تا مۆغانی پەرستگاکە لەنزاو نوێژەکانی بووەوە، کە هاتە دەرەوە هۆزا دەستی بەسنگەوە گرت و پەلاماری هەردوو دەستی داو ماچی کردن و وتی:

- قوربان من برای پیرسیمیارم، چەند ساڵێکە لێمان دوور کەوتووەتەوەو ئەراگێڵی خوێندن و فێربوونی ئاوێستا بووە، دایکی نەخۆشەو داوای دیتنی دەکات، هەواڵی نازانی؟.

مۆغانەکە پشتی کۆمبووی خۆی راستکردەوەو دەستێکی بەریشە درێژەکەیدا هێناو یادەوەری خۆی لەمێشکیدا جەمداو وتی:

- گوێم لەو ناوە بووە... وەلێ وێنایم لەبیر کردووە... وا بزانم لە ئەکباتانەیە...

وای وت و گۆچانەکەی بەرخۆی داو بەکوورە کوورِ بەرەو ماڵەوە گەڕایەوە. ئاوڕی لەهۆزا نەدایەوە...

هۆزا لەوە دڵنیا نەبوو کە ئایا مۆغانەکە کە وتی: (وابزانم لەئەکباتانەیە) لەراستیدا لەوێیە؟ یان مۆغانەکە ویستی لەدەستی قوتار بێ و حەوسەڵەی قسەکردنی نەبوو؟!. هۆزا گەڕایەوە ماڵی پوورە رەخشان، ئەو شەوە تا بەیانی لەوێ ئارامی گرت، بەر لەرۆژ بوونەوە لەپوورە رەخشان روخسەتی خواست و پەیمانی دایە لەو سەرەوە کە گەڕایەوە سەری لێ بداو، لەگەڵ خۆیدا بۆ لای کوڕەکانی بیبات...

پوورە رەخشان بەر لەخواحافیزی دەستی بەبەرکەمەری پشتوێنەکەی هۆزا کردو وتی:

- کوڕم نا شارەزای... دەخیلتم بەگوێ ی دایکی خۆت بکە:

کە چویتە ناو شارەوە ئاگات لێ بێ خۆت لەکەسانی قۆڵبڕو ساختەچی بپارێزە....

* * *

هۆزا بەئاسانی لەشارۆچکەکەی پووره رەخشانەوه گەیشتە شاری ئەکباتانە، شارەکە گەوره بوو، تا ئەو کاتە ئەو شاری وا پڕ بەخەڵك و ئاپوورەی نەدیبوو، خەڵکی گوندو دەورو بەرو دەڤەرەکانی تر بۆ کڕینی پێداویستییەکانیان و فرۆتنی بۆن و بەرامەکانیان دەرژانە ناو ئەو شارە، بە سەربەسەرو دراو، سەودای شتومەکیان دەکرد، دان و سان بەپارە بوو، کەس بەکەسی نەدەوت: فەرموو.

مەیدانی ئاژەڵ و مەڕو ماڵات فرۆتن و سەوزەو مێوەو ورده کوتاڵی دەسکردو دەرامەتی کشتوکاڵ و دەغڵ و دان هەبوون، لەناوەراستی شاردا بازاری سەر گیراو که پێیان دەوت: کەیسرەوی هەبوون...

هۆزا که ئاپوورەی ناو شارەکەی دی، وتەکەی پووره رەخشانی بەبیر هاتەوه که پێ وتبوو:

- خۆت لەکەسانی قۆڵبڕو ساختەچی بپارێزه.

باش چاوی کردەوه... ئەوەی باشکرد که لەمە گەیشتە ناو شار ئەو رێگەیه که گەیاندبوویه ناوەراستی شار دیاری کردبوو، لەدڵ خۆیدا نیشانەی لەسەر ئەو شوێنانه که دەیدین دادەنا، لەناو شارەکەدا خەڵکانی جلوبەرگ لەبەری جۆراو جۆری دەدین، کەهەر جۆره پۆشاکێك ناسنامە بوو بۆ دەڤەرێکی تایبەت، یەکێکی چاو پێ نەکەوت، چۆغە و رانك و فەرەنجی و کڵاو بەسەری وەك لای خۆیان بێ، ئەوەی پتر سەرنجی راکێشا بوو، بوونی ئەو فرە مۆبیدو مۆغانانە بوو که بەناو بازارەکدا تێدەپەرین، بە سەرو تەپلەو پۆشاکیاندا دیار بوو سەر بەچینێکی. بەفیزەوه دەرۆیشتن و ئاوڕیان لەکەس نەدەدایەوه، کەسیش وەك ئەو لێیان ورد نەدەبووەوه، هەر جوانخاسێکی لەوانە بدیایە، دڵی رادەچڵەکاو دەیووت:

– تۆ بڵێ ی ئەوە سیمیار نەبێ !.

دیار بوو خەڵکەکە ڕێزیان لەو پیاوە ئاینییانە دەنا، کە بەناو خەڵکەد تێدەپەڕین زوو ڕێیان بۆ چۆڵ دەکردن و ئەوانیش بەخۆزل زانینێکەوە تێدەپەڕین. سەرو پۆتەلاکیان و ریشیان جۆرە خۆشییەکیان دەخستە ناو دڵی هۆزاوە، چونکە سەرو ریشی موغانەکەی لای خۆیانی دەخستەوە یاد... سەرنجی لێ دەدان. دەیووت: تۆ بڵێ ی سیمیاریش وەك ئەوانە ئەو جۆرە پۆشاکەی لەبەربێ؟ نەی دەزانی وەرامی ئەو پرسیارە چلۆنە!... داخۆ ئەوانە بەناو خەڵکەکەدا تێدەپەڕن. بۆ کوێ دەڕۆن؟.

کەوتە شوێن دوان لەوانە، بەڵکو ئەمە خوایە، ئەو شوێن کەوتنە بەسیمیاری بگەیەنێ... کەوتە شوێنیان، تا لەدەروازەیەکی گەورە چوونە ژوورەوە. حەوشەیەکی بەرینی پەرستگایەك بوو، هەرلاچوار دەورەی بەباڵاخانەی دوو نهۆم دەورە درابوو، رووی دەرەوەی باڵەخانەکان بە کۆڵەکەی مەرمەڕی سپی راگیرا بوو. قاتی سەرەوە هی مۆبیدو موغانە گەورەکان بوو، لەحەوشەکەیدا دەیان شاگردو ئاراگێڵی خوێندن، لێرەو لەوێ بەتاك و کۆ راوەستابوون، دان و سانیان دەکرد دەوریان دەکردەوە

هۆزا لەدڵ خۆیدا دەیووت: بێت و نەبێت، سیمیار لەناو ئەمانەدایە، ئەوەی دەهاتە دەرەوە، ئەوەی دەچووە ژوورەوە لێ ی ورد دەبووەوە، تۆ بڵێی دیمەڵەی سیمیار گۆڕدرابێ و نەی ناسێتەوە؟... لەدڵەوە دەیووت: خوزگا جلەکانی خۆم لەبەر بوایە، خۆ ئەگەر سیمیار لێرە بێ بەجلەکانمدا دەیناسیم و بانگی دەکردمە لای خۆی... بەخوا ئەگەر لێرە بوایە ئێستا دڵی خەبەری دابوو کە من بەشوێنیا هاتووم!... ئەو وردە ختوورانە لەوێدا سەری هۆزایان کردبوو بەکلوورەی خۆیان.

یەکێك لەمۆبیدە گەورەکان لەقاتی سەرەوە هاتە خوارەوە، هەموو شاگردەکانی ناو حەوشەکە لەبەری راوەستان و لەجموجووڵ و بۆڵە بۆڵی خوێندن و دەورکردنەوە کەوتن...

هۆزا لێ ی چووە پێشەوەو دەستی ماچ کردو وتی:

- قوربان من کەسی پیر سیمیارم... دەمەوێ ببینم...

مۆبیدەکە گوێ ی نەدایە... یان لێ ی تێنەگەیشت.. دوو شاگردی بانگ کرد، بۆ ئەوەی بزانن ئەو کەسە چی دەوێ؟. شاگردەکان حاڵییان کرد کە ئەوە کەسی پیرسیمیارەو دەیەوێ ببینێ...

کابرای مۆبید هەر ئەوەندەی وت:

- ئۆ هۆ!... پیرسیمیاری دەوێ؟ ئەوە ساڵێك دەبێ بەفەرمانی کیسرای ساسان چووە بۆ تەیسەفۆن... پایتەخت!..

کە مۆبیدەکە وای وت هۆزا لە شوێن خۆیدا وشك راما!. دڵی لەناو سنگیدا لەباڵە کۆتێ ی ئەو گوشاد بوونە کەوت کە بەتەمای بوو لەناکاو رووبەرووی سیمیار بێتەوە: ئەو بەتەما بوو لەو حەوشەدا یان لەناو یەکێك لەو حوجرانەی سەرەوەو خوارەوەدا بەدیداری سیمیار شاد ببێ و خۆی پێ ی بناسێنێ و ئەو ماندوو مەکەتیەی کە لەرێ ی دیتنی ئەودا چەشتبووی بۆی بگێرێتەوە!... کەچی ئەوەتا مۆبیدەکە بەبێ یەکودوو کردن وتی: لەتەیسەفۆنی پایتەختە... هۆزا وەك گوڵێکی گەش بدەیتە بە ئاگرێکی بەتین وەها بەقسەی مۆبیدەکە روخساری لەبەرنەما...

ناوی تەیسەفۆن و پایتەخت، لەناو مێشکدا دەزرنگانەوەو ئەم پرسیارانەی لەکاسەی سەریدا دەخولاندەوە:...

– داخۆ تەیسەفۆن لەچ مەملەکەتێك بێ؟ دوورە نزیکە؟ داخۆ کیسرای ساسان بۆچی بانگی کرد بێ؟!.

دوو شاگردەکە کەزانینیان رەنگی گۆڕاو مات بوو، لێ ی چوونە پێشەوەو پێیان وت:

– پیرسیمیار چی تۆیە؟.

– برامەو دەمەوێت بگەمە لای...

دوو شاگردەکە که زانییان ئەوە کەسی پیرسیمیارە، دڵیان دایەوەو بردیانە ناو حوجرەکەی خۆیان، دڵنیایان کرد کە بەو زووانە دەگاتە لای، ئەو رۆژە بەناو کوچەو بازاری شاردا گێرایان، ئێوارە بە مۆبیدە گەورەکەیان ناساند، مۆبیدەکە بەو ناسینە گەلێ دڵخۆش بوو... چونکە رێکەوت وابوو ئەو مۆبیدە دوای چەند رۆژێك بەرەو تەیسەفۆن لەگەڵ چەند شاگردێکی خۆیدا، بۆ کارێکی تایبەتی خۆی بڕوات، هەم بەشداری لە جەژنی مێهری ئەو ساڵەدا دەکات، هەم بەهۆی سیمیارەوە دەتوانێ وەزیری دەستەراستی کیسرا ببینی و ئەوکارەی کە هەیبوو پێ ی جێ بەجێ بکات، دەرفەتێکی چاك بوو بۆی هاتبوو، ئەم کورە کەسی سیمیارەو لەگەڵ خۆیدا دەیبات و دەیکاتە دیاری بۆ سیمیار...

مۆبیدەکە کە زانی هۆزا بەپەلەیەو دەیەوێ زوو بگاتە لای سیمیار، دوو رۆژ سەفەرەکەی پێش خست، لەگەڵ چەند کەسان و چەند شاگردێکدا هۆزایان لەگەڵ خۆ بردو رێ ی بەرەو تەیسەفۆنیان گرتەبەر...

* * *

کاروانی مۆبیدەکە زۆر بەسستی و لەسەرخۆ بەرەو تەیسەفۆن ڕێی دەبری و دەڕۆیشت... هۆزا ئەگەر پێ ی نەنگ نەبوایەو بەڵەد بوایە، ئەو کاروانەی بەجێ دەهێشت و خۆی بە تاکەکەس ڕێ ی دەگرتە بەر... بۆ ئەوەی لای پیرسیمیار خۆیان وەپێشخەن سواری وڵاغێکیان کردبوو، لەدوای وڵاغی مۆبیدەکەوە، وەسە بۆ سەرگورستانیی چاکێك بچن وەها ڕێیان دەبڕی، لەپێشەوە چەند شاگردو مپاشییەوە چەند کەسانێکی تر بۆ گەیاندنی مۆبیدەکە هاتبوون، دوو ڕۆژەی پێش خستنی سەفەرەکەی بەو خاو چوونەی ڕێیە پڕ کردەوە، قۆناخ بەقۆناخ دادەبەزین و ئەرکی خۆیان و وڵاغەکانیان دەخستە سەر ئەستۆی (ئەسپەهدار)ی ئەو شوێنە، ئەویش بەدووجاو سێ جا لەخەڵکی ئەو شوێنەی دەسەندەوە!...

تا ئەوکاتە هۆزا وای دەزانیی هەموو کەس وەك خەڵکی لای خۆیان وەهانە، لەسەفەردا سنوور لەنێوان گەورەو بچوکدا کەم دەبێتەوەو هەرکەس بەپێ ی توانای خۆی دەکەوێتە کار... کەچی گەلێ پێ ی سەیر بوو ئەو مۆبیدە بەدرێژایی ئەو هەموو قۆناخ و ڕێگەیە، خۆی کردبووە مەردەلۆغەو شاگردەکانی وەك بەندەی کڕدراو بەکاری دەهێنان، بارێکی قورس بوو بەسەر شانیانەوە!.

تا خۆی تێر ئاور خواردنی نەخواردایەو دەستی هەڵ نەگرتبایە، حەزی نەدەکرد ئەوان دەس بۆ خواردن و خواردنەوە ببەن!. کە دادەنیشت دەبوو بن بە پشتی بۆی، لەراکشانیشدا، دەبوایە یەکێکیان بۆی بچەمێتەوەو بڕواتە سەرپشتی ئەوجا سوار دەبوو! بە درێژایی ڕێ نەی هێشت ئەو وڵاغە بەسەرزمانەی ژێری لارێیەك بکاو لەرێدا قەپ لەپووش و لەوەرێك بدا!! ڕەشوەکەی لەدەست زەلامێکدا بوو بە درێژایی ئەو ڕێیە قیت و ڕەپ و ڕەوان لەپێشیەوە دەڕۆیشت!.

لەهەر قۆناخێکدا دادەبەزین داوای خوانی رازاوەو پارووی چەوری دەکرد. دەبوو بۆی پەیدا بکرێ، خەڵکەکەی بەوە دەترسان کە گوایا ئەو شایی ساسان بە شوێنیا ناردوە بۆ ئەوەی لەکۆری (ئەنجومەنی پیران)دا بەشداری بکات. هۆزا لەماڵی خواجە بەهمەن و لای هەنارخان و نازەنین وا فێرکرا بوو کە جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان گشت زیندەوەراندا نییە، بەتایبەتی لەخۆراکدا... گیان لەبەرانیش برسی و تینویان دەبێت و لەکاتی برسییەتیدا دەروونیان بۆ خواردن دەکەوێتە هەنسکەدان، کەخواردنیش لەلایدا بخورێت و بەشی ئەو نەدرێت، چاوی تێ دەبڕی و هەناوی بۆی دەبرژێ و کامی بۆ دەکات!.. کەچی ئەو کابرا مۆبیدە زلە، کە تەماشای گەدەو گیپاڵی‌و سەرو سەکوت و ریشی پانی دەکەی بەپیاوێکی کارامەو دانا دەهاتە پێش چاو، لەگەڵ ئەوەشدا لەئاستی هۆش و ئارەزوویدا منداڵێکی ساوا بوو... تۆ بڵێی هەموو مۆبیدە گەورەکان وەها بن؟!.

هۆزا لەدڵەوە وا پرسیاری لەخۆی دەکرد.... رەفتاری ئەو پیاوە زلەو برینی ئەو رێگەیە، بەو سستییە، دڵی هۆزای گوشیبوو، رێگەکەی لەبەرچاو تەنگ و تار کردبوو، لەداخ ئەو رەوت و خاوەخاوەو ئەو مۆبیدە تێکسمریاوەدا گەلێ جار لە ولاغەکەی دادەبەزێ و پێشی دەکەوت و بەزمانی حاڵی خۆی دەیووت: وەرن بەپێ ی من رەو بکەن، پشوویەك بەو ولاغە بەسەزمانە بدەن...

کابرای رەشوو گری ولاغی مۆبید دەقی خۆی نەدەشکاند... هۆزا حەزی دەکرد جاروبار شاگردەکانیش بە نۆبە سواری ولاغەکەی ئەو بن و بحەوێنەوە، ئەو ئەوەی نەدەزانی کە ئەوان نەریتیان

وابوو، شاگرد نابێ لە کاروانیی مۆبیدا سوار بێ ! کە ئەو سوار بوو، دەبێ شاگرد پیادە بێ، با ولاغیش هەبێ!.

مۆبیدەکە بۆیە ئەوی سوار کردبوو، بۆ ئەوەی کە گەیشتە تەیسەفۆن، پیرسیمیار بزانێ کە چۆن ڕێزی لە کەسی ئەو ناوە.... بەو هۆیەوە لە شالیاری دەستە ڕاست و شا نزیك دەبێتەوە... دەنا لەلای ئەو سوار بوونی ولاغ لە تەك ئەودا جگە بۆ یەکێك نەبێ کە هاوشانی خۆی بێ بۆ کەسی تر ڕەوا نەبوو! ئەگەر هەشبوایە، دەبوو زۆر لە دوای کاروانەوە بڕوات!.

کە لە دوورەوە تاقی کیسرا دەرکەوت هۆزا خەریك بوو لە خۆشیاندا باڵ بگرێتەوە...

مۆبیدەکە هۆزای تێگەیاندو پێ ی وت:

– هۆزا ! کە گەیشتینە ناو پایتەخت خۆت دەرنەخەیت و نەڵێی :

– من کەسی پیرسیمیارم، دان بە خۆتا بگرە، خۆم دەیبینم و لەناکاو دەتخەمە بەردەمی!.

هۆزا لە خۆشی ئەو نزیك بوونەوەدا نەی دەزانی چۆن وەرامی مۆبیدەکە بداتەوە، ئەوەندە نەبێ کە وتی:

– چی دەفەرمووی وا دەبێ...

*        *        *

ئەو ڕۆژە کە هۆزا لەگەڵ قافڵەی مۆبیدەکەدا گەیشتە شاری تەیسەفۆن، بۆ بەیانییەکەی ڕێکەوتی جەژنی میهرەجان بوو، ئەو میهرەجانە پێنج ساڵ جارێك لە پایتەختەکەدا ساز دەکرا، شار دەڕازراوە، پیاو ماقوڵانی هەموو دەڤەرەکان بۆ ئەو جەژنە بانگ دەکران، سەر لەبەیانی ئەو ڕۆژە هەموو خەڵك لە دەرەوەی شاردا لە

مەیدانی ئەردەشێردا کۆ دەبوونەوە، سەکۆیەکی بەرین بەقەد یەکلای سەروی مەیدانەکە بۆ دانیشتنی شاو شاژن و وەزیرو گەورە پیاوانی دەولەت و مۆبیدو مۆغانەکان و دەستو پەیوەند دروست دەکرا، ئەوەی کارێکی دادپەروەرانەو شکۆدارو بە نموودی لە ماوەی ئەو پێنج ساڵەدا لەقەڵەم رەوی ساساندا بە ئەنجام گەیانباو خەڵك شایەتی جوامێری ئەو کەسەیان بدایە کە ئەو کارەی کردووە، لەو رۆژەی جەژنەدا دەخرایە روو، خاوەنی ئەو کارە بە باشترین هاوولاتی لە دەفتەری دەوولەتدا ناو زەند دەکراو خەلات و پاداشێکی شایستەی لەلایەن شاو شاژنەوە دەدرایەو ناوی لەم مەیدانەدا هەڵ دەواسرا...

هۆزا قسەی مۆبیدەکەی نەشکان، دەنا هەر لە دوێنێوە دەیتوانی خۆی بگەیەنێتە سیمیار، حەزی نەکرد خۆی سپلەو بێ ئەمەك بکات، لەگەڵ ئەوەشدا یەك سات دواکەوتن بۆ ئەو زۆر بوو، ئەو بە پەلە ئەو هەموو دەشت و دەرەی بڕیبوو، دەشیویست بە پەلە بگەڕێتەوە... ئەوەتا لە هۆشیدا درێژایی ئەو رێگەیە، لەوێوە بیگرە تا دەگاتە پوورە رەخشان و هێشاو واران و دەگای هەورامان و مەرێگا و هەنارخان و نازەنین و دایکی و خەڵکی دەگا هەموو چاوەروانی زوو گەڕانەوەی دەکەن، پەلەی هاتنەوەی ئەویانەو رۆژگاریان لێ هاتووەتەوە یەك.

لەبەیانی ئەو رۆژەوە، خەڵکی پایتەخت و دەوروبەر بە جلی جوانەوە رژانە مەیدانی ئەردەشێرو چاوەروانی دەرکەوتنی خاوەن شکۆ پاشای ساسانیان دەکرد..

هۆزاو مۆبیدەکەی برادەری پێکەوە بەرامبەر بە تەختی شاهانە راوەستان و کەوتنە چاوەروانی، مۆبیدو مۆغان و گەورە پیاوان لەسەر سەکۆکە جێ ی خۆیان گرت، خاوەن شکۆ کە دەرکەوت چقەکەی سەری جەواهیر نیگا بوو لەگەڵ رۆژدا

ـﺒﺮﻳﺴﻜﺎﻳﻪﻭﻩ، ﺋﻪﻭﻩﻯ ﻟﻪﻭﻯ ﺑﻮﻭﻥ ﺭﻭﻭﻳﺎﻥ ﺗێﻜﺮﺩﻭ ﺑﻪﺭێﺰﻩﻭﻩ ﺭﺍﻭﻩﺳﺘﺎﻥ، ﻟﻪﮔﻪڵ ﺷﺎژﻥ ﻭ ﺷﺎﭘﻮﻭﺭ ﻛﻪ ﻭﻩﺯﻳﺮﻯ ﺩﻩﺳﺘﻪ ﺭﺍﺳﺘﻰ ﺑﻮﻭ، ﻭﻩﺯﻳﺮﻩﻛﺎﻧﻰ ﺗﺮﻳﺶ ﺩﺍﻧﻴﺸﺘﻦ.... ﺧﻪڵﻜﻪﻛﻪ ﻛﺮﺩﻳﺎﻧﻪ ﭼﻪﭘڵﻪ ﺭێﺰﺍﻥ ﻭ ﭼﻪﭘﻜﻪ ﮔﻮڵ ﻓڕێﺪﺍﻥ ﺑۆ ﺑﻪﺭﺩﻩﻡ ﺳﻪﻛۆﻛﻪﻯ ﺷﺎ....

ﺩﻭﺍﻯ ﻛﻪﻣێﻚ ﺷﺎﭘﻮﻭﺭ ﻫﻪڵﺴﺎﻳﻪﻭﻩﻭ ﺭﻭﻭﻯ ﻛﺮﺩﻩ ﺧﻪڵﻜﻪﻛﻪﻭ ﻭﺗﻰ::

– (ﺑﻪﻧﺎﻭﻯ ﻳﻪﺯﺩﺍﻧﻰ ﻣﻪﺯﻥ... ﺑﻪﻧﺎﻭﻯ ﺷﺎﻯ ﺷﺎﻫﺎﻧﻰ ﺩﻩﻭڵﻪﺗﻰ ﺳﺎﺳﺎﻧﻪﻭﻩ... ﺩﻩﺳﺖ ﺑﻪ ﻣﻴﻬﺮﻩﺟﺎﻧﻰ ﺋﻪﻣﺴﺎڵﻤﺎﻥ ﺩﻩﻛﻪﻳﻦ، ﻟﻪﻡ ڕۆژﻩﺩﺍ ﭘﺎﺷﺎﻯ ﮔﻪﻭﺭﻩﻣﺎﻥ، ﺩﺍﻣﻪﺯﺭێﻨﻪﺭﻯ ﺩﻩﻭڵﻪﺗﻰ ﺳﺎﺳﺎﻥ ﺋﻪﺭﺩﻩﺷێﺮ... ﭘﺎﺩﺍﺵ ﻭ ﺧﻪڵاﺗﻰ ﺑﻪﻭ ﻛﻪﺳﺎﻧﻪ ﺑﻪﺧﺸﻴﻮﻩ ﻛﻪ ﻛﺮﺩﻩﻭﻩﻛﺎﻧﻴﺎﻥ ﻣﺎﻳﻪﻯ ﺷﺎﻧﺎﺯﻳﻦ ﻭ ﭘﻪﻳﺮﻩﻭﻯ (ﺑﻴﺮﻯ ﭼﺎﻙ، ﻭﺗﻪﻯ ﭼﺎﻙ، ﺭﻩﻓﺘﺎﺭﻯ ﭼﺎﻙ) ﻳﺎﻥ ﻛﺮﺩﻭﻭﻩ... ﻭﻩﻙ ﺋﺎﺩﻛﺎﺭﻯ ﺋﻪﻭ ﭘﻴﺎﻭﻩ ﺳﻪﻻﺭﻭ ﺑﻪﺩﻩﺳﻪڵاﺗﻪ، ﻛﻪ ﻛﻮﺭﻩ ﺗﺎﻗﺎﻧﻪﻛﻪﻯ ﺑﻪ ﺩﻩﺳﺘﻰ ﭘﻴﺎﻭێﻜﻰ ﭼﻪﭘﻪڵ ﺑﻪ ﻧﺎﺣﻪﻕ ﺩﻩﻛﻮﮊﺭێ... ﺋﻪﻭﻳﺶ ﻛﻮﺭێﻜﻰ ﭘﻴﺎﻭ ﻛﻮﮊﻩﻛﻪ ﺩﻩﮔﺮێ ﻭ ﻟﻪ ﻣﺎڵ ﺧﯚﻳﺪﺍ ﭼﻪﻧﺪ ڕۆژێﻚ ﺑﻪﻧﺪﻯ ﺩﻩﻛﺎﺕ ﻭ ﺑێ ﺋﻪﻭﻩﻯ ﺋﺎﺯﺍﺭﻯ ﺑﺪﺍﺕ، ﺳﻰ ژﻩﻣﻪﺵ ﺧﻮﺍﺭﺩﻥ ﻭ ﺧۆﺭﺍﻛﻰ ﻭﻩﻙ ﻫﻰ ﺧۆﻳﺎﻥ ﺩﻩﺩﺍﺗێ، ﻟﻪ ﺩﻭﺍﻳﻴﺪﺍ ﺑﻪﺯﻩﻳﻰ ﭘﻴﺎ ﺩێﺘﻪﻭﻩﻭ ﻟﻪ ﺩڵ ﺧۆﻳﺪﺍ ﺩﻩڵێ: ﭼ ﺭﻩﻭﺍﻳﻪ ﺋﻪﻡ ﻛﻮﺭﻩ ﺑێ ﺩﻩﺳﻪڵاﺗﻪ ﺑﻪ ﻧﺎﺣﻪﻕ ﺑﻜﻮﮊﻡ، ﻣﻦ ﺟﻪﺭﮔﻢ ﺑﻪ ﻧﺎﺣﻪﻕ ﺳﻮﻭﺗﺎﻭﻩ، ﺑۆ ﺟﻪﺭﮔﻰ ﺩﺍﻳﻜﻰ ﺋﻪﻡ ﻛﻮﺭﻩﺵ ﺑﻪ ﻧﺎﺣﻪﻕ ﺑﺴﻮﻭﺗێ؟! ﺋﻪﻡ ﻛﻮﺭﻩ ﻭﻩﻙ ﻛﻮﺭﻩﻛﻪﻯ ﻣﻦ ﺑێ ﮔﻮﻧﺎﺣﻪ، ﺩﻩﺳﺘێ ﺟﻠﻰ ﺟﻮﺍﻧﻰ ﺑۆ ﺩﻩﻛﺎﻭ ﺭﻩﻭﺍﻧﻪﻯ ﻻﻯ ﺩﺍﻳﻜﻰ ﺧۆﻯ ﺩﻩﻛﺎﺗﻪﻭﻩ... ﺋﻪﻡ ﻧﻤﻮﻭﻧﻪﻭ ﮔﻪڵێ ﻧﻤﻮﻭﻧﻪﻯ ﺗﺮﻯ ﻭﻩﻫﺎ ﺭﻭﻭﻳﺎﻥ ﺩﺍﻭﻩ ﻛﻪ ﻣﺎﻳﻪﻯ ﺳﻪﺭﺳﻮﻭﺭﻣﺎﻧﻦ، ﺧﺎﻭﻩﻧﻪﻛﺎﻧﻴﺎﻥ ﺷﺎﻳﺴﺘﻪﻯ ﺋﻪﻭﻩﻥ ﺑﻜﺮێﻦ ﺑﻪ ﭘێﺸﺮﻩﻭﻯ ﭘﻴﺎﻭ ﭼﺎﻛﺎﻥ ﻭ ﺧﻪڵاﺕ ﻭ ﺑﻪﺭﺍﺗﻰ ﺷﺎﻳﺎﻧﻪﻳﺎﻥ ﭘێ ﺑﺒﻪﺧﺸﺮێ... ﺋﻪﻭ ﺟۆﺭﻩ ﻛﻪﺳﺎﻧﻪ ﺯۆﺭﻥ، ﻭﻩڵێ ﻫﻴﭽﻴﺎﻥ ﻧﺎﮔﻪﻧﻪ ﺋﻪﻡ ﻧﻤﻮﻭﻧﻪﻳﻪ!

– ( ﻟﻪﺳﻪﺭﺩﻩﻣﻰ ﺳﺎﺳﺎﻧﻰ ﻣﻪﺯﻥ ﻭ ﮔﻪﻭﺭﻩﻭﻩ: ﺋﻪﺭﺩﻩﺷێﺮ، ﻫﻪﻭڵﺪﺭﺍﻭﻩ ﻛﻪ ﺑﻪﺷﻪﻛﺎﻧﻰ ﺋﺎﻭێﺴﺘﺎﻯ ﭘﻴﺮۆﺯ ﻛۆ ﺑﻜﺮێﺘﻪﻭﻩﻭ ﺳﻪﺭ ﻟﻪﻧﻮێ ﺑﻨﻮﻭﺳﺮێﻨﻪﻭﻩ، ﺑﻪڵاﻡ ﺗﺎ

ئەمساڵ ئەو  ئاواتە نەهاتە دی، ئەمڕۆ لە سایەی خاوەن شکۆدا، پاشای گەورەمان، پیاوێکی بلیمەت و داناو نەبەرد کە ناوی پیرسیمیاری شارەزووری هەورامییە، ئەو ئاواتەشمان هاتە دی کە ئاواتی هەموو کەسێکی ئاریان زەمیێ بوو، زۆرینەی پارچەکانی ئاوێستای پیرۆزی دۆزینەوەو سەرلەنوێ کۆی کردوونەتەوە، و زەندێکی وای بۆ نوسیوە کە هەموو کەسێکی ئایندار بە ئاسانی لێی تیبگات ئەو کارە پیرۆزە کاری ئەو پیاوە مەزنە دڵی هەموو مۆبیدو مۆغان و خوا پەرستێکی شاد کرد، ئەو پیاوە نموونەی یەکەم هاووڵاتی ئەم میهرەجانەی ئەمساڵمانە، بەو بۆنەوە شای مەزنمان، نازناوی (پیرشالیار)ی پێ دەبەخشێ و دەیکات بە سەرۆکی هەموو مۆبیدوو مۆغانەکان )...

به تەواو بوونی وتارەکەی شاپوور، خەڵکەکە دەسیان بە شایی و چەپڵە ڕێزان و ڕوانین بۆ ئەو کەسەی کە لەم جەژنەدا بە یەکەم هاووڵاتی قەلەمڕەوی ساسان هەڵبژێدراوە، لە ناو گرۆی پیرو مۆغانەکاندا گەنجێکی بە ویقارو نموود نیگا هەڵسایەوەو چووە بەردەم شاو شاژن، جوانی و نموودی هەموو خەڵکەکەی سەرسام کرد... بە پێ ی دەستوور کە گەیشتە بەردەم شا، شاو شاژن و ئامادە بووان هەموو هەڵسانەوە، شا شاڵێکی زێوەری خستە سەرشانی، سەپەرێکی لە مل کرد، لەو کاتەدا سەیری نێو نیگای کرد ئەوەندەی نەمابوو دەستی لە ملیدا وشك ببێ و خۆی بە سنگیەوە بنووسێنێ، چونکە تا ئەو وەختە نە بە خەون نە بە خەیاڵ نێو  نیگای پاکی پیاوانەی وای نەدیبوو     چاوی پڕ لە ئەفسون و ڕوومەتی پڕ  نهێنی جوانی ئاوێستا ئامێز هیچ خۆی لە بەریدا نەدەگرت، دوای وەرگرتنی شاڵی گەورە مۆبیدان و سەپەری خۆ پاراستن لە بەڵای ناگەهان هاتەوە و جیێی خۆیوو ڕووی کردە شاو شاژن و وتی :

– گەورەم  ئەی شای داد پەروەر و نەوەی ئەردەشێر .. ئەوەی من کردوومە
ـەرکی خۆمم زانیووە       من هاولاتییەکی ئاساییم. خۆم بەشایستەی
ـونەزاکەت و ڕێز لێنانەی خاوەن شکۆ نەزانیوە. دیارە ڕێز لێنانی من لەلایەن
ـێوەوە ڕێزلێنانە لەوانەی کاری چاك ، بیری چاك ، ڕەفتاری چاك بەدیدەنی خۆیان
ـزانن    پایە دار بێ شای مەزن، بەرقەرار بێ سایەو پایەی دەوڵتی ساسان.

ووتە ئاسکەکەی پیر شالیار تیشك بارانێك بوو، ناو دەروونی گوێگرانی پڕ
ـاوێزان و ڕووناکی کرد

دوای ووتەکەی پیر شالیار گرووپەکانی مهرەجان دەستیان بە وازی و
ـمزەمەو ڕم بازی کرد

ئەوانەی گەرەکیان بوو لەنزیکەوە پیر شالیار ببینن بەبەر دەمیا تێدەبەرین و
بەدەست بەرز کردنەوە سلاوو پیرۆزباییان لەوو لە شا دەکرد

*          *          *

مۆبیدەکەی ئەکباتانە بۆ مەبەستە تایبەتەکەی خۆی هۆزای کردبووە دەستە
گوڵی خۆی بۆ ئەوەی پێشکەشی پیرشالیاری بکات، دەرفەتەکەی بۆ هات، پێش
هۆزا کەوت و بەرەو ئەو شوێنەی کە پیرشالیار تیا ڕاوەستابوو ڕۆیشتن، خەڵك
ئاسا دەستی بۆ ئاسانەی شا بەرزکردەوە، کە گەیشتنە ئاست پیرشالیار،
هەڵکشانە ناو سەکۆی دانیشتنەکە، لەبەر ڕیشی سپیو تەمەنداری مۆبیدەکە
پاسەوانەکان لێی گەڕان بەرەو پیرشالیار بچێ وەلێ هۆزانیان گل دایەوەو لێ ی

نەگەڕان بچێتە لای، موبیدەکە کە گەیشتە لای پیرشالیار، پاش راموسان و پیرۆزبایی، خۆی پێ ی ناسان و وتی:

– دیارییەکی پڕ بەهام بۆ هێناوی!

– دیاری؟!.

بۆ ئەوەی زەینی بۆ هیچ شتێکی لاوەکی نەڕوات زوو وتی:

– کەسێکی ئازیزی خۆت!.

– کەسی ئازیزی من؟!.

– بەڵێ... بەبۆنەی ئەو پایە گەورەیەوە...

– (دەستی بۆ لای هۆزا کێشاو) ئەوە؟!.

– ئەوە! کەسی منە؟ کێیە؟...

– پیر شالیار بەدەست، ئاماژەی بۆ پاسەوانەکە دا کە ماوەی ئەو کەسە بدات بچێتە لای...

هۆزا کە لەپیرشالیار نزیك بووەوە، لە خۆشیاندا ئەو هەموو ئاوات و تاسەی ناو دەروونی ئەو هەموو ئێش و ئازارو مەترسی و دڵە ڕاوکێ و نارەحەتییەی کە بەسەریدا هاتبوون، بوون بە قوڵپی هەنسك و فرمێسك لەبەردەم ئەو پایەو سایەی پیرشالیارەدا هەرەسیان هێناو لەناو قوڕگیدا پەنگیان خواردەوە، خۆی دا بەسەر هەردوو دەستی پیرشالیاردا، چی هەوڵی دەدا خۆی پێ کۆنترۆڵ نەکراو هەموو هەستەکانی لەناو شەتاوی سۆزدا خنکان، هەوڵی دەدا شتێ بڵێ تاکە وشەیەکی لەقوڕگی پڕ لەهەنسکیدا بۆ قوتار نەکرا...

پیرشالیار دەستی کردە ملی و پێ ی وت:

– وێنات دەکەم ، وەلێ باش نایەییتەوە بیرم.. تۆ کێ ی؟!.

– من ؟ هۆزای بەردەستی نازەنین خانم...

ـه هۆزا وای وت... پیرشالیار، هەڵوێست و دەوروبەرەکەی خۆی لەبیر نەماو ـ لەچوڵەواریدا بێ وا بەتووندی باوەشی پیا کرد و تێر ماچی کرد!.

ئەوەی ئازاری غوربەت جۆشی نەدابێ و تامی ئەڤینی راستەقینەی ـچێشتبێ، رەنگە بڵێ: ئەو پیاوە گەورەیە، چۆن ئەو هەموو سنوورەی لەو ـوێنەدا بەزاندو وا دەستی لەملی ئەو کوڕە عەودالە کرد !؟.

پیرشالیار لەهۆزا ورد بووەوە وتی:

هۆزا گیان، کە من لەدەگای هەورامان دەرچووم تۆ منداڵ بووی! خوا بیچاوینت بکا، گەورە بووی، بۆیە زوو تۆم نەناسییەوە... ئەوە چۆن گەیشتیتە ئێرە؟! لەبەر چی؟...

کە وای وت: ئەوەندەی نەمابوو هۆزا کۆنترۆڵی خۆی لەدەست دەرچێ، بۆیە نەی توانی وەرامی بداتە...

پیرشالیار لەوەرام نەدانەوەکەی هۆزا پەرۆش بوو، بۆیە وتی:

– هۆزا پێم بێژە خۆ شتێك رووی نەداوە...

هۆزا هەر ئەوەندەی پێ وترا:

– نا... هیچ نەقەومیان... دەگا سەلامەتەنە...

– ئەی ؟!.

مۆبیدەکەی ئەکباتانە، بۆ بەرژەوەندی خۆی ئەم پێشنیارەی خستە بەردەم پیرشالیار:

– قوربان ئەم شەو پێکەوە دەبین و هەموو بەسەرهاتەکانت بۆ دەگێڕێتەوە..

ئەو وای پیشان دا کە ئاگای لەهەموو شتێ هەیە!...

هۆزاش حەزی نەدەکرد ئەو خۆی بکات بە دەمراستی و وەها لێ ی بئاڵێ و بیکات بە دەستە گوڵی دیاری خۆی...

پیرشالیار هۆزای لەتەنیشت خۆی داناو، رووی کردەوە ئەو حەشاماتەی کە بە بەردەم سەکۆکەدا تێدەپەڕین و بەو بۆنەوە بەدەست درودو پیرۆزباییان بۆ شاو بۆ ئەو ئاراستە دەکرد...

*　　　*　　　*

## (١١)

ئەو ئێوارە لەحەوشەی ئایرگای گەورەی شاردا پیرشالیار بەپێی رەویەو دەستوور پیرۆزبایی هەموو مۆبیدو مۆغان و پیاو ماقوڵانی قبوڵ کرد، هۆزای وەك کەسێکی ئازیزی خۆی لەتەنیشت خۆی راگرت، ئەوەی پیرۆزبایی لێ دەکرد سەری رێزو خۆشبەختیشی بۆ هۆزا دەلەقان، دوای تەواو بوونی رێ و رەسمی تایبەتی ئەو بۆنەیە، پیرشالیار و هۆزا بە یەکەوە لەحوجرەکەی پیردا دانیشتن، هۆزا لەنووکەوە، لەو رۆژەوە، کەلەگەڵ هێشاو واراندا کەوتبوونە رێ تا ئەو ساتەی بەخزمەتی ئەو گەیشت بەوردو درشتەوە هەمووی بۆ گێرایەوە...

هەر ئەو شەوە پیرشالیار شاپوور، وەزیری دەستەراستی ئاگادار کردەوە کە روخسەتی لەشا بۆ بخوازێ کە ئارەزوو دەکات، بەرەو شارەزووررو هەورامان بۆ سەردانی کەسوکاری بگەرێتەوە، ئەوەی پتر هەڵی نا زوو بگەرێتەوە گلدانەوەی هێشاو واران بوو، کە بەناحەق لەلایەن دەهقانی بیستوون زەمینەوە گلدرابوونەوە، مەسەلەی ئەو گلدانەوەی بۆ شاپوور روون کردەوە، ئەویش بڕیاریدا چوار سوارچاکی رەعنا ئاسایی لەتەکدا بنێرێ، هەم بۆ پاراستنی رێگاو هەم بۆ تەمێ کردنی ئەو دەهقانەی کە ئەوانەی بەو چەشنە بەند کردبوون... لەهەمان کاتدا مۆبیدەکەی ئەکباتانەی بەشاپوور ناساندو ئەوەی کەمەبەستی بوو بۆی جێبەجێ کرد...

ئەوشەوە هۆزا لەخۆشیاندا نەخەوت، بەو ئاکام گەیشتنەی وای دەزانی چقەی شاهانەی ئاریان زەمینی لەسەر نراوە لەدڵەوە دەیووت:

بەیانی کە لەگەڵ پیرشالیاردا بەرەو وڵات دەکەوینە رێ، خوزیا هەنارخان لە کەنارێکەوە چاوی لێمان دەبوو، ئەوکات دەیزانی من چتۆ کەسم و چەند دڵسۆزم. خۆ ئەگەر من لەگەڵ هێشاو ولراندا نەهاتمایە کێ بەپیرشالیاری دەوت هێشا لەکوێیەو چی بەسەر هاتووە؟!.

پیریش کە دەیروانییە هۆزا پێ ی شاد دەبوو، لەودا خۆی بەدی دەکرد. بەروڵەیەکی نەبەردو یارای دەزانی و بیری لەوە دەکردەوە کە داخۆ چەندان روڵەی ئازاو چەلەنگ لەناو خەڵکدا هەن و نەخراونەتە بەر ئەزموون تا بزانرێ توانایان تا چەند بڕ دەکات...

ئەو کاتەی هۆزا لەتەنیشتی لەسەر سەکۆکەی مەیدانی ئەردەشێر راوەستا وای دەزانی هەموو دەڤەری شارەزوورو هەورامان لەگەڵ ئەودا هاتوون و لەو خۆشیەیدا بەشدارریان کردووە.

لەراستیدا هۆزا نامەیەکی یەزدانی بوو مەگەر یەکێکی وەك زانای سیمیار، پیرشالیار توانیبێتی بیخوێنێتەوە، خۆ ئەگەر بە دەستگیری ئەو نەبوایە ئەوەندە هێڤم نەبوو بتوانێ خۆی لەبەردەم ئەودا راگرێ و وەك برادەرێکی دێرین، یان پێسە ئازیزێك لەحزووریدا دانیشێ و بەتەواوی متمانەوە ئەوهاتن و سەختی رێگەیەی بۆ بگێرێتەوە... ئەو متمانە بە خۆ کردنەشی رەوشتێك بوو لەنازەنین خانەوە فێری ببوو... رێگەی هاتنەکەی بۆ ئەو وردە حیکمەتانە رای هێنابوو کە لەهەنارخانەوە فێریان ببوو..

مۆبیدەکەی ئەکباتانەش لەگەڵیاندا گەرایەوەو خۆی بەوانەوە بەست، ئەو کابرایە تەنیا بەسەرو سەکوت مۆبید بوو دەنا تەپی لەهیچ نەدەپێکا، لەگەڵ

ئەوەشدا پیرشالیار پێشی خۆی دەخست و گوێ ی بۆ قسە بێ تام و پڕو پووچەکانی دەگرت و بەسەر زار بەڵێ ی بۆ دەکرد... کابرای مۆبید گەلێ میوان نەواز دیار بوو، شەوو رۆژێك کە لەلای ئەو مانەوە بۆ هۆزا دەرنەکەوت ئەو میوانداریيە بۆ هەموو کەس وا بوو! یان لەبەر ئەو پایەو سایيە بوو کە پیرشالیار لەلایەن کۆشکی شاهانەوە پێ ی درابوو، چونکە ئەو مۆبیدە رووپاماییەکی پڕ بە خەجاڵەت و زەلیلی بۆ سوار رەعناکانی کۆشك دەنواند..

بەلای دێکەی رەخشان دایکی سەپان و لاپان و هاماندا تێپەڕین لەبەر سێ شت هۆزا پێ ی نەکرا بچێتەوە لای و پێ ی بڵێ: فەرموو بەرەو کوڕەکانت لەتەکماندا وەرە، یەکەم: موبیدەکەی ئەکباتانە تا لەوێ تێپەڕین بەرێ ی کردن و ولزی لێ نەهێنان، دووەم: لەپایەو سایيەی پیرشالیار نەدەوەشایەوە ئافرەتێك سێ کوڕی دوای کوشتنی دەهقانی ئەوێ هەرایان کردبێ، ئەو بیبات و بیخاتە تەك خۆی! سێیەم: پەلەکردن لە گەڕانەوەو نەبوونی هەلێك وابێ کە لەپاشدا گومان دروست نەکات.

خۆ ئەگەر هۆزا مەسەلەی ئەو ژنە داماوەی بۆ پیر باس بکردایە، لەوانە بوو چارەسەرێکی بۆ بدۆزێتەوە، هەڵەیەکی گەورە بوو هۆزا کردی، بەگەیشتن بەپیرشالیار وا مەستی کرد بوو ئاگای بەلای شتی ترەوە نەما، بێگومان ئەگەر ئەو بیزانیایە لەرێیاندا ستەمێکی وا رووی داوە، لەوانە بوو شتێکی دەربارە دەکرد... خۆ ئەگەر ئەو دایکە جگەر سووتاوە دەسی لەپیرێکی وا گیر بوایە کە گوێ لەستەمەکەی بگرێ، یان ئەوەی بەسەر ئەودا هاتبوو بۆ هەر کەسی بگێڕایەتەوە دڵی بەردی رەقیش بوایە دەسکرۆی دەکرد... دڵی ئافرەتێکی وەها ستەمدیدە هەناوی مەنجەنیقێك بوو ئەوەی نزیکی بکەوتایە گڕی تێبەر دەدا....

لەو رۆژەوە هۆزا پێ ی وتبوو لەو سەرەوە کە گەرامەوە لەگەڵ خۆمدا دەتبەم بۆ لای سەپان و لاپان و هامان، کچە جاحێلە بێ سەرو شوێنەکەی چش لێ کردبوو، دەیووت: ئەو سێ کوڕەم لەو بەڵایە رزگار بن بریمی کچەکەم سارێژ دەکەن...

ئێستا ئەو ژنە ناتەسەرە بێکەسە، بێ ئۆقرەیەو هەموو هەست و نەستێکی خستووەتە سەر چرپەی پێیەك و بێت و بڵێ: (من هۆزام، ئامادە بە بڕۆین)!...

ئای هۆزا داخۆ دایکی تۆش ئێستا چۆن وێنای تۆ دەکات! ئەوا کوڕەکانی رەخشان تۆ سۆراخت کردن، ئەی کێ سۆراخی تۆ بۆ دایکت دەکا... تۆ بڵێ ی بەچی دڵی خۆی بداتەوە؟!.

بەدرێژایی رێ ئەو وردە خەیاڵانە خۆشی هاورێیەتی پیرو بەرەو گەرانەوەی بۆ وڵات لێ تێك دابوو...

تۆ وەرن سەیری کەن، ئەو هۆزایە کە هەنارخان رازی نەبوو بکەوێتە شوێن هێشاو واران وا ئێستا لەتەك پیردا بەرەو وڵات رێ دەبڕێ و بەنازوفیزەوە سواری وڵاغێکی خۆش رەو بووەو چوار سوارچاکی شاهانە لە دواوەی دەرۆن...

مۆبیدەکەی ئەکباتانە لەوە حاڵی نەبوو کە ئایا پیرشالیار سەری دەڤەری هەورامان دەداتەوەو دەگەڕێتەوە یان هەر لەوێ دەمێنێتەوە؟.. ئەو بەلای ئەوەدا دەچوو کە دەرواو سەرێك دەدات و دەگەڕێتەوە، چونکە مۆبیدی هەموو مۆبیدەکان دەبوو نزیك بەکۆشکی شاو دەربار بێ...

بەتەمەن پیرشالیار بەکوری بچوکی ئەو مۆبیدە دەژمێردرا، ئەوەی هەردووکیانی پێکەوە دەدی پێ ی وابوو ئەو مۆبیدی مۆبیدەکانەو پیرشالیار شاگردیەتی... هۆزا لەدڵەوە حەزی لێ نەدەکرد، لەگەڵ ئەوەشدا سەودایی نەبوو گاڵتەی بە قسەکانی ئەو مۆبیدە دەهات، چونکە لەئاستی ماریفەتی پیرەژنێکی فرمزان و

نەخوێندەواردا بوون، هەموو زانیارەکانی ئەو وتە ئاینیانە بوون کە سینە بەسینە هاتبوون و لەناو خەڵکدا ئەوەندە دەماو دەمیان پێ کرابوو لەئاستی بنێشتە شینەی ناو زاریشدا نەمابوون، هەموو کەس چەندان جار بیستبوونی... بە درێژایی ئەوهاو دەمی بوونەیان دەمی نەکردەوە پرسیارێك دەربارەی مەسەلە گەورەکانی ئاین لەپیرشالیار بکات... ئەویش لەبەر نەزاکەتی خۆی و ریشی سپی ئەو بابەتێکی وەهای نەهێنایە پێشەوە ئەو تیایدا تەریق بێتەوە...

ئەوان پەلەی ئەوەیان دەکرد زوو فریای هێشاو واران بکەون، مۆبیدەکەش بۆ بەرژەوەندی خۆی وای لاباش بوو ماوەیەك لای ئەو بمێنێتەوە، تا هەموو خەڵك ببینن کە لەگەڵ کار بەدەستانی دەوڵەتدا تێکەڵاوی هەیە!..

کەلە ئەکباتانە دوور کەوتنەوە بەپەلە خۆیان گەیاندە وڵاتی بێستون زەمین، بەر لەوەی ئەوان بگەنە ئەوێ سێ ڕۆژ بوو برا گەورەکەی دەهقان مردبوو، بەکلۆك شکاندنەکەی نەمردبوو، بەڵکو لەپڕ توشی تەنگە نەفەسی دەبێ و لەناکاو گیانی دەردەچێ...

لەشەوی دووەمی مردنیدا، هێشاو واران لەترس ئەوەی نەبادا هۆی مردنەکەی بدەنە پاڵ کلۆك شکاندنەکەی و لەجیاتیدا بیانکوژن هەرا دەکەن، دەهقانی برامردە لەهەر چوار قوڵەوە زەلامیان بۆ دەردەکا بۆ ئەوەی بەمردن بێ یان زیندی بیانگرن و بیانهێننەوە تا لە حەوتەمین ڕۆژی مردنەکەیدا، بەر لەوەی گیانی لەلاشەکەی جیابێتەوە بیانکوژن!.

هەردووکیان، دەگیرێن و بەقوڵ بەستراوی دەهێنرنەوەو لەمەیدانی شارەکەدا بەدارێکەوە دەبەسرێنەوە، بۆ ئەوەی هەر کەسێك بەوێدا تێپەڕێ تفیان لێ بکات و شەقیان تێ هەڵدا!.

منداڵە وردەی شار لێیان خڕ دەبنەوە، هەندێکیان گاڵتەیان پێ دەکردن و هەندێکیان سەیریان دەکردن و تەزووی بەزەیی پیا هاتنەوە لەسەر دەم و چاویان نیشانەی سەرسووڕمانی دەنەخشان.

کچە بچوکەکەی کابرای مردوو، تازە بەناو تاقی هەرزەکاریدا دەچوو، شۆخ و شەنگ بوو، گەلێ رای لەخۆی هەبوو، کەم تێکەڵاوی لەگەڵ خەڵکدا دەکرد، رای لەرەوریەو بیرورای خەڵك نەبوو، گوێ ی بۆ کەم کەس رادەگرت قسەی بۆ بکات، چونکە دەیزانی قسەکانییان بێبەرو پشتبوون...

لەو ماوەدا کە هێشا برینەکانی باوکی تیمار دەکرد، یارمەتی دەداو ئالوودەی ببوو، قسە پڕ ماناو دڵگیرەکانی ناو هۆش و مێشکیان روناك دەکردەوە، لەناخی دڵیدا دەچەسپین و هەستی دەکرد ئەو وەك خەڵکانی تر نادوێ و شتی وتراو دووبارە ناکاتەوە... چەند تیمار کردنەکەی برینەکانی باوکی سارێژ دەکرد ئەوەندە بگرە فرەتریش هۆش و مێشکی ئەو باوکە خۆ بەزلزان و نەزانەی ئاوەدان دەکردەوە، وای لێ هاتبوو لەگەڵ باوکیدا ببوون بەدۆستی یەکتری و حەزی دەکرد شەو رۆژ لای بێ و قسەی خۆشی بۆ بکات بە شمشاڵەکەی ناو دەروونی پاك دەکردەوەو گەلێ جاریش پێ ی وتبو:

– بم بەخشە، خەتای من بووو، وەلێ چی لە برام بکەم، کە دەمقانەو ئەو حوکمەی بەسەر ئێودا داوە؟!.

رەنگین کەبیستی هێشا گیراوەو لەو مەیدانەی ناو شاردا خەڵك تف و نەفرەتی لێ دەمکات، بە پەلە خۆی گەیاندە ئەوێ و ئەوانەی کە تەموورەیان لێ دابوون، دەرنی پێ دان و هاواری بەسەریاندا کردو وتی:

– ئەوە بۆ گەلەکۆمەتان لەسەر ئەو دوو پیاوە کردووە؟!.

خەڵکەکە پێیان وابوو ئێستا رەنگین بەپێڵاوەکانی دەم و چاوی هەردووکیان دەکوتێتەوە...

هێشا کەسەیری نێو نیگای رەنگینیی کرد چاوی بریە ناو چاوە شینە مەندەکانی وای دەزانی سۆزو ئەڤینی دایکی و هەنارخان و نازەنین و هەموو ئافرەتانی گێتی لەناو دەریای ئەو چاوە مەندانەدا تواوەتەوەو چی رك و کینە و ستەم هەیە لەبەر زەبرەی ئەو برژانگە تیژانەدا قیمە کراوە... ئەو بێ تاوانییەی کە ئەوان پشتیان پێ ی قایم بوو وەك باهۆزەیەك هات و پەردەی شەرمەزاری بەرووی ئەوانەی  کە تەمووریەیان دابوو، داو بینایی کردنەوە، کاتێ کە رەنگین چووە بەردەمی هێشا وتی:

– ئەوە بۆ هەڕاتان کرد؟!.

لەراستیدا هەرا کردنەکەیان بەرای واران بوو، ئەو لەیەکەم هەنگاوەوە حەزی لەو کارەی خۆیان نەدەکرد، حەزیشی نەکرد خەتای هەراکردنەکە بخاتە سەر ئەستۆی واران، بۆیە هۆی ڕاکردنەکەی بردەوە سەر هۆیەکی تری لەبارو وتی:

– لەترس ستەم و نەفامی کەللە رەقی ئێوە!... ئێوە بریندار بوونی باوکی تۆیان لەگەردنی ئێمە ئاڵاند هەموو خاوەن هۆش و ئاوەزووێك دەزانێ مرۆی رێبوار، یان کاروانچی بۆ هەر لایە روو بنێ، پێویستی بە زەردەخەنەیەکی ئاستەمی خەڵك هەیە، نەك شەرنگێزی و بەگژ خەڵکدا چوون... ئەو ماوەیە کە لێرە ئێمەتان بەناحەق گلدایەوە ویستمان ئەوەتان پێ بسەلمێنین کە مەردایەتی و رەفتاری چاك و بیری چاك چۆن دەچێنرێن و لە چ زەمینەیەکدا سەوز نابێ، دیار بوو ئێمە بەهەڵەدا چوو بووین.

نەمان زانی، هۆش و مێشکی ئێوە ئەو شتانەی تیا سەوز نەبووا. رەنگین گوێ ی دابووە وتەکانی هێشاو چاك لێیان حاڵی دەبوو، بۆیە لەسەر خۆ وتی:

- ئاوا؟!.

ئەو چەقۆیەی لەبن پشتینەکەیدا شاردبوویەوەو بۆ ئەو مەبەستە هێنا بووی، دەری هێناو ئەو گوریسانەی کە ئەوانی پێ تەنگدرا بوو بڕین و هەردووکیانی کردەوەو وتی:

- زەمین نە هەمووی ڕیچەو نە هەمووی بە پیتە، وەلێ دەستی پاك هەر تۆوێ بچێنێ بێ بەرهەم نابێ...

ئەو کەس ئێوە بەتاوانبار بزانێ بزنێکە قۆچی لەسەنگەری ڕەق داوە!..

هێشا لێ ی ئاین بوو ئەو ژەهرە کوشندەیە، ئەو تاوانە کە لەپاداشتی چاکەدا خرابووە ئەستۆی، بەرامبەر بەخواین و خۆ ڕاگری کاریگەر نابێ، ئەوەتا ئەو کچە لەناو کۆتی ئەو داب و نەریتە چەپەڵەدا چوون گوڵی ناو شەخەڵ چاوی لەروناکی بڕیوەو ڕۆژ بەو گەورەیە لەو ئاسمانە بەرزەوە پێکەنینی لەگەڵ دەکات و بەکۆش تیشکی بۆ ڕەوانە دەکات....

دیار بوو لەو ماوەیەدا کە هێشا برینەکانی باوکی نگینی تیمار کردبوون، کردەی چاك و نەزاکەتی بێ گەردی پاکی ئەو لەو ماڵەدا ببوون بە وردە داوی ورشەدارو بەدەوور دڵی نگیندا قەیتانێکی ڕەنگینی عیشقیان چنی بوو! ئیدی ئەوەی ڕەنگین لەو هێشایەوە هەستی پێ دەکرد لەخۆی بەولاوە کەسی تر پەی پێ نەدەبرد... ئەو پەڕی پیاوەتی ئەو، ئەوە بوو بەئاسانی دەیتوانی بەر لەمردنی کابرا خۆی و برادەرەکەی لەو بڕیارەی کە دەهقان بەسەریاندا دابووی دەرباز بێن و بڕۆن، کەچی نەڕۆیی و ئەو ماوە خووی دایە چاککردنەوەی باوکی نگین!.. بە شمشاڵەکەی سیمیار خۆشترین نەوای بە گوێیدا دابوو.

بەراستی ئەوان نەك لەمردنی کابرایەك بەڵکو لەکلۆك شکاندنەکەیشیدا گوناحییان نەبوو، ئەی بۆ زوو هەرایان نەکرد؟ بۆ چی عەودالْ ببوون؟ بۆ

بەشوێنیدا نەرۆیشتن؟!.. هێشا گەلێ جار خۆیشی ئەو پرسیارەی لەخۆی کردبوو... پێ ی وابوو ئەگەر هەرای بکردایە تاوانە ناحەقەکە بەسەر خۆیدا دەمێنێ و بەر لۆمەی ویژدان دەکەوێ...

باوکی رەنگین لەسەرەتاوە کەهێشا تیماری دەکرد وای دەزانی بەندەیەکی بێ دەسەڵاتی دەسکەوتووەو دەشێ خزمەتی بکات، کەچی لەدواییدا پەشیمان بوو، پێ ی دەوت:

(کوڕم گەردنم ئازاد بکە، خوا ئاگادارە من دەربارەی تۆ خۆم بە گوناحکار دەزانم... با چاك ببمەوە مەرج بێ بڕۆمە سەریانی ئاتەشگاو پڕ بەدەم هاوار بکەم کە تۆ بەقەد تاڵە موێك گوناحت نەبووە، خەتا خەتای من بوو، خۆیشم وەرم گرتەوە، تۆ بەرێ ی خۆتا دەرۆیشتی، من رەوتی رێگەم لێ تێك دان...).

لەماوەی ئەو رۆژانەدا کە هێشا باوکی رەنگینی تیمار دەکرد، وێڕای ئەو هیچ کام لە منداڵەکانی بێزیان نە دەهات نزیکی ئەو باوکەیان بکەون... چۆن خۆی باوکێکی باش نەبوو، هەموو منداڵەکانیشی بەئاگری خراپی خۆی سووتاند بوون، ئەگەر باوکێك چەتوون و ئەگریس نەبێ چۆن منداڵی ئاواتی مردنی دەخوازن و حەز دەکەن لەکۆڵیان بێتەوە!.

مەگەر نۆشای دەگای هورامان وەك ئەو بەدو بەدخواز بووبێ.. وەلێ ئەم بەر لەسەر مەرگی دەسێکی خوایانەی بۆ وارس بوو، خەریك بوو کەڕەکێفی ناو دەروونە روخاوەکەی راماڵی و پاکژی بکاتەوە، کەچی ئەو بەدەردی خۆیەوە سەری نایەوە...

ئەو گوریسەی کە هێشاو وارانی پێ بەسرا بوونەوە رەنگین دوولای کردەوەو سەرەکەی گرێ ی لێ داو وەك گورزی لێ کردو سووڕی داو ئەو زەلام و منداڵانەی کە لەوێ بوون دووری خستنەوە...

هێشاو واران له شوێن خۆیان راوەستان، یەکێکی ژیریان دەویست قسەی لەتەکدا بکەن، وەلێ رەنگین بوو بە سەنگەرێکی وەهایان کە نەکەس بتوانێ نزیکیان بکەوێ نە ئەوانیش پێویستیان بەوەما کە خەڵك گوێیان لێ بگرێ و لێیان حاڵی ببێ...

کەیمنا برای رەنگین بوو، دەقاو دەق لەباوکی دەچوو، بەهەناسکە برکە هات، ئاگر لەچاوە پڕ ریپۆقەکانی دووکەڵەی دەکرد، دەمەپڕ لە کەپوەکەی لیقاوی دەپڕژاند، دەم و لێوی، نیوچاوانی و تەوێڵی لەگەوڕی ولاغی بەرزە دەچوون، هات، ویستی پەلاماری رەنگین بداو بەپرچی رای بکێشێ، بەلام هێشا بەری گرت و نەی هێشت وا بکات، پەلاماری دا گوریسەکە لەرەنگین بسێنێ و هێشاو واران بداتە بەر لێدان و سووکایەتییان پێ بکات، بەپاڵ پێوە نانێکی هێشا کەوت و لنگاو قوچ بوو، هێشا خەمی ئەوەی لێ نیشت بەلاکەی لێ دووبارە بێتەوەو ئەویش وەك باوکی ئەستۆی شکابێ و بەسەر ئەودا ساغ بێتەوە، کە کەوت سڕ بوو، زوو هەڵنەسایەوە، بۆیە هێشا چووە سەری و پێی وت:

- ها!... ئاوا پیاوەتی خۆت دەنوێنی؟...

کابرا بەخۆیدا هاتەوە... وەلێ عاری نەگرتبوو، خۆی راوەشان، گوا دەیویست هەندێ شەرمی رژاوی بو نێو چاوان خۆی گل بداتەوە! پەلاماری رەنگینی داو ویستی لێ ی بدا، تومەز دەستی هێشا لەبێ غیرەتی ئەو یاراو خیراتر بوو، توونو مەچەکی باداو لەشوێن خۆی تەزاندی و پێ ی وت:

- هەی نا پیاو، ئەوە خوشکی خۆتە وای لێ دەکەی داخۆ دەرحەق بەژنی بێگانە چتۆ پیاوێ بی!..

کەیمنا هانای بوو خەڵکەکەی دەورو بەری برد کەسیان بە هانایەوە نەچوون، لەبەر دەست هێشادا مایەوە، ئەو یەخەی بەر نەدەدا، ئەمیش هەر دەیویست تەمێ

ی بکات و لێ ی دوور کەوێتەوە، رەنگین کەوتە بەینییانەوە، نەی دەتوانی لێکیان جیا بکاتەوە، کە واران کەوتە نێوانیانەوە پشت ملی کەیمنای گرتوو دووری خستەوە، لەبەر رەنگین حەزی نەکرد لێی بدات... یەکدووانێك ویستیان سەری کەیمنا بکەنەوە وەلێ رەنگین چاویی لێ زەق کردنەوەو زووپاشە کشێ ی پێ کردن... رەنگین گوریسە گورز ئاساکەی لەرووی خەڵکەکەدا سوور داو وتی:

– ئەگەر ئەم دوو پیاوە بەتاوانیار دەزانن بڕۆن دەهقان بانگ بکەن با بێتە ئێرە لەگەڵ من قسە بکات، بزانم بەچی ئەمانە تاوانبار دەکات؟!.

خەڵکەکە نقەیان لەدەم نەترازاو بەدەور ئەو سێ کەسدا تەموورەیان بەست و سەیریان دەکرد وا کەیمنا بەدەم دژیوێن و هەڕەشەوە لەناو خەڵکەکەدا وەك کەسێکی سووکایەتی پێ کراو کشایەوەو نەزانرا بۆ کوێ چوو، لەبەر بێ وەجی خۆی کەسیش وتەیەکی خەیری بۆ پشتگیری ئەو نەکرد..

هێشا بەر لە ئێستا رەحمی بۆ رەنگین دەجووڵا، ئەو ماوەیە کە باوکی تیمار دەکرد تەنها بەو تەسەلای دەهات، هەر ئەویش لێ ی تێدەگەیشت ئەو رەحمەی هێشا سەدان وردە داوی بە دەور دەروونیدا تەنیبوو، وا ئێستا ئەو داوانە بوون بە تۆڕێکی زێڕین و ناتوانێ لێ ی دەرباز ببێ...

داخۆ ئەو رەحمەی هێشا لای رەنگین چی کردبێ...؟ ئەو هەڵوێستەی رەنگین کە سەبارەت بە بەردانی هێشاو واران نواندی شایستەی ئەوەیە بکرێ بە وەڵامی ئەو پرسیارە..

(گرامە کەڕ)، ناوی خۆی بە خۆیەوە بوو، بەدەرو دیمەن و قەڵافە تەواو بوو، تا یەکێك قسەی لەگەڵدا نەکردبایە نەی دەزانی کەڕو لاڵە، بە گەدەو گیپاڵیدا دیار بوو تەمەڵ و تەوەزەل بوو، بەقەد ئەسپێك بەهێز بوو، خووی پێوە گرتبوو لەخوار شارەوە لەسەر تاشە بەردێکی قوچ لەقەراخ رێگەکەدا بەچوار مەشقە دادەنیشت،

لەهاتووچۆی خەڵك ورد دەبوومەوە، ئەوەی نەیناسیایە پێ ی وابوو پەیکەری بودایەو لەسەر ئەو گاشەبەردە دانراوە، کەس بۆی لێك نەدابوومەوە داخۆ بۆچی بەو جۆرە دانیشتنە لەسەر ئەو بەردە دادەنیشی؟!.

هەرکەس بەپێ ی هۆشی خۆی هۆکارەکەی دەبردەوە سەر ئەو شتەی کەخۆی پێ ی خۆش بوو، لەگەڵ ئەوەشدا زۆرینەی خەڵك وایان بۆ تاشیبوو کە دەعقانی ئەو شارە لەوێ دایناوە! پاسەوانی شارە تا بزانێ کێ دێتە ناو شارەوەو کێ لەشار دەردەچێ؟! گوایا تەنها دەعقانیش لەزمانی تێدەگات! لەبەر ئەوە خەڵك مەرابیان بۆ دەکردو سەر شاخیان نەدەگرت... لای ژنان بەجۆرێکی تر دەیانڕوانییە گەرامەکەی، وایان دەزانی ئەو شاهێنی ترازووی خێرو شەڕەو دەزانێ چی دەبێ و چی نابێ؟! لەرازو نیازەکانی ژنان ئاگادارە و دەشتوانێ ئاواتەکانیان بەجێ بگەیەنێ؟! لەبەر ئەوە دیارییان بۆ دەبردو نیازو نهێنی یەکانی خۆیان بۆ دەردەکاندو لێ ی دەپاڕانەوە! ئەویش سەری بۆ دەلەقاندن و چاوی خۆی ئەبڵەق دەکردوو رووی دەکردە ئاسمان...!

گرامە لەمە چاوی بەهاتنی پیرشالیارو هۆزاو چوار سوارەکە کەوت، لەسەر بەردەکە هاتە خوارەوەو چوو لغاوی وڵاغەکەی پیرشالیاری گرت، بە پەرۆشەوە دەستی کرد گڵمەگڵم و ترەترو دەست راوەشاندن و ئاماژە دان بەدەست درێژ کردن بۆ ناو شار، وەك سەگێك خاوەنی لەسەفەر گەڕاوەی خۆی دیبێتەوە وا بە دەوریاندا دەسووڕایەوە....

هۆزا سەبارەت بە هێشاو واران دڵی داخورپاو لە دڵ خۆیدا دەیووت ئەم پەرۆش بوونی کەڕوڵاڵە بێ مەلامەت نییە!. مەوڵەتی لە پیر خواست و گەرامە گەڕی پێش خۆی خست و پێش ئەوان کەوت، گرامە کەڕ بە پەلەو پەرۆشەوە

پێشی هۆزا کەوت، ئەوانیش ڕەوتی خۆیان تێك نەداو بەرەو ماڵی دەهقان ڕوویان نا.

گرامە بە پەلە پرۆزە لە پێش هۆزاوە دەڕۆیشت؛ ئەوە ئەوەندەی تر دڵی هۆزای خستە ناو ختوورەوە... کە گەیشتنە ئەو مەیدانەی کە خەڵك لە دەور هێشا و واران و ڕەنگین خڕ بوو بوونەوەە، گرامە دڕنی بە خەڵکەکەداو هۆزای گەیاندە ناو جەنجاڵەکە، کە هۆزا دی هێشاو واران لەناو جەنجاڵەکەدا دەورە دراون و ڕەنگیان زەردو لێویان بە بارو چاویان پڕ لە حەژمەتەو دەستەو ساتن، زوو لە وڵاغەکەی دابەزی و، پەلاماری هێشای داو باوشی پیا کردو، هاوارێکی پڕ بە تاس و سۆزی کردو وتی:

– کاکە هێشا!؟!.

هێشاش دەستی لە مل کردو وتی:

– هۆزا؟!.

هەردووکیان لەناو ئەو ژوانە لە ناکاوو سەیرەدا خەریك بوو بەسەریەکدا بتوێنەوە...

هێشا وەك لە ژێر زەمینەوە لە پڕ کەوتبێتەوە سەر زەمین و هۆزای لە حەوت تەبەقەی ئاسمانەوە بۆ هاتبێتە خوارەوە، وا سەری سوڕماو هۆزای توونند بە خۆیەوە نووساندو، بەبێ ئەوەی لە رادەدەی خۆی بترازێ یان سەنگینی خۆی لەنگ بکات، وا لەگەڵ ئەو هەڵوێستەدا ڕەفتاری کرد، دەست لەملانی هێشاو هۆزان، هۆزان و واران لەو شوێنەدا فرمێسکی شادبوونەوەی لەناو سنگیاندا کرد بە لێزمەی بارانی بە هارێکی تینوو گوڵاڵە سوورەی لەیەك دلبڕانی ناو هەناویانی ئاو داشتە کردەوە، سەوزە گیای ئومێدیانی بوژاندەوەو بەنگای فرمێسکی شادیان نە ڕژاندە دیوی دەرەوەی ئەو ژوانە بەڵکە بەسەر نەرگسەجاری ناو سنگیاندا بەریان

دایەوە... ئەو ساتە بۆ ئەوان لەو ساتانە بوو کە زەردەشت دەربارەی دەڵی (گرینگترین کات، ساتی دابڕان و بەیەك شادبوونەوەیە).

ئەوانەی دەرەوەیان دابوو سەیریان دەکرد، لێیان تێ نەدەگەیشتن، رەنگە هەندێ لە دڵی خۆیاندا وایان زانیبێ گرامەکەر فریاد رەسی بۆ هێنان، ئەوەتە بەدەور هێشاو هۆزاو واران قونە قون دەکات و دەسوورێتەوە، رەنگینیش بە رەخشەکەی هۆزادا خەریك بوو بیری بۆ ئەوە بچێ کە فریا کەوتەیەك وارس بووەو دەیەوێ رزگاریان بکات... باوەڕیشی بەلای ئەوەدا دەچوو کە گوا گەرامەکەرە نزای لای ئەهرۆمەزدا. گیرایە! باشە چۆنی زانی ئەوانە بێ تاوانن، تا نزایان بۆ بکات!؟ ئەویش نەی دەزانیی لەبەرچی هێشاو واران وا خەڵك دەورەی داون!.

هێشا هەر ئەوەندەی بۆ درکاندو وتی:

– هۆزا! فریامان کەوە... لێرەدا بۆ کوشتن راگیراوین.

(رووی کردە رەنگین) ئەو کچە سەلارو خانمە نەبوایە ئێستا ئێمە نەمابووین...

– بۆ؟! کابرا چاك نەبووەوە؟.

هۆزا.. وای وت و روانییە رەنگین و واقی وڕما...روانینەکە دەیووت: پەنا بەخوا، ئەوە کێیە؟! لە نازەنین خان دەچێ، چاو هەمان چاو، بەژن و بالآ هەمان بە ژن و بالآ! تۆ بڵێ ی خۆی نەبێ و بۆ سۆراخی ئێمە نەهاتبێ؟!. ئەو لەو خەیاڵانەدا بوو، دوو لە سوارەکانی پیر گەیشتنە ئەوێ، ئەو خەڵکەی کە لە مەیدانەکەدا جەنجاڵەیان کرد بوو روویان بەلایاندا وەرچەرخاند، یەکێکیان زوو لە وولاغەکەی دابەزی و چووە بەردەم هۆزاو سەری رێزی بۆ دانەواند!.

هۆزا رووی کردە هێشاو واران و بە کابرای سوارەی ناساندن و وتی:

– ئەوە هێشایەو ئەوەش واران ....

کابرای سوارە سەری رێز لێ وەرگرتنی بۆ دانەواندن...

بۆ ئەوەی هێشاو واران بەو پیاوانە بناسن، هۆزا وتی:

- ئەمانە پاسەوانی پیری خۆمانن: زانای سیمیار، پیرشالیار... هێشا هەڵای لە مەسەلەکە بە تەواوەتی حاڵی نەبوو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا دڵی بە گوێچکەی هۆشیدا دەیچپاند کە هۆزا کارێکی وەهای بە ئاکام هێناوە کە رزگار بوونی ئەوانیی تیا مسۆگەرە... ئەوەندەی پێ نەچوو هەموو دەس و پەیوەندی دەهقان بە کۆمەڵ هاتن و رژانە ناو مەیدانەکەوە، خەڵکەکە نەی دەزانی بۆ کوشتنیان هاتن یان چی؟

دوای کەمێك پیرشالیار بە سواری و لەگەڵ سوارەکانی ترو دەهقان هاتن، هێشا کە چاوی پێیان کەوت بەرەو رووی پیرشالیار رووی ناو، پیریش لەسەر ئەسپەکەی دابەزی و لەگەڵ هێشادا بە گەرمی وەك دووبرای دوورە وڵات لە شوێنی غەریبیدا یەکتری ببیننەوە دەسیان لەملی یەکتری کرد، هەموو خەڵکەکە سەریان لەو دوو پیاوە سەنگینە سوڕماو دەیان روانییە یەکتری...

دەهقان رووی کردە پیرو هێشا، ویستی داوای لێ بوردن بکات و خەڵکەکە تێبگەیەنێ کە نەی زانیوە هێشا بە دوای پیردا ئاراگێڵەو رێ ی کەوتووەتە ئەو دەڤەرەی ئەوان، دەنا ئەو حوکمەی بەسەردا نەدەدا!.

پیر وتەکەی دەهقانی راگرت، دوای ئەوەی خەڵکەکە کەمێ لە مەسەلەکەیان لا روون بووەوە، رووی کردە خەڵکەکەو وتی:

- حەز دەکەم، هێشاو واران بە دادگا بدرێنەوە، ئەگەر حوکمەکەیان راست بووە ئیدی پێویست ناکات دەهقان داوای لێبووردن لە ئێمە بکات، حوکمی راست شەرمی لە کەس نییەو گوێ بە کەس نادات، ئەگەر ناحەقیش بووە، با خەڵك بزانێ راست نەبووە...

رەنگین هاتە پێشەوەو خۆی بە پیر ناساندو وتی:

– من کچی ئەو پیاوەم کە مردووەو باڵاگەردانی ئێوەیە، من برازای_ روانییە دەهقان – دەهقانم... ڕێم بدەن تا ڕاستی و ناڕاستی ئەو حوکمەی کە بەسەر ئەو دوو کەسەدا درابوو بۆتان ساغ بکەمەوە.

وتەکەی ئەوەندە بە متمانەو بەخۆ نازینەوە، وت یەکسەر پیر بیری کەوتە سەر نازەنین، وای دەزانی ئەوەو بۆ فریاکەوتنی هێشا هاتووە... پێ ی وت:

– فەرموو، تۆ لە هەموو کەس نزیکتری، وتەی تۆ سەر دەستەی هەموو گەواهی دانێکە... فەرمووو...

ڕەنگین چووە ناوەڕاستی خەڵکەکەو وتی:

– خەڵکینە هەمووتان دەزانن من کێم! من کچی بچوکی ئەو باوکەم کە برای دەهقانە، ئەوەتەی هەم نەگزاف ئەم و ئەو نە بەفیتی خەڵك هۆشی خۆم تەفرە نەداوە... تاکە کەس کە خزمەتی ئەو باوکەی منی کردبێ هەر منم... دڵنیاتاز دەکەم، باوکی من بە شکاندنی کلۆکی نەمرد... چەند جار ڕووی کردە هێشا گوێ لێ بووە بەو پیاوەی وتووە: (کوڕم گەردنم ئازاد بکە، خەتا خەتای من بوو، دەنا ڕێبوارێکی پڕ بەزەیی وەکو تۆ کە ڕەحمت بە ڕێوییەکی بەسەزماند کرد، چیت لەوە داوە بە ناحەق بە گژ تاقمە کەسانێکی پڕ چەك و ڕاوچیاند بچی!). بە زمانی خۆی دەگێڕایەوەو دەیووت (ئەگەر - دەیروانی بۆ هێشا – ئەو پیاوە نەبوایە ڕەنگە هەرلەوێ دەمردم).

ئەوەی ئەو پیاوە لەو ماوەیەدا بۆ باوکی منی کردووە ئەگەر بەندەیەکی لە بازار کڕدراوی عەرەبستانیش بوایە، بافتی ئەوە بوو پاش مردنی یەکسەر ئازاد بکرێ...

زۆرجاریش دەیووت (کە بە تەواوی چاك بوومەوە، خەڵك گلێر دەکەمەوەو دەڵێم: بە گەردنم ئەو پیاوە _ ڕوانییەوە بۆ هێشا _ منی لە نەخۆشییەکی

کوشنده چاك کردەوه که خەتای تیا نەبوو..). وا من ئەو راستییەتان پیٚ دەڵیٚم...
باوکی من بەو برینه نەمرد که هەیبوو، هەموو دەزانن چاك بوو بووەوه، وەلیٚ قەیرانی خۆی هات و بە ئاکامی خۆی گەیاند، کیٚ هەیه بڵیٚ وا نییه با بیٚته پیٚشەوه...

کەیمنا هاته پیٚشەوەو وتی:

من دیٚمه پیٚشمەوه، رەنگین راست ناکات... بەڵیٚ (رەنگین راست ناکات)!.

– من راست ناکەم؟!. بۆ تۆ رۆژیٚك سەری ئەو باوکەت دا لیٚ ی بپرسی و بڵیٚ ی چۆنی، چلۆنی؟

کەیمنا وتی:

– من لەویٚ نەبووم، دایکم لەویٚ بووه! ئەگەر ئیٚستا لیٚره بوایه دەیزانی چۆن ئەو قسانه بەدەمتا دەداتەوه....

دایکەکه لەدوورەوه راوەستا بوو، که گویٚ له قسەکانی کەیمنای کوڕی بوو کەبەدەم ئەوەوه دەیەویٚ ناحەقی بڵیٚ، بۆ ئەوەی زۆرتری بەدەمەوه نەدا هاته پیٚشەوەو وتی:

– ئەوه لیٚرەم نەمردوووم تا بەدەم منەوه قسه بکریٚ..

چووه ناوەراستی خەڵکەکه، وەلیٚ کەیمنا لەروویدا راوەستاو ویستی مەرایی بۆ بکات بەڵکو پشتی بگریٚ و وتی:

– دایه دەزانی رەنگینی کچت پەردەی شەرمی دڕاندووەو دەیەویٚ لەکەدارمان بکات!؟. -

دایکەکه پاڵیٚکی به کەیمناوه نا وتی:

– بڕۆ بەو لاوە، کەم کەف لاکە لاوەی خۆت هەڵخڕێنە ... حەز ناکەم دەم و چاوت ببینم! نانێك بخۆو سەد بە ڕێ خوا بدە کە ڕەنگین خوشکتە... دەتەوێ بەو کەزییە سپییەوە درۆت بۆ بکەم!!.

چووە لای هێشاو مەچەکی گرت و هێنایە ناوەڕاستی خەڵکەکەوەو وتی:

خوزگەم بەو دایکەی ڕۆڵەی وەك تۆی بووە... ڕووی کردە خەڵکەکەو وتی:

– ڕەنگین چی وت هەمووی ڕاستە...

ڕووی کردە هێشاو وتی: (ئەم کوڕە هیچ گوناحێکی نییە، لەبەردەست ئێوەدا داوای لێبوردنی لێ دەکەین، بەرامبەر بەو خۆمان بەخەجاڵەت دەزانین).

کەیمنا بەتووند نەڕاندی:

– خەجاڵەتی چی! ئەوە باوکمی کوشتووە... ڕوانییە دایکی و وتی:

ئەوە چەند مانگێکە تووڕاوەو ئاگای لەهیچ نییە...

کە وای وت، ئامادەبووان دایانە بەر گاڵتەو قەشمەری... دەهقان هاتە پێشەوەو وتی:

– تۆ نەت وت، دایکم لێرە بوایە شتێکی تر دەبوو... بۆ دایکی ڕوانی – ئەوە دایکت... گوێت لێ بوو دایکت چی وت؟!. ئەی من مامی تۆ و برای (لالۆ) نیم؟ من بڕوام بە وتەکانی ڕەنگین و دایکی هەیە... ئەگەر حەقێکمان بەسەر هێشاو وارانەوە هەبێ لێیان دەبووڕێن، هەر حەقێکیشیان بەسەرمانەوە هەبێ ئەگەر گەردنمان ئازاد بکەن ئەوە لەنەزاکەتی خۆیانەوەیە...

کە وای وت، کەیمنا وەك ڕێوی کلکی لەبن خۆی ناو دەرپەڕی... خەڵکەکە بەسەرکەوتنی ڕەنگین و دایکی و بەسەر خۆدا شکاوەی کەیمناو وتەکەی دەهقان گەشانەوە، لەبەر ئامادە بووان و دەهقان نەبوایە سەد چەموڵەو تفیان بەسەر کەیمنادا دەباران...

پیرشالیار لە رەنگین و دایکی چووە پێشەوەو بەدایککەکەی وت:

– ئافەرین... بەراستی تۆ لەو دایکانەی کە ئەهروٚمەزدا خێرو بێری خۆی بەناو کۆشی ئەواندا دەباو بەسەر گشت گیان لەبەرانیدا دابەش دەکا...

رووی کردە رەنگین و وتی: (ناوت چییە)؟...

– رەنگین، کچی(لالۆ) برازای دەهقان...

– ئەو قسانەی کردت بەدڵ و یەقین بوون؟.

– بەڵێ... بەدڵ و بە یەقین... ئەگەر یەقینتان نایەت ئەوە دایکم... ئەگەر راستی یەقینم نەداتێ چۆن پێ بەحەقی خۆمدا دەنێم...

– نا... مەبەستم ئەوەیە ئەو خەڵکە لە قسەکانت دڵنیا بن باشە...

– قوربان من مەرایی بۆ کەس ناکەم... ئێوە رێبوارن و دەڕۆن، ئەو خەڵکە هەمووی کەسوکاری منن، دەزانن من لەراستی ناترسم، راسستیم بۆ باوکی خۆم وتووە، بۆ ئەوەی لەبارەگای خوادا ئارام بگرێ...

– ئافەرین... تۆ کچی ئەو دایکەیت... فریشتەی یەزدانی... من و تۆ و دایکت.. روانییە دەهقان – بە دەهقان رات دەسپێرم، تۆ گەلێ پایەداری چۆنی هەر ئاوابە، بەختێکی نگیندار چاوەروانتە... رووی کردەوە دەهقان ئێستا حەق هەیە داوای بەخشین لەهێشاو واران بکەیت...

هێشا زوور هاتە دەم و وتی:

– بە حزووری تۆ و بەشادبوونەوەت هەر حەقێکم بەسەر هەر کەسێکەوە هەبێ لێی بووراوم... وەلێ سێ برای پەناهەندە هەن حەز دەکەمم ئەوانیش بەر بدرێن...

هێشا کە وای وت، هۆزا، سەپان و لاپان و هامانی هاتنەوە یاد... بۆیە رووی کردە هێشاو وتی:

– ئەو سێ برایە نەبن کە من ناردوومن؟!.

– ئەوانن...

هۆزا رووی کردە دەهقان و وتی:

– گەورەم ئەو سێ برایە، من بەرەو ئێرەم ناردوون... روخسەتم بدەن، با ئەو بارەی ئەوانی تێکەوتوون بۆتانی باس بکەم.

دەهقان رووی کردە هەمووان با بفەرموون بڕۆینە دیوەخان ئەوجا چیتان دەوێ، لە ئێوە فەرمان و لەمن کار...

*   *   *

لەدیوەخانی دەهقاندا، هۆزا رووداوی سێ براکەی بۆ هەمووان گێڕایەوە... کە دەهقان زانی خەڵکەکە لەمەسەلەکەیان حاڵی بووە، بۆ ئەوەی ئەوە داپۆشێ کە ئەو پەیوەندی بە دەهقانەکەی ئەکباتانەوە نییەو نایناسێ وای پیشان دا کە بۆیە ئەوانەی لەبەندیخانەدا گرتووە، چونکە ئەوانە ویستویانە ئیشکگرەکانی بکوژن و چەکەکانیان بەرن و خۆیان یاغی بکەن و بەهەوەسی خۆیان رێگری بکەن... ئەو وای دەزانی پیرو ئەوانەی کە لە گەڵیدا بوون و ئەوانەی گوێیان لەو بڕو بەهانەیان بوو بڕوای پێ دەکەن، هەموویان دەیانزانی بۆیە بەندی کردبوون تا لەگەڵ دەهقانی ئەکباتانەدا پەیوەندییەکانی خۆی بەهێز بکات و بە ئارەزووی خۆیان دەست بخەنە ناو خوێنی خەڵکەوە... ئەمیش هەندێ بڵحی هەبوون لەبڵحەکانی دەهقانی ئەکباتانە کەمتر نەبوون، هەرچەند ئەم شەوی یەکەمی بووك و زاوای بۆ خۆی گل نەدەدایەوە وەلێ دایکانەو شیربایی و باجێکی زۆری لەسەر شووکردن و

ێ هێنان دانابوو، بەتایبەتی ئەگەر بووکەکە جوان بوایەو کوڕەی زاوا عاشیقی بوایە، دەبوو چەند ساڵێك کوڕەکە بۆ ماڵی دەهقان کارو کاسبی بکات، هەرکەسێکیش سەرپێچی لە فەرمانەکانی بکردایە، دەی خستە ناو حەوزێکی ساردەوەو بەشووڵەدار فەلاقەی دەکرد، ئەو بەد خوانەی ببوون بەدەستوورو یەگەکانی دەڤەرەکانی تریش بۆ چەوساندنەوەی خەڵك بەکاریان دەهێنان. نەبادا ئەو بەد رەفتارانەی بخرێنە بەردەستی کار بەدەستە دەسەلاتدارەکانی دەوڵەت و تووشی گیروگرفتی بکەن، فەرمانی دا هەرسێکیان بەربوون...

ئەو جۆرە حوکمرایەی ئەو و هی دەهقانەکەی ئەکباتانە لەگەڵی شوێنی ئاریا زەمیندا هەبوون، چارە نەدەکران، وەلێ ئەگەر یەکێك بەو بەهانەوە بکەوتایە بەردەستی دەوڵەت، پیاوە دەسەلاتدارەکان ئەو بارەیان بۆ خۆیان دەقۆزتەوەو باج و دەسکەوتێکی زۆریان لێ دەسەندو خۆیان پێی دەوڵەمەند دەکرد ئەویش کە دەستی بەردەبوو دەکەوتەوە ویزەی خەڵکەکەو هەمووی لەوان دەسەندەوە!.

پیرشالیار سەرو خواری وڵاتی ئاریان زەمین گەڕا بوو دەیزانی خەڵك لەژێر باری چ جۆرە ستەمێکدا دەناڵێنن، کار بەدەستانی دەوڵەت و دەهقان و مۆبیدەکان لەسەر ئەو جۆرە حوکمرانیە راهاتبوون، خەڵکەکەش شانیان بۆ شل کردبوو پێیان وابوو هەر وابووە هەرواش دەبێ!...

پیرشالیار چی پێ دەکرێ؟ بەئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی لەهەر شوێنێك تووشی ستەم بێ هەوڵ بدا هەڵی بگرێ، چارەسەرێکی راست و دروستی بۆ بدۆزێتەوە، ئەوەتا هۆزا ستەمی ئەو سێ برایەو دایکێکی کلۆڵی جگەر سووتاوی خستە بەردەم، خۆ هەر ئەوەندەی پێ دەکرا، تا ئەو چوار سوارەی کۆشکی شاهانەی لەتکدا بن هەر ناحەقیەك بهاتایە رێ چارەسەری بکات، بەو دەم و دەستەو لەو سەرە رێیەشدا هەموو شتێ ناکرێ، ئەوەش کە دەکرا شتێکی کاتی

بوو، لەمە پشتی وەردەچەرخان دیزە دەبووە بەدەرخۆنە... ئەو هەستی دەکرد لەهەموو شوێنی ستەم خۆی خەست کردووەتەوە، وەلێ کارەسات لەوەدا بوو خەڵکەکە ئالوودەی ببوون و هەستیان پێ نەدەکرد، ئەگەر لەبەر ترسی رێ نەبوایە ئەو پێویستی بەوە نەبوو چوار سوار لەگەڵ خۆیدا بێنێ...

سێ براکە بەقەد هۆزا بۆ دایکیان پەرۆش نەبوون، چونکە ئەو پەیمانی پێ دابوو لەگەرانەوەیدا بیخاتە تەك خۆی بۆ لای کورەکانی بیهێنێ، بەجێ نەگەیاندنی پەیمانەکە ویژدانی کرموڵ کردبوو، لەمە ئەو سێ برایەی دەدی دەکەوتە ژان، بۆیە بۆ پیرو دەهقان و ئامادەبووان پێشنیاری کرد، دووکەس یەکێکیان لەو برایانە بێ بخەنە تەکی و برۆن بیهێنن... دەهقان پێشنیارەکەی هۆزای بەو جۆرە بەدڵ نەبوو، وای بۆ دەچوو ناردنی یەکێك لەو سێ برایە، لەحاڵەتی گرتنیاندا، یان ئاشکرا بوونیادا، پیلانەکە بەسەر ئەودا دەشکێتەوە، لای دەسو پەیوەندی دەهقانی ئەوێ بەپیاو خراپ دەردەچێ، بۆیە وای لاپەسەند بوو، دوو کەسی نەناسراوی لای ئەو و هۆزا ئەوکارە ئەنجام بدەن... هۆزاو دوو کەسی تر رۆیشتن و پیر لەگەڵ ئەوانەی لەگەڵیدا بوون لەلای دەهقان مانەوە...

هێشا دەتووت لەسەر ساجی سوورەو کراو دانیشتووە، ئۆقرەی لێ برا بوو، سێ رۆژ چاوەروانی بۆ ئەوان خەیلێ گران بوو، ئەو دەیویست ساتێك بکەن بە دوو سات و هەنگاوێك بە دوو، ئەو وای دانابوو ئەگەر لەو چاڵەی کە تێ ی کەوتبوو رزگار بێ، رێ ی رۆیشتن وەبەر بگرێ و بەرەو دواوە نەروانێتەوە، کەچی شتەکە واهاتە پێشەوە رۆیشتن و نەرۆیشتن کەوتنە دەست پیر، ئەویش بەگوێ ی هۆزای کرد، ناردی بە شوێن دایکی ئەو سێ برایەدا، جا خوا دەزانێ کەی دەگەرێتەوە، لەماندوو بوونی خۆیدا جاروبار گوێ ی دەزرنگایەوە وای دەزانی دەنگی هەنار خانەو لەسەر لوتکەی شاخەکانەوە دەیچرێ کە دوا نەکەون و زوو

بگەرێتەوە، لەلایەکی تریشەوە دڵی بەو کچە ئازاو چەلەنگە دەسووتا کە هەموو داب و نەریت و خووە بەدەکانی خۆیانی خستبووە ژێر پێ ی راستییەوە بۆ ئەوەی ئەو لەچنگ ستەم رزگار بکات، خۆ ئەگەر ئەو نەبوایە، ئێستا لاشەکەی ئەو و واران کەس نەیدەزانی لەکوێدا فڕێ دراوەو چۆن بۆگەنی کردووە... ئەوەی رەنگین کردی کەس شتی وا ناکات، وانەیەکی راستبێژی بوو بۆ خەڵکی ئەو شارە بەڵام هەموو کەس نرخی وانە وەرناگرێت و دەست لەنادانی خۆی بەئاسانی بەرنادا، پەردەی تاریکی بیناریژی ناداتە بەر رووناکی... دەتووت لەگەڵ نازەنین دا لەیەك ئامێزدا گۆشکراون و لەیەك کۆچەڵەدا ئاویان خواردووەتەوە...

هێشا خەمی نگینی لێ نیشتبوو، لەدڵەوە دەیووت:

خۆی کردە قۆچی قوربانی بۆ من و واران، سبەی کە ئێمە پشتمان لەم شارۆچکە وەرچەخان و رۆیشتن، ئەویش لەپرسەی باوکی بووەوە خەڵکەکە چوونەوە سەر بەزمی خۆیان، چی بە رەنگین دەڵێن؟ ناڵێن لەبەرچی بەرنگاریت لەسەر ئەوانە کرد؟ داخۆ دەهقانی مامی لە دڵەوە چی بۆ حەشار دابێ؟.. بەسەزمان رەنگین بەو راستبێژییەی خۆی کردە نیشانەی ئاگاوتنی تیرو تانووتی خزمەکانی!... ئەوە بوو برا گەورەکەی رەشە دووکەڵی قینی ناو هەناوی بەسەریدا پەرت دەکرد... کە زانی تا سێ چوار رۆژ لەوێ دەمێنێتەوە، هەوڵی دەدا پیلانێك بۆ هێشا بدۆزێتەوە بۆ ئەوەی لەبەرچاو نگین و خەڵك رەشی بکا، چونکە ئەو وای بەمێشکدا چەقیبوو ئەو نەزاکەتەی هێشا بۆ باوکی دەینواند و ئەو بەرگریەی رەنگین بۆ ئەوی کرد بێ مەلامەت نەبووە! هەڵبەتە لەگەڵ رەنگیندا دەستیان تێکەڵاو کردووە!...

ئەو گومان بردنەیشی لای مامی درکاند بوو، ئەویش لە ژێرەوە پێ ی خۆش بوو داوێکیان بۆ بنێتەوە هیچ نەبێ لای ئەو چوار سوارەی کۆشکی شاهانە

لەکەداریان بکات، بۆ ئەوەی کە گەڕانەوە لەبەرچاو شادا کەم ببنەوە، دەهقانیش لە خوو سروشتیدا لەبراکەی و کەیمنا شتێکی وای زیاد نەبوو، (چی لەمشکە هەمان دەدڕێ) کەچی لەرەوالەتدا بەزمان بن کەوشەکانی پیری دەلێسایەوە!.

ئەو رۆژە کە هێشا چوو بۆ لای نگین و دایکی بۆ ئەوەی سوپاسیان بکات و پێزانینی خۆی سەبارەت بەو چاکەیە بۆ ئەویان کرد دربخات و ئەمەکداری خۆی دەبڕێ و بۆ دواجاریش چاوی بە رەنگین بکەوێ و دڵنیای بکاتەوە کەلەیادی ناکات... هەر ئەو رۆژە کەیمنا وەسیەتەکەی باوکی هێنا بووەوە یادی نگین و هەندێ کلکە لەقێشی بۆ کردبوو، وای بۆ نواند بوو کە بەخوێدا هاتووەتەوەو پاش مردنی باوکی گۆڕدراوە و بووە بەپیاوێکی تر، وا پێشنیاری بۆ کردبوو، ئەو پارەو گەوهەرانەی کە باوکی لەناو کوپەڵەیەکی نەخشدارا کوێ کردبوونەوە لەجیاتی ئەو چاکەیەی کە سەبارەت بەباوکیان کردبووی بیدەن بەهێشا، هەم وسیەتەکەی باوکیان بەجێ بگەیەنن، هەم بیکات بە یادگارێك هەمە دەم ئەوان و باوکی ئەوانی لەبیر نەچێتەوە!...

وەلێ رەنگین زوو پەی پێ برد کە ئەو لەپڕ گۆڕاندنەی کەیمنا شتێکی لەپەنادا هەیەو بێ مەلامەت نییە، خۆی بۆ داگرت تا بزانێ بەرەو چی سەر دەکێشێ... ئەو لەو باوەڕەدا بوو هەر پەیوەندییەکی ناکاو گەر لەپارەوە دەست پێ بکات بەرگەی یەك چەپۆکی رۆژگار ناگرێت...

هێشا بۆ دواجار کە بۆ خوا حافیزی چووە ماڵ نگین، کەیمنا لەوێ بوو پێشوازییەکی گەرمی لێ کردو خەریك بوو وەك مومێك لەبەرپێیدا بتوێتەوەو داوای لێ بوردنی لێ کرد...

کوپەڵە پارەو گەوهەرەکانی هێناو لەبەر دەستیدا داینان و وتی:

– ئەمە باوکم وەسیەتی پێ کردووە: نیوەی هی ڕەنگینەو ئەویتری هی هەموو خێزانەکەیە، ئێمە هەموو بەیەك دەنگ و بەدڵ بەتۆمان بەخشیوە، دەبێ لێمان قبوڵ بکەیت و بشمان بەخشی، گەردنی باوکمان ئازاد بکەی!!.

ڕەنگین کە ئەو درۆیەی لە کەیمنای برایەوە بیست زانی دەیەوێ هێشا بە تەڵەوە بکات، لەگەڵ ئەوەشدا دەنگی نەکردو خۆی گرت تا بۆی دەرکەوێ هێشا بەرامبەر بەو بەخشینی خەزێنەیە هەڵوێستی چییەو؟ ئەوجا دەنگ بکات کەچی لەداخاندا خوێن لەناو دەمارەکانیدا دەکوڵان و لەبەد ڕەفتاری کەیمنای برای خەریك بوو لەپێستی خۆی بێتە دەرەوە... ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە دەیویست بزانی هێشا لەو تاقیکردنەوەدا دەکەوێ یان دەردەچێ زوو بەرپەرچی کەیمنای دەدایەوەو بەدرۆی دەخستەوە...

هێشا کە ئەوەی لە کەیمناوە دی و بیستی و ئەو کوپەڵەیشی خستە بەردەستی، تێرروانینێکی پڕ بەتێزو سەرسورمانی تێگرت و پێ ی وت:

– ئەوە لەبەردەمی مندا دامەنێ، بیبەوە شوێن خۆی ئەوجا وەرە تێم بگەیەنە: ئەوە چییەو؟ بۆ بەمنی دەبەخشی؟!.

کەیمنا لەنێوان بێ دەنگی ڕەنگین و ئەو جۆرە ڕوانینە تیر هاوێژەی هێشادا پەشۆکاو چوون کەری چەقیوی لێ هات، بێ ئەوەی نقە بکات کوپەڵەکەی بردەوە شوێن خۆی... ئەوجا هێشا ڕووی تێ کردەوەو وتی:

– وەرە بزانم بۆ ئەوە بەمن دەبەخشی؟!.

– گەورەم... وامان پێ خۆشە بەتۆی ببەخشین!.

– بۆ؟

– چاکەت لەسەرمانە...

- کەواتە بڕۆ بە کوچەو بازاردا بگەڕێ، کێ هەژارە، کێ هەتیوە، کێ لێ قەوماوە، کێ پەك کەوتەیە... پێیان بێژە با بێنە ئێرە..

- بۆ؟

- بە منت نەبەخشیوە؟ منیش دەیدەم بەوانەی کەپێویستییان پێ ی هەیە..

- گەورەم ئێمە بەتۆمان بەخشیوە...

- منیش بەوانی دەبەخشم!..

- وانابێ؟!.

- تۆ نایدەی بە من؟ منیش وا بەوانەی دەدەم... ئەگەر هەرواش ناکەی و دەتەوێ ئەو چاکەیە لەگەڵ مندا بکەی ئێوارە بیهێنە بۆ دیوەخانی مامت، لەوێ بەحزوری خەڵکی ناو دیوەخان پێمی ببەخشە، منیش، جاڕ دەدەم چی هەژارو لێ قەوما هەن بێن، بەسەریاندا دابەشی دەکەم، ئەوەش بەمەرجێك خۆت و هەموو ئەندامەکانی خێزانەکەی باوکت لەوێ ئامادە بن...

- گەورەم ئێمە بەتۆی دەبەخشین، حەقمان چییە بەسەر لێ قەوماوانەوە!.

- تۆ بەمنی نادەی؟

- بەڵێ...

- منیش بەو جۆرە بەوانی دەبەخشم باشە؟!.

- گەوررەم... حەز ناکەم دوای باوکم، ئێمە لەسەر ئەو خەزێنە ببێ بەدڵ شکاندمان!...

- وا؟!. کەواتە ئێوارە بیهێنە، دیوەخان، با پیرشالیار بە حزووری پیاو ماقوڵان و خانەوادەکەت، بەسەرتاندا وەك یەك دابەشی بکات... باشە؟! ئەگەر هەر واش ناکەیت، ئێستا من دەچمەوە دیوەخان و بەمامت دەڵێم با دووکەس بنێرێ بیهێننە

دیوەخان، ئەوەی کە سەری گەورەتانە بەوی دەسپێرم ئەوجا ئەو چۆن رجوا دەبینیٚ وای لیٚ بکات!..

کەیمنا دەمی هات بەیەکداو زانی فێڵەکەی سەری نەگرت و دانە دەست مامی هاتە ناوەوە، ترسا و وتی:

– نا!... وا ناکەم... من دەمویست شتەکە تەنها لەنێوان خۆم و خۆت و نگین دابیٚ!..

هێشا بەئاسایی و لەسەرخۆ وتی:

– باشە ئێستا کە چوومەوە دیوەخان، بەدەهقان دەڵێم، کەیمنا کەسێکی دەهەندەیە، ئەوەی بەمنی بەخشی، منیش بەتۆم بەخشیوەتەوە!...

کەیمنا ترسا کە هێشا وا بەمامی بڵیٚ و سبەی رۆژ دەست بەسەر ئەو سامانەیاندا بگریٚ و ئەوانی لیٚ بێبەش بکات، بەپاڕانەوە وتی:

– بەقوربانتم وا مەڵیٚ.. وەری دەگری وەری گرە، دەنا نە لەتۆ قسەو نە لەئێمە بەخشین!..

هێشا سەرێکی لەقان و بەتەوسەوە وتی:

– وا؟! ئیٚ! ئیٚ! زانیمان پیاوێکی بەخشندەی..

رەنگین هاتە پێشەوەو رووی کردە کەیمناو وتی:

– ئەوە بە ئەنقەست خۆم بیٚ دەنگ کرد وتم بزانم ئەوسەری مەسەلەکە دەگاتە کویٚ!.. ها، بەخۆتا وەرەوە هەموو کەس وەك تۆ نییە!...

کەیمنا بەگرژییەوە بەنگینی وت:

– یانی چی؟!.

– یانی ئەوەی کەوتم...

– ئەی برا گەورەی تۆ نیم؟...

– برا گەورەمی لەتەمەندا، نەك لەتەڵەكەبازی وادا..

كەیمنا بە رکەوە..

– ئاوا؟!..

نگین بەهەمان شێواز

– بەڵێ ئاوا

– ئاە! زانیمان!..

– لە چەوتی بەو لاوە چیتر نازانی.. لەوە زیاتر قسەم پێ مەدركێنە (روانییە هێشا) ئەو پیاوە چاكەی بە سەرمانەوە هەیە... (لەوە زیاتر خۆت رامەوەشێنە!)

كەیمنا بۆی دەركەوت لەوە زیاتر درێژەی بداتێ زەرەر دەكات بۆیە وتی:

– كەواتە من دەڕۆم.. ئەو ئاوانەو من بێگانە:...

ویستی بڕوات، هێشا رای گرت و وتی:

– نا... من دەروم.. گەردنمان ئازاد بكەن... (هەڵساو رۆیشت).

نگین كەیمنایی برای چاك دەناسی، دەیزانی شتێك پەرییە كەللەی هەر ئەوەیەو بەكەس رام نابێ و قسەی كەسیش بەگوێیدا ناچێ، لەگەڵ ئەوەشدا. خۆی پێ رانەگیراو دوای رۆیشتنی هێشا لەروویدا راوەستاو پێ ی وت:

- لەخوا بترسە... لەكەیەوە ئەو دوو پیاوەتان بەناحەق بەند كردوون، رێبوار بوون، خوای رێبواران لێتان رەوا نابینی، چاكەیان بۆتان هەبوو، ستەمتان لێ كردبوون، لەگەڵ ئەوەشدا دەتەوێ چ داوێكی بۆ بنێیتەوە؟... بەنیازی چی ئەو پارانەت دەدایە؟.

كەیمنا بەسەر نگین دا نەڕاندی:

- ئەوە كاری تۆ نییە!..

- با:... كاری منە...

- دەبێ تۆڵەی باوکمی لێ بکەمەوە!..

– تۆڵە؟! تۆڵەی چی؟! ئەگەر نیازێکی ترت نییە، بۆ لەبەر دەمتا دانیشتبوو، پێت نەوت تۆڵەم لەسەرتە؟ ئەگەر راست دەکەی ئەوەتا لەدیوەخانی مامتە، برۆ لەوێ داوای تۆڵەی لێ بکە؟... تۆڵەی رەواو هی مرۆی پیاو رووبەرووە، ئەوەی تۆ دەتەوێ بیکەیت، کاری کەسانی بێ فەڕو ترسنۆکانە، ئەگەر تۆ ئەوەندە پیاوی ئەی بۆ رۆژێك ئاورێك لەباوکت نەدایەوە؟... دەزانی ئەو پیاوە چی بۆ باوکی تۆ دەکرد؟ دەزانی لەدوا هەناسەیدا چۆن دەسی گوشی و داوای لێبوردنی لێ کرد! برۆ دایکم بانگ بکە با دووبارە راستییەکانت بەروودا بداتەوە؟.

کەیمنا کە ناوی دایکی بیست هەندێ دامرکایەوەو وتی:

– چیت لەمن دەوێ؟.

– لادان لەبەد رەفتاری..

– من بەد رەفتارم؟...

وای وت و وەك ئێستری نەقیزە لێدراو لەماڵ دەرپەری..

*　　　*　　　*

ئەو سێ رۆژە کە پیرشالیار لەوێ مایەوە دەهقانەکە بە رەواڵەتی مەرایی ئەو و رووپامایی بۆ سوارەکانی کۆشکی شا دەکرد، چەند خزمەتی کردن ئەوەندە لەدڵەوە کینەو قینی لێیان دەبووەوە، حەزی نەدەکرد لەناوچەی هەوراماندا پیاوێکی وەها بەنموودی تیا هەڵکەوێت، خووی وا پێوە گرتبوو چەند بەزارو

ڕەواڵەت مەرایی خەڵکی دەکرد لەپشت ملەیش پتر لەوە قسەی بۆ هەڵ دەبەست و پاشقولەی دەدان... لەگەڵ کەیمنای برازیدا پیلانێکیان بۆ نایەوە، پیلانەکە لەدوو سەرەوە بوو، لەم سەرەوە کوپەڵە زێرو گەوهەرەکانی باوکی کەیمنا بەدیاری بدەن بە هێشاو بیبات، لەو سەریشەوە چەند کەسانێك وەك جەردە دانێن، دوور لە دەڤەرەکەی ئەوان، لەرێیاندا دانیشن، بەر لەوەی بگەنە ئەو شوێنە ئەمان لێرە بڵاو بکەنەوە کە هێشا کووپەڵە زێرەکانی دزیوە، ئەوجا دوو سوارچاك بۆ هێنانەوەی زێرەکانی بە شوێنیان کەون لەگەڵ ئەوانەی رێدا یەك بگرنەوە، هەم رووتیان بکەنەوە، هەم بە دزیان دەربکەن، هەم ئەو رووتەوە کردنەیان بخەنە ئەستۆی بەگی ئەو دەڤەرە کە تیایدا رووت دەبنەوە، کەواتە بەیەك تیر سێ نیشانە دەشکێنن!.

لەم سەرەوە پیلانەکە سەری نەگرت و کەیمنا دەهقانی مامی تێ گەیاند کە هێشا کوپەڵە زێرەکانی وەرنەگرت، کەواتە مایەوە ئەوسەری پیلانەکە...

ڕەنگین چاك لەمامی و کەیمنای برای حاڵی بوو نیازیان چییە، چاك دەیزانی مامیشی وەك کەیمنا بەد رەفتارە، خووی پێوە گرتبوو بەرەواڵەت خزمەتی مێوانی خۆی دەکردو لە ژێریشەوە داوی بۆ دەنایەوە بۆیە ڕەنگین زوو پەی بەوە برد کە بەخشینی پارەکانی باوکی بە هێشا لەو جۆرە رەفتارە بەدانە بەدوو نەبوو، بۆ ئەوەش لەبناغەوە پیلانەکە سەر نەگرێ خۆی ئامادە کرد بوو ئەگەر هێشا ئەو پارانەی وەك دیاری قبوڵ کرد ئەو هەڵی وەشێنێتەوە، ئەوە بوو سەری نەگرت و هێشا لەو جۆرە کەسانە نەبوو پارە پشتی لەزەوی بدات، جگە لەوەش هەرپاش چوونە دەرەوەی کەیمنا، ناردی بەشوێن چەند ئافرەتێکی دنیا دیدەو چەند کەسانێکی دەمراستدا، بە ئامادە بوونی دایکی، کوپەڵە زێرەکانی پیشان دان و تێ ی گەیاندن کە کەیمنای برای ویستویەتی بە هێشایان ببەخشێ و ئەویش وەری نەگرتوون، کەیمنا لێی دەوەشایەوە تۆمەتێکیش بۆ ڕەنگین بتاشێ، شەو

پارەکانی بشارێتەوەو بڵێ هێشا دزیوونی یان شتێ بکات، وا نەبوایە بە گوێ ی ئەو ئافرەتانەی دەکرد کە وایان لاپەسند بوو ئەو کوپەڵە زێرانەی لای یەکێکی ئەمین بشارێتەوە، یان بیداتە دەست مامە ژنەکەی کە گوایا ژنێکی دەسپاك و خانەدانە، بەگوێی ئەوانەی نەکردو دیار بوو تەگبیرێکی تری لەدڵ خۆیدا دانابوو... بۆیە ئەو کەسانەی ئاگادار کردنەوەو پارەکانی پیشان دان، تا سبەی ڕۆژ شاهید بن هێشا ئەو جۆرە پیاوانە نەبووە، چاوی لە دیاری و پارە و پوولی خەڵك بێ...

هێشا کە گەڕایەوە لای پیر، هەستی بە شتێکی نا ئاسایی کرد، واران و دەهقان و هەموو دەسوپەیوەندی مات مەلوول بوون و سەریان دانەواندبوو، کە هۆزای لەناویاندا دی یەکسەر زانی ئەو مات و داماویە لە ئەنجامی هاتنەوەی هۆزاوە پەیدا بوون.. پیر باسی مردنی دەکردو سێ براکە سەپان و لاپان و هامان بە خوڕ دڵۆپی فرمێسك لەچاویان دەهاتە خوارەوە، دوو پیاوەکەش کە دەهقان لەگەڵ هۆزادا بە شوێن دایکی ئەو سێ برایەدا نارد بوونی لەوێ بوون، ئەوانیش گوێیان بۆ وتەکانی پیر ڕاگرتبوو وەك ئامادەبوان سەریان دانەواند بوو... کە هاتبوونەوە، بەپیرو سێ براکەیان ڕاگەیاند بوو: لەمە دەگەنە کەنار ئەو گوندەی کە دایکی ئەو سێ کوڕە (ڕەخشانی) لێ ی دەبێ، خەڵکانێك دەبینن کە خەریکی ئەسپەردەکردنی کەسێك، هەر لەوێ دڵیان دادەخورپێ... لە دواییدا بۆیان دەردەکەوێت کە ئەو مردووە ژنێك بووە ناوی ڕەخشانەو لەژێر باری خەم و کەسەردا تواوەتەوەو مردووە، بە پرسین لە گەرەکەکاندا بەیەقین دەزانن کە ژنە مردووەکە دایکی ئەو سێ کوڕە بووە کە ئەوان بەشوێنیدا هاتوون... خۆیان لە ژنێك کە نزیکترین دەرهاوسێیان دەبێ نزیك دەخەنەوەو ناونیشانی کوڕەکانی پێ دەڵێن و تێ ی دەگەیەنن کە ئەوان لەلایەن کوڕەکانیەوە هاتوون، ئەویش بەپێ ی

راسپاردەی دایکیان: ئەو سێ جووت گۆرەو پووزەوانەی کە بۆ هەرسێ کوڕەکەی، بەدەستی خۆی چنیبوونی لەگەڵ ئەو (حەمایەڵەی) کە رەخشان لە دایکییەوەو ئەویش لە پێشینانەوە بۆی بەجێ مابوو- کە هەر ژنێك منداڵ بوونی بگیرایایە لەمە دەیان بردە سەری بەئاسانی رزگاری دەبوو- بەواندا بۆ ئەو سێ برایانەی ناردبوو، سێ براکە لەمە حەمایەڵەکەو گۆرەو پووزەوانە دەست چنەکانی دایکیان دەبینن، گومانیان لا نامێنێ کە دایکیان ئەمری خوای کردووە...

پیرشالیار کە حەمەیەڵەکەی کردەوە، ئەو قەباڵە لوولدراوەی ناوی دی کە خوێندیەوە یەکسەر بۆی دەرکەوت: ئەو چەند (واندیدادە)ی کە لە ئاوێستا دابڕابوون‌و تا ئەوکاتەش نەدۆزرابوونەوە لەناو ئەو قەبارەدا تۆمار کراون، بۆیە هەڵی گرتن و پاراستنی...

پیر لەمە دی هێشا گەڕایەوە ناویان و لەمەسەلەکە حاڵی بوو، فەرمانی دا هەر ئەوکاتە رانەوەستن و بەڕێ بکەون، سێ براکەش بەئارەزووی خۆیان و لەسەر داوای پیرشالیار لەگەڵیاندا چوون...

مانەوەی پیرشالیار لەو شارەدا هەرچەند لەچەند رۆژێکی تێنەپەڕاند، گەلێ کاری گەر بوو لەسەر رەوت رەوشتی خەڵکەکەی، ئەوەی یەك سات لە حزووری ئەو زاتەدا بوایە بەبێ هەست بەخۆی بکات لەدڵ و دەروونیدا روناکییەکی تیا پەخش دەبوو دەچووە سەر رەویەو رەوشتی ئەو خەڵکەکە لە نەزاکەت و پیاو چاکی ئەوەوە نامەردایيەتی کار بەدەستانی خۆیان بۆ دەردەکەوت، هەر لەبەر ئەوەش بوو دەهقان لەدڵەوە حەزی لێ نەدەکرد... خەڵکەکە لەمە بیستیان پیرو دەستو پەیوەندەکەی دەیانەوێ بڕۆن لێیان کۆ بوونەوە، بە گەورەو بچووك و ژن و پیاوەوە تا دەرەوەی شار لەگەڵیدا چوون، بەر لە هەموویان رەنگین بوو، سواری ماینەکەی بوو و کەوتە شوێنیان...

ئەوان جگە لە پیرشالیارو هێشاو هۆزاو واران و چوارسوارەکەی دەرباری شا، سێ کورەکەی رەخشانیش کەوتنە تەکیان، بە هەموویانەوە ژمارەیان یانزە کەس بوون، خەڵکەکەیان لەدەرەوەی شاردا گەڕاندەوە، پیر گەلێ سوپاس و ستایشی کردن، داوای لە یەزدانی مەزن بۆ کردن کە وەك برا تەباو چاکەخوازبن، وەلێ دەهقان و هەندێ دەستو پەیوەندی و رەنگین نزیکەی فرسەخێك لە تەکیاندا چوون، کانی و سەیرانگایەك لەرێیاندا بوو، لەوێ راوەستان و راموسانیان لەگەڵدا کردن، لەکاتی خوا حافیزیدا رەنگین دەسماڵێکی هەورێشمینی لەبەرکەمەری دەرهێناو دایە دەست پیرو بەچاوێکی پڕ بەسۆزو ماناداری بەهێشاو واراندا خشان، زەردەخەنەیەکی مەلوولی لەیەك جیا بوونەوەی بەهێشا بەخشی و بەئاستەم لغاوی ماینەکەی بەرەو دوا بۆ گەڕانەوە بادایەوە...

گەڕامەکەر وەك لەزووەوە ژوانی بەخزمەت گەیشتنی پیرشالیاری بڕیار دابێ وا شەیدایی پیر ببوو، ئەو چەند رۆژە کە لەوێ بوو یەك سات لەحزووری جیا نەدەبووەوە، وازی لە دانیشتنەکەی خوار شار هێنا بوو، هەر لەبەر دەمیدا هەڵ دەتووتاو سەیری نیو نیگای نوورانی ئەوی دەکرد و لێوی دەجووڵاندو وردە زەردە خەنەی ئاستەم لەسیلەی لێوەکانی دەبزواند، وەك دەروێشێك کەمەندکێش کرابێ ئاوها کەوتبووە پێش ئەوانەی کە پیریان رەوانە دەکرد، خەڵکەکە هەموو گەڕانەوە، کەچی ئەو تازە لەسەر رۆیشتن گەرم ببوو، تەکی بەرێگەکە وا هەڵ چنیبو، دەیویست پێش سێبەرەکەی خۆی بکەوێ، چی لەدەهقان و دەستو پەیوەندەکەی بوو، گەرامە بۆ هەر شوێنی بڕوا کە ماندوو بوو، چۆن رۆیشتووە وا دەگەڕێتەوە، کەچی تا ئێوارەی ئەو رۆژە چاوەروانیان کرد هەر نەگەڕایەوە، ئەو نەگەڕانەکەی ئەویان بەنوقڵانە بەخێر نەدەزانی، چونکە زۆربەی خەڵك وا چوو بووە مێشکیانەوە: ئەو نازو خێرو بێرەی کە هەیان بوو لەبەرەکەتی یەکێکی وەك

گەڕامەکەڕەوەیە، ژنانیشیان متمانەیەکی زۆریان پێ ی هەبوو، وایان دەزانی گەرامە رازو نیازی داماوان دێنێتە دی، بەتایبەتی لەو کاتەوە کەپێشی هۆزا کەوتبوو زوو فریای هێشای خست، ئەوەندەی تر لایان بزرگ بوو.. خەمەکەی دەهقان لەوەدا بوو گەڕامەکەڕ نەخشەکەی لێ پووچەڵ بکاتەوەو ئەو کاتە حەیایی بچی!...

ماوەیەك چوون، پیر سەیرێکی دەسماڵەکەی رەنگینی کرد، کە کردیەوە بۆنی میسك و عەبیری لێ دەهات، بە خەنە هێلکاری تیا کرابوو! هێڵەکە وەك داری دوو لق وەها بوو لەناوەراستی دا دوو رێیان بوو، یەکێکیان بەرەو دەستی راست دەکشاو ئەویتریان بەرەو دەستی چەپ و بۆ لای خوارەوە دەشکایەوە، لەسەر لقەکەی لای راست نیشانەی بڤەی لەسەر دانرابوو، پیر کە تەماشای کرد یەکسەر لەمەبەستی هێلکارییەکە تێگەیشت، دەسماڵەکە نامەیەك بوو لەگەڵ ئەو سرۆشەی پیرشالیار خۆیدا کە دڵی خستبووە خورپەوە یەکیان دەگرتەوە... دەسماڵەکەی دایە هێشاو پێ ی وت:

- دیاری تایبەتە بۆ تۆ، بۆنەکەی بۆ تۆیە نەخشکارییەکەی بۆ هەموومانە.

هێشا کە وەری گرت، بۆنەکەی خەریك بوو کەیلی بکات، کە کردیەوە لەناو هێلکاریەکەدا، دەست و پەنجەو رەنگ و روخساری رەنگینی تیا بەدی کرد، بەزەیینی وێنا کردنی رەنگینی لەناو دەسماڵەکەدا خڕ کردەوە چەند پرسیارێکی خنکاوی لەبەردەم سۆزیدا راگرت: ئەوە چۆن بەو ئاسانییە ئەو کچە پر بەنەزکەتەتان بەجێ هێشت؟ خۆ ئەو نەبوایە بەو ئاسانییە رزگار نەدەبوون؟ تا ئەو شوێنە دوورە رەوانەی کردن بۆ شتێکتان پێ نەوت؟ کە دەگەڕێتەوە ئەوانە تووشی سەخڵەتی دەکەن، داخۆ چۆن چۆنی بەرگری لەخۆی بکات؟... هێشا بە

ئەسماڵەکەدا دەیڕوانی، دیار بوو ماوەیەك بوو بەدەسماڵەکەدا وڕ ببوو، ئاگای لەدەورو بەرەکەی نەمابوو، تا پیر بەئاگای هێناوەو رای چڵەکان و وتی:

– لێ ی تێگەیشتی؟.

هێشا وەك یەکێك بێدار بێ و لەپڕ بەئاگابێتەوە وەرامی پیری بەبێ هەدەر دایەوە:

– بەڵێ تێگەیشتم؟!.

– لەرۆخساری نا، لەنووسینەکەی؟ چیمان پێ دەڵێ؟

– قوربان ئەوەیان تێناگەم...

– تۆ دەرگای دڵت بگرەو هۆشت بکەرەوە ئەوجا تێ دەگەی.

هێشا پێ ی نەکرا لەناو نقوم بوونی ئەو ئەندێشەدا وەك پیر دەیویست زوو بێتەوە سەر خۆی و وەرامەکەی پیر بداتەوە، بۆیە دەمی هات بەیەکداو باش لەمەبەستەکەی پیر تێ نەگەیشتو وتی:

– قوربان بڕوام پێ دەکەی تێ ناگەم...

– لە پرسیارەکەم یان لەدەسماڵەکە؟.

– لەهەردووکیان!...

– دەزانم لەدیارییەکەت حاڵیت وەلێ لەنەخشەکانی نا... هێشا وردی نەخشکاریەکەی ناو دەسماڵەکە بووەو مات بوو...

پیر بە زەردەخەنەوە پێ ی وت:

– وتم نامەکە بۆ تۆیە... خوێندنەوەی بۆ هەموومانە... هەر ئێستا لەویش حاڵی دەبی؟!...

دوای هەندێ ڕۆیشتن پیر فەرمانی دا کە ڕاوەستن، ڕاوەستاندنەکە لەنزیک گوندێکەوە بوو، داوای لە هۆزاو واران کرد کە بەگورجی لەگەڵ یەکێک لەسوارەکاندا بڕۆن لەو گوندە پیاوێکی بەڵەدو ڕێناس بەکرێ بگرن و بێنەوە...

ماوەیەکی ئەوتۆی نەخایاند هاتنەوەو پیاوێکی بەدڵەدو کارامەیان هێنا، پیر داوای لێ کرد کە لەوێوە، بەرەو دەستە چەپی ڕێگاو دەڤەری گەرمیان و شارەزوور بەڵەدی ڕێگایان بکات، پیاوەکە بەپیری وت:

– قوربان دەبێ بەسەر هەندێ تەپوڵکەو زووڕگدا لەلای دەستەچەپەوە سەرکەوین، ئەوجا تووشی باریکە ڕێیەک دەبین کە کاروانچی لەوێوە دێن و دەڕۆن، ئەو باریکە ڕێیە دەتانگەیەنێتە ئەو ڕێیەی کە بەرەو گەرمیان دەڕوا ئەوجا دێ بەدێ و قۆناخ بە قۆناخ دەپرس و دەڕۆن... هەر لەو شوێنەدا پیاوەکە پێشیان کەوت و ڕێیان گۆڕی...

– گرامەکەر لەپێشەوە دەڕۆیشت و شارەزای ئەو ڕێیە بوو کە بەلای ڕاسستدا زووتر دەیگەیاندنە دەڤەری هەورامان، کە بەلای چەپدا وەرچەرخان، کە دی ئەوان ڕێگەیەکی تریان گرتە بەر بەغاردان و بەبێ تەریق بوونەوە، هاتەوە سەرخەتی کاروان و کەوتە پێشیانەوەو ملی لەکەندو کۆسپ و زووڕگەکان نا...

پیر بەغاردان و پێشکەوتنەکەی گرامە، زەردەخەیەکی کردو وتی:

– هەر مل دەنێ و حاڵی نەبوونی لەسەر نییە!.

لەدەربڕینی ئەو تێبینییەی پیر بەگرامەکەر هێشا خۆی وریا کردەوەو سەیرێکی تری نەخشکاری دەسماڵەکەی ڕەنگینی کردو ئەوجا حاڵی بوو کە نەخشکاریەکە چۆن دەخوێنرێتەوە، بەڵام لەوە حاڵی نەبوو، بۆ ئەو دەسماڵە وایان پێ دەڵێ؟ بۆ پیر ڕاستەوخۆ بەگوێ ی ئەو دەسماڵەی کرد؟.

هێشا دەسماڵەکەی نایەوە ناو گیرفانی و ڕووی کردە پیرو وتی:

- ئەوجا حاڵی بووم...

پیر گەشەیەکی بۆ کردو وتی:

- بەتەواوی نا... هێشا ماوتە حاڵی ببی...

هێشا زانی شتێك هەیەو ئەو جارێ پەی پێ نابات، کە گەیشتنە ئەو دیوی زوورگەکان، تووله ڕێگەیان دۆزییەوەو کابرای ڕێناس، کرێ ی ڕێناسییەکەی وەرگرت و گەرایەوە، هێشا ویستی گەرامەکەڕیش لەگەڵیدا بەرەو دوا بگەڕێتەوە تا بەگەڕانەوەکەی ئەودا ڕەنگین بزانێ کە بەئاسانی نزیك دەڤەری گەرمیان بوونەتەوە... وەلێ گەڕامەکەڕ خۆی دا بەزەویدا و بەهێما تێ ی گەیاندن: ئەگەر نەیبەن لەگەڵ خۆیاندا لەوێ خۆی دەکوژێ!.. ئەوانیش بەپەلە گەیشتنە سەر ڕێ ی ڕاستەو بەرەو گەرمیان و شارەزوور کشان و تێیان تەقان و خۆیان لەو داوەی کە دەهقان دوور لە دەڤەرەکەی خۆی بۆی نابوونەوە لادا...

* * *

# (١٢)

خەڵکی بێستون زەمین بە مردنی براکەی دەهقان شادمان بوون، ئەو کابرایە خەڵکی ئەو دەفتەرەی خستبووە ناو زەلالەت و ستەمەوە، بە ئارەزوی خۆی باج و سەرانەی لە خەڵك دەسەند کەسیش نەی دەتوانی لە ئاستیدا نقە بکات.

ئەو ماوە کە هێشا لە بارمەتەی چاکبوونەوەی ئەودا بوو،خەڵکەکە چەند لەبەر خۆیانەوە نزای دەسخۆشیان بۆ دەکرد ئەوەندەش نزایان دەکرد(لالۆ) نەمرێ بەڵام وا کلۆڵ و پەککەوتە ببێ دەست لەناو پیسی خۆی بخات بیخواتەوە، ئەو کورە گەنجانەش لەو ئەسارەتەیان رزگاربین..لەو ماوەیەدا کە پیرشالیار لەوێ بوو، لەبەر ئەوەی هەستیان بە ئاسوودەیی دەکرد، ئەگەر لە ترسی دەهقانەکەیان نەبوایە، دەکەوتنە بەر خاك و پایی وداوایان لێ دەکرد، کە لەوێ بمێنێتەوە کەچی وای ترساندبوون نەیان دەوێرا نە بەدزی نە بەئاشکرا بەپیر رابگەیەنن کە بە رووپامای ئەو کابرایە هەڵنەخەڵەتێ و وریابێ لەپشتەوە وەك ماری بێ ئیجازە پێوەی نەدات. ئەوان لەوە حاڵی نەبوون، پیر لە یەکەم ساتی دیتینیەوە بۆی دەرکەوتبوو رەفتاری دەرەوەی وەك ناوەوەی نییە، ئەو کابرایە لە باوکییەوە ئەو بەد کارەیەی بۆ مابووەوە لای وابوو ئەوەی بەگ و دەهقان و سەرداربێ هەموو مافێکی بە دستەو خەڵکی تر بۆ خزمەتی ئەوان دروستکراون.. تاوانی زۆر بوون، تاوان لای ئەو ئەوە بوو یەکێك لە فرمانەکانی لابدا، یان خۆی بەشت بزانێ، کەچی لەو داوەی کەلە دێدا بۆ پیری نابوەوە دڵی لێی کرمی ببوو. گەلێ دەترسا

ئەنجامەکەی کارەساتێك بێت بەسەر خۆیدا بشکێتەوە و دامو دەزگاکەی لە بنەوە هەڵ تەکێنێ.. دیاربوو سام و سەیبەتی پیر تارماییەکی سامناکی لە دەروونیدا بۆ دروستکردبوو.. تەنانەت کەیشتبووە رادەیەك سوپاس بۆ یەزدان بکات کە نەی هێشت بەگوێی ئەهریمەن بکات یەکسەر هێشاو واران بکوژێت پیر گەڵکاریگەری لەسەر بیر کردنەوەی ئەو دەهقانە هەبوو، دووری بۆ مەرۆ ئەگەر چەند رۆژێکی تر بمایەتەوە لەوانەبوو تۆبە بە سەر دەستیدا بکات و پێ لە هەموو گوناحەکانی خۆی بنێ و لە کەوڵەکەی خۆی بێتە دەرەوە.. هێشاو ئەوانی تر لەو دڵنیە کە پیر گرتیە بەر شارەزا نەبوون، کەسیشیان ئەو پرسیارەیان لێ نەکرد کە ئایا بۆ رێگەی گەرانەوەیان گۆری؟ چونکە ئەوان لەوە دڵنیا بوون ئەوەی پیر دەیکات خەیر لەوە دایە. چونکە لەگەڵ ئەودا بوون ئیدی مەترسی ئەوەیان لانەبوو رێیان لێ گوم ببێ یان تووشی کەسانی خراپ و رێگربێن وپەکی زوو گەرانەوەیان بدات.. بەئاستەم و خۆشی دەرۆیشتن رێگە بەپیریانەوە دەهات، هێشاو واران و هۆزا لەو سەفەرەیاندا بە ئامانجی خۆیان گەیشتن، ئەوەتا پیرشالیار لەگەڵیاندا بەرەو دەگای هەورامان دەگەرێتەوە، چی لەوە خۆشترە مرۆڤ کارێکی پێرابسپێدرێ و تیایدا سەرکەوێ، چـــی لـــــەوە خۆشـــــترە کەدەگەنەپێشـــــەوە ئەنـــــدامانی (مـــــەرێگاو) خواجەبەهمـــەن وپیرخوادادو ژێرلـــەی مـــەرێ و هـــەنارخان ونازەنین، پێشـــوازییان دەکەن و دڵشاد دەبن،دایەو باوك و کەس وکارەکانیـان شـانازیان پێوە دەکـەن.. ئەوەی مژدەی گەرانەوەیان بە هەنار خان و نازەنین بدا بگرە پاداشتێکی باش و ئافەرین بکرێ.. ئـەو سـێ برایـەش هـەر چـەند دەروونیـان بـە مردنـی دایکیـان و سەرنگومی خوشکیان و کوشتنی زاواکەیان بەسەر یەکدا رووخابوو، وەلێ کەوتنە تەکی ئەو پیاوە بزرگە ببوو بە پەنایەکی پر لە ئەمان، روناکییەکی خستبووە ناو دڵیانەوە، بۆیە بەگوڕ لەگەڵ ئەواندا رێگەیان دەبری، ئەوەی لـەوان قەوەمابووئـەو

هەموو ڕێگە پڕپێچ و پەنایە نەی دەتوانیبڕینی ئێش و ئازارەکانیان بڕین پێچ بکات ئیتر چەند لە خانزادەی خۆیان دوور دەکەوتنەوە فرە تر خەمبار دەبوون..ئەوەی هەندێ ڕوناکی پێ دەبەخشین پەنایپیرشالیارو کۆلکە ئومێدێکیمانی خوشکەکەیان بوو،دەڕۆیشتنو لەناو تەپوتۆزی غەمەکانیادا ورشەی دەموچاوی خوشکەکەیان جاروبار لەخەیاڵیاندا تروسکەی دەدا.چوار سوارەکەش دڵسۆزییان بۆ دەرباری شا دەنواند، ئەو هاتنەیان لەگەڵ پیرشالیردا بە خەلاتێکی شاهانەو شایستە بە خۆیان دەزانی و هەریەکەش لەناو قەفەزەی سنگیخۆیدا چەندان نهێنی و ئاواتی تایبەتی خۆی حەشاردابوون. گرامە کەریش یەك دیاو تێروانینی پیری بە هەموو مەبەستێکی خۆی دەزانی، خوا پێداوبوو، ئاواتەکانی لە ڕادەی خۆی و سنوری ئەو ڕۆژەی کە تیایدا دەژیا تێنەدەپەڕین.. خوا خۆی ئافەریدەی خۆی دەناسی کێ ئاڵێ، ئەو لەناو ئەو کاروانەدا لە هەمووان بەختیار تر ئان کلۆڵ تر نەبووبێ. وەك تەتەری شاهانە هەر لە پێشەوە دەڕۆیشت ، جاروبار ئاوری بەرەو دوا دەدایەوە بزانێ پێویستیان بەو نییە..

* * * *

دەبوو ئەوانە پەلە بکەن و زوو بگەنەوە دەگا وەڵێ هەندێ ڕووداو و چوترم دەهاتنە ڕێیان دوای دەخستنی، گەڵێ شتی وا دەهاتە پێشیان کە خەڵکیتر بە لایاندا گوزەریان دەکردو نەئاوریان لێ دەدانەوە نە سەرنجیانی ڕادەکێشا،کەچی پیربەئەرکی سەرشانی خۆی دەزانی کەبەدەم ئەوشتانەوە بچێو بە پێی توانا چارە سەریان بۆ بدۆزێتەوە یان یارمەتی خۆی تیا پیشان بدات ...

لە بناری هۆرێندا بەرەو رۆژهەڵاتی گەرمیان بەرێوە بوون، ئافرە تێك منالێکی شیرەخۆری توووند بەپشتی خۆیەوە بەستبوو ..هەموو دەم و چاویو بە جنجرۆك رنرابوو، بە پە لەو سنگ کوتان و گریان، بەپێخاوسی رێگەی دەکوتاو لاڵەو نزای دەکرد،خەریك بوو بەلای ئەواندا تێپەرێ ..پیر فەرمانی دا ئەو ئافرەتە راگرن ولێی بپرسن چی لێقەو ماوە کەوا دەکات ؟

ئافرە تە دەیقیژان و دەیوت :

– راست نەماوە.. ئەهرۆمەزداش وەك جاران نەماوە! پشتی لە لێقەوماوان کردووە و دەسبەرداریان بووە.. هێشا لێی چووە پێشەوەو پیێ وت :

– پووریێ راوەستە، بۆ وادەکەی ؟!.

ژنەکە کەزانی ئەوانە بەهانا یەوە دەچن شلگیر بوو، دەیووت :

– راناوەستم، تا نەگەمە دەرگای پاشا، بەم دەسانەی خۆم دەروازەگەی رانەوەشێنم ناگەرێمەوە!دەبێچی لەم هەناوە برژاوەم داهەیە هەمووی بۆهەڵرێژم.. ئەویش لێم نەپرسێتەوە تا بێخیدنیا دەرۆم ،هەرچوار قوڕنەی دەگەرێم تابزانم هورمزان لەکوێ خەوی لێکەوتووە رای دەچڵەکێنم،ئەویش دادم نەدا..دەستی لەپشتی مندالەکەی پشتی دەدا ..

– ئەم شیرەخۆرە بێتاوانە فرێدەدەمە بەردەمیو دەگەرێمەوە..ژنەکە وای دەوت و هاواری دەکردودەستی بۆئاسمان بەرزدەکردەوە :

– هۆ، ئەهرۆمەزدا !..ئەو چەترە شینەت بۆچی هەڵداوەو خۆت لێمان بزرکردووە ! ئەگەر نگاباتی خەڵکت پێناکرێ وازلەخوایی خۆت بێنە ..

هێشا چووە بەردەمیوپیێ وت:

– دایە..وەرە خۆت سەخلەت مەکە.ئەهرۆمەزدا چاوی لێتەو گوێی لەنزاکانتە،وائێمەی بۆهانات ناردووە ..وەرە بزانین چیت بەسەرهاتووە ..

– دەستی بۆ پیرشالیار درێژ کرد– سەیری ئەو پیرەو ئێمە بکە ئەوجا دەزانی.
ئەمرۆمەزداچۆن فریای لێقەوماوان دەکەوێ ..

ژنە کە تۆزێ دامرکایەوە سەیرێکی پیری کرد و لێیچووە پیشەوە دەستی پیری ماچ کرد، ویستی دەستی هەمویان ماچ بکات وەلێ هێشا نەی هێشتو لەشوێن خۆی رایگرت، هەموو دابەزین و لە سەرخۆ گوێیان لە سکالآی ئافرەتەکە گرت..

(کوڕەکانم.. گەورەکانم، لەو ساوە ئەو قوڵە رەشە هاتووە ناومان تا ئەمرۆ ئۆخەیان نەکردووە، ئاغا ژنمان لەبەر ئەو قوڵەرەشە رکی لێمان دەبێتەوە، بیەوێ هەر کەسێ تووشکات، بەو قوڵە رەشە کارێکی ناپەسندیان گەردەشێك دەگێڕێو دەیخاتەمل ئەوەی حەزی لێناکات..خەڵکەکە کۆدەکاتەوە بەبەهانەی دۆزینەوەی ئەوەی ئەوکارەی بەر پاکردووە بۆنی یەکە یەکەیان دەکات و کێ ی مەبەست بێ پێوەی بکات کە بۆنی کرد گوناحەکە دەخاتە سەرئەستۆیو بۆئاغاژنی (لالەخان) _خوا خەجالەتی دنیاو ئایندەی بکات وەك خەجالەتی کردووە_ دەست نیشان دەکات، بەوفێلە خەلکی بێتاوان تاوانبار دەکەن و دەیدەن بەدەم سیروانەوەو لەکۆڵی خۆیانی دەکەنەوە، گوناحەکانی خۆیان بەو ترسنانەوە پەردەپۆش دەکەن!.. حەفتەیەك لەمەو بەر قوڵە رەشە بە فیتی ئاغا ژنی چووبوو دوای ئەوەی باخی ماڵێکی بریبوو کێڵکەشی رماندبوو، سبەی کە دەرکەوت ئەو کارە رووی داوە، دوو کورەکەی منی بۆن کردنو تاوانەکەی خستە ئۆباڵێ ئەوان، ئیدی هەردووکی لە تەویڵەی وڵاغەکانی خۆیدا بەستنەوەو رۆژانە لێیان دەدات، چاوەروانی ئەوەیە روباری سیروان لافاو بکات و بیاندات بەدەم ئاوەوە، منیشی چاو بەست کردو لەگەڵ پشیلەیەکی دڕدا خستمیە ناو خەرارێکەوە و دەمی خەرارەی بەست و لە دەرەوە بە دار کەوتە ویزەی هەردووکمان. ژنەکە لەو کاتەدا

که ئەو قسانەی دەکرد هەردوو قۆڵ و لاڕان و دەم و چاوی خۆی پیشان دان و وتی:

– ئەها تەماشام کەن.. نازانم ئەو پشیلە چۆن هەردوو چاوی هەڵنەگۆڵیم!. ئەوە گرفتی منە.. ئەگەر وایە ئێوە لەلای ئەهرۆمەزداوە هاتوون تا فریام کەون ئەوە باشە، دەنا وازم لێ بێنن تا رەگی تەر لە بەدەنمدا ماوە دەڕۆم ولا ناکەمەوە و سکالای دڵی خۆم بە هەموو دنیا رادەگەیەنم، تا نەگەمە مەبەست ناگەڕێمەوە.. مەرجم کردووە ئەم منداڵە بێ گوناحەی خۆم فڕێ بدەمە بەردەمی ئەهرۆمەزدا ئەوجا بگەڕێمەوە.. هێشتا ووتی:

– قوڵە رەشە لای ئێوە چی دەکات؟!. ئافرەتەکە هەناسەیەکی دوکەڵاوی دەرداو وتی:-

– ئاغای دێمان - خوا لەوە زیاتری بەسەردا بێنێ - لە وەختی خۆیدا بۆ کاروان دەچێت کە دەگەڕێتەوە منداڵێکی رەشی‌لچنی قیڕاوی لەگەڵ خۆیدا دێنێ..ئەو کات خەڵکی ناو دێ دەسە دەسە بۆ سەیرکردنی دەچوونە دیوەخان کەس بڕوای نەدەکرد ئەوە مرۆڤ بێ،لە دوایدا دەرکەوت ئەوە منداڵکی رۆح سووکە و بێ دایك و باوکە.هەر لەوکاتەوە ئاغا کردی بە غولام و بەردەستی خاتوولالەی خێزانی، کە گەورەبوو، خۆی ناسییەوەوجێی ئاغای گرتەوەو ئەوی بە دەرکردن داو لەسەر ساو سەحەندی ئەو پاڵی دایەوە، چی دەکاو چی بڕیاردەدا کەس ناتوانێ‌دەست بخاتە بەردەستی،ئەوەی حەزی لێ نەکات، یان دەربارەی نقە بکات لە گەڵ ئاغا ژنیدا شتێکی بۆ دەتاشن و ئەوجائاوی سیروان بیگرەو هات!.

هێشا ژنەکەی دەدواندو پیرو ئەوانی تر گوێیان بۆ رادەگرت..

پێی وت:

– ئێستا دەتەوێ بەرەو پایتەخت بڕۆی؟!.

- بەڵێ..

- پایتەخت دوورە نایگەیتێ..

- نا بۆ دایکێکیجگەر برینداری وەك من هەزار ساڵ ڕێیش دوور بی دەیگاتێ..ڕەنگە ئێوە نەزانن دڵی دایکیجگەر سووتاو یانی چی؟!..

هێشتا وتی:

- ئەی ئەگەر پایتەخت هاتبێتە لات، هەر دەڕۆی؟..

ژنەکە لە وتەکەی هێشتا حاڵی نەبوو، بۆیە وتی..

- مەرجم کردووە..

ڕاستگۆیی ژنەکە وای لە پیرشالیار کرد ڕووی تێ بکاو پێی بڵێ:

- دایە.. ئێمە بە هانای تۆوە هاتووین، ئەمڕۆ مەزدا بەر لەوەی تۆ دەنگی بۆ بەرز بکەیتەوە و هاواری لێکەی ئەو ئاگای لە خورپەی دڵت هەبووە.. نابینی ئێمەی چۆن بە پیریای تۆوە ناردووە؟!. وتەکەی پیر ژنەکەی هێور کردەوە وەك نیگای لە بەهەشتەوە بۆ هاتبێ، هەناسەیەکی داو وتی:

- سوپاس بۆ خوا.. هەر زانیم بە هانامەوە دێ.

بە فەرمانی پیر، هێشتا وڵاغەکەی خۆی بۆئافرەتەکە ڕاگرت کەسواری ببێو لەگەلیاندا بەرەوگوندەکەیان بگەڕێتەوە ..

ئافرەتەکە کەوتە ناوجیهانێکیترەوە، نەیدەزانی خەونەیان خەیاڵە،ئەو وای دەزانی کەس نییە گوێ لەقرچەی هەناوی سووتاوی بگرێ، کەچی والەپڕ ئەمرووەمەزدا کۆمەڵە فریشتەیەکی بۆناردەخوارەوە،بۆئەوەی فریای بکەون، نەیدەویست سواربێ وەلێ هێشا موکری لەسەر سوار بوونی وڵاغەکەی خۆی کرد..ئافرەتە هەردەیوت:

– بەقوربانتانم لێم گەڕێن، ئەوەندەم بەسەکە بەهانامەوەدێن.. من چە حەددم هەس لەتەك ئێوەداسواربم، دەکەومەپێشتان نەك لەسەرپێ‌بەلکولەسەرسەر دەڕۆم و دەبمە خۆڵی‌بەرپێتان..

هێشا پێی وت:

– دایە، بۆ ئێمە شوورەییە سواربین و دایکێکی ماندووی منداڵ لە کۆڵ بە پیادە بڕوات.. ئەوەتا پیر داوات لێ‌دەکات سوار بی.. دەنا یەك هەنگاو بەو جۆرەی تۆ دەیڵێ‌ی ناتوانین بڕۆین..

هەرجۆر بوو رازیان کرد.. کە سوار بوو منداڵەکەیان لە کۆشیدادانا.. بەخێرایی بەرەو دێکەی ئەو کەوتنە رێ، لە رێدا گەڵێ‌شتیان لەبارەی خۆی و ناوچەکەیەوە لێ پرسی..

بۆیان دەرکەوت خاتوو لالە سەرداری دێکەیانە و چەند دێیەکی تریشی لەبەر دەستایە، ئەو قوڵە رەشەی لە جێ‌ی مێردەکەی خۆی داناوەو کردوویەتی بەکوتەکی دەستی‌و خەڵکی‌پێ دەچەوسێنێتەوە، مێردەکەی خۆی دەرپەراندووەو لە دێیەکی تری ئەو دەڤەرەدا ژنێکی تری هێناوەو، بۆ ئەو قوڵە رەشە وازی لە لالە هێناوە!..

دێکە، کۆنە ئاتە شگەیەکی کاولە ئاسای هەبوو، لەمە گەیشتنە ناو دێ، پیر داوای لە( واران) کرد لەگەڵ سێ‌براکەدا بەناو دێ داجار بدەن کە خەڵکە کەلەماڵ بێنە دەرەوەو لەلای ئاتەشگەی دێدا خر ببنەوە .. بەرلەوەش بگەنەناو دێ هۆزاو یەکێك لەسوارەکانی بەرەو ئەو گوندە ناردن کەزوو ئەو پیاوە کەناوی (پاتۆ)یەو کۆنەئاغای ئەو دێیە بووە بیهێنن.. خەڵکی دێکە کە بەجاردانەکەی واران لەماڵ هاتنە دەرەوە، کەدییان پوورە( شەرمین ) لەگەڵ چەند سوارەیەکدا سواری ولاغەو لەتەك چەندسوارێکی تری لەوجۆرە نەدیتراوەدا بەناودێ‌دا دەڕۆن و رویان لە

ئاتەشگەکەیە، سەریان سورماو لەو مەسەلە چ حاڵی نەبوون، هەموو بەدەم بانگەوازەکەوە بەرەو ئاتەشگەکە چوون. لە دەور پیر خربوونەوە هەر سەیریان دەکردو سەرسام دەمان و ئەوەی پتر سەرسامی کردبوون، پوورە شەرمین بوو لەگەڵ پیرو سوارەکاندا راوەستا بوو،! زمانی حاڵ پێی دەوتن:(دیارە پوورە شەرمین خوا خۆشی دەوێ وئاگای لێیەتی وارزوو بە هانایەوە هات، ئەگەر وانییە بۆ بەهانای کەسی ترەوە نەهاتووە؟!.. کۆکردنەوەی خەلکە کە لەئاتەشگەدا ئەوەی دەگەیاند کە لەخاتوو لالە توورەن و مەسەلەکە پەیوەندی بەدووکورەکەی شەرمینەوە هەیە، ئەگەر وانییە ئەی بۆ نەچوونە دیوەخان !؟. داخۆ چی روویداوە ؟، بەراستی پوورەشەرمین دایکە نەك دایك).

خەڵکەکە بەچاردانەکە ترسان، وەلێ کەخر بوونەوە چاویان بەو پیاوە دەمو چاو نوورانییە کەوت کە بەروێکی گەشەوە بۆیان دەروانێ دڵنیابوون هیچیان بۆ نابێ، ئەگەر شتێ ببێ بۆخاتوو لالەو قولەحەنەشە، خەلك لەپەناوە واناویان دەبرد،لالە لەو کاتەوە (پاتۆ) یدەرپەراندو لای لالەخان نانی کەوتە روون دەبوو خەلکەکە پێی بلێن: (لالە حەنەش) واتەحەنەشی خاتوو لالە ..هەردووکیان هێنان بەرامبەر بەخەلکەکە راگیران ..حەنەش قولێکی تابلێی رەش‌و شان‌و مل پان‌و تێکمسر یابوو،خاتوو لالەش ئافرەتێکی بەتەمەن داچووی تەروو تووندو پڕ لە هازی‌مێیانەبوو،قسەزان و کەڵە گەت،پیر بەرامبەر بەخەلکەکە رایگرتن، وەلێ رووی نەدانێ ، نەی هێشت قسە لەگەل کەسدا بکەن و کەسیش قسەیان لەگەڵدا بکات پیاوەکانی پیر بەدەور خەڵکە خڕکراوەکەدا دەسوورانەوە پیریش بەناویان دا لەسەر خۆو بەرویەکی گەشەوە بەناویان دا هاتووچۆی دەکرد، نزیکی خاتوو لالە بووەو وتی :

– تۆی خاتوو لالە ؟!..

- بەڵێ

- هەر ئێستا فەرمان دەدەی ئەو دووکوڕەی پوورە شەرمین دەهێننە ئێرە!..

لالە داوای لە دوو کەسی ناو خەڵکەکە کرد، کلۆمی دەرگای تەویلەکە کە دوو کوڕەکەی پورە شەرمین تیایدا بەند کرابوون، لەبەر پشتێنی خۆیدا دەرهێنا و داینێ و پێی وتن:

- هەرۆن بیان هێنن..

کە هەردوو کورەکەیان هێنا، پوورە شەرمین پەلاماری دان و تێر ماچی کردن..

دوو کوری تازە هەڵچووی توولە نەمام ئاسا بوون، دەم و چاویان و جل و بەرگیان ئەنجرئەنجر بوو لەریخ و سەنێری ولآغ وەردرا بوون، بە فەرمانی پیر بەرامبەر بە خاتوو لالە و قوڵەحەنەش و خەڵکەکە راگیران، پیر رووی تێکردن و وتی:

- ئێوە بران؟ کوری پوورە شەرمینن؟!.

یەکێکیان وەرامی دایەوە..

- بەڵێ براین.. کوری ئەوین..

ئەوەندەی پێ نەچوو(پاتۆ) یان لە دێکەی ترەوە هێنا و ئەویشیان بەرامبەر بە خاتوو لالە و حەنەش راوەستان، پاتۆ پیاوێکی بوودەڵەی پشت چەماوەو مینگن و چاو پڕ لە ریپۆق و قوپاو بوو، کە راوەستا ئەو سەرەی دای خست بەرزی نەکردەوە،نقەی لێوە نەهات، نەشی دەزانی مەسەلە چییە؟. وەڵێ هێنانیو راگرتنیو بەو جۆرە ئەوەیان دەگەیاند ئەو هێنانەی پەیوەندی بە رابردوویو پاشەرۆکی خۆیەوە هەیە، ئەوەی ئەوی سەرگەردان کردبوو، تا ئەو ساتە زەلامی وای بەو جۆرە نەدیتبوون بەو دەڤەرەدا گوزەر بکەن..

ئەوەندە شەرمە زار بوو حەزی دەکرد لەو شوێنەدا ببێ بەدڵۆپێ ئاوو بتوێتەوە..

کە هەموو ئامادە بوون، پیرشالیار رووی کرد هەمووان و وتی:

(خەڵکینە، ئێوە لم دێیەدا وەك گەڵآی یەك دار وەهانە، مردن و ژیانتان بەیەکەوە بەستراوە،خۆشییەك یان ناخۆشییەك کە روو دەکاتە ئەم دێیە بۆ هەمووتانە، لە ناو خۆتاندا دەبێ سەردارێکی داد پەروەرتان هەبێ، ئەو سەردارە بە یەك چاو تەماشاتان بکات،چوون دایكو باوك بە خۆشی و ناخۆشیتان دڵگیر ببێ، وەك ئەو بە ئێوە دەژی،ئێوەش لەسایەی ئەودا ئارام دەگرن، یەزدان سزای بۆتاوان بار داناوە،پاداشتی بەچاکەکار بەخشیوە ،تاوانی سەرداری خەڵك گەورەترە لەتاوانی خەلکی تر، چونکە کە ئەولاربوو هەموو دەکەون، راست رەو بێ هەموو بەختەوەر دەبن،گەورەو بچوکی لای یەزدان بەکردەوەی چاك وبیری چاك و رەفتاری چاکە)..

پیر لەو زیاتر قسەی نەکرد ..بەئاستەم چووە بەردەم پاتۆ بەنەوازشەوە بەم جۆرە لەگەڵیدا دوا:

– ناوت چییە ؟.

– ناوم پاتۆیە..

– دانیشتوی کوێی؟.

– قوربان جاران دانیشتوی ئەم دێیە بووم ...

– سەرداری ئەم دێیەبووی ؟.

– بەڵێ جاران ..

– ئەی ئێستا ؟.

– دێیەکی ترم هەیە، لەوێ ژنم هێناوەو دەژیم ..

– ئێرەت بۆبەجێهێشت ؟.

– بۆحەنەش ولالە

– ئاوا؟!..

– ؟.بەڵێ ئاوا

– دەتەوێ بگەرێتەوە ئێرە ؟.

– نا..

پیر سەری بۆمانای نەگەرانەوەکەی پاتۆ راوەشاند ..ئەوجا چووە بەردەم حەنەش ..

– خەلکی کام وڵاتی؟..

– قوربان نازانم !هەرئەوەندە دەزانم لەوڵاتی تازییانەوە هێنراوم..

– بۆگەیشتیتە ئێرە ؟!.

– قوربان لەمن مەپرسە، لەپاتۆ بپرسە..

– تەواوە !.

پیر چووەوە بەردەم پاتۆو پێی وت :

– ئەو پیاوە تۆهێناوتە ئێرە ؟..

– بەڵێ بەمنداڵی لەبازاری بەندە فرۆشاندا کڕیوومەو هێناومە، لێرە لای لالە گەورە بوو، تاوای لێ هاتووە ..

– ئاە ..تەواوە

پیر دیسان بەناو تەموورەی خەلکەکەدا گەراو بەرووێکی خۆش و کراوەوەبۆی دەروانیین، بەڵام تاگەیشتە لای دوو کوڕەکەی شەرمین کەسی نەدواند، لەبەردەمیاندا راوەستاو هەندێ پیایاندارواانیو ئەوجا وتی:

– ناوتان چییە ؟..

یەکێکیان هاتە دەم :

– من ناوم پەلاشە، ئەویش پووشۆ..

– کوڕی پوورە شەرمینن؟

پەلاش وەرامی دایەوە..

– بەڵێ:

– ئێوە لەئەمڕۆ بەدواوە دەبنە خزمەتکاری ئەم دێیە :

ئەوجا ڕووی کردە پوورە شەرمین

– پوورە شەرمین، تێ گەیشتی چیم وت ؟..

پوورە شەرمین لەخۆشی بەربوونی دوو کوڕەکەیدا ئاگای لە وتەکانی پیر نەمابوو، هەربەگۆترە وتی:

– بەڵێ تێگەیشتم ،،

دوو براکە ..پەلاش و پووش، لەمانای تەواوی وتەکەی پیرحاڵی نەبوون.. وەلێ خاتوو لالە بۆی دەرکەوت ئەو فت کرا.. بەڵام نەیزانی چی لێ دەکرێ!..

هەر ئەو کاتە پاتۆ ڕەوانەی دێکەی خۆی کرایەوە، بەڵام شتێکی وەها لەو هێنان و بردنەوەی خۆی حاڵی نەبوو..

پیرداوای لە هاوڕێکانی خۆی کرد(حەنەش) رابگرن و ئەوانی تر هەریەك بڕواتەوە ماڵی خۆی، داواشی لە خاتوو لالە کرد لەمەو دوا، تێکەڵاو بە کاروباری ئەو دێیە نەبێ.. خەڵکەکە بەو ڕووداوە کەوتنە ناو گێژاوی خەیاڵەوە، جگە لەوەی خاتوو لالە لە سەرداری لادرا شتێکی تریان لا حاڵی نەبوو،بەڵام بە گرتنی حەنەش دڵشاد بوون کە ئەو مێملە گەورەیان لە کۆڵ بووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە خاتوو لالە هەمووی چەوساندبوونەوە لە ناو ئەو گەرمەی خۆشییەدا بەزەییشیان پیا دەهاتەوە، چونکە بێکەس و ئۆجاخ کوێر بوو..

*  *  *

پیرو هاوڕێکانی شەو لە دێکەی شەرمین مانەوە، ئەو شەوە چەند پیاوێکی کارامەو ریش سپی بانگ کردنە لای خۆی و لە بارەی خاتوو لالەو حەنەشەوە، دواندنی، بۆی دەرکەوت ئەوەی شەرمین پێی ڕاگەیاندن کەمێی هەبوو زیادی نەبوو.. بەوا بۆی دەرکەوت کە ئەو ئافرەتە ڕاستگۆیەو مافی ئەوەی هەیە، داواشی لە ریش سپییەکان کرد کە شەرمین بە دەمراسی دێ قبوڵی بکەن، هەر شتێ ڕوویداو لەو بپرسن و ئەویش ڕاو تەگبیری ئەوان بۆ دێکەیان جێبەجێ بکات.. هەروەها داوای لێ کردن سزادان بە خستنە ناو ئاوی سیروانەوە وازبێنن..

شەرمین وەك کابانێکی کارامە خواردنی ئەو شەوەو توێشوی ڕێی بۆ ئامادەکردن..

بەر لە ڕۆژهەڵاتی ئەو شەوە حەنەشیان دایە بەر خۆیان‌و بەرەو دەربەندی گەرمیان کەوتنە ڕێ، کە گەیشتنە ڕۆخی سیروان، پیر داوای لە حەنەش کرد کە تەگبیری پەڕانەوەیان بۆ بکات، گوندێکی بچوك لەو ناوەدا هەبوو، ئەو دەیزانی ئیشیان پەڕاندنەوەی خەڵکە..ئاگاداری کردنەوەو هاتن،بەکەلەك هەموویانیان پەڕاندنەوە ئەوبەر.

لەو بەری سیروان، پیر حەنەشی بانگ کردە لای خۆی‌و بە نەوازشەوە پێی وت:

– لێرەدا ئێمە بەرەڵلات دەکەین.. بۆ خۆت ئازادبە نەکەی بگەڕێتەوە لای خاتوو لالە، بزانین دەگەڕێیتەوە یەکسەر قۆڵ بەستت دەکەین و وەك ئەوانەی خۆت بەدەم سیروانتەوە داون وەها دەتدەین بە دەمیەوە.. تا لە کوێوە هاتووی بتباتەوە بۆ ئەوێ.. خۆ تێدەگەی چیت پێ دەڵێم؟..

حەنەش وتی:

- مادام ئازادم دەکەی بە هەوەسی خۆم دەکەم..

- نا.. ئازادکردنت سزای تاوانەکانت نییە.. بۆ ئەوەیە لەمەو دوا هەر تاوانێکی تر بکەی پتر سزا بدریێ..

- گەورەم سزام بدە بەس ئازادم مەکە، من بەندەی لالە خانم..

پیر زانی مەبەستی چییە بۆیە وتی:

- ئەگەر ئازادت نەکەم دەشێ ئێستا بنێرم خاتوو لالە بێنن، هەردووکتان توونـد بەیەکەوە ببەستم و ئەوجا بتاندەم بەدەم سیروانەوە!..

حەنەش کەدڵنیا بوو ئەو پیاوە لە وانە نییە بەو فریو بدریێو لە سزای تاوانەکانی دەرچوونی ببێ بۆیە وتی:

- قوربان کە هەر وای لێهات بەڵگەیەکی ئازاد بوونم بدەرێ، نە بادا تووشی کەسانێکی وابم تەشقەڵەم پێ بکەنو بە تالان بمبەن و بمفرۆشن!..

پیر پارچە چەرمێکی لە ناو هەگبەکەی دەرهێناو بەقەڵەم نەخشاندی و دایە دەستی.. حەنەش پیێ وابوو لە سزایەکی سەخت رزگاربووە، جگە لەوەش بووە بە خاوەنی خۆی و ئازادە.. نەی دەزانی مەرگی لە ئازاد بوونەکەی ئاسانترە، ئەوە تانیبەو ئازادییە فرێ درایە ناودەشتی نا ئومێدی بێپایانەوە.. خەریك بوو پەشیمان بێتەوەو بە پیر بڵێ:(قوربان بمدەبەدەم سیروانەوەولێم گەرێ.. یان هەر لەوێدا لە جیاتی ئەو ئازادبوونەم زیندەبەچاڵم بکە)..

پیر کە پیێ وت:

- هەر ئێستا لەبەر چاوی ئێمەوە بەرەو خوار دەکشێێ و لە کوێوە هاتووی بەرەو ئەوێ مل دەنیێ وا ئێمە تا لە چاو بزر دەبی چاومان لێتە و بەدواتا دەروانین..حەنەش لەبیری نەمابوو ئەو لە بازاردا کڕدراوە و بەندە بووە، (پاتۆ)ش بیری لەوە نەکردببوەوە کە لە وڵاتاندا مرۆڤ وەك ئاژەڵ بازاری کڕین و فرۆشتنیان

بۆ داناوه، لەم وڵاتەدا مرۆڤ ئافەریدەی خوایەو ئازادەو بەندە نییە.. لەبەر ئەوە ئەو جۆرە سەودایە نەبووە، کەسیش ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەو جۆرە خەسڵەتە نا لەبارەی بەروودا نەدابوو، ئائەویش داوای ئازاد بوونی خۆی لە پاتۆ یان لەلالە خان بکات!.. زۆر لە پیر پارایەوە کە ئەو ئازادییەی لێ بسێنێتەوەو بیکات بە غولامی خۆی.. پیر لێی قبوڵ نەکرد.. خۆ ئەگەر پیر دەسەلاتی شاهانەی لە دەست نەبووایە، مافی ئازاد بوونی ئەوی بەدەست نەبوو. حەنەشیش چ بە ڕاست و چ بە درۆ نەیووت من بە خاتوو لالە دراوم ئەویش ئازادی کردووم.. بەرلەوەی لێیان جیاببێتەوە، پیرشالیار پێی وت:

– وامەزانە ئەو سزایەت دەدەم لەبەر ئەوەیە پێستت ڕەشە..نا.. مرۆڤ لای یەزدان هەموو یەکە، ئیتر لەناو هەرجۆرە پێستێکدا هەبێ.. وەك زانیم تۆ خەڵکی بێ گوناحت بەدەم ئاوی سیروانەوە داون، من تۆ بەو جۆرە سزا نادەم، بەڵکو بەدەم ئەو ساراتەوەدەدەم..برۆ لانەکەیتەوە حەنەش وەك داڵهۆیەکی بێگیان بەبێ دەنگ ڕێگەی نەهامەتی خۆی گرتەبەرو خۆی دایە دەست هات و نەهاتی ئەو دەشتەکاکی بەکاکییە.. سێ ڕۆژ پاش ئەو ڕووداوە خاتوولالە تووشی مەراق بوو، مرد، پوورە شەرمین و کوڕەکانی دەست و بردیان لێکردو لەگەڵ خەڵکیدێدا، وەك شاژنێك ئەسپەردەیان کردو، کێلێکی درێژی شاژنانەیان لە سەر گۆڕەکەی قیت کردەوەو لەسەر کێلەکەی لای سەری نەخشی ئاگردانێك کە لەناویدا مانگێکی تیا سوتابێ نەخشان، لەبەر ئەوەی ئۆجاخ کوێر بوو دەسیان لەناو ماڵ و سامانەکەی نەداو پارێزگاریان کرد، تالەو سەرەوە پیر دەگەڕێتەوەو تەکبیرێکی بۆ دەکات.. هەواڵیشیان بۆ (پاتۆ)ی کۆنە ئاغایان نارد: نەکا نیازی ئەوەبکات بگەڕێتەوە ناو ئەو دێیە..

* * *

# (١٣)

ئازاری نەخۆشییەکەی هەنارخان هەموو لەشی داگرت لە هەڵسوکەوتی ئاسایی پەکی خستبوو، گەرچی ئەو وەك قەڵایەکی سەخت خۆی لەبەریدا ڕاگرت و دەیویست لە ئاستیدا نەچەمێتەوەو وا پیشان بدا لەو بەهێز ترە، لەگەڵ ئەوەشدا هەستی دەکرد لەناوەوە ژیانی کنە دەکات و بەرەو مردن نزیکی دەکاتەوە..کەچی مردن دەستی لە خواجە بەهمەن وەشانو لە پڕ مرد! تەرمەکەی چەند ڕۆژێك لە هەیوانی پەرستگاکەی دەگادا لەسەر تابووتێك دانرا،ئەوان دوای سێ ڕۆژ مردوویان ئەسپەردە دەکرد،بەتایبەتی ئەگەر لە پایەی خواجە دا بوایە، هەم بۆ ئەوەش بوو: ئەو دۆست و ئاشنایانەی کەلەدوورەوە دەهاتن تا چاوێك بە تەرمەکەی دا بگێرن، ئومێدی ئەوەشیان دەکرد لەو ماوەیەدا سیمیارو هێشاو هۆزاو واران لە شوێنێکەوە سەر هەڵ بدەنەوە... لە گەلێ شوێنەوە پرسە کاران دەستەدەستە دەهاتن، ڕەنگە هەندێکیان بۆئەوە دەهاتن، چاویان بەنازەنین بکەوێ و بزانن شوو کردنەکەی بەچی گەیشت بەتایبەتی (پیر وەسان بەگ) بەبۆنەی پرسەوە دیارییەکی زۆری لە گەڵ خۆیدا بۆ تازییە هێنا، خۆی کردبوو بە خاوەن تازییەو چەند کەسانێکی خۆی بەدیار تەرمەکەوە دانابوون وپێشوازی و بەرێ کردنی خەڵکیان لەئەستۆی خۆیان نابوو، (پیر وەسان بەگ) وای ئامڵاندبوون کە بە کزوو داماویەوە خۆیان پیشان بدەن! ئەژدەری کوری نۆشاش خۆی خستبووە تەکیان...نە دەزانرا چۆن لەگەڵ ئەوانەدا خۆی جووت کردووە؟ نەئەو نەکەسی تر

نەیان دەزانی باوکی ئەژدەر، پیرەوەسان بەگ کوشتوویەتی.. کێ نالێ لەبەر ئەوەی ویژدانی ئازاری نەدا لەگەڵ کوڕەکەیدا ئاشنایی دانەمەزراندبێ! لەوانەش بوو ئاشنایەتی دابەستن لەگەڵیدا بۆ ئەوە بووبێ تالەدەگادا بیکات بەدەستەبەری خۆی بۆنیازەکانی خۆی گەمەی پێ بکات و دەگای پێ تێك بدات!.. پیاوەکانی پیر وەسان لەبارەی نەمان و سەر نووگم بوونی هێشاو وارانەوە، پرووپاگەندەیان دەکردو ئەژدەریش لەدەگادا بۆیانی بلاّو دەکردەوە، ئەوەی لەو بارەوە بلاّو دەکردایەوە بە گوێی هەنارخان و نازەنین و کەسوکاری هێشا و واران و هۆزادا دەدرا، پیرەوەسان بۆ ئەوەی خۆی بباتە پێش، هەواڵی بۆ هەنارخان و نازەنین دەنارد! کە گوایە ئەو لە دەقەری خۆیدا بۆ رۆیشتن و هاتنەوەیان ئێشگری داناون، بەو چەشنە (لە ناڵیش دەداو لە بزماریش). نازەنین خان چاك دەیزانی کێن ئەوانەی ئەو پروپاگەندەیە دروست دەکەن و کێ لە دەگادا بلاّویان دەکاتەوە.. لەبەر ئەوە نەبوایە کە تەرمەکەی خواجە بەهمەن هێشتا نەسپەردە نەکرابوو دەنا ئەوانەی ئەو کارەیان دەکرد وەدەری دەنان.. بەڵێ‌نە ناشتنی تەرمەکەی باوکی دەستی بەستبوو دەنا بەخۆی و دیاری و پیاوەکانیەوە سەگی تێبەردەدان، خەڵکی دەگاش گومانیان لێکردبوو، لەبەر خۆیانەوە دەیانووت:

– ئەو دڵسۆزی نواندنەی ئەو کابرایە لە پای چیدایە؟.

خواجە بەهمەن کۆڵەکەی دەگابوو، بەڕاو تەگبیرو بڕیارەکانی مایەی بەختیاری بوون ، هەنارخان و نازەنینیش لەوەوە فێری ئەو جۆرە فەرمانڕەوایە ببوون وخۆیان بەخزمەتگوزاری خەڵکی دەگا دەزانی  بۆیە لەو رۆژەوە کە خواجە مرد خەڵکەکە لەدەگا نەچونە دەرەوە و وازیان لەهەموو کارو فرمانێك هێنا .. ئەوچەند لاوەش کە هەنارخان  لەسەر رێگا بۆ چاوەروانی هاتنەوەی سیمیارو هێشای دایئابوون ، کەوتنە سەروکاری پرسەو وازیان لە چاوەروانی هینا

دەگا تووشی پەرۆشی و سەرقاڵی ببوو، لەلایەکەوە بۆمردنی خواجە لەلا یەکی ترەوە بۆ بێ سۆراخی هیشاو واران و هۆزا بەتایبەتی هەنارخان، چونکە لەبەر ئەو بەشوێن سیمیاردا وێڵ ببوون، ئەو پڕو پاگەندەیەش کاری خۆی دەکرد. لەدڵدا تۆوی گومانی خراپەی دەچاند بۆیە ئەوەی دەهاتە پرسە دەیزانی خڵکەکەی ئەوێ گەلێ پەرۆشن، بۆدامرکاندنەوەی دڵی تازییەباران بە بەهانەی خەون دیتنەوە هەر کەس بە ئارەزووی خۆی قسەی دڵخۆشکەرەیان هەڵدەبەست.. هەنارخان لەوە دەترسا هێشاو واران شتێکیان بەسەردا هاتبێ‌و ئەوی تیا خەجاڵەت بێ، چونکە هەر شتێ دەربارەیان کە بڵاو دەبووەوە کەس و کارەکانیان دەچوونە لای ئەو تا بزانن ئەو چی دەڵێ؟ وەلێ نازەنین و سەرجەم پیاو ماقوڵانی دەگا هێشتا هەر لەو یەقینەدا بوون کە هیچیان بەسەردا نەهاتووەو بەو زوانە سۆراخێکیان دەبێ.. نازەنین وەك خەڵك نەبوو هۆش و بیری خۆی بداتە بەر هەوای ئەو خەونانە کە پەرژینی سەلامەتیان بە دەوریاندا تەنیبووە.. بەڵکو هەستی خۆی و ژیری و ئەزموونەکانی هێشای دەکردە سەرپشکی بۆچوونەکانیان، هۆشی ڕێی بەدڵی نەدەدا خورپەیەکی وای تیا سەرهەڵ بدا کە بەلای خراپەدا بشکێتەوە.. بەبۆنەی مردنی خواجەوە کناچە جەحێلە لەتەرە رێسەکان، سەری لە تەرەکانیان رەش کردبوو، بەیەکەوە لە تەرەیان دەرێسی، لەو دووڕۆژەی دواییدا بە نازەنینیان راگەیاند کە: تەشیەکانیان ڕێك دەخولێنەوەو بە درێژایی ئەو دوو ڕۆژە یەك داوایان نەپساندووە کرژیان تێنەکەوتووە، دووخ رێسەکانیش هەمان هەواڵیان دابووگوایا دوو ڕۆژە دووخەکانیان وەك ڕۆن قازیان لێدرابێ مات و مەلوولن و کەچی لە کلافکردنی دووکڵەکاندا یەك داوایان نەپساندووە.. چۆلەکە پاسار ییەکان پاش مردنی خواجە کش و مات بوون کەچی دوو ڕۆژە ئۆقرەیان نییەو هەر جریوە جریویانە، کەوی سەر شاخەکانیش

ناخوێنن کەچی هەر خەریکی فجوق کردنن لەم لووتکەو بۆ ئەو لووتکە، ئەوانە هەموو نیشانەی گەرانەوەی ئەوانەن کەئاراگێلْ و دوور ولاّتن، ئەگەر وانییە ئەی بۆ دوو رۆژ لە مەو بەر کوڕمابوون و دەنگیان لێوە نەدەهات!؟. ئەوە هەم نیشانەی ماتەمینیە بۆ خواجە، هەم نیشانەی خۆشییە! خۆشییەکە بۆ هاتنەوەی سیمیارو هێشا یە.. خەڵکەکە وا نقلاّنەیان لێدەدا، بەش بە حاڵ خۆیان بڕوایان پێی هەبوو چونکە تاقییان کردبووەوە!. کەس و کاری هێشاو واران وهۆزا رۆژانە دەچوونە لای هەنارخان، بۆ ئەوەی دڵی یەکتری بدەنەوە و دڵە راوکێی خۆیان لە پاڵ دڵنیایی ئەودا ساتۆر بکەن، ئەوان بەرگەی ئەو قسە گول و بێ ئومێدانەیان نەدەگرت کە لەو رۆژانەدا بلاّودەبوونەوە.. نیشانەی ماتەمینی بە ئاشکرا دیار بوو،ئافرەتەکانی دەگا کراسی کەوەیان لەبەر کردبوو، پیاوەکانیش قۆڵنجەکانیان لە خۆم نابوو فەرەنجیەکانیان بۆ ناوەوە قوڵ شکێن کردببووەو بە هەردوو قۆڵ لەبەریان دەکردن، ئافرەتەکانیش کلاّویان لەسەر نە کردبوو.. ماتەمینەکە لە هەندێ خەسڵەتدا وەك شایی لێ هاتبوو، هەر ماڵێکی ئاژەڵدار بزن و مەرێکی بۆ ئەرکی پرسە بەخشیبوو، رۆژی سێ چوار سەر مەڕو بزن بۆ خواردنی تازییەباران سەردەبردران و چێشتی گەرمە گۆڕ بە تێروتەسەلی دەر خواردی خەڵك دەدرا..!.
دەگا تووشی تێکەو لێکەیەکی ناهەموار ببوو، لەلایەکەوە خواجە بەهەمەن مردبوو،لەلایەکی ترەوە قسەو باسی دڵتەزێن سەبارەت بە هێشاو واران و هۆزا ناو دەگایان پڕکردبوو. ئەگەر هۆشیاری هەنارخان و نازەنین و پیاو ماقوڵان نەبوایە فرمێسکی گەرمی دەگا دەپەشۆکان و نەیان دەزانی بۆ کێ برژێنە خوارەوە. شاخەکانی دەورو بەری دەگا دۆش دامابوون، نووکیان بەسەر دەگادا دانەواندوو، پەڵە هەورەکان بە ماتی دەهاتن و هەندێ فرمێسکیان بەسەر دەگادا دەرشت وبە خێرایی وەك رێبوارێکی پەیام بەکوڵ تێدەپەرین و بەری رۆژەکەیان بەردەدا..

یەکێك لە شوانەکانی دەگا لەسەر تیغەی یەکێك لە شاخەکانەوە فەرەنجیەکەی ڕاوەشاندو بە توونـد بەرەو دەگا دەیچڕی:

– هۆ.. خەڵکی دەگا.. هەواڵ بدەنە هەنارخان، سیمیارو هێشا هاتنەوە.. خەڵکەکە لە دەنگی شوانەکە چاك حاڵی نەدەبوون، بەڵام بە ڕاوەشاندنی فەرەنجیەکەیدا گومانیان کرد شتێ قەوماوە، دەنا شوان مەڕو بزنی خۆی بەجی ناهێڵی و هاوار بەرێتە بەر دەگا، بیریان بۆ ئەوە نەدەچوو کە هێشاو برادەرەکانی لەڕێ سەختەکەی ئەو بەرەوە بگەرێنەوە ..

خەڵکی زۆر بەدەم هاوارەکەی شوانەوە ڕۆیشتن، ئەویش لە کەلی شاخەکەوە هاتە خوارەوەو بەگورجی بەرەو ئەوان شۆڕبووەوەو پێی وتن: مژدە بدەن سیمیار وهێشا هاتنەوە ..کەئەو هەواڵەیان لەشوانەکەوە بیست، هەندێکیان زووبەرەو دواگەڕانەوە هەواڵەکەیان بەناو دەگادا بڵاوکردەوەو گەیاندیانە هەنار خان ونازەنین ، بەگەیاندنی ئەو هەواڵە خۆشی و ناخۆشی لەدەگادا تێکەڵاوبەیەك بوون، خەلکەکە بەماتەمینەوە کەوتنە قوڵاخەکردن ، پیاوانی سەر تەرمەکەش شڵەژان و گەرکیان بوو زوو شوانەکەبگاتە لایان و هەوالەکەیان پێرابگەیەنێ

پیر وەسان بەگ بەهەواڵی گەرانەوەی سیمیارو هێشا خراپ شڵەژا ، هەستی کرد چی پروو پاگەندەی نایەوە و چی نیازی هەبوون هەموو دران بەدەم بای ئەو هەوالەوە و توانەوە، خەمی ئەوەی لێ نیشت سیمیارو هێشا بیناسنەوەو پەی بەنیازە خراپەکانی ببەن و ئەو دەمامکەی هەی بوو لەرویدا دایماڵن و بەپەیمان شکێن بیدەنە قەڵەم و ئەو کاتە وەك چەند ساڵێك لەمەو بەر چۆن تووشیان کرد، گرفتاری بکەن و لەناو خەڵکدا شەرمەزاری ببێ،بۆیە زوو بەخۆی کەوت و بەهانەی بۆگەرانەوەی‌خۆی هێناویەوە، یەکێك لەبەر دەستەکانی خۆی نارده لای هەنار خان کە روخسەتی بدات ، بگەڕێتەوە، بەهانەکەی ئەوەبووگوایا لە دەڤەرەکەی خۆیدا

هەندێ شت قەوماوە، ئەگەر زوو نەگەڕێنەوە دەبێتە کارەسات هەنار خان بەسارديیەوە روخسەت خوازییەکەی لێ قبولْ کردو یەکێك لەبەردەستەکانی خۆی نارد کەخوا حافیزی لە جیاتی ئەو لێ بکات ...

ئەوپیاوانەش کەبەدیار تەرمەکەی خواجەوە بوون گەلێ پێیان سەیر بوو ئەو کابرایە، بەهاتنی هەواڵێ سیمیارو هێشا وا شڵە ژاو لەپڕ کەوتە سەرو کڵاوی گەڕانەو..بەهانەی گەڕانەوەکەی بەلاّیانەوە شتێکی پووچەڵەو بێمانابوو، بەبێ ئەوەی ئاوڕ لەتەرمەکەی خواجە بداتەوە، بەخۆی و بەردەستەکانیەوە بەوئێوارە وەختەگەڕایەوە !..

دایکی هۆزاو واران کەگوێیان لەشوانەکەبوو دەیووت:

– سیمیار و هێشاهاتنەوە، ناوی هۆزاو وارانی نەدهێنا دڵیان کەوتە پەلەقاژەو خەریك بوو خەم لەناو کەمەرەوەبیان پسێنێ و چۆکیان بشکێنێ هاواریان دەکردو دەیان ووت:

– ئەی هۆزاو واران ؟! ئەی ئەوان ؟! شوانەکە ویستی هەواڵەکە بۆ خەڵکی سەرتەرمەکەی خواجە بەهەمەن دووپات بکاتەوە و تێیان بگەیەنێ، لەو کاتەدا دایکی هۆزاو واران و کەسوکاریان بەپەرۆشەوە خۆیان گەیاندە ئەوێ و پرسیاریان لەشوانەکە کردو وتیان:

– ئەی هۆزاو واران ؟!.

شوانەکەهەرئەوەندەی پێوترا :

– هەموویان.. من خۆم (واران)م بەچاوی خۆم دی، هەرئێستا دەگاتە لاتان..

دایکی واران هەناسەیەکی هەڵکێشاو سوپاسی یەزدانی کرد، وەلێدایکی هۆزا، وەك خۆی مایەوە، هەرئەوەندەی نەمابوو بکەوێ و برسی لێببردرێ.. دایکی واران دڵی دایەوەو دەیووت:

– (کنا ئەختەر بەخوا هەموو بەیەکەوەن و هیچیان لیّ نەهاتووە)

ئەختەر وەك شێت دەستی رادەوەشاندودەیووت:

– نا..کوڕی منیان لەتەك دانییە، لەم سەرەوە دیار نەبوو لەگەڵیاندارۆییوە. لەوسەریشەوە هەردیارنییە!..

وادیاربوو شوانەکە مردنی خواجە بەهەمەنی بەوارانی گەیاندبوو، واران وەك هێشا و هۆزاو ئەوانی تری هاورێکانی پیر شالیار دەستێ جلی پۆشتەی بەگ زادانەی لەبەرکردبوو، سەرووم‌ێزەرەیەکی گەورەو قیتی لەسەر نابوو، ئەووای دانابوو کەگەیشتەوە ناودەگاو مژدەی گەرانەوەی پیرشالیاری گەیاند، خەڵکی ناو دەگا هەموو بەجاریّ دەهروژێن و پێشوازیەکی شاهانەیان دەکەن، خواجە بەهمەن لەگەل ْپیاو ماقوڵاندا بەتاسەوە چاوەروانییان دەکەن و ناو دەگا پر دەبێتە شایی و خۆشی، وەلیّ کەهەواڵی مردنی خواجەی بیست وەك تیرێکی لێبدەی والەشوێن خۆیدا کەوت و تاسا، وەك باوبوو هەندێ خۆڵی لەسەرشانی خۆی داو دۆش داما

واران بەتەگبیری پیر پێش هاورێکانی کەوت بوو تامژدەی گەرانەوەیان و ئامادەی بەیەك شاد بوونەوەیان بەدەگا بگەیەنێ ..کە واران گەیشتە پێشەوە، چی منداڵ و ژن و پیاو هەبوون هەموو چوونە سەربانەکان چاویان برییە هاتنەوەکەی واران، کەسانی ناو پەرستگاکەش کەلەدەور تەرمەکەی خواجە ئاپوورەیان دابوو کەوتنە چاوەروانی دەرکەوتنی واران

ئاواتی هەریەکێك لەهاورێکانی واران ئەوەبوو ئێش و ئازارو چەشتنی تاڵی و ترشی رێگەیان بدەنە بەر قەڵبەزەی خۆشی گەیشتنەوەیان و بە مژدەی گەرانەوەو سەرکەوتنیان هەمووی بەرباد بکەن،واران کە چاوی بە خەڵکەکەی دەگا کەوت هەمووی لەناو تازییەداکزوماتن لەگەل ْئەوەشدا هەموو بە تاس و شەوقەوە

پێشوازی هاتنەوەکەی ئەویان کرد ناو هەناوی وەك مەنجەڵی سەر ئاگر کەوتە کەف و کوڵ و فرمێسکی خۆشی لەسەر رووومەتی جۆگەلەیان بەست ..رووی کردە پەرستگاو یەکسەر خۆی دا بەسەر تەرمەکەی خواجە بەهمەندا، تێکەڵاوی خۆشی وناخۆشی ئاگری بەردایە ناو هەناوی ئەوانەشەوە کەلەوێ راوەستا بوون، لەسەرتەرمەکەی هەنسکەی گریانی ئەو ناوچەوانی ئامادەبووانی پڕلە فرمێسکی گریان کردەوە، کەکەف و کوڵی دەروونی نیشتەوە دوو ریش سپی لەتەرمەکە جیایان کردەوەورووو بە خەڵکەکە دایان ناو یەکەیەکە بەخێر هاتنەوەیانی لێکرد، ئەویش چاوی بەهەموویاندا خشاندو هەواڵی هاتنەوەیانی پێ راگەیاند، دایکی هۆزا – ئەختەر – بێپەروا درِنی بەخەڵکەکەداو لە واران چووە پێشەوە و دەستی لەملێ کردو بەتاسەوە ووتی:

– بەقوربانتانم ..هەموومانبەقوربانی تەرمەکەی خواجە بەهمەنین!.. ئایا هۆزاکەی منتان لەگەڵە یان بەقوربانی حازری بووە؟!. واران لەپێشەوەوای زانیبوو دایکی خۆیەتی وابەکوڵ دەستی لەمل کردووە کەناوی هۆزای هێنا فرمێسکەکانی چاوی خۆی سریەوەو سەرنجی دایە ئەوجازانی ئەوە دایکی هۆزایە، پەلاماری هەردوودەستی داو پێکەوەی لکاندنو ماچی کردنو هەردوودەسەکانی بەچاوی خۆیەوە نووساندن و وتی :

– ئەگەر ئەو نەبوایە ئێمە نەمابووین !ئێمە بەوەوەماوین و نەمردوین !. بۆ ئەوەی ئەوانە کەلەوێ بوون گوێیان لێ بێدەنگی هەندێ بەرزکردەوەو وتی

– (کەس نەواچۆ خواجە بەهمەن مەردەن ، دەگاو خواجەی تاکەسانێ پێسەو پیر شالیاری‌و هێشای‌و هۆزایش چەنە با، نەمەردەن..ئۆجاخەش رۆشنەنە..)

ئەختەر کەدڵنیابوو هۆزاش لەگەڵیانەو، ماوەو نەمردووە،دەستی ستایشی بۆ یەزدان بەرز کردەوە ،دانەوییەوە سەرسنگی لاشەکەی خواجەی ماچ کردو

کشایەوە دواوە و هەر ستایشی یەزدانی دەکرد ..هەندێ لەوانەی کەگوێیاز لەوتەکەی واران بوو دەیانپرسی:

– پیر شالیار !..پیر شالیار کێیە ؟!..

واران کەزانی خەڵکەکە دەیەوێ بزانن مەبەستی لەپیر شالیار کێیە؟رووی تێکردن و ووتی:

– ( براینە ..بەیانی پیر شالیارو هێشاو هۆزا و ئەو کەسانەی کە شا لەتەکیدا ناردوونی و چەند کەسانێکی تر دەگەنە بەرەوە..ئەگەر دەپرسن پیرشالیار کێیە؟.باپێتان بڵێم زانای سیمیاری ڕۆڵەی دەگای خواجە بەهمەنەو لەهەموو قەڵەمڕەوی شانشینی ساسان و ئاریان زەمین دا لەلایەن شای هەموو شایانەوە ئەو نازناوەی دراوەتێ وکراوە بەپیری هەموو پیرەکان، هەرچەندە ئەو بەو نازناوەوە خۆی هەلناکێشێ، حەزدەکەم بزانن ئەوپایە بەو دراوە تا ئەمڕۆ بەکەم کەسی تر نەدراوە، لەبەر زانای خۆی پێی بەخشراوە.. خۆزگا خواجە بمایە تابەچاوی خۆی بیدیایە چ پیاوێکی بەنموود و زانا لەدەگاکەیدا هەڵکەوتووە، چ چقەیەکی شاهانەی لەسەر نراوە.. خۆزگا..)

*        *        *

ژنان لەماڵی خواجە بەهمەن وەك پوورەی هەنگ لەشاژن هەنارخانو نازەنین لەهاتوو چۆی تازییە گێراندابوون ، پیرە ژنە کارامەکانیان ، بۆ دڵدانەوەی تازییەباران وێردەکانی یەسناو وەندیداتیان دەخوێند کۆتەڵەکەی خواجەیان بەرامبەر خۆیان وەك پەیکەرێك دانابوو ..ژنەکان لەدەور هەنار خان و نازەنین تەموورەیان بەستبوو، هەموو چاوەڕوانی (واران)یان دەکردکە بڕواتە لای هەنارخان و چوون و هاتنەوەکەی بۆیان بگێڕێتەوە.. واران دڵی وەك چۆلەکەی

بەند کراو بۆ ئەو دیدەنییە باڵە فڕێی دەکرد، هەوڵی دەدا وابکات بەنموودو نەوازشەوە ئەو دیدەنییەی بەسەرکەوتوویی بۆ مەیسەر ببێ، لەناوەوەهێزی دەدایەخۆی و راهێنانی دەکردکە لەحزووری هەنارخان دا نەشێوێ و وەك پیاوێکی دامەزراو وخاوەن ئەزموون وقسە زان خۆی پیشان بدات و بزانێ لەناو ئەو هەمووژنانەدا چۆن خۆی بنوێنێ ، نەبەلای شاییدانەبەلای شیوەندا لارەسەنگ نەبێ، گفتولفتەکانی پیرشالیاری دەهێنایە بەر چاوی خۆی کەچۆن لەوجۆرە هەلوێستانەدا دەکەوتەئاخاوتن   لەدڵەوەبەخۆی دەوت:((خەمی ئەومە هەنارخان وەك قەتار چییەکەی جاران تەماشام بکات ، ئاگای لەوەنەبێ لەو ماوەیەدا کەکەوتوومەتە تەك پیرشالیار گەلێ گۆردراوم و بوومەتەکەسێکی تر خۆئەو نازانێ من لەم گەشتەم دا چیم کردووە چیم بەسەر هاتووە و چۆن فێری گەلێ نهێنی ژیان بووم    دەی واران واخۆت بنوێنە هەنارخان رێزت لێوەربگرێ ئاگاشت لەخۆت بێ، نەشێوێی! پرسەیەو بزانە چۆن سۆزو ماتەمینی خۆت بەبۆنەی مردنی خواجەوە بۆ هەنارخان ونازەنین و ئەو هەموو ژنانە دەردەبڕی، هەم نوێنەری ئەوان و هەم مژدەدەری هاتنەوەی پیرشالیاری، ئاگات لەخۆ بێ تۆ قەتار چییەکەی جاران نیت! بەوچاوەمەروانە، بڕۆ بۆ ئەوێ، واهەنار خان چاوەروانتە، ئەگەر ناتوانێ وەك پیرشالیار بی خۆ دەتوانی نموونەیەکی هێشا ئاسابێ ))

* * *

وازنانی دەگا هەموو لەماڵی خواجە کۆ بوونەتەوە، هەموو بەتاسەوە چاوەروانی گەیشتنی وارانیان دەکرد، ئاخۆ لەو گەشتەدوورو درێژەیدا چۆن گۆڕدراوە، چۆن دێتەژوورەو خۆی پیشان دەداوچۆن لەحزووری هەنارخاندا رادەوەستێ و پرسەوسەرەخۆشی لەخانمی گەورەدەکات و باسی چوون وگەرانەوەی خۆی وهاورێکانی بۆ دەکات؟.

واران لەمەگەیشتە ناو حەوشەی دیوەخان، ئەو ئافرەتانە کەلەوێ بوون وئەوانیش کەرۆژانە لەوێ کارو فەرمانی مێوان رایی کردنیان ئەنجام دەدا، یان ناز و چاشتیان بۆ هەرسێ ژەمەکە ئامادەدەکرد بە چاوی پر فرمێسکەوە دەسیان لە کارەکەیان بەرداو وەك پێشوازی کردن لەرێیدا راوەستان و رێی بەرەوچوونە لای هەنار خانیان بۆ واز کرد ،تائەو ساتە نەیان زانیبوو ئەوەندەشۆخ و شەنگە. لەگەڵ هەنگاونانیدا سەیریان دەکرد و لەدڵەوە ئاواتیان دەخواست ئەوانیش وەك پوورە رەنێی دایکی واران پۆلەیەکی ووهایان هەبووایە ئاوەها هەنار خان بەتاسەورێزەوە داوای چاو پێکەوتنی بکردایە.. واران چوون دڵسۆزانی بنەماڵەی خواجە بەهمەن هەندێ قوری لەشانی خۆی داو هەنگاوی مەحکەمی بەناوژنەکان دا بەرەو هەنارخان دەنا، دەتووت پیرشالیار رێبەری دەکات، وابەسام و سەیبەت وچاو پر لەفرمێسك هەنگاوی دەنا تاروو بەرووی هەنار خان و نازەنین راوەستا.

هەنارخان لەمەوارانی دی بەبێ هەدەرووبەبێ یارمەتی کەس وەك نازەنین لەبەری هەڵسایەوە!. واران بەوپەری رێزلێوەرگرتنەوە ،هەردوو دەستی ماچ کردوئەویش تەوێڵی ئەوی ماچ کردەوە..لەبەر سەیر کردنی ئەو دیدەنیە جگە لەنازەنین، ژنەکان هەستیان بەهەڵسانەوەی هەنار خان نەکرد !..

ئەی بۆ چاك بوونەوەی هەنارخان نەبوو هێشا و واران ئەو رێگەسەختەیان خستەبەر خۆیان ؟ ئەوەتا بەنزیك بوونەوەی سروەی هەناسەیان کەنفتیەکەی رەوییەوە! وارانیش لەبەر سامو سەیبەتی ئەو هەڵوێستە پڕ لە شادمانییە، بیری بەلای هەڵسانەوەکەی هەنار خاندا نەچوو!..

نازەنین خەمی ئەوەی هەبوودایکی سەبارەت بەوماندوو بوونەی واران نەتوانێ رێزی شایستەی لێ بنێ، وەلێ کە لەبەری هەڵسایەوە،راستەوخۆ زانی ماندووبونەوەکەیان بە فیرۆ نەچووە ئەوەتا بەهیمەتی سیمیارجارێ بەبێ ئازارو

یارمەتی هەڵسایەوە سەرپێ‌و دانیشتەوە، هەستی بە نۆشداری کرد، کەچی دەنگی نەکرد!.. واران بەرێزەزەوە چەند هەنگاوێك لە شوێن دانیشتنەکەی هەنارخان کشایە دواوە بەفرمانی ئەو بەسەرچۆك دانیشت وپرسەو خەمباری خۆی لەگەڵ فرمێسك رشتندا بەبۆنەی مردنی خواجەوە دەربڕی و وەرامی پرسیارەکانی بەراست و روانی دایەوە ئەوجا بەکورتی: چوون و هاتنەوەو رووداوەکانی رێی سۆراخکرنی سیمارو وەرگرتنی پایەداری و بەخشینی نازناوی پیرشالیار لەلایەن شای ئاریان زەمینەوە بەسیمیارو گەرانەوەیان بەریك و رەوانی بۆ گێڕایەوە

هەنارخان بەگەرانەوەی سیمیارو هێشاو واران و هۆزا گەلێ شادمان بوو لەپەنای ئەو شادبونەوەیدا خەمێکی تر کەوتە سەرخەمانی:

لە دڵ خۆیدا دەیووت: خۆزگە ئێستا خواجە نەمردبایە، تا گوێی لەو قسانەی واران دەبوو ئەوجا دەیزانی ئەم دەگای هەورامانە چ جۆر رۆڵەی مەردی لێ هەڵکەوتوون

* * *

پاش ئەوەی هەنارخان پێشوازی وارانی کردوو لە چوون و هاتنەوەکەیان حاڵی بوو، رووی کردە نازەنین و ووتی:

– چی بکەین؟..

– پرسیارەکەی هەنارخان لەپرسیاری کەسانێك دەچوو گیری بەدەست دوو شتی دژ بەیەکەوە خواردبێ و بیەوێ هەردووکیان لەناو یەك لەپی دەستیدا کۆ بکاتەوە.....

نازنین چاك دەیزانی مەبەستی دایکی لەو پرسیارەدا چییە؟. خۆ ئەگەر ئەو نەی وتایە چی بکەین؟ لەوانەبوو ئەو بەوی دەیوت چی بکەین؟... لەگەڵ ئەوەشدا حەزی دەکرد دایکی بەئاشکرا مەبەستی پرسیارەکەی بدرکێنێ، بۆیە ووتی:

– لەبارەی چییەوە چی بکەین؟

لە بارەی ئەم دووشتەوە کەبەسەریەك داکەوتوون: ئەسپەردە کردنی خواجەو هاتنەوەی سیمیارو ئەوانەی کەلەگەڵی دان... خۆ گوێت لێ بوو واران چی ووت؟ نەی ووت: سیمیار لەلایەن شای ساسانەوە پایەو پلەیەکی وای پێ دراوە تا ئێستا بەکەم کەس نەبەخشراوە؟ چەندان کەسیشی لەگەڵ دایە.

نازەنین وەك لەو پەڕی مەبەستەکەوە هاتبێتەوە ووتی:

– ئایا دەتوانین شین و شایی بەیەکەوە گرێ بدەین؟!

لەگەڵ ئەوەشدا خۆ نابێ هاتنەوەی سیمیارو هێشاو ئەوانی تر هەروا بەبێ بایەخ دان بخەینە پشت گوێ، ناشبێ لەسەر تەرمەکەی خەاجە ئاهەنگ و خۆشی سازبدرێ ..

نازنین وای بەپەسەند زانی پیاوانی مەرێگا بەسەرداری ژیرلەی مەرێ و پیر خودادو کەسانی تر بانگ بکرێنە دیوەخان و لەوبارەوە راو تەگبیریان وەربگیرێ، بەڵام دەبێ واپیشان بدرێ مەبەست لەهاتنیاندا بۆ ئەوە بێ پایەو سایەی هەردوولا کەم نەکرێتەوە، نەبادە شتێکی وا رووبدا ببێتە نەنگ و نیشانەی تیر تێ ئاگاوتنی تانەو تەشەری ئەم و ئەو...

ئەوەی ئەودایك و كچەی پەشۆ کاندبوو ئەوەبوو: نازەنین بەروالەت مەرجی هێشای لەئەستۆدا بوو، لای خەڵکیش یەقین بوو ئەوانە ئەو رێیهات و نەهاتەیان بۆ هەنار خان گرتە بەر، بۆ سۆراخ کردنی سیمیار وێڵ بوون بۆ ئەوەی فریای هەنارخان بکەوێ و چاکی بکاتەوە وائێستا هەموو گەڕاونەتەوە، هەرشتێ بۆ پێشوازی سیمیاری بکەن لەسەریان دەوەستێ و لەپایەی مردووەکەشیان کەم دەکاتەوە..خۆ ئەگەر گوێش بە هاتنەوەکەیان نەدەن دەبێتە هۆی نوکلی کردن وبێوەفایی ..بەتەمای تەگبیری ریش سپیانی مەرێگا بوون شتێك بریاربدەن ..بڕیاری مەرێگا بەم جۆرە بوو:

(لەحەوشی پەرستگاوە تا ئەو بەری دەگا، خەڵکەکە بەژن و پیاوەوە لەم بەرو لەوبەری رێگەی هاتنەوەیاندا راوەستن،ئەوەی دەستەسڕی رەشی دەس دەکەوێ لەملی بکات ، ئەوەی قولانجکی شۆڕی هەیە کەوەیبکات ، ئەوانەش فەرەنجی لەشانن قۆڵی فەرەنجیەکانیان بۆ ناوەوەبنووشتێننەوە، ژنانیش پرچ بەربدەنەوەو کراسی کەوەلەبەر بکەن ، بەبێ دەنگی راوەستن نەبگرین ونەپێبکەنن،مات و داماو راوەستن، منداڵ و مێرمنداڵیش پۆل پۆل بەپیریای پیرەوە برۆن ..پیاوماقوڵان وریش سپیان لەگەڵ هەنارخان و نازەنین دا لە سەر تەرمەکەی خواجە راوەستن و وا پیشان بدرێ کە بۆ ئەسپەردەکردنی خواجە چاوەروانی گەیشتنی پیرشالیار دەکەن).

نەخشەکەی مەرێگا چۆن بوو، وا بە ماتەمینی پێشوازی پیرشالیارو هاورێکانی کرا.

*　　　*　　　*

سەر لەبەیانی بوو، منداڵ و مێرد منداڵانی دەگا ریٚ ی ئەوبەریان گرت و پۆل پۆل بەبێ دەنگی بە پیر، پیرشالیار هاورێکانیەوەکەوتنە رێ، پێش هەموویان لاس و سەپانی پیرخواداد بوون، شوان و گاوانەکانیش گەلەو گاگەلەکانیان بەرەو ئەو شوێنە کە رێی پیرشالیاری تیا تێدەپرێ بۆ لەوەڕ برد، تا ئەوانیش بەهاتنەوەی پیرو هێشاو هۆزا شادبن، پیر لەمە لە کەلی (کەمانچەرەوە)[1] ئاودیوو بوو، جۆرە ماتییەك دای گرت، هاورێکانی وایان زانی پیر مانوو بووە بۆیە وا مات و بێ دەنگە، هێشا کە سەیری نیگای پیری کرد زانی کە شتێ لە دڵی دا هەیە و پێ ی نیگەرانە، لە دڵەوە پرسیاری لە خۆی دەکردو دەیوت:

– تۆ بڵێ ی شتێ رووی نەدابێ؟! ئەگەر وانی یە، ئەی بۆ لە دوێنێوە واران هەواڵی گەیاندووە کەچی تا ئێستا کەسێکی دەگا دەرنەکەوت؟! چەند ساتێکیان مابوو رووەو دەگا ببنەوە، هەستیان کرد منداڵە ووردە وەك مێروولە رێچکەیان پێکاوەو بەرەو ئەوان دێن، ئەو نوقڵ و نەبات و شیرینەی کە بۆ منداڵانی دەگایان هێنابوو، لەناو بارەکەدا دەریان هێناوو پیر هەگبەکەی خۆی لێیان پر کرد، بەر لەهەمووان لاس و سانا گەیشتن، نەیان دەزانی کامەیان سیمیارە.... هێشا زوو ناسینیەوەو داینییە دەست پیر، ئەو بەگەیشتنی منداڵەکان دابەزیوو تێر هەردووکیانی ماچ کردن و بە سینگی خۆیەوە نووساندنی ئیتر هەرمنداڵێکی دەگەیشتێ ماچی دەکردوو نوقلێکی پێدەداو دەستی بەسەریدا دەهێناو لەناوی دەپرسی و دەیدواند.... بە گەرمی راوموسانی لەتەك شوان و گاوانەکاندا دەکردو، هەواڵی لەوراندنی ئاژەڵەکان و شمشاڵ بۆ ژەناندنیان لێ دەپرسین و بە

---

[1] شاخێکی بڵندەکە لەسەرروی رۆژهەڵاتەوە بەسەر شارەزووردا دەڕوانێ.

مشت نوقڵ و شیرینی دەدانێ     لەوکاتەدا بزنێکی مەرەزی سووری گوڵنگدار لەناو گەلکەدا هەرەتە بوو، کەوتە ناو کاروانەکەوە، شوانەکەی چەند راوی دەنابگەڕێتەوە ناو گەلەکە پتر لە خەڵکەکە ئاڵنگارە دەبوو.

پیر کە بزنەکەی دی یەکسەر بزنە( ژیوا)ی هاتەوە یادو کت و مت لەویش دەچوو، لێ ی چووە پێشەوەو گرتی و دەستی لە مل کردو دەستەسڕێکی ئاوریشمی لە گیرفانیدا هەبوو دەریهێناو کردیە ملی و ماچی کردوو ئەجا کەبەری دا بزنەکە بە ئاستەم ڕێ ی خۆی گرتە بەرو چووەوە ناو ڕانە بزنەکان.

ئەوانەی کەلەگەڵی دا بوون   وەك: چوار سوارەکەی شای ساسان و سێ براکەو گەرامە کەر پێیان سەیر بوو کە پیاوێکی وا گەورە، یەکەیەکەی ئەو منداڵانەی ماچ کردو و بە دەستی خۆی نوقڵیان دەداتێ و دەیاندوێنێ! ئەوان شتی وایان نەدی بوو لای ئەوان وا باو بوو  ئاغایەك یان بەگێك یان گەورە پیاوێك ئەگەر شتێکی بە منداڵان بدایە بۆی تووڕ دەدان یان خڕی دەکردنەوە ئەوجا شتەکەی بەسەردا دەپژاندن، وەك نوقڵ و نەبات چۆن بەسەر بووك دا دەکرا وەها ، جا هەر منداڵێ ئازا بووایە پەلاماری دەداو لەناو دەست و پێیان دا بەشی خۆی دەڕفاند، هەبوو زۆری دەست دەکەوت، هەبوو هیچ ئەوانە وایان دەکرد ئەوانیش وایان دیبوو، ئەوەی پیر کردی شتێکی تر بوو پڕ بەرێزوو نەوازش بوو بۆ منداڵان، ئەو منداڵانەی وەك برادەری خۆی تەماشای دەکردن و بە زمانی ئەوان ئاخاوتنی دەکرد لە هەمووی سەیرتر ئەوە بوو لەمە لێی نزیك بوونەوە لەسەر وڵاخەکەی دابەزیو لەبەر ئەوەی ئەوان دەستی ماچ بکەن، ماچی دەکردن و دەستی بەسەریاندا دەهێناو بە شێوەی ئەوان سادەو ساکارانە قسەی بۆ دەکردن هەمووبەبێ دەنگی لەتەك قافڵەکەدا دەڕۆیشتن فرە وردیلەکانیان بزوز بوون پێشکەوتن و غاریان دەداو بەرەو دەگا گەڕانەوە هەتا بەخەڵکی دەگا بڵێن وا

گەیشتنە بەرەوە، کە نزیك بوونەوە، پیرو هێشاو هاورێکانی تێی گەیاند کە سەرداری دەگا خواجە بەهمەن ئەمری خوای کردووەو تەرمەکەی ئەسپەردە نەکراوەو چاوەڕوانی هاتنەوەی ئەوان دەکەن بۆیە داوای لێ کردن کەروو بەدەگا بوونەوە لە وڵاغەکانیان دابەزنو هەرکەس رەشووی ووڵاغی خۆی بگرێ و لەسەرخۆ بڕوات..

رەشووی وڵاغەکەی پیر درایە دەست سەپان پیر لەپێشەوە دەرۆیشت و هێشاو هۆزا بەدوایەوەو ئەوانی تر یەك لەدوای یەك بوون، هێشتا لە دەگاوە دەرنەکەوتبوون واران بەپیریانەوە هاتوو بەخێرهاتنەوەی هەنار خان و نازەنین و پیرخوادادو مەرێگای پێ راگەیاندن، بە زمانی هەنارخانەوە پێی ووتن ..(ئەگەر لەبەر مردنی خواجە بەهمەن نەبوایە هەر لە دوێنێوە هەموو دەگا بە پێشوازی بەپیریەوە دەهاتن)..

* * *

پیر کە بەناو خەڵکەکەو پێشوازی کارەکاندا بە ویقارو لەسەرخۆ تێدەپەڕی بەشێوازێکی وەهابوو هەردوولای خۆشی و ناخۆشی دەگەیاند، لەسەر ئاوێنەی جەمینی بێگەردیدا ئەو دووشتە بە ئاشکرا دەخوێندرانەوە، دەساڵ لەمەوبەر کە لەدەگا دەرچوو لاوێکی چەند خەیاڵ بۆی بڕوا ئەوەندە سەلارو سەنگین و مەند

بوو وائێستا وەسە پاشایەکی خاوەن شکۆ بێ و رۆژی چقە لەسەر نانی هاتبێ وەهابوو..

به قەتارەی خۆی و هاورێکانی بەو جۆرو جل و بەرگەوە سۆزە کپ نەبووەکانی ژنانی هێنایە هاژین و فرمێسکی خۆشی و ناخۆشیان تێکەڵاوو بەیەك دەبوون و دەجۆشانو لە چاویانەوەشەتاوەی دەکرد.

پەسەندی زڕ دایکی پیرشالیار کەدیی ئەو هەموو خەڵکە بە تاسەوەن بۆ دیتنی سیمیار قوفڵی هەموو مەگێزەکانی لەناخەوە ترازان و تووشی جەزبەی سۆفیانە بوو نەیدەزانی چۆن چۆنی لێی بچێتە پێشەوەو دەست لەملانێی لەگەڵدا بکات، هەر ئەوەندەی بۆ هات لەسەر رێگەکەیدا بەچوارمشقی دانیشێت و بە سمتی زەوی دەکوتایەوەو هەردوو دەستی بەرز دەکردەوەو دەیووت:

– هۆ کاکە سمیار گیان.. بەقوربانت بم کاکە سمیار گیان.. بەخێر هاتیتەوە کاکە سمیار گیان

کە پیر لێی نزیك بووەوە پەسەند پەلاماری داو توووند هەردوو دەستی لە مل کردو بە جۆرێکی وا پێوەی نووسا منالەکانی تەریق دەبونەوە، تا دوو ژن کاریان راسبێ پەسندیان لێ جیا نەکردەوە بەری نەدا.. کەس و کاری هێشا کە ئەو رەوشە ناشیرینەی پەسەندیان دی خەڵك پێیان باش نەبوو ئەوان لەسەر خۆو بەئاسایی پێشوازیی هێشایان کرد.

کەس وەکو دایکی هۆزا ( ئەختەر) نەکەوتووە ناو خۆشی و کامەرانییەوە بەڵام لەبەر مردنی خواجە دەری نەبرێ. ئەوەبوو کە هەواڵی هۆزای لەواران پرسیو پێ ی ووت..(ئەگەر ئەو نەبووایە، ئێمە نەمابووین) چی لەو مژدەیە خۆشترە! ئەو تا ئەو ساتە بەتەمای کوڕی خۆی نەبوو وا ئێستا وای لێ هاتووە شان بەشانی هێشا دەڕوا، ئیدی چۆن بست بە بست بالاّ نەکات !.. ئەو خۆی گرت و قەدی خۆی

نەشکاند، لە پێشەوە هەردوو شانی پیر شالیاری ماچ کردنو ئەوجا هی هێشاو ئەوجا دەستی کردە ملی هۆزای کوڕی لە خۆشیا هەردوو چاوی لەناو گۆمی فرمێسکدا نوقم بوون.. وتی:

– ئۆخەی هۆزا گیان ئەوە تۆی شان بە شانی هێشا لە دوای سیمیار گیانەوە دەڕۆی!..

هۆزا بە دڵێکی کەیلەوە دایکی ماچ کردوو وتی:

– دایە لە پیرۆزی تۆوە من پیرۆزم.

ئەختەر وەك ژنێکی سەلارو دامەزراو پێشوازییەکی دایکانەی شایستەی بە پایەی پیرشالیارو هاوڕێکانی کرد.. پیر کە گەیشتە ناو حەوشەکەی پەرستگا چووە سەر تەرمەکەی خواجە راوەستاو هەردوو دەستی نزای بەرز کردنەوەو هەندێ وێردی خوێندوو ئەوجا پەردەی سەر دەم و چاوی خواجەی لادایەوەو تەوێڵی ماچ کرد لە پاشدا چووە بەردەم هەنارخان و نازەنین،ئەو ئێش و ئازارەی کە لەلەشی هەنارخاندا مابوون لەپڕ مەحف بوونەوە بۆیە بێ پەروا لەبەری هەڵسایەوەو بەرامبەری راوەستا. پیر هەردوو دەستی هەنارخانی ماچ کردن و زەردەخەنەیەکی جاویدانی و خەمناك و پڕ تاس و خنکاوی بۆ نازەنین دەربڕی. هەندێ لەبەردەمیدا هەڵوەسەی کرد ئەویش پەشۆکاو بۆی نەهات چۆن گوزارشت لەو شکۆمەندیەی ئەو بە وتەیەك بداتەوە.

پیر یەکە یەکە پیاو ماقوڵانی بەسەر کردنەوەو هەردوو دەستی مامی پیر خوادادو ژیرلەی مەرێ ی ماچ کردن...

هێشاو هۆزاش بە هەمان چەشن دوای پیر چوونە بەردەم هەنار خان و نازەنین..هەنارخان حەزی کرد کە هۆزا وەك کەسێکی هەڵکەوتەی هێشا ئاسای لێ هاتووە، بۆیە پێ ی وت:

– هۆزا: ئەوە تۆی؟!

بەڵێ.. دایە گەورە، ئەوە منم هۆزای نۆکەرت..

– لێم ببوورە، نەمزانی وای ..

– تۆ لێم ببورە کە بە گوێم نەکردی و قسەم شکاندی...

– باشت کرد بەگوێت نەکردم.

هۆزا بە(باشت کرد بە گوێت نەکردم)ەکەیدا بۆی دەرکەوت کە هەنارخان پێ ی وتراوە کە ئەو لەو گەشتەدا چ دەورێکی هەبووەوە چی بەسەرا هاتووە!.

ژیرلەی مەڕێ رووی کردە پیرشالیارو وتی:

– دەزانی چەند ساڵ بوو خواجە هەر بەتەمای گەڕانەوەی تۆ بوو؟. بۆیە ئەسپەردەمان نەکرد تا بەهاتنەوەی تۆ ئاواتەکەی نەباتە ژێر گڵ، ئێستا چی دەڵێ ی؟.

– پیر وەرامی دایەوەو وتی:

– ئێوە چی دەڵێن وایە.

– ئێمە دەڵێین با ئەسپەردەی بکەین..

– فەرموون..

هەنارخان وەك نەخۆشی نەمابێ یەکسەر هەڵسایەوە سەرپێ و خۆی بە نازەنینەوە راگرت..

ئەو ئەسکەملەی کەبۆ هەڵگرتنی هەنارخان لەوێ ئامادکرابوو ، بۆ ئەوەی لەسەری دانیشێ و چوارکەس لەسەرشانیان هەڵی گرن و دوای تەرمەکە بکەوێ، پێویستی پێی نەما، کاتێ پیرشالیار هەردوو دەستی ماچ کرد لەگەڵ ماچکردنەکەدا ئەو ئازارەی کە لەجەستەیدا مابوو رەوییەوە.. ئیتر نەیویست

لەسەرشان هەڵی بگرن بەڵکو لەنگەری خۆی بە دوو ژن راگرت و کەوتە شوێن تەرمەکە...

گەڕامەکەر هەردوو دەسکی دواوەی دارە مەیتەکەی داگیرکردن و بەدەس کەسیەوە نەدەدان!. هەرکەسە هەوڵی دەدا لەو لەسەر شانگرتنە بێ بەش نەبێ.. هەندێ کەس داوایان لە هێشا کرد گەرامەکەر حاڵی بکات کە دەرفەتی کەسی تریش بدات بچنە ژێر تەرمەکەوە..

لەمە لە پەرستگاکە هاتنە دەرەوە قیژەوگریان و شین وشەپۆڕ دەستی پێ کرد. شمشاڵ ژەن و دەف لێدەرەکان و خاوەن چەمەریەکان شینەکەیان تاودا، دەگایاز هێنایە ناڵەو ڕۆڕۆ.. کە گەیشتنە سەر ئەو تروپکە کە گۆڕەکەی لەسەر هەڵکنرابوو، تەرمەکە دانرا، هەریەك بەلایدا تێدەپەڕێ بەسەر دانەواندنێك بەڕێی دەکرد، دوای ئەوەی کە بۆ ناو گۆڕەکەی شۆڕیان کردەوە و سەریان نایەوە.. پیرشالیارلە لای سەری راوەستاو، خەڵکەکەش لە دەور گۆرەکەی دانیشتن و سەریان دانەواندو و گوێیان بۆ واندنی مۆچیاری ئەوە نامای و گەرانەوەی خواجە بۆ بارەگای یەزدان گرت.. پیر بەم جۆرە مۆچیارییەکەی دادا:.

خـواجە مەردەن خـواجە مەردەن
هەرمانەو خوایش بەجێ ئاوردەن

ئەی خـوا ئامانەن خواجە مەردەن
ئینە کاریۆەن وێت ئـەفرا کەردەن
گەر گونـا بارەن گەر بێ گـوناهەن
بـە ئاگایی وێت ئـانـەشە کـەردەن

پەنـاش پەی قاپی لاو تـۆ ئاوردەن
چەنەش بویەرە هەر چێوێش کەردەن

وێت دروست کەردەن بیٚ دەسـەلاٚتن
چێش بـڕیارتـەن ئـانەش خـەلاٚتەن
بە رەنـگ زەردی ویش ئامان حزوورت
هـەر وێت مـزانی چێشەن دەسـوورت
جـەلاو ئێمەوە گـەردن ئـازادەن
چەنەش بویەرە هەرچێوەش کەردەن
بەزەردەشت و تـۆ بـاوەڕ ئـاوردەن
جە فەرموودەو تۆ نوکلیش نە کەردەن
راو ئـەوەدمایش وەنـە ئاسان کەر
هـەر گوناحیش هـەن چەنەش ویەرکەر
بـەڵەدیش کـەر راگـەکش دوورەن
زەردی رەنگەکەش شەرمی حزوورەن
بـا یـاگەش جـەلای یاوەرانت بـۆ
جـەمیهرو تـۆنە بـا ئـارامش بـۆ
ئامین ، سەد ئامین گرد واچدیٚ بەزار
نـەك جاریٚ ، ئامین ، ئامین هەزارجار

پاش تەواو بوونی ئەو مووچیارییە پیاو و ژنەکان دووا فرمێسکی گەرمیان بۆ ئاوابوون و ئەوە ئامای خواجە رژان تەرمەکەیان بەنەرم و نیانی بە خاك

سپارد     پیاوەکان لا کەوتن و ژنان چوونە پیشەوەو هەنارخان و نازەنین لای سەریەوە راوەستان و باوەشیان بەکێلە درێژەکەی بان سەریاکرد   کێلەکەیان بەسنگ خۆوە نووساندو هەر یەك سەری خستە سەرشانی ئەوی تر .. ئافرەتێکی سەرسپی چوو لێکی جیاکردنەوە    نازەنین هەندێ کشایەوە ، کەچی هەنارخان رووی کردە گڵکۆ کەو گوتی :

_ ( خواجە ؟.. لەبیرتە هەمەدەم دەمووت خوا بکا مەرگی من پێش مەرگی تۆ بکەوێ ،،دیارە مەرگ گوێی لەکەس نییە ، وا تۆ رۆیشتی و ئیمەت بەدیار خەمەوە بەجێ هێشت .. سەربەرزۆ بکەو ببینە هەموو خەڵکی دەگاو دەوروبەر لە دەورتن ، لەگەڵتا هاتوون ، بەخەم و پەژارەوە چاوی پر لە فرمێسکەوە راوەستاون وسیمیار و هێشاو واران گەڕاونەتەوە هۆزاشیان لەگەڵە ئای چەند بەتاسەوە بووی بگەڕێنەوە، وا گەراونەتەوە سەرهەڵبرە بیان بینە   خواجە! بریا من لەجیاتی تۆ بوومایەو ئێستا تۆ لەسەر گۆڕەکەی من قسەت بکردایە      وەلێ کاری یەزدان بەخۆزگە نییە، کەس دەست بەرداری ئەوی نییە   ئای خواجە! چاوت بگێرەو ببینە کە چۆن شای ئاریان زەمین سیمیاری هورمزیاری کردووە بە پیری هەموو پیران و ناوی ناوە ( پیر شالیار ) ئەوەتا ئەویش لەسەر گڵکۆکەت  راوەستاوە دەی هەڵسەوە بەخێر هاتن و پیرۆزبایی لێ بکە تۆ چەند ئاواتت بوو بگەڕێتەوە ، ئەویش ئەوەندە ئاواتی بووە پێت شاد بێتەوە   خۆ گوێت لێ بوو بە دەنگە خۆشەکەی چەواندێکی بۆ کردی !خۆ گوێت لێ بوو چۆن نزای بۆ کردی   بنوو گەردنت ئازابێ   لە شوێن خۆت ئارام بە ، لێت پیرۆز بێ ئەو ئارامگەیە، تۆ رۆیشتی سبەی ئێمەیش دێینە لات و هەموو پێکەوە بەرەو بارەگای یەزدان دەکەوینە رێ .. )

لەکاتی وتەکانی هەنارخاندا ژنەکان وەك ئاوی ناومەنجەڵی سەر ئاگر دەکوڵان وبەچمکی لەچەکەکانیان گریانی خۆیان دەپەساندەوە ناو هەناویان ..هەنارخان زۆر شتی تری لەدڵابوون بیڵێ بەڵام لەوە زیاتر قسەی بۆ نەهات ..فرمێسکەکانی خۆی بەرۆخی سەرپۆشەکەی دەسرینەوە ،لەپاش دا ئەو سەرپۆشەی تووند بەنووکی دارێکەوە گرێداو وەك ئاڵا لەژوور سەری گۆڕەکەی خواجەدا چەقاندی ، تاهێمابکات بۆ وەفاداریو گەردن ئازادی ..ئیدی بەبەردەم پیاوەکان دا تێپەریو ماتەمینیلێ وەر گرتن و داوای تەمەن درێژی بۆهەمووان خواست.

کەگەیشتە بەردەم ژێرلەی مەرێ وپیرخواداد دەستیراستی خستەسەر چەمەیگۆچانەکەی ئەو،ئەویتریانی بە بەرپشتێنی خوادادا کرد ..بەبێ ئەوە یەك وشەلەدەمی بێتەدەرەوە سەیری نێوچەوانی هەردووکیانی دەکرد فرمێسك لەچاویدا قەتیس مانو،ئەوەیلەدەروونیداهەبووبەتیشکی چاوەماندووەکانیو روومەتە رۆژگار بەزێنەکەی گوزارشتی بۆ دانەوەو تێی گەیاندن ..ئەوەش لەوهەلوێستەدا کە سەیری ئەوبێدەنگیەی دەکرد تێدەگەیشت چی لێ یان دەوێت ..کەگەیشتەلای پیرشالیار سەرنجێکی سەرتاپای لێداو نێوچاوی گەشایەوە،مەملەکەتیناو دەروونی بوو بە بەروبارێك لەقەراخیدا گوڵاڵەیهەمەرەنگە خرمەیان دا، بای ئومێدمان دەی شەکاندنەوە، بۆیە سەرسام ماو هەلوەسەیەکی کرد،ئەوەی فەراهەم بوولای کە پێی بڵێو وەك ژەرەژێکی دەنووك سووریتوورە فڕی وپێینەگیرا.. نەی زانی بناشت بووفەراهەمی هێنابوو یان بەخێرهاتنەوەی، یان پیرۆزبای بۆ ئەو پایەو سایەی بوو کەبۆ هەمووانی هێنابووەوە..شتێکی ئامادەکردبووپێی بڵێ، خۆیشی نەی زانیچی بوو، لەوهەڵوەسەدا لەدەسی چوو بۆی نەگیرا..نەی زانی چی بڵێ هەمووشتەکانیلێئاڵۆز بوون و هیچیانی پێنەوترا..حەپەسا !..هەرگیز خۆی

وانەدیبوو! ئەوهەمیشە وەك دایکێکی دڵۆڤان دەیڕوانییە خەڵکی دەگاو لەرووی دایکیەتیوە نازی بەسەردادەکردن،کەچی ئەوەتا لەبەردەم سیمیاردا وەك پەلکەدارێکی زەردی پایزانی لێهاتووەودراوەبەردەم رووبارەوە! دڵیپڕەوناتوانێ وتەکانی ناو سنگی ببزوێنێ نەبا وەك بەنگایەك بتەقنەوەو بیکەن بەژێرەوە نەدەزانرا لەتاومردنەکەی خواجە بەهمەن بووەوای لێهات یان لەخۆشی‌نزیك بوونەی بەختی نازەنین، یان تێکەڵاوبوو لە هەردووکیان !؟.. خۆیشی‌نەی دەزانی ...نا ..!

هێشا دەیزانی خەڵکەکە لەو هەلوێستەدا بەتەواوەتی تێنەگەیشتوون بۆچی بەزانای سیمیار دەوترێ(پیرشالیار) ویستی ئەو دەرفەتە بقۆزێتەوەو هەموو خەڵکیدەگا بەگەورە و بچووکەوە بەژن و پیاوەوە بزانن جگە لەوانیش هەندێ خەڵکی دەڤەرەکانی دەوروبەری هەورامانیش بۆ بەشداری کردن لە ئەسپەردەکردنی خواجەدا لەوێ بوون ،وەك جاردانێك ویستی پێیان رابگەیەنی کە زانای سیمیار لەلایان شای ساسانەوە پایەی (پیرشالیار)ی دراوەتێ کە دەکاتە پیری هەموو پیرەکانی ئاریان زەمین.. تا بزانن پیرشالیار خۆی ئەو ناوەی لە خۆی نەناوە.. لەلایەکی تریشەوە دەیویست ئەوە بگەیەنێکە ئەگەر خواجەیان لە دەست دەرچووە مانای ئەوە نییە دەگای هەورامان لە گەورە پیاوان چۆڵ بووە، خۆ ئەگەر خواجەگەورە مرۆڤی دەڤەری هەورامان بووبێ زانای سیمیار پیرشالیاری هەموو وڵاتی ئاریان زەمینە.. هەروەها هێشا دەیویست لە پشت ئەو مەبەستانەشەوە ئەوە بگەیەنێ کە ئەمرۆ پیرشالیار بە پایەو سایە لە هەموو کەس مەزن و گەورەترە.. ئەوەی هەنارخان و نازەنین خەویان پێوە دەبینی ئەوەتا خەون نییە و لە خەونیش باڵاترە.. بۆیە وتی:

- (خەڵکی دەگای هەورامان.. میوانە ئازیزەکان.. هەموومان گەردەنی خواجە بەهمەنمان ئازاد کرد.. ئەوەتا بە بارەگای خوا شاد بوو، ئەو باوکێکی میهرەبانی هەموومان بوو..ئەو رۆی،خوا حافیزی بێ، ماوەتەوەسەر ئێمە، ئێمەیش بەرێوەین و دەڕۆین و مردن هەموومان دەپێچێتەوەو برا گەورەی هەموومانەو دنیا بۆ کەس نامێنێ و چۆڵیش نابێ.. ناشبێ دەستە پاچە دوای نەمانی گەورە پیاوانمان دانیشین و خەم بە با بدەین، دەبێ کاروان بڕواو را نەوەستێ.. ئەگەر ئەو رۆییوەوە داخی بەدڵ هەموومان‌دا ناوە.. ئەو ئێستا لە گۆڕەکەدا گوێی لێمە: وای پێ خۆشە ئەو خەمانە زوو برەوێنەوە، ئەو ئاواتانەی کە بۆی نەهاتنە دی بێنە دی، ئەو رۆیشت و رۆڵەی بە ئەمەکی لە دوا بەجێ ماون، ئێمە هەموومان رۆڵەی ئەوین،هەنارخان دایکی گەورەمانە، نازەنین خوشکی بەرێزمانە، رۆڵەکانی دەتوانن لە گۆڕەکەیدا دڵی شاد بکەن.. ئەومان لە دەست دەرچوو، وەلی خوا بە گەورەیی خۆی چاکەی لەگەڵدا کردین بەهاتنەوەی پیرشاڵیار قەرەبووی بۆ کردینەوە، جێگەی ئەوی بۆ پڕ کردینەوە. حەزدەکەم پێتام بڵێم: پیر شاڵیار ڕۆلەیەکی بەئەمەکی ئەم دەگای ئێمەیە چەند ساڵبوو لەپێناو ئاینی زەردەشت و رێی خوادا لێمان دوور کەوتبووە، بەلاّم لەبەر زانایی‌و بلیمەتی خۆی لەلایەن شای ئاریان زەمینەوە پلەی(پیرشالیار)ی دراوەتێ‌و بەدڵسۆز ترین‌و گەورەترین زانا هەڵبژێردراوە. ئەمە مایەی شانازیە بۆ هەموومان، ئەمە بەرز بوونەوەی دەڤەری هەورامانە هەرچەند ئەو بەو ناوەوە خۆی هەڵناکێشێ وەلێ دەربارەی شای مەزن وا بڕیاری داوە کەوای پێ بووترێ –روانییە چوار سوارەکەی دەرباری شا – ئەوانەش چوار سوارەکەی دەربارن هاتوون ئەوەتان پێ رابگەیەنن کەمن پێتانم وت..)

نازەنین وەك دایكی سەری سوڕما بوو، هەستیان بەشتێكی سەیر دەكرد هەرگیز نەیانزانیبوو هێشائەوەندە بەدەمو دووە! بەبێ ئەوەی زمانی لەنگ بێ بەو جۆرە بەرامبەر بەو هەموو حەشتاماتە دوا!..

سیمیار بۆناڵێی ئەوەتانێ دەڵێی شای سەرزەمینەو چەندان تەخت و چقەو دەربار پێشوازی لێ دەكەن..تا دوێنێ بوو هۆزا كەس ئاوڕی لێ نەدەدایەوە ،وا ئێستا شان بە شانی پیرشالیارو هێشا رادەوەستێ، داخۆ لە ناو منداڵانی دەگادا چەندان قتولەی تری وەها هەبن خۆرە تاو خەریكی تنگاندنەوەیان بێ؟!. ئەمە كاروانی ژیانە، یەك دەكەوێو دوو راست دەبنەوە، چوار فەراهەم دەبن ئەوجا دوو رێ بەردەدەن، زەردەشت لە زووەوە فەرموویەتی:

(رۆژ دوای رۆژ روناكی پەرە دەسێنێ) ئەو جۆرە بیرۆكانە لە پشت خەم و پەژارەكانی هەنارخان و نازەنینەوە دەجوڵان و دەرسكان..

(وەسەنووچە) دەف ژەنێكی كارامە بوو لە كاتی ئەسپەردە كردنی خواجە بەهمەندا دەف لێ دانەكەی لەبەر وتەكانی هێشاو هەنارخان راگرتبوو لە سەر لەپی دەستی راگرتبوو، كەچی پەنجەكانی لەسەر كەوانەی دەفەكەی هەر دەجوڵانو لەكاردا بوون، دەم نا دەم بەپێی نەزمی هەڵچوون و داچوونی وتەكانی هەنارخان و هێشا ئەڵقەی ناو دەفەكەی دەهێنایە هاژین و دەیلەراندنەوە، بەوتەكەی هێشا ئەوەندەی

دی دڵی كەوتە كەف و كوڵ، چی هێز لە كەف و دەفدا هەبوو هەمووی خستە كار و دوا ناڵەی لە دەفەكەیەوە هەڵسان، كەلە بەردەم پیرشالیاردا راوەستا دەنگە

بەسۆزەکەی تێکەڵاو بەناڵەو هاواری دەفەکەی کرد، بە ئاوازی(ئەوە نامامەن) دڵی دەگای کردە هەورە تریشقەی وەهارێکی شێت..

مەتی(هاتیێ)ی جگەر سوتاویش لەناو ژنەکاندا کەیل بوو، هاتیێ ژنێکی دەنگ خۆش و جوان و پێکەوتەبوو بەدڵی خۆی شووی نەکردبوو کەمێردی نابەدڵیشی کرد، مێردەکەی و کورە هەرزەکارەکەی بەرووداوێکی دڵتەزین مردن و کۆس کەوتە بوو، هەموو دەریاچەی زرێبارت بەسەر کڵپەی هەستە ناسکە برینداراەکانیدا بکردایە نەی دەگوژاندەوە، خۆی رووخابوو وەلێ دەنگەکەی نەکەوتبوو لەزووەوە وازی لە گۆرانی هەرزەکارانەو شایی ئامێز هێنابوو خووی دابووە گۆرانی لاواندنەوە و ماتەمین.. لەوەختی پرسەو ماتەمیندا کەمردووی دەلاواندەوە بەردی دەتواندەوە.. لەو هەڵوێستەدا وا هەڵچووبوو رکێفی سۆزی خۆی پیێ نەکرا، ئازارو خەمەکانی بەسەر یەکدا کەوتن و هەرەسیان هێنا لەشی وەك سێبەرۆدار کەوتە لەرزین و جەزبە گرتن، دەنگی هەڵبڕی و ئاوازی

(ئازیز وە مەرگت)ی چڕی، ئاوازەکە لافاوێك بوو هەموو بەنگا مەندە خنکاوەکانی ئازارو خەمی ئەو حەشاماتەی بە شەتاوەی سۆزو ئاوازەکەی هێنایە کەف و کوڵ و تەقاندی..

* * *

## (١٤)

له سەرتاسەری دەڤەری هەورامان‌و دەڤەرەکانی دەورو بەریشدا تا دەگاتە قەوقان، دەنگ بڵاو بووەوە کە لە دەڤەری هەوراماندا پیرێك هەڵ کەوتووە، پاشای ساسان کردوویەتی بە پیری هەموو پیرەکانی ئاریان زەمین‌و نازناوی پیرشالیاری پێ بەخشیووە چونکە بە هەوڵ و تەقەلاو بلیمەتی خۆی توانیویەتی پارچە تەفرو توونابووەکانی ئاوێستا کۆ بکاتەوەو زەندێکی وای بۆ بنووسێ هەموو کەس بە ئاسانی لێی تێبگات و ئاینی زەردەشتی پێ نۆی بکاتەوە.. چەند دەنگ و باسەکەی دوور دەکەوتەوە ئەوەندەش شتی سەرسورهێنەری پێوە دەلکا.

لەو ساوە ناوی پیرشالیار ببووە وێردی سەر زمان، چی مۆبیدو مۆغان هەبوون حەزیان دەکرد دیدەنی بکەن و تاقی بکەنەوە کە ئایا وایەئەو کەسە کە هێشتا لە تافی لاویەتی دایە سەر لەنوێ‌ئاینی زەردەشتی زیندوو کردوەتەوەو ئاگاداری هەموو ووردو درشتێکی ئەو ئاینەیە؟..

خەڵکی گرفتارو دەردەدارو دێوانەو ئاین پەروەر روویان دەکردە دەگای هەورامان‌و بە دیتنی ئەو شادو بە فەڕ دەبوون و ناو دەروونیان پڕ لە نوری یەزدان و ئومێدیان بەبەر ژیانی خۆدا دەکردەوە.. پیرشالیار هەستی کرد دەگای هەورامان بەرەو ئەوە دەچێ ببێ بەناوەندێك رۆژ لەدوای رۆژ ناوی دەرواو خەڵك رووی تێدەکات، ئیدی ئەگەر دەگا هەر بەو جۆرە بمێنێتەوە لەوانە بوو نەتوانێ ئەو ئەرکەی کەدەکەوێتە سەری بەگای بهێنێ، بۆیە بەپێویستی زانی زوو

تەکبیرێکی وای بۆ بکات هەروەها نەمێنێ، ئێستا وای لێ هاتووە بووە بەسور ڕیانێك یان قژقلینێك خەڵك تیایدا کەمێك دەحەوێنەوەو دەڕۆن، بۆیە پیر بیری لەوە کردەوە بیکات بە بنکەیەکی ڕۆحی بۆ تێگەیاندنی ئاینداری و بوژاندنەوەو گەشەپێدانی خوا پەرستی دیارە ئەوەش پێویستی بەپەرستگایەکی وەك پەرستگاکانی شاری ئەکپاتانەو خانەگایەك هەبوو کەخۆی تیایدا سەقام گیر بکات و ڕێنماییەکانی تیا یەکتایی ئەهرۆمەزدای تیا بلاو بکاتەوە، هەم ببێت بە جێگەی حەواندنەوەی هەژاران و ڕێبواران و لێ قەوماوان..

چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد پرسەو ماتەمینی خواجە بەهەمەن تەواو بێ، ئەوساهەندێ شت لەبەردەمدا هەبوون

بیکات، بەسەرهەموویانەوە بەرەو دوا ناردنەوەی ئەوچوارسوارەیەی کە شا لە تەکیدا ناردبونی و یەك لاکردنەوەی شووکردنەکەی نازەنین و گەلێ وردەشتی تر.. لەبارەی هەنارخان و نازەنینەوە، کەلەگەڵ مامیدا پێکەوە دەبوون، بیرو هۆشی بۆ شوکردنەکەی نازەنین دەبزواند ،بۆی دەرکەوت بەوەی کەئەو بیری لێ دەکردەوە مامی وەها لێکی نەدەدایەوە، ئەوهەر ئەوەندەی لا مەبەست بوو بلێن برازای پیر خواداد، زاوای هەنارخانەو نازەنین ژنیەتی، سەبارەت بەو مەسەلەیە هەندێ شت هەبووله مامی دەشاردەوە، بۆیە وای بەباش زانی لەگەڵ هێشادا نەخشەیەکی پتەو بۆ ئەو مەسەلەیە دانێن و هەنگاو بەهەنگاو بەرەو جێ بەجێ کردنی بڕۆن ، هەرچەند هێشا چەندان جار وتبووی (من خاوەنی ئەو مەرجە نیم کەبۆ نازەنین خانم هێناوەتە دی ). وای پیشان دابوو خاوەنی ڕاستەقینەی مەرجەکە سیمیاری جاران و پیرشالیاری ئەمڕۆیە، وەلێ لای پیر تەنها ئەو وتنە ڕێ پاکەو کەرە نەبوو.. لە چاو خەڵکی دەگا و دەورو بەردا مەرجەکە هێشتا لەمل هێشا ئالأبوو، کەچی

هەر ئەو خەڵکە خۆیان دەیانووت(تا پیرشالیر وەستا بێ کەس بە هێشا ناڵێ لە کوێوە هاتووی..).

هێشا لەناو کولەکەی دڵی پیرشالیاردا بوو، حەزی نەدەکرد گەردێك بکەوێتە سەر پەڕەی دڵی، سەرکەوتنی ئەو پرۆژەیەی کەپیر لە هزری خۆیدا بۆ دەگای رەخساندبوو بە یارمەتی کەسانی وەك هێشا دەهاتە دی، بۆیە بە پێویستی زانی ئەو شتانە کە دەبوو بکرێت لەگەڵ هێشادا گفتوگۆیان لەسەر بکات و لەگەڵ ئەودا بڕیاران لەسەر بدرێ..

*　　*　　*

بە هاتنەوەی پیرشالیار، هەنارخان هەستی بە لەش ساغی کرد، وەلێ بە مردنی خواجە وای دەزانی لە دەشتێکی چۆڵدا ماوەتەوە و کەسی لە دەوریدا نەماوە، تا ئەو کات هەستی بەوە نەکرد بوو کە ئەو هەموو دەسەڵاتەی لە خواجەی مێردییەوە وەری گرتبوو، ئەو هەموو خەڵکە کەخۆیان بەبەر فەرمانی دەزانی لەبەر ئەو بووە! حەزی دەکرد بەشەوو بەرۆژ دیوەخان چۆڵ نەبێ و دەس و پەیوەند لێی دوور نەکەونەوەو دەرفەتی ئەوەی نەدەن لەگەڵ نازەنین دا بکەونە ناو خەم و پەژارەوە، بۆ ئەو ئەوەی تامی ژیانی تیامابوو تەنها نازەنین بوو، خۆزگەی دەخواست ئەو ئاواتەی کە هەیبوو وەك ئاواتەکەی خواجە نەیباتە بن گڵ.. بیدیبایە! نازەنین بە دڵ خۆی، بە ئامانجی خۆی گەیشتووە..

هەنارخان تووشی نەسرەوتی دەروونی و دڵە راوکێ ببوو، نەی دەزانی لەبەر چی هێشا هامشوی کەم بۆتەوە؟ ئایا لەبەر ئەوە بوو بە مێوانەکانی پیرشالیارەوە

خەریکە؟ یان شتێکی تر هەبوو؟ دەیان وەك واران و هۆزا هەمیشە لەبەر دەستیدا رادەوەستان و چاوەروانی فەرمانی بوون، کەچی بۆ ئەو هەموویان نموودی هێشایان نەبوو، چونکە ئەو لە زووەوە لەگەڵیان ژیابوو، گشت کارو بارو نهێنییەکی دیوەخانی دەزانی و جێگەی متمانەو دڵنیایی خواجە بوو، شێوەی ئەوی پێوە لکابوو، هیچیان لای ئەو نەدەشاردەوە ئەویش هەموو تەناهییەکی ئەوانی دەزانی. بۆیە بەو دڵیان دەکرایەوە.. ئەوەی دلە راوکێکەی دەنایەوە ئەوە بوو: دەبوو هێشا بەلای کەمییەوە رۆژی جارێ لەجیاتی خۆی و پیرشالیار سەری دیوەخانی بدایەو گوێی بۆ وتەکانی هەنارخان بگرتایەو لە دەمی خۆیەوە حکایەتی چوون و هاتنەوەکەیان ببیستایە هەنارخان لەبەر خۆیەوە دەیوت:

- کوا. لەو ساتەوە هاتووەتەوە وەك جاران نەماوە؟!.

لە ناوچەی هەوراماندا، هەر لە کۆنەوە وا باو بووە ئەوەی بەتەمای کچی ماڵێك بوایە بە مەحرەمی ئەو ماڵە دەژمێراو دەبوو بە خزمەتکارو هەڵسووڕێنەری هەموو کاروبارێکی ، هێشا وەك خزمەتکاری پیری لێ هاتبوو کەواتە دەبوو لە دوو لاوە ئەو جێگەی خۆی لە دیوەخاندا چۆڵ نەکردایە.. وا دیار بوو هێشا بۆیە لەو دوایەدا هامشۆی خۆی کەم کردبووەوە دەیویست دابڕانێك لەنێوان هزری ئەو خەڵکەو مەسەلەی شووکردنەکەی نازەنین دروست بکات.. هەر چەند هەنارخان بەو کەم چوونە سەخڵەت ببوو، کەچی نازەنین بەلایەوە کارێکی ڕەواو رێ خۆشکەرە بوو بۆ شتێکی وا کە هەنارخان لەو رووەوە بۆی نەدەچوو.. رەنگە پیرشالیاریش ئەو کەم هامشۆیەی هێشای لا باش بووبێ، تا لەناو هۆشی خەڵکدا هێشا بە نازەنینەوە وێنا نەبێ،کە مردنەکەی خواجەش لە دەفتەری یادەوەریدا رۆژگار کاڵی کردەوە ئەو کاتە دەرگا بە ئاسانی بۆ مەسەلەی نازەنین دەکرێتەوە و رێی ئاسایی خۆی دەگرێتە بەر.. ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە هێشتا کفنەکەی

خواجه له گۆڕەکەیدا بۆنی خاکی لیّ نەنیشتبوو، ئەگەر وا نەبوایە ئەندامانی مەرێگا لەمێژ بوو داوایان لیّ دەکرد کە شووکردنەکەی نازەنین بخەنە بەر بڕیارو کۆتایی هێنان و ریّ نەدان بەوانەی کە هێشتا کۆلکە نیازێکیان لەو بارەوە هەر مابوو.. پیرشالیار دڵدارێکی حەکیم و زانا بوو دەیزانی چۆن رکێفی ئەو سۆزەی دەربارەی نازەنین لە دەست بگرێت و بە چ جۆر بۆی بڕوا، لە کاتێکدا لەوە دڵنیا بوو نازەنین جگە بۆ ئەو دڵی بۆ هیچ کەسێك لیّ نادات،پاڵنەری تەقینەوەی ئەو بلیمەتیەی پیرشالیار لە خۆشەویستی نازەنین بەدەر نەبوو، چرای ئەو خۆشەویستییەی لەناخەوە شەوقی دەدایەوە و ئاوێتەی رازونیازو هەناسەو هەنگاوەکانی ببوو.. ئیدی وای بە پەسەند زانی بەر لە هەموو شتیّ لەگەڵ هێشادا ئەو مەسەلەیە یکلا بکاتەوە و گەردێکی ئەو مەسەلەیە لەنێوانیاندا نەمێنیّ و کەلێشی چوونە پێشەوە بە چاوێکی کراوە و دیدەیەکی رووناکەوە ئەو کارە بە ئەنجام بگەیەنن و بزانن بەیەکەوە چۆن روو بەرووی دەبنەوە..

پیر لە حەوشی پەرستگاکەدا راوەستابوو چەند کەسێك دەورەیان دابوو بەتەمای ئەوە بوون پیر کارێکیان پیّ راسپێریّ یان لەگەڵیاندا بدویّ،رووی بەلای هێشادا کردوو دەستی خستە ناو دەستی و لەو کەسانەی کە لەویّبوون دوور کەوتنەوە تا گەیشتنە پشت پەرستگاکەو پێکەوە دانیشتن.. پیر رووی کردە هێشاو وتی:

– هێشا! برای ئازیزم.. تۆ گەلیّ قوربانیت بۆ من داوە، لەوە زیاتر نامەویّ بۆ من ماندوو ببی.. حەز دەکەم پێکەوە لەسەر هەندیّ شت هەن بدوێن و بڕیاریان لەسەر بدەین..

– چی دەفەرمووی لە تۆ فەرمان و لەمن هەرمان..

- نابێ هەروا دانیشین، چۆنمان بۆ ڕێکەوت وا بکەین، دەشێ ئێمە پێش شتەکان بکەوین، بیان جوڵێنین و هەڵگێرو وەرگێریان بکەین،کام لای دەسی داو چۆنمان بۆ لوا، یان چاکەی چۆن بۆ هەمووان فرە تر بوو بەو لایەدا پاڵیان پێوە بنێین و دەسکاریان بکەین.. نەك ئەوان بێن و دەسکاری ئێمە بکەن، ئەو کاتە ببین بە دەونی دەم ڕەشەبا.. تێدەگەیت؟.

- گەورەم تۆ بەو هەموو زانستەوە و من بەم هەموو نەزانینەوە لە کوێ لە مەبەستی تۆ تێدەگەم!.. حەز دەکەم کە قسەم بۆ دەکەی وەبزانە قسە بۆ خزمەتکارێکی نەزانی خۆت دەیکەی، وام تێبگەیەنە!..

پیر ئەوەندە هێشای خۆش دەویست کە قسەی لە تەکدا دەکرد وای دەزانی قسە بۆ خۆی دەکات.. کە هێشا پێی وت:(حەز دەکەم کە قسەم بۆ دەکەی وەبزانە قسە بۆ خزمەتکارێکی‌نەزانی خۆت دەیکەی). پێکەنینێکی ئاستەمی لە ڕوودا پەخشکردو هەر دوو قۆڵی گوشی ، وەك بیەوێ ئەو سنوورەی کە لە نێوانیاندا هەیە ڕای ماڵی و تێکەڵاو بەیەك ببن..

- نا.. من هەر ئەو سیمیارەی جارانم، تۆش هێشای هاورێمی.. چەند شتێك هەیە، دەبێ پێکەوە قسەیان لەسەر بکەین.. یەکێك لەوانە شووکردنەکەی نازەنینە..

- قوربان! پرسی منی ناوێ.. ناوی خوای لێ بێنەو ئێمەیش سەرمان لە ڕێتە..

- ئەی تۆ؟!.

- من؟ جگە لە پیرۆزبایی و خزمەت شتی تر نازانم..

- نا.. تۆ لە چاو خەڵکدا مەرجی نازەنینت لەملە..

– گەورەم گەر تۆ نەبوایت من چی بووم تا مەرجی نازەنین ببەمەوە ئێستا بەم ڕۆژی نیوەڕۆیە بم خەنە ناو ئەو حەوزەوە، ئەگەر تۆ ئاگات لێم نەبێ یەك سات ئابا دەبمە تەختەی سەر ئاو.. حەز دەکەم ئەوەش لە حزوور تا بڵێم:

ئەو شەوە کە بڕیار درا من بێم بە شوێن تۆدا، لە دیوەخاندا بە ئامادەبوونی خواجە و هەنارخان و نازەنین و پیاو ماقوڵان و کەسوکاری خۆم وتوومە من خاوەنی مەرج نیم.. خەڵکیش لە پشت ئەو ڕەواڵەتەوەراستییەکەیان دەزانی. خواجە ، هەنارخان ، نازەنین لە من و تۆ باشتر ئەوەیان دەزانی.. قوربان با پێت بڵێم: لە وڵاتی ئاریان زەمیندا ئەوەی شایستەی نازەنین خان بێ هەر تۆیت، ئەو خانمەش شایستەی ئەوە بێ ببێ بە هاوسەری تۆ نازەنین خانە.. من خزمەتکاری نازەنین خانم، خزمەتکردنی ئەوان و تێکەڵاو بوونی تۆ، منی کرد بەم هێشایە کە لە پشت سەری تۆوە بڕۆم.. دەنامن بەپتکە بەردێکی ناو ئەو خڕە بەردانەی قەدباڵی ئەو شاخانە نەدەشیام، کەچی ئەمڕۆ لە سایەی خاڵی خواجەو تۆوە وا خۆم بە ئەنگوستیلەی ناو پەنجەکانی تۆ دەزانم.. من حەز دەکەم زوو دەست و برد لەو کارەدا بکەین.. دەسەڵاتی دنیاو دین لە یەك گرێ بدەین و سایەو مایەی هەورامان بەر فراوان بکەین.. فەرموو فەرمان بدە، تا بە دڵ و بە گیان شان بدەمە بەری..

بەر لەوەی هێشا وابڵێ، پیر نیازەکانی هێشای لا بێ گومان بوون، وەلێ دەیویست پەڕەی دڵی خۆیان بۆ یەکتری بکەنەوە و ئەگەر گەردێك هەبێ بەیەکەوە لای بەرن.. گەرمی ناو وتەکانی هێشا وای کرد پیر توووند باوشی پیا بکات و ناوچاوانی ماچ کات و ئەوجا پێی وت:

– ئەی ئەگەر نازەنین مەرجی دووەمی هێنایە پێشەوە، نە بە من نە بە تۆ، نە بە هەردووکمان بەیەکەوە نەهاتە دی چی بکەین؟!.

– قوربان هەموو مەرجێکی بۆ تۆیە،مەرجێ بەتۆ نەیەتە دی ماناى وایە ئەستەمەو بەکەس نایەتە دی، نا.. گەورەم نازەنین بلیمەتە بۆیە ئەو مەرجەی هێنایە پێشەوە، تا خەڵکی دەرەکی وازی لێ بێنن و لە دەگا نەچێتە دەرەوە.. لە دەگاشدا کێ مەرجی بوو؟ تۆ..

– ئەگەر ئەو مەرجی نەبوو من هەمە!..

– تۆ؟!.

– بەڵێ من.. مەرجێکم هەیە..

– تێ ناگەم!.

– تا تۆ ژن نەهێنی و نازەنین لە شایەکەتدا شایی نەکات، نە من ژن دێنم، نە ئەو شوو دەکات..

هێشا دەمی بەیەکدا هات، هەر ئەوەندەی پێ وترا..

– نازەنین خان، فێری کردین بە مەرج شوو بکەین و بە مەرج ژن بێنین.

پیر وەك لەناو دڵی هێشاوە هاتبێتە دەرەوە، وتی:

– مەرجەکەی تۆش هەر وایە؟..

– بەکێ؟!.

پیر دەسماڵەکەی نگینی لە باخەڵی دەرهێناو وتی:

– بە خاوەنی ئەمە.

– بەڵێ گەورەم.. نازانم بۆ چی حەزمان بەیەکتری کرد، پەیمانم دایە.. پێم وتووە ئەگەر رزگاربووم، فەرامۆشت ناکەم، ئەوە بوو ئەو فریام کەوت.. ئەو نەبوایە نە من نە واران، نە هۆزا ئێستا تۆزیشمان نەمابوو.. بەڵێ پەیمانم دایە.. بەلاّم من لێرە و ئەو لەوێ، کێ ناڵێ داخۆ ئێستا چی بەسەر هاتووە!..

- هیچی بەسەر نەهاتووە.. نەچووە بچیٚ هەر وەفاداری تەنها بۆ تۆ نەبووە..حەقی بەسەر هەموومانەوە هەیە..(پیر دەسماڵەکەی والاٚ کردو لەبەر چاو هێشادا رای گرت) سەیری بکە.. چی دەڵیٚ؟..

هێشا وەك لەبەر ئاوێنەیەکی بالاٚنمادا راوەستا بیٚ وەها دەموچاوی خۆی کردەوەو سەیرێکی وردی دەسماڵەکەی کردو رووانییە پیرو دەمی بەیەکدا هات و قسەی نەکرد..

پیر وتی:

- دەزانی ئەو رێیە کە خەتێکی راست و چەپی لەسەر داناوە مانای چییە؟..

- ؟..

- مانای ئەوەیە لەو رێیەوە مەڕۆن، داوێکتان بۆ نراوەتەوە.. واتە نەك هەر تۆ بەڵکو بەم نامەیە هەموومانی قەرزار بار کرد، بەم نامەیە رزگار بووین. کەواتە لەسەرمانە ئێمەیش پاداشتی بدەینەوە، ئەگەر لەسەر پەیمانی خۆی مابیٚ بیکەین بە بووکی دەگای هەورامان.. هێشا لە خۆشیان خەریك بوو دەنگی پەیڤەکان لە گەروویدا بخنکیٚ، لە خۆشیدا هەر ئەمەندەی پیٚ وترا..

- قوربان ئێستا دەگا چاوی لە تۆو نازەنینە..

- رەنگینیش چاوی لە دووی تۆیە..

هێشا بە وتەکەی پیر کە وتی:(ئەگەر لەسەر پەیمانی خۆی مابیٚ..) خورپەیەك کەوتە ناو دڵیەوە بۆیە وتی:

قوربان خوا دەزانیٚ ئێستا رەنگین چی لیٚ هاتووە..

وای وت، تا بزانیٚ ناو دەروونی پیر چی پیٚ دەڵیٚ، کە پیر وتی:

- نا.. تا ئەم دەسماڵە لای ئێمە بیٚ و گەرامە نەگەڕێتەوە ئەو هەر چاوەڕوانە..

که پیر وای وت.. هێشا گەشایەوە و گومانی لا نەما کە رەنگین لەسەر پەیمانی خۆیەتی..

پیر وەك یەکێك لە خەو راچڵەکێنێ وەها دەستی هێشای راوەشاندو وتی:

– دەبێ لەم ساتەوە ئەو کارە بکەینە دەستەبەری کارەکانمان..

– قوربان.. تکات لێ دەکەم.. کاری من واز لێ بێنە و خۆت مەرەنجێنە..

پیر دەنگی هەڵبڕی :

– هێشا! ئەوەی تۆ دەیڵێی دەکاتە ئەوە کە وازیش لە نازەنین بێنین و لایدەیەك بێ دەگامان لێ زەوت بکات..

– قوربان کەوای لێ هات چۆنی بەباش دەزانی با وابێ..

– زۆر باشە.. ماوەتەوە سەر شتێکی تر..

– فەرموو..

– ناردنەوەی ئەو چوار سوارەی دەربارو مەسەلەی ئەو سێ برایە... ئەم کارانە دەشێ بە پەلە رایی بکرێن..

– ئەی گەرامە کەڕ؟.

هێشا کە ناوی گەرامە کەڕی خستە ناو ناوانەوە، پیر سەیرێکی پڕ بە بە شەوقی نێو چاوانی هێشای کردو زەردەخەنەیەکی جاویدانی دایە بەر شەپۆلی قسە بە سۆزەکەی و دەستی لەسەر دڵی داناو وتی:

– دیت؟ گەرامە کەڕت چەند خۆش دەوێ!.. ئەوە ئەو دڵە گەرمەیە شەوان ئەستێرەکان دەسترێژی لێ دەکەن و بۆیان کپ نابێتەوە.. ئەگەر ئەو دڵە گەرمە نەبێ، ئەو هەموو دڵسۆزی و رۆشناییە لەکوێوە سەر دەکات.. داخۆ ئێستا دەڤەری بێستون زەمین چەند بەرینتر بووبێ و چەندان دڵبریندارێ عیشقی رەنگین تێیدا سەما دەکەن.. پیر لە کۆتایی وتنەکانیدا وتی:

- وات دەزانی ئاگام لەو دڵە ئاوەدانە نییە چ گرێکی تیایە..

- قوربان؟!.

- نا.. دڵ ئاوێنەی دڵە.. ئەو کارانە دەجوڵێنن و بە چوستی لە گەڵیاندا دەکەوین کار، تا ئەوانە گەلاڵە دەبن دەشێ کارێکی تریش هەیە بیکەین..

- فەرموو..

- دەشێ لە شوێن ئەم پەرستگایەدا لەسەر تەرزی پەرستگاکانی ئەکباتانە پەرستگا بۆ شاگردو مۆبێدو موغان و دەروێش و رێبواران بکەینەوە لە نزیک ئەویشەوە خانەگایەك بۆ دیدەنی کۆبوونەوەکانی مەرێگا دروست بکەین.. هێشا بەو نیازەی پیرشالیارە گەشایەوەو وتی:

- قوربان ئەگەر تۆ وات نەوتایە، لە نیازمدا هەبوو وات پێ بێژم کە ئێمە پێویستمان بەو شوێنانە هەیە، لەمەو پاش کە دەبینە خاوەن دەسەلاتی دنیاو دین خەڵك لە هەموو لایەکەوە روومان تێ دەکات، کەمێوانمان زۆر بوون، دەبێ ئەوانیشمان هەبێ..

- کەواتە لە پێشەوە ناردنەوەی ئەو مێوانانەو سۆراخکردنی رەنگینەوە دەست پێ دەکەین، لەو لاوە دەجوڵێین و لەم لاشەوە دەست دەکەین بە بنیاتنانی پەرستگاو خانەگا.. دەگای هەورامان دەکەینە شارێك بۆ هەموو دەڤەری هەورامان و دەوروبەری..

– تۆ بڵێی ئەو کارەمان بۆ برەخسێ؟..

– بە هیمەت دەرەخسێ..

پیر دەستی خستە ناو دەستی هێشاو وتی:( با بڕۆین بزانین چۆن دەست پێ بکەین دەست لە دەست و یارمەتی لە خوا..) بەرەو ماڵی پیر خوادادی مامی روویان ناو رۆیشتن..

* * *

ژنخوازیان لە خۆ دوور دەخستەوە، جوانیش نەبوو خەڵکانی تر بۆ مەسەلەیەکی وەها لێیان بچنە پێشەوە، خۆ ئەگەر ئەو مردووە پیاوێکی ناودار و سەرداری دەڤەرێك بوایە، ئەو نەریتە هەموو دەڤەرەکەی دەگرتەوە، نەدەبوو زوو ماتەمینی ئەو سەردارە بشکێ، ئەگەر ناچاری وای بخوازستایە، دەبوو پرس بە بنەماڵەی ئەو مردووە بکرێ.. خواجە بەهمەن بۆ دەڤەری هەورامان سەردارێکی پێویست بوو، لایهەمووان خۆشەویست و رێزدار بوو، لەناو سەرداروبەگەکانی ئەوسەردەمەدا دیاروتایبەتمەندی خۆی هەبوو، لەورۆژگارەی ئەودا ستەمکاری دەستبەری دەستەلاتدارەکان بوو، کەچی ئەوجەربەزە نەبوو پیاوێکی میهرەبان و دڵنەرم و بیرفراوان بوو، منداڵی نێرینەی نەبوو، بەپێوەری ئەو دەمە ئۆجاخ کوێر بوو، وەلێ هەنارخانی حەرمی ونازەنینی کچی هەموو کەلێنێکیان بۆ پرکردبووەوەو وێرای ئەوەش هەموو منداڵی دەڤەرەکەی بەمنداڵی خۆی دەزانی، خۆی لەخەڵکەکە جیانەدەکردەوە، لەهەمووکاروفرمانێکداپرسی بەئەندامانی

مەرێگاو خەڵکەکە دەکرد، بەئازاریان ئازاری دەچێشت و بەخۆشیان دەگەشایەوە ،نەی دەهێشت کەس دەستی خراپەیان بۆدرێژبکات

ناوچەی هەورامان لەسەرکاروانچیەتی گوزارانی خۆیان بەرێوەدەبرد،کاروان وکەڵکیان لەپانتایی هەورامان لەهەرچوار لاوە، دەچووەدەگەڕایەوە، لەسەرەوە دەگەیشتە ولاّتی میدیاو دەریاچەی وان لەخواریشەوە تادەگەیشتە نزیکی مایەدەشتو ئەکباتانەو لەرۆژئاوا ورۆژهەلاّتەوە دەگەیشتەولاّتی پارس و ناوچەکانی شارەزوورو نەینەوای دەبەزاند، لە کاروانەکانیدا بەقازانجی باشەوەدەگەڕانەوە کەچی خواجە وەك

سەرداری ناوچەکانی تری نەدەکرد، باج لەکاروانەکە وەربگرێ، بۆیەلای هەمووان وەك باوکێك تەماشادەکراو خۆشەویست بوو، پیاوەتی خواجە لەلای پیرشالیار لەهەمووکەسی دی زیاتربەولاّتانداگەڕابوو،دەیزانی ئادەمیزادی ولاّتان چتۆ بەدەست سەردارەکانیانەوە زەلالەتیانە، چتۆ لەژێرباری ستەمیاندا دەنالێنن، لەبەرئەوە ئەو لەهەمووان فرەتردەیزانی هەورامان بەمردنی خواجە کۆسێکی گەورەی لێکەوتووە..

هاتنەوەی پیرشالیارو مردنی خواجە هاوکات بوون، زۆر شتی لەلای هەنارخان تێکەڵ بەیەك کردن و سەروبەری شتەکانی لیَ تێك دا،دوو رووداوی گەورەی دژ بەیەك بوون: مردنی خواجەو هاتنەوەی پیرشالیار بەو هەموو پایەو سایەوە کە پێی درابوو، ئەو وای دانابوو: ئەگەر هاتەوەو لەو نەخۆشییەی چاکی کردەوە شایی و زەمرەمەیەك بۆ گەڕانەوەی بە ناوی چاکبوونەوەی ساز بکات، ئەو خواجەو نازەنینی وا حاڵی کردبوون، کەچی بە مردنی خواجەو هاتنەوەی ئەو کەوتە ناو گێژاوێکەوە بەرو پشتی شتەکانی لیَ تێك داو گێژینەی پرۆسەکانی

بەسەر یەکدا رووخاند.. لە هەمان کاتدا شەوقدانەوەی‌نگینی نازەنین کەلەناخیەوە ئاسۆی دابوو جێی بەتاریکی لەق دەکرد ومەیدانی بۆرۆژێکی نوێ ئاچوخ دەکرد مەسەلەی شایی‌و شیوەنەکەی هەنارخان‌و سەرجەمی خەڵکی دەگا بۆ پیرشالیار تاقیکردنەوەیەکی ئەوتۆ بوو ئەگەر بە بیروو هۆشی پیر نەبووایە بۆ یەکێکی دی بووایە ستەم بوو بەسەرکەوتووی تیادەرچێ .. ئێستا ئەو بەرامبەر چەند کارێك راوەستاوە، زرووفەکە وای لێدەخوازێ بیکات بەسەنگی مەحەك بۆ دەربازبوونێکی هێمنانە لەوتاقیکردنەوە، بەرلەهەموویان مەسەلەی هێشاو رەنگین بوو کەچیەو ویتەویتی ناوخەڵکەکەی پێ یەکلاًدەبووەوە، وای‌بەباش زانی لەدووتۆی گەرانەوەی‌ئەوچوارسوارەی دەرباری شادا سەرەتەقەیەکیش لەگەڵ ئەومەسەلەیەدا بکات، واتە لەگەڵ گەرانەوەی ئەواندایەکدوو کەسێك لەتەکیاندا بنێرێ وسەردانێکی رەنگین بکەن، وای‌بەباش زانی پێشەکی کۆبوونەوەیەك لەگەڵ هێشاو خوادادی مامی بکات،تابزانێ ئەوان بیریان چۆن بۆ ئەوکارەوکارەکانی‌تردەروات ..کارەکان ئەمانەبوون :

١ - گەرانەوەی ئەو چوار سوارەکە لەپایتەختەوە لەگەڵیدا هاتبوون، بەشێوەیەکی وەهاگەرانەوەکەیان بارتەقای ئەوزەحمەتە بێ کەئەوان لەپێناو بەسەلامەتی گەیاندنەوەی‌ئەوداکێشابوویان، هەم لای شا شایستەی ئەوەشبێ رووی گەشی دەڤەرەکەو دەوروبەری پیشان بدات..

٢- ناردنەوەی یەکێك لەسێ براکە بۆئەوەی هەم سۆراخی خوشکەکەیان بکەن هەم ببێتەزمانی گەرامەکەر کەدەگەرێتەوە لای رەنگین وخەبەری دەداتێ کەهێشا لەسەر پەیمانی خۆیەتی،هەم هەواڵ هێنانەوەی رەنگین، هەم مژدەدان بەشاکە پارچەیەکی تری ئاوێستا دۆزراوەتەوە، کەئەویش ئەوحەمایەڵەی‌رەخشان دایکی

ئەوسێ برایە بوو، پیر کەتەماشای نووسراوی ئەوحەمایەڵەی کردبوو. دوایبەراوردو لێکۆلینەوە بۆی دەرکەوتبووبەشێکی گرینگی ئەو (گاتانە)ی ئاوێستا کەسۆراخیان نەبوو، لەناوئەوپارچە نووسینەی حەمایڵەکەدان،کەئەوەش مژدەیەکی گەورەی بەشای ساسان دەگەیاندو بەخششێکیشی بۆئەوبرایانە تیاهەبوو، هیچ نەبێ بەهۆی ئەوەوەبراکان دەیانتوانی ستەمدیدەیی خۆیان بەشا بگەیەنن و سۆراخی خوشکەکەشیان بکەن، هەم دەبووبەیەکێك لەوانە، کە جۆرە داخوازێکی رەنگینیان بۆ هێشا دەکرد

٣ – ناردنی چەند کەسێك بۆ دەڤەرەکانی دەوروبەری ناوچەی هەورامان و پێراگەیاندنیان کە پیر شالیار دەیەوێ پەرستگایەك بۆ فێرکردن و خوێندنی ئاوێستا و رێنماییەکانی ئاینی پیرۆزی زەردەشت لە دەگای هەوراماندا بنیاد بنێ، بۆ ئەوەی ئەوانە ئاگادار بن و ئەگەر توانییان بار بووی خۆیان رەوانە بکەن

کە پیر شالیار و هێشاو پیر خواداد لە هەموو رووێکەوە ئەو شتانەیان هەلگێر و وەرگێر کرد، پیر خواداد وای لا پەسەند بوو ئەو شتانەش لەگەڵ هەنار خان دا باس بکرێن بۆ ئەوەی ئەو خاتر جەم بێ و هەرکارێك بکرێ لەو نیهاد نەبێ، نەوەك وابزانێ پاش خواجە پاییەی کەم کراوەتەوە ، بەلکو بەپێچەوانەوە هەتا هەست بکات رای ئەو دەربارەی هەموو کارو کردەوەیەك سەرپشکی هەموو رایەکەو دەسەلاتی ئەو سەردەستەی هەموو دەسەلاتێکە ، وەلێ پیر شالیار ختورەی ئەوەی هەبوو لەگەڵ راستی راکەی مامیدا هەست بریندارییەکی هەنار خانی تیا بێ، چونکە ئەو لە هەموو کەسی دی شارەزایی سروشتی ژنان بوو، پێدەچوو ئەو پرس و را پێکردنە بیری بەلای ئەوەدا راکێشێ گوایا وابزنێ دەسەلات لەوەوە دەگوێزرێتە بۆ کەسانێکی تر، بەتایبەتی کە دەبینێ لەلایەن شای ئاریان زەمینەوە

ئەو پایە مەزنە بە سیماو دراوەو بە هەموو سەلتەنەتەوە هاتۆتەوە ئەوەش بەلای هەنار خانەوە قەیدی نەبوو ئەگەر ماوەیەکی زۆر بەسەرمردنەکەی خواجەدابڕۆشتایە،ئەوەتاهێشتاپرسەکارانیخواجە پابڕنەبووبوون وژنانی دەگاش کەوە پۆش بوون وپرسەیان نەشکاندبوو..لەگەڵ ئەوهەمووشتانەشداپیرپێی خراب نەبوومامی بڕواتەلای وبەبەهانەی پەلەکردن لەگەڕانەوەی ئەو سوارانەی دەربار قسەبکات و لەپەناشەوە هەندێ وتەیماناپەنهان سەبارەت بەمەسەلەکەی هێشا بهاوێ و بزانێ کاردانەوەی ئەوبابەتەلەلای هەنارخان چۆنە!..ئەگەر لەبەر ئەوەنەبوایە جگەلەپیرشالیار نەبێ کەس لەگۆڕەپانی بەتەمابوونی نازەنیندا نەمێنێ، لەبەرئەوە نەبوایەهەرگیزرێی نەدەدا بەو زووە داخوازی رەنگینی بۆ بکرێ،کێدەزانێ رەنگە دڵدان وپەیماندانی بەرەنگین هەرلەبەرئەوەبووەتاهیچ گەردێك لەرێی بەیەك گەیشتنی پیرشالیارونازەنیندا نەمێنێ ..

لە وەتەی هێشا پیر شالیاری ناسیوە، وتەکانی ئەوی وەك ئاڵقەلە گوێی خۆی کردووەو قسەی نەخستووەتە بەر وتەکانی پیر، وەلێ چونکە ئەو بابەتانە لە چکمێکەوە پیوەندییان بەوەوە هەبوو،رایەکی جوانی دەربڕی،کە ئەویش ئەوە بوو، بۆ ئەوەی ئەو لە مێشکی هەنارخان و کەسانی تردا لەگەڵ پیردا هاوجووت نەبێ، هەروەهاش تا هەنارخان هەست بکات پایەو سایەی لە هی جارانی بەر فراوانترە بۆیە داوای کرد لەگەڵ پیر خوادادا ژێرلەی مەرێش بڕوات و پێکەوە ئەو کۆمەڵە بابەتانە بخەنە بەردەمی، واش بدەنە قەڵەم کە ئەگەر ئەو ئارەزوو بکات ئەو کارانە دەکەن، ئەگەر پێشی پەسەند نەبوون ئەوا نایکەن.. ئەوەی خستە روو کەچی دەیزانی هەنارخان دەست ناخاتە رێی کارو باری هیچ کەسێك ئەگەر پرسێکی دایکانەی پێ بکات.. داواکەی هێشا جێی خۆی گرت، چۆنی وت پیر وای لەسەر بڕیاردا..

پیر خوادادو ژیرلە چوونەکەی لای هەنارخانیان خستە سەر بەناوچوونی پیاو ماقولانی دەگاوە، کە لەگەڵیدا کەوتنە قسە بەو جۆرە لەگەڵیدا دوان کە ئەو سەرداری هەموویانەو هەر واش دەمێنێ، نابێ دەستە ئەژنۆ دانیشین و بە دوای مردنەکەی خواجەدا بڕوانن و جەڵەوی کاروباربەر بدەن و پشت لە داهاتوو بکەن..

ژیرلەی مەرێ دەیزانی چۆن ئاخاوتن بکات و چۆن حیکمەتسازی لە دوو تۆی وتەکانیدا ناوەخەن بکات و دەیزانی ئەو بیرانەی دەیخاتە روو چۆن و لەکام قاڵبدا دایان دەرێژێت.. ئەوەی هۆشمەند نەبووایە درەنگ پەی بەمەبەستی و تەکانی دەبرد.. لەگەڵ هەنارخاندا کە کەوتنە قسە، ژیرلە گەلێ نموونەی پەردە پۆش و هێماداری بۆ وتەکانیخۆی هێنایەوە.. هەنارخان زیرەك بوو، لەمە ژیرلەو پیرخواداد هانای قسەیان لە دەم ترازا ئەو راستەوخۆ حاڵی بوو قسەکانیان بە دەور پیرشالیارو پاشە رۆژی نازەنین دا دەسووڕێنەوە.

نازەنینیش لەدایکی باشتر دەیزانی وتەکانیان لەبەر بای چ شەماڵێکدا شەن دەکەن،سەرجەم باسو خواسەکان لەهەر چوارلاوە ڕێیان بۆ داخوازی کردنی نازەنین بۆ پیرشالیار خۆش دەکردو دڵنیاییان لەکێڵگەی دڵەراوکێ وخورپەی گومانی هەنارخان دا دەچەسپاند ..

هەنارخان بەوسەردانەی ژیرلەو خوادادە گەلێ گەشایەوە، هەستی بەخۆ نازین وبەخۆ دا پەرمینی بەتین بوو،ئەو یەقینەیبۆ دەهێناکەلەچاوخەڵکداهەر هەنارخانەکەی جارانە، هەرشتێکیان وت بەسنگێکی فراوانەوەوەری گرتو راو رەزامەندی لە سەر دەربڕیو ئاریکاریخۆیبۆئەنجامدانیان نیشاندا،یەکێك لەو بابەتانە کە خرانە روو مەسەلەکەیهێشا بوو ،ئەومەسەلەیە بۆ هەنارخان و نازەنین شتێکیناکاو بوو،ئەو وای دانا بوو هێشا هەرکارێك بکات دەبوو سەرەتا لەوەوە سەرهەڵبداو ئەوجا نزیکترین کەسی پێی بزانێ ،بەلام چونکە ئەو مەسەلەیە لەم

سەفەرەی دوای هێشادا سەری هەڵدابوو ئەوەندە نەی دایەبەر گەپی گڵەیی کەچی بەتاسەوە پرسیاری لەو بارەوە لێیان دەکردو دەیویست پتر لەسەری زانیاری بدەنێ، دیار بوو ژێرلەو خوادادیش کەمێ نەبێ ئەوەندەیان لیێ نەدەزانی

هەنارخان و نازەنێن یەکسەر لەونهێنیە حاڵی بوون کەلەو دەمەدا ئەو بابەتە بۆچی فەراهەم کراوەو بۆچی خرایە بەردەمیان

هەنارخان لەدڵەوە ختوورەیەکی وای لا رەچاو ببوو مەترسی ئەوەی دەنایەوە مەرجی شووکردنەکەی نازەنێن کەلەدەست هێشادا بوو سبەی رۆژ نەنگێك بخاتە سەر بەخت و نگینی نازەنینی کچی، نەنگەکە نەك لەلایەن هێشا خۆیەوە سەرهەڵبدات بەڵکو لەلایەن کەسانی ترەوە دەنا ئەوە ئاسان بوو یەکەم: ئەولەئاست هەنارخان دا سەری لەموو باریك تربوو ،دووەم: ئەوبۆ پیرشالیار پەیوەندییەکی گیانی وای لەگەڵدا هەبوو ببوو بەسێبەری ئەووهەرگیز لێی جیا نەدەبووەوە، هەنارخان کەوتە سەر ئەو بڕوایە کەپیرشالیار هەستی بەختوورەکانی ئەوکردووەو دەیەوێ ئەو رێگایانە کە لەبەردەم رەوتی ئایندەی نازەنیندا تەگەرەو گوومان دەنێنەوە پاك بکاتەوە، ئەو وەك دایکێك چەندان خووریەی وا لەناوگەردە لوولی گوماندا بەدڵیدا دەهاتن و دەچوون، خۆ ئەگەر راستگۆیی‌و باوەڕ بەخۆ بوونی نازەنێن نەبووایە، لەلایەکی تریشەوە ئەگەر ئەو ئێوارەیە کەهێشا بەشوێن پیرشالیاردا رۆیشت ئەوەی رانەگەیاندایە کەچوونەکەی بەشوێنیدا نابێتە مەرجی دووەم و وازهێنانی لەمەرجی یەکەم لەهەمان ئێوارەدا، ئەگەر ئەو دوو شتە نەبوایەن لەوانەبوو ئەوختوورانەی ناودڵی ناوهەناویان داوەشاندایە ،ئەوەتاپیر هەستی بەو ختوورانەی ناودڵی کردووە بۆیە دەیەوی بەر لەهەمووشت هێشا دامەزرێنێ‌و سەرنجی خەڵکەکە بەتەواوەتی لەسەر ئەو بۆ لایەکی تر وەرچەرخێنێ.. هەنارخان وا باسەکەی هێشای لێك دایەوە بۆچوونەکەشی زۆر

لەراستی ونەخشەکەی پیرشالیار وەنزیك بوو.. ئەوبابەتە گشت گوومان و ئەجیاکانی رەواندەوەو گەردیان لەبەردەم ئەڤینێکی گەورەدا نەهێشت ، ئەڤینێکی بێدەنگ و پڕبەحیکمەت وپیرۆز هەنارخان دوای مردنی خواجە ناو هەناوی ببوو بەبارەگای ئەجیاو گومان و ختوورەی نالەبار، ناحەقی نەبوو، هەرکەسێکی تر بوایە لەجێی ئەوخراپتر دەبوو، ئەوەی بۆ مابووەوە تاقە کچێ بوو کە ئۆجاخی خواجەی پێ روون بکرێتەوە، ئومێدی وا بوو بەر لە مردنی خواجە نازەنین بە ئاواتی خۆی بگات، بە جۆرێکی وەها دەسەلاتی دەڤەرەکە نەکەوێتە دەست کەسانی دەرەکی و لە خۆ بەدەر..هێنانەدی ئەو ئاواتەی بە پیر شالیارەوە بەستبوو، تا ئەو کاتەی ژیرلەو پیرخواداد پێیان راگەیاند کە پیرشالیار یەکێك لەو کارانەی کە پرسی بەو کردووە ناردنەوەی چوار سوارەکەی دەرباری شا بوون، تا ئەو ساتەی ئەو خورپە لە دڵیا هەبوو کە پیرشالیار لە دەگا دانەنیشێ و پایتەختی ئاریان زەمین بکاتە جانشینی خۆی، کە بۆی دەرکەوت گومانەکەی لە راستەوە دوورە،شادمان بوو، بۆیە داوای لە ژیرلەو خواداد کرد پێی رابگەیەنن کە دەیەوێ چاوی پێی بکەوێ و رووبەروو ئەو مەسەلانەی لەگەڵدا باس بکات.

*　　　*　　　*

چەند رۆژێك پاش دیدەنیەکەی ژیرلەو پیر خواداد هەنارخان خۆی ئامادە کرد لە دیوەخاندا چاو پێکەوتنێك لەگەڵ پیرشالیاردا بکات و جگە لەو ژیرلەو پیر خواداد و پیاو ماقوڵانی دەگاش تێیدا ئامادەبن.. بە دەستو پەیوەندەکەی خۆی راسپارد کە لەرۆژی ئەو دیدەنیەدا وا خۆبنوێنن کەپێشوازی کەسێکی پایەدار و

مەزن دەکەن، بەلاّم بەهێمنی و بێ دەنگ و خەماویانە،پێشوازییەکە نە تازییە شکێن بێ، نە جەختدانەوە بێ لەسەر ماتەمینی، وەلێ بە نموودو شکۆدارانە.. تا بەو چەشنە وا پیشان بدەن و مێوانەکانیش وا بزانن پیرشالیار هەر لای ئەوان خاوەن سایەو پایەنییە، بەڵکو ئەو مایەی نگین و بەختەوەری هەموو دەڤەری هەورامانە..

هەنارخان لەبەیانی رۆژی چاوپێکەوتنەکەوە واران و هۆزاوچەند کەسانێکی تری ناردە لای پیرشالیار کە پێی بڵێن هەنارخان چاوەروانیەتی و بەخۆی و مێوانەکانیەوە بفەرمووێ بۆ دیوەخان. بەر لەوانیش ناردیە لای ژیرلەو پیرخوادادو پیاو ماقولاّنی دەگا کە بێنە دیوەخان بۆ ئەوەی لەگەڵ هەنارخان و نازەنیندا پێکەوە پێشوازی پیرشالیار بکەن تا هەنارخان بەو پێشوازییە حەقی رۆژی هاتنەوەکەی بۆ پڕ بکاتەوەو وا پیشان بدا کە ئەگەر ئەو رۆژە تەرمەکەی خواجە لەبەر دەستا نەبوایە، پێشوازییەکی شاهانەی بۆ ساز دەدا، نەك لەبەر ئەوەی بەهیمەتی ئەو لە نەخۆشییەکەی نۆشدار بوو بەڵکو هەتا بزانرێ ئەو لای خزم و کەسوکارەکەی خۆی لە هەموو کەس فرەتر پایەو سایەی هەیە.. لەبەر گەلێ شتی تریش کە هەنارخان بۆ خۆی لێکی دابوونەوە..

هێشا وای بە پەسند زانی ئەو رۆژە پێشوەخت بگاتە کۆشکی هەنارخان و لە تەك خزمەتکارو نۆکەرەکاندا بۆ پێشوازی پیرشالیار راوەستێ و وا پیشان بدا ئەو هەر خزمەتکاری ئەو خانەوادەیە و هیچێکی تر..

پیرشالیار ئەو چاوپێکەوتنەی بەباش زانی، چوار سوارەکەی دەربارو سێ براکەو گەرامەکەری تێ گەیاند کە خانمی گەورە هەنارخان چاوەروانییان دەکات، بەیەکەوە دەرۆنە لای، واران و هۆزاشی لەگەڵ خۆیدا بردن و وەك لەلایەن شابانۆیەکەوە ژوانی بۆ دانرابێ وەها بەرەو دیوەخان کەوتنە رێ.. کە گەیشتنە

ناو مەیدانەکەی کۆشك، ئەو چوون و ئەو دیمەنە شکۆمەندەو ئەو بەتاسەوە چاوەروان بوونی گەیشتنەی پیرشالیارە سۆزی پێشوازییانی وا تاو دا ئەگەر لەبەر شکاندنی رێنماییەکانی هەنارخان نەبوایە ئاغا رۆیان بۆ خواجە دەکرد کە رۆژێکی وەهای نەدی، هەم لە خۆشی پیرشالیاردا قریوەی خۆشی کە بەو پایەو سایە گەیشتووە بەرز دەکردەوە، ئەو دوو حاڵەتە وا ئاوێتەی یەکتری ببوون پێت وابوو هونەری دەگا چەندان ساڵە بۆ ئارایش دانی ئەو دیمەنە خۆی تەرخان کردووە، خۆشی و ناخۆشی لە دەروونیدا دەبوونە گورزە تیشکێکی ئاوێزان و لەچاو پێشوازییاندا شەتاوەی بە رووباری فرمێسکی خۆشی کردبوو، سۆمای چاو لەناو ئەو رووبارەدا کەیل وپڕ ئارام بوو..

پیر کە هێشای لەناو پێشوازییاندا دی دەری هێناو دەستی خستە ناو دەستی و بردی و لە دیوەخاندا بەرامبەر بە خۆی داینا..

دیوەخان بەسترا، هەنارخان و نازەنین و پیرخوادادو ژیرلەو هێشا سەردەستەی دیوەخان بوون.. بابەتی ئەو کارانە کە ژیرلەو پیرخواداد بە هەنارخانیان گەیاند بوون، لای زۆربەی ئامادەبووان پەنهان نەبوون، هەموو چاویان لە دەمو دووی پیرشالیار بوو، بەپێی پێویست و هەڵوێست گەڵێ باسی جۆراو جۆر خرانە روو، باس هاتە سەر ئەوەی کەلەو سەفەرەی دواییەدا کچێك لە بێستون زەمین خۆی کردە جانفیدای ئەوان و بۆتە هۆی رزگار بوونیان، لەبەرئەوان پشتی کەسوکارەکەی خۆی بەرداوەو لای راستی گرتووە، لەبەر ئەوە مافی ئەوەی بەسەریانەوە هەیە کە لەیادی نەکەن و وەفایان بۆی هەبێ.. دیارە قوربانی دانی ئەو کچە لەپێناو خۆشەویستی هێشادا بووەو دڵی لێی چووە، هێشاش پەیمانی پێ داوە کە ئەگەر لەو گرفتەی کە تێی کەوتبوو رزگار ببێ پەیمان شکێن نەبێ.. بێگومان دەردی خۆشەویستی دەرمانی بەیەك گەیشتنە، پیرشالیار وتی:

( وا بەباش دەزانرێ لەتەك چوونەوەی ئەو چوار سوارەدا کەسێك لە ئێمە لەگەڵیدا بڕوات، هەواڵی ئێمەی بۆ ببات و هی ئەویش بێنێتەوە). وتەکەی پیرشالیار وەك مژدەیەکی خۆش نیونیگای هەنارخانی گەشانەوەو رووی کردە هێشاو وتی:

– ئەی نەدەبوو پێمان بڵێی؟..

پرسیارە پڕ بەنازو لۆمەدارەکەی هەنارخان خۆشییەکی شەرمنانەی بە هێشا بەخشی و رووی تێکرد..

– خانم! جاکەی دەرفەتم هەبووە تا پێت بڵێم.. شتی سەفەری و دوورە دەستی هەر وا دەبێ..

– خۆشت دەوێ؟..

– بەڵێ چونکە بە وەفا بوو، ئێمەی لە مردن رزگار کرد.. پەیمانم پێی داوە..

– پەیمان؟ یان مەرج؟..

– هەردووکیان..

–پیرۆزە..

کە هەنارخان وتی پیرۆزە.. هێشا هەڵسایەوە دەستی هەنارخانی ماچ کردوو رووی کردە دانیشتوان و وتی:

(گەورەکانم.. خانمی گەورەمان شتێکی خستەوە یادم.. ئەویش مەرجە.. دەمەوێ دیسانەوە ئەو راستییەتان بخەمەوە یادو بۆ هەمووتان بیڵێمەوە.. ئەو مەرجەی کەمن بۆ نازەنین خانم هێنایە دی، ئەو خاوەن مەرجە من نەبووم، بەڵکو پیرشالیار بوو.. خۆتان دەزانن ئەگەر هێزێکی گەورە نەکەوتایەتە کارو مۆدزەی خۆی نەنواندبایە کەی یەکێکی وەك من توانای ئەوەی هەبوو نەك ساتێك بەڵکو

نیو سات بتوانیٚ لەناوئەو سەهۆڵیٚ بەنداندا، لەناو ئەو حەوزەدا شەو بە رۆژ بکاتەوە. من ئەو کاتەو ئێستاش خۆم بە پەنجەیەکی پیرشالیار دەزانم، ئەگەر ئەو قبوڵم بکات تا ماوم هەر وا دەبم..).

دانیشتوان سەرجەم ئەو خۆ پاکتاو کردنەی هێشایەبە حزوری پیرشالیار لە مەرجەکە بەکارێکی پەسەندو بەجیٚ لێیان قبولٚ کرد، مەردی و پیاوەتی گەیشتە ئەندازەیەك ئەو پشتوێنەی کە بۆ ئەندامیەتی مەرێگا پێی درابوو سەدجار شایستەی بوو، دوا بەدوای وتەکەی ئەودا ژیرلە رووی کردە هەمووان:

– من هەر ئەو کاتەی کە هێشا هەموو بەگلەرە پۆزە بەرزەکانی دەورو بەری بەزان، وتوومەو دەیلێمەوە.. تا دەگای هەورامان رۆڵەی وەك هێشای تیا هەبیٚ ئەستێرەی نگینی هەر درۆشاوە ترو بەرزترین ئەستێرەی گەردوون دەبیٚ.. ئافەریم کورم..(رووی کردە پیرشالیار)گەورەیش بۆئەو مامۆستایەیە کەئەوی ئاواتامڵاندووە..

پاش پەیڤەکەی هێشاو ژیرلە،پیرشالیار نیگای سەرنجێکی خێرای لەهەنارخان و نازەنینەوە بەسەرهەموو ئامادەبووواندا خشان، کەهەموو بێدەنگیان نواندن، ویستی لەپەراوێزی پەیڤەکەی ژیرلەدا، شتێکی بۆ بهاوێتە سەرو وتی:

–حەزنەکەم هەمووتان بزانن کە لەناودەگادا گەلیٚ رۆڵەی پڕ بەتواناهەن یان بەرێوەن ودێن، وەختیٚدەردەکەون کەبخرێنەبەر کار ، داوی فەرمان لەملیان بئاڵێت ، کیٚدەیزانی یەکێکی وەك هۆزاچی لەباردایە، من ئێستا پێم پاڵەوانێکی نەبەردە، شاسواری تەنگ وچەڵەمەبەزێنە، ئەیواران بۆ ناڵێن،ئەوەلەهێشابپرسن چ هاورێیەکی تەنگانەو لێقەومانە، پیرۆزبایی لەهەنارخان دەکەم کەزانیویەتی کیٚ هەڵبژێریٚ و کیٚ لەدوو رێیانی هات و نەهاتدا راگریٚو کیٚ بەدوای مندا بنێریٚ ؟.. ئافەرین بۆ ئەودایك و باوکە کە رۆڵەی خۆیان واپەروەردە دەکەن.خوایارمان

بێ..بەهیمەتی پیاوماقوڵانو بەمەرحەمەتی هەنارخان وشان وبازووی‌گەنجەکانمان بەم زووانە دەگای هەورامان کاڵایەکی جوانتر دەپۆشێ ودەبێتە بنکەیەکی گەورەو پایەدار..

کەپیر وای وت، هەمووسەری رەزامەندیان بۆ لەقاند ..

*          *          *

هەر لەوکۆ بوونەوەدا قسەهاتەسەرئەوە کەلەگەڵ رەوانەکردنەوەی چوارسوارەکەی شادا گەرامەکەرو یەکێك لەخۆیان رەوانەی لای رەنگین بکرێن، لەم سەرەوە هەواڵ بۆرەنگین ببەن و لەوسەریشەوە هەواڵ بێننەوە ..هەروەها یەکێك لەسێ براکانیش لەگەڵیاندا دەگەرێتەوە، ئەویش دەرواسۆراخێکی خوشکەبزر بووەکەی دەکات، هەم ئەونووسراوەی ناوحەمایەڵەکەی دایکی(رەخشان) کە بۆپیرشالیار دەرکەوت ناوەخنەکەی بریتی بوولە چەند گاتێکی ئاوێستا کەلەسەرپێستی ئاسك نووسرابوو، دوای ئەوەی پیر دانەیەکی بەخەتی خۆی لەبەرنووسییەوە، دوای راڤەو زەندکردن، بەپێویستی زانی ئەوپارچەگاتانە وەك دیارییەك رەوانەی لای شا بکرێن، بۆ ئەوەی بخرێنە سەر ئاوێستا، ئەوئاوێستایەی کەتاڵانکارانی گریك بردیان و مەحفیان کردەوە.. پیر وای‌بەباش زانی ئەوسێ‌برایەتائەوەندە خەملەبەری خوشکەکەیان نەبن، ئەوگرێیەش کە بۆ هۆزا دەرحەق بە دایکیان هەی بووئەوەندە ئاڵۆز نەبێ، وای بەباش زانی یەکێك لەو برایانە بەهۆی ئەونووسراوەوە خۆی بگەیەنێتە شای ساسان لەجیاتی خەڵات و بەراتی ئەونووسراوەدۆزراوەیە داوای مافی خۆیان و دۆزینەوەی

خوشکەکەکەیان بکەن .هەروەهابڕیاردرا چەندکەسانێك دەستنیشان بکرێن و بۆدەڤەرەکانی دەوروبەربنێردرێن و بەمۆغان ومۆبید وپیاوە دەسەڵاتدارەکان رابگەیەنن، کەپیر شالیار دەیەوەێ پەرستگایەکی گەورە لەدەگای هەوراماندا بۆ خوێندن و فێربوون و پاراستنی ئاوێستا بنیات بنێ بۆ ئەوەی ببێ بەزەندگای ئاوێستا و ئارامگەی ئایینداران و خواپەرستان ..

هۆزاو واران و هێشا و گەلێ لەدەست و پەیوەندەکانی تر بۆ ئەنجام گەیاندنی ئەوکارانە ئامادەگیان نواندن، وەلێ پیر شالیار رای لەسەر ناردنی ئەوان نەبوو. وای بەباش زانی دیاری کردنی ئەوکەسانە بخرێتەئەستۆی هەنارخان و جارێ پەلەیشی لێ نەکری ..تەگبیرەکەلەسەرئەم نەخشەیەیە سەقامگیر بووکەلەگەڵ ئەوچوارسوارەدا یەکێك لەبراکان و یەکێکی دەگاو گەرام کەڕو تائەوشارەی رەنگینی تیا دەژیا بەیەکەوە بن و هەموویان بەیەکەوە بڕۆنە لای رەنگین و پەیمانەکەی هێشای بۆتازەبکەنەوە، ئەوجا لەوێوە گەرامەو کەسەکەی دەگا بگەرێنەوەو ئەوانی تر بەرەو(تەیسەفۆن) بەرێ بکەون ...

پـــیر، پارچـــەگاتەکانی ناوحەمایەڵەکـــەی رەخشـــانی تۆماربەنـــد کردبـــوو لەپارچەقوماشـێکی هەورێشـمینی پێچـاو بەقـەیتانێکی رەنـگ ئـاوێزان بەسـتی وخەســـتییە ناولوولەیـــەکی نەخشــێنراوی لەدارگوێزتاشـــراوی دەســـکردی شـارەزاترین خـەڕاتی هـەورامان ..سـەرقاپەکەی بەودووئاڵقە زنجیرەکەپێوەی بەنـد بووسەری نایەوەو، تێ‌ی‌گەیاند کەئەوی‌ناوی لوولەکەلـەناو حەمایەکەی دایکیانـدا بووەوشـــتێکی بـــەهادارەو چەندســـاڵ شـــای ساســـان بەشـــوێنی‌دا دەگـــەرێ چوارسـوارەکە وسێ‌برایەکە لەوشێوەزارەی کەئـەوان لەوکۆبوونـەوەدا ئاخاوتنیـان پـــێ‌دەکرد ئـــەوان بـــاش لێـــی حاڵی‌نـــەدەبوون..هـــەنارخان دیارییـــەکی شایســـتەی

بۆشـــای ئاریـــان زەمـــین ئامـــادەکردبوو، لـــەوبارەوە پرســـی بەپیرشـــالیار کـــرد، دیاربوونـــــاردنی ئەودیاریانەلەبــــەرخاتری پیرشــــالیار و وەفـــاو پێزانینـــــی ئەوچاکەیەبووکەشادەربارەی پیرشالیار کردبووی ..دیارییەکان ئەم شتانە بوون:

١. دڵەرەبایەکی گران بەها کە بەقەد لەواسەی دەستێك پان بوو، لەناو قەپاغێکی نەخشینراوی تایبەتداو بەحێل و مێخەکێکی پلپلەدارو زیوینەوەبەندبوو، شارەزاترین زێرینگەری سەردەمی خۆی دروستی کردبوو..

٢. قەڵەمبەرێکی دوودەم کەدەسکەکەی زەردی ئاچۆخ و شاخی کەڵەکێوی بوو، بەدووبزماری زێرین هەردووسەرەکەی وەك چاوی کەڵەشێر نەخشێنرابوو..

٣. ئەنگوستیلەیەکی زیوین کە(گۆ) کەی فەیرۆزەیەکی‌ئاسمانی‌خەست بوو، لەگەڵچەند جووتێ گۆرەوی‌یگوڵچن و پووزەوانەی گوڵەنگداری شاهانە ..

ئەمە جگە لەوەی بۆچوار سوارەکە هەریەکەو دەستێ جلی خۆماڵی و جووتێ گۆرەوێ و پووزەوانەی تایبەتی بۆئامادەکردبوون، هەروەهاش بۆسێ‌براکەو گەرامەکەڕ دیاری بۆدانابوون ..

کەهەنارخان ناوی ئەودیاریانەی‌هێنا، دوای‌هەندێ پشوودان پیرشالیار داوای لەدانشتوان کرد گەجگەلەئەندامانی مەرێگا و پیاوماقوڵان ئەوانی تربڕۆنە دەرەوە و دەرفەت بدەن هەندێ‌شتی‌تایبەت هەیە، پەیوەندی بەخانەوادەی خواجەوەهەیە، حەزدەکات لەگەڵ هەنارخاندا باسیان بکات ..لەپیرو هەنارخان و نازەنین و ژیرلەو هێشاو یەکدووریش سپی بەولاوە ئەوانی تر هەمووچوونەدەرەوە..پیرشالیار داوای لەهەنارخان کرد کەدیاریەکانیان پیشانیان بدات.. کەهەنارخان شتەکانی هێنان، پیرشالیار حێل ومێخەکەکەی هەڵگرت و دایەدەست ژیرلەی مەڕیو پێی وت:

– لالۆ هەواس، ئەوحێل مێخەکە بکە بە ملی هەنارخاندا..ژیرلە هەڵساو چووە بەردەم هەنارخان و پیرچی پێوت وای کرد.. پیرشالیار ڕۆانییەهەنارخان و وتی:

–ئەوحێل و مێخەکە هی پێشینانمانە دەبێ هەرلەگەردەنی خۆماندابێ وبەبەرگەردنی‌ترانەکرێت..

ئەنگوستیلەکەیشی هەڵگرت، دوای‌سەیرکردنی،دایەدەست پیرخوادادی‌مامی و داوای‌لێ‌کرد بیکاتەچەنجەی نازەنین،کەخوادادویستی‌لەپەنجەی نازەنینی‌بکات، نازەنین گەرەکی بوو خۆی لەپەنجەی خۆی بکات..وەلێ پیرداوای‌لێکرد دەبێ خواداد لەپەنجەی بکات..چی بەخواداد وتراوای‌کرد، نازەنینیش لاری نەنواند..پیر ڕووی‌کردەهەمووان و وتی:

– ئەوئەنگوستیلەیە نگینی‌بنەماڵەیە و دەستاو دەست گەیشتووەو دەشێ‌بگاتە دەستی‌نەوەی‌هاتوو، نابێ لەبنەماڵەوەبگوێزرێتەوەبۆ لایدە..هەنارخان ئەوەی لەبیرنەبوو ئەوئەنگوستیلە وەسیەت و ڕاسپاردەی پێشینانی لەسەرە،کەپیر شالیار ئەودووشتەی لەناودیاریەکاندا گێڕایەوە، ئەوجاوەبیری‌هاتووەو لەوێداگەورەیی وبلیمەتی ئەواتەی بۆدەرکەوت، ژیرلەی‌مەرێش لەهەنارخان فرەتر لەبلیمەتی و دانایی پیرشالیار سەری‌سوڕما و بۆی‌دەرکەوت ئەوان شتەکان تەنها لەرووی‌دەرەوە دەرك دەکەن کەچی ئەونهێنییەکانی پشتەوەش دەزانێ وەك پەیغەمبەرێکی یەزدانی‌بیر دەکاتەوە..

وەسەیەکێك بەگوێی ژیرلەدا چپاندبێتی لەپر داوای‌لەنازەنین کرد لێی بێتەپێشەوە، کەهاتەلای داوای ئەنگوستیلەکەی پەنجەی کردو نایە ناودەستی پیرو وپێی‌وت: کەخۆی بیکاتەوەپەنجەی نازەنین ..پیر بێ‌دڵی ژیرلەی‌نەکرد، چی‌وت وای‌کرد، بۆیە ژیر لە نێوچاوانی هەردووکیانی‌ماچ کردوسوپاس

وستایشی ئەمرۆمەزدای کرد کەرێکەی لێ ون نەکردن و دنیاودینی بەیەکەوە بۆگرێدان .. ئەوجا رووی کردە هەنارخان و وتی:

– ئا لێرەوە ئەنگوستیلەی نگینمان دەکاتە دەست نەوەی نوێمان..

هەنارخان کەوتە ناو خۆشیەکی وەهاوە، ئەوەی لەو هەڵویستەدا بیدیایە ئەی دەوت ئەو خاتوونە تازییە بارە. نازەنین دایکی هۆزای مۆژیاری کردبوو کە لە دەرەوە چاوەروانی بکات، هەرکات لە دیوەخان هاتە دەرەوەو دیتی دەستی بەهەر دوو لا زولفیدا هێنا، مانای ئەوەیە شتەکە بڕایەوە، واتە لە پیرشالیار مارە کراو ئەویش زوو بڕوات بە دوو سێ کەسی دەگای بگەیەنێ تا بەناو خەڵکدا بڵاوبێتەوە.. چۆن نەخشەی دانابوو وای کرد. هێشتا کۆبوونەوە لە دیوەخاندا گەرم بوو، لە دەگا بوو بە چرە کە کە نازەنین لە پیرشالیار مارەبڕا..

ئیتر هەر بابابوو لەوی تری دەپرسی:( ئەری راستە نازەنین خان لە پیرشالیار مارەکرا؟).. بەڵێ وایە، ئەگەر وا نییە ئەی ئەو هەموو پیاو ماقوڵانە لە دیوەخان چییان دەکرد!.. تۆ خوا نازەنین لە پیرشالیار مارە کرا؟. بە خوا باش بوو، داخی بەجەرگم خواجە بەهمەن ئەو ئاواتەی بردە بن گڵ.. ژنان کردیانە چرە.. مژدەیان بۆ پەسەند برد:(پەسەند ئەوە بۆ لە خۆشیاندا شێت نابی؟ نازەنین خانیان لە پیرشالیار مارە بڕی..).

پەسەند داتەپیبوو، نقەی لێوە نەدەهات، دەتووت دۆی بەسەردا کراوە.(ئەی بۆ بە ئەو نەوتراوە !. ئەو هەموو خەڵکە دەزانێ.. ئەی ئەو بۆ بێئاگایە! ناحەق نەبوو وابێ، دەبوو بەر لە هەموو کەسێ پرس بەو بکرایە.. دیارە بەکەمیان زانیووە بۆیە پێیان نەوتوە!وای زانی ئەو پیرشالیارە گەورەیە بەشی ئەوی تیا نەما!..ماڵی هەنارخان بردیان بۆ خۆیان!.

ژنان، منداڵان دەسە دەسە دەچوونە ماڵ خواداد و پیرۆزباییان لە پەسند دەکرد، ئەویش مات بوو، حەپەسا، پێ ی وابوو ڕەنجەڕۆ بووە.. پیرشالیاری لە دەست دەرچووە!..

ژنان حەسوودیان پێ دەبرد کە پەسند بووە بە خەسووی نازەنین خان و لەمەو دوا شان لەشانی هەنارخان دەدات.. کەچی ئەوەتا ئاگای لە هیچ نییە!..

ئاواتی دەگا هاتە دی، نازەنین خان نەچووە باخەڵی لایدەیەك بۆ خۆیان مایەوە، ئەگەر یەکێکی وەك پیرشالیاری لە پشت بێ دەتوانێ بەیەك پەنجەی دەڤەرەکە بەرێوە ببات ، پیرشالیاریش ئەگەر ئافرەتێکی وەك ئەو هاوسەری بێ دەڤەرەکە دەخاتە ناو بەختەوەرییەوە.. دەگا وا بیری لەو مەسەلەیە دەکردەوە، کەچی پەسەندی ئامۆژنی پیرشالیار و ئەژدەری کوری نێشا وا نەبوون، پەسەند لەبەر ئەوەی لەمارە بڕینەکەدا بەشدار نەبوو لای وابوو سوکایەتی پێ کراوە.. لەوانەشە سبەی ڕۆژ هەنارخان و نازەنین وەك ژڕ خەسوویەکیش بۆی نەروانن. ئیتر خۆی نوقمی ئەو جۆرە ئەجیایەکردبوو..

ئەژدەریش لەداخاندا دنیای لێ تاریك داهات، نەی دەزانی لای کێ خەمی خۆی بەبا بدات.. چۆن خەم نەخوات و نەتەقێ، نازەنین لە پیرشالیار مارە کراوە، بەقسەی ئەو:(ئەو هەموو گەجەرو گوجەرە بەو بۆنەوە بۆ مارە بڕینەکەی بانگ کراون ئەو نەبێ!..) جا تۆ خوا حەقی نییە لەداخاندا شەق نەبات؟.. خۆ هیچ نەبێ ئەو ژڕ ئامۆزای نازەنینەو خۆیشی بەپیاو دەزانێ، ئەگەر باوکی نازەنین نەماوە ئەوا ئەو لە شوێنیەتی!.. ئەوە بۆ ئەو سووکایەتییەکی کەم نەبوو، نەپرس و نەرایەك، نەبانگ کردنێك، ئیتر بە چ ڕوێکەوە لەناو دۆست و برادەراندا خۆی هەڵکێشی و بڵێ: من برازای خواجەم و نازەنین مامۆزامە.. لە هەمووی گرانتر : ئەو لەبەر خۆیەوە وای دەیزانی پاش مردنی خواجە سەرە گوریسێکی دیوەخان

دەدرێتە دەسی ئەو. چونکە بە مردنی خواجە گەلێ شتی لەخۆیدا راست کردەوە، گوایا لەهەژمەتدا خۆی لەخۆم نا.. لە تەپڵی سەریەوە تا سەرچۆکی خۆی بە قور سواخدا وای دەزانی بەو کارەی گەلێ لە هەنارخان نزیك بووەتەوە. لە گەرمەی تازییەشدا سنگی خۆی دەرپەراندو نەمانی کارو باری پرسەی بەسەر ئەم و ئەودا دەدا، کە بەگوێی دەکرا، لە دڵەوە لەخۆی بایی دەبوو و دەیوت:(کورینە دەڵێی دەزانم ئاغایەتی بکەم).. ئەوانە کە لە دەرەوە بۆ پرسە دەهاتن ئەو پێشوازی دەکردن، وەك یەکێکی بنەماڵەو خاوەن تازییە خۆی دەنواند کە دەگەڕانەوە بە ڕێی دەکردن و خەم و پەژارەی تازییەی لێ وەر دەگرتن.. ئەو هەموو شتانەی کرد کەچی ئەوەتا نازەنین مارەکراو کەس بەوی نەوت:

(کەرت بەچەند)! خەمی هەموو دەگا لای ئەو باربوو، ئەوەندەی نەمابوو لە پێستەکەی خۆیدا نەتەقێ و شەقار شەقار نەبێ. بە حوکمی ڕێکەوت پەروەری کوری جۆشان، دای بەلایدا، ئەو دەیزانی دەماری کەریەتی گرتوویەتی و پلتۆکت لێ بدایە شەق دەبوو، پێی وت:

کاك ئەژدەر، ئەرێ راستە نازەنین خان لە پیرشالیار مارە کراوە؟!.

ئەژدەر خەنجەرێکت لێ بدایە لەو پرسیارەی پەروەر گەلێ لای ئاسان تر بوو.. بە کرژییەوە وەرامی دایەوە:

بەخێر نەیێی بۆ پرسیارێ کردت..

پەروەر بەمخنەتی و تەوسەوە وتی:

چۆن نەت زانیوە!.. وام زانی تۆ لە جیاتی هەموو کەسو کارێکی دەسی هەردووکیانت لە دەست یەکتری ناوە.. خوا ئاگادارە من بوومایە قبوڵم نەدەکرد..

ئەژدەر لە ڕکاندا قیڕاندی:

پەروەر وازمان لیٚ بیٚنە.. تا برادەری وەك تۆم هەبیٚ من هەر وا دەبم..

چوزانم.. هاتم پیرۆز باییت لیٚ بکەم، نەم زانی بەکەسیان نەزانیوی!..

پەروەر ئەو سیخورمە کەلەکە بڕەی لیٚداو ڕۆیشت..

کە پیٚی وت (بەکەسیان نەزانیوی) ئەوەندەی تر کورەی خەمی دووکەڵی ڕەشی دەرداو وای دەزانی بەسەر کەری ناو کەندەکەی چەند یاڵ لەمەو بەرەوە – کە ئەستۆی تیا شکا– بە رووتی گیراوە.. بیری لە زۆر شتی خراپ کردەوەو ویستی ئاگری گەردەشیٚك بنیٚتەوە بە ڕووداویٚکی نەحسی ئەو مارە بڕینەی بداتە قەڵەم بەلاّم کە ڕووداوەکەی چەند ساڵ لەمەو بەری کەرەکەو کەنداوەکەی هاتنەوە بیر ترسی لیٚ نیشت و نەی کرد..

لە دڵ خۆیدا وتی:(نا.. با شتیٚك بکەم منی تیا دیار نەبم). وای وت و رووی کردە ماڵی هیٚشا، ئەو کات تەنها سەوسەن دایکی هیٚشا لەماڵ بوو کەدی ڕەواڵەتی ئەژدەر وەك هەڵیزی دۆی ترش کرژو چرچ بووەو چاوی دەتووت هی ڕیٚوی برسییە لەناو زەرداوی چروکی و نەگرسیدا تەتڵە دەکات، فریای خۆی کەوت و هەڵویٚستی لیٚ وەرگرت.

ها!.. ئەژدەر گیان بۆ وا شێواوی؟

ئەی ئێوە نەشێواون!؟.

بۆ؟.

بۆ؟. هێشتا دەڵێی بۆ؟.

چی رووی داوە! نابێ بزانم؟ چی رووی داوە!

لەخۆت بپرسە بزانە لەدەگادا چ قەوماوە...

چی قەوماوە؟ خۆم شێواوە؟!..

خۆت لەگێلی دەدەی !.

ئەی‌نابێ بزانم چی بووە؟.

من نازەنینم بۆ هێشا دانابوو، ئەوخاوەن مەرج بوو، کەچی یەکێکی تر رفاندی ..!

سەوسەن خۆی لێ مۆن کردو وتی:

– ئەژدەر هۆ ئەژدەر چاك گوێم لێ بگرە ..نازەنین ئەو کچە نییە بڕفێنرێ ..ئەگەر بۆ سیمیار کە ئێستا بێچاوین بێ بووە بەپیری پیران، مارەکرابێ، ئێمە بەر لە هەموو کەسێك پیرۆزبایی لەخۆمان و ئەوجا لەدەگاو نازەنین دەکەین ..تێگەیشتی؟! ئەگەرتێنەگەیشتی بابۆتی دووپاتی بکەمەوە! ئەگەر بۆ ئەوەهاتووی لێرەوە بەردێك بگرێتە ئەوشاخە سەرکەشە، لێرەمەنیشەو لەبەرچاوم گوم بەو برۆ هاوشانی خۆت بدۆزەرەوە..دایکی هێشا چاك لێ ی هاتەدەم ، وەك گسك لەمشکێکی تۆپیو بدات وا دەری‌کردە دەوەوگێسکی لێ دا..لەترسی دایکی هێشا کلکی خۆی لەبن هەنگڵی خۆی ناو، پشتی هەڵکردو وتی:

– من نازەنینم بۆ هێشا دەویست..

– تۆ !؟ تۆ کیٚی؟!.

– من ئەژدەر، تاقە میرات گیری بنەماڵەی خواجە..

– ئیف!.. خۆی بەچی دەزانی.. خۆزگا هەنارخان گوێی لیٚ بوایە..هەی نەی خۆی!.. ئەژدەر کەزانی ئەوزەمینەی کەئەودەیویست درکی تیا بچێنیٚزەوییەکی رەقە.. رۆیشت و ئەم وتەی لەپاش خۆی بەجیٚ هێشت

– کە هێشا هاتەوە پیٚی بڵیٚ:(کیٚکردیو کیٚ خواردی)!. دایکی هێشا لە پشتەوە چەموولەیەکی ئاراستەی پشت ملی کردو وتی:( ئەوەی کردی هەرئەوە خواردی) برۆ بەرنەفرەتی ئەهرۆمەزدا بکەوی، هەی گێڕی کڵۆك شکاو لەوە خرابترت بەسەردابیٚ ..لەدۆزەخیشداجێت نەبێتەوە ئەژدەر کەزانی لەدەگادا کەس نییە گوێی بۆ رابکریٚ.. چووەماڵەوە، لەنەگریسی خۆیدا بەگژ دایکیدا چوو،تێروپڕیلیٚ داو، بەرەو دەڤەری(دەربەند دالآش) تیٚی تەقاندو(پیروەسان بەگ) بمگرەو هاتم ..

*            *            *

جۆشان پیاوێکی چاپووك و قسە زان و ئازابوو، هەرجار خواجە راسپاردەیەکی بۆ ئاغاو بەگەکانی دوست و برادەرانی هەبووایە ئەوی دەنارد،بۆ هەرلایەك دەیناردو هەر کارێکی پیٚ رادەسپارد بەسەرکەوتوویی ئەنجامی دەداو دەگەڕایەوە..تەمەنی لەچڵ ساڵ تێپەڕیبووکەچی پیٚوەی دیار نەبوو، بەخواییٚ و لەسەرخۆو زمان شیرین و رەوانبێژ بوو..هەنارخان ئەوی هەڵبژارد کەلەگەڵ

چوارسوارەکەی شاو هامان و گەرامەدا بڕوات و سەرێك لەرەنگین بدات و بزانێ لەسەر پەیمانەکەی ماوە، لەگەر وابوو بەناوی پیرشالیار و هەنارخانەوە خوازبینیەکەی بۆ هێشا بکات..

بۆ بەرێ کردنیان لە بەردەم پەرستگاکەدا لەگەڵ خەڵکێکی زۆری دەگادا راوەستاون و چاوەروانی هاتنی پیرشالیارو هەنارخان و نازەنینیان دەکرد کە بگەن و بەرێیان بکەن، پاش گەیشتنیان ئەو دیارییانە کە بۆ شا دانرابوون، هەنارخان داینیە دەست گەورەی سوارەکان، پیرشالیاریش، لوولە تۆمارەکەی دایە دەست هامان کە برا بچوکی سێ براکە بوو، پیر داوای لە چوار سوارەکە کرد کە هامان نا شارەزایەو ئەمانەتە لە ئەستۆیاندا، نوێنەری خۆیەتی ئەو ئامانەتەی کە پێیەتی بەشای دەگەیەنێ..

لە وەرامی نامە دەسماڵینەکەی رەنگیندا کە رێی هات و نەهاتی تیا نەخشاندبوو، نامەیەکی دەسماڵینی هەمان جۆریان بۆ نەخشان دایانە دەست جۆشان، نەخشەکانی ناوی گوزارشتی ئەوەی دەدا کە ئێمە لەسەر پەیمانی خۆمان چاوەروانین هەواڵی ئەو دەکەن.. لە سوچێکی دەسماڵەکەدا پیر ناوی( هێشا) ی نووسیبوو. دەسماڵە نامەکە نازەنین خان لەسەر داوای پیرشالیار ئامادەی کردبوو.. دەسماڵەکەی رەنگینیش بە ئاگاداری هێشا بۆ هەڵگرتنی درایە دەست ئەو..

ئەو دەسماڵەو چەند دیارییەکی تر لەلایەن هەنارخانەوە درانە دەست جۆشان کەبیانداتە رەنگین و منەتباری خۆیان پێی بگەیەنێ سەبارەت بەو چاکەی کە دەرحەق بە هێشاو هەواڵەکانی نواندبووی..

بەرێزو حورمەتەوە بەرێ کران، نزای بە ئاسان گەیشتنیان بۆ کرا، چەند کەسانێکیش تا ماوەیەکی دوور لە دەگا بەرێیان کردن..

*        *        *

لەسەر داوای پیرشالیار، هەنارخان چوار کەسی ئازاو یارای دەسنیشان کردن کە راسپاردەکانی پیرشالیار بە موغان و بە موبیدو ئاغاو بەگ و سەردارەکانی دەورو بەری دەڤەری هەورامان بگەیەنن. کە پیر دەیەوێ پەرستگایەك بۆ فێرکردن و خوێندنی و زەندی ئاوێستا بینا بکات، هەم شوێنی زانیاری بێ هەم شوێنی خوا پەرستی.. چوار کەسەکە چوونە خزمەت پیرشالیارو خۆیان پێی ناساند،ئەویش تێی گەیاند کە بەیانی رۆژی دوای ئەو رۆژە بێنە لای و هەریەك بۆ لایەك راسپاردەیان بکات.. هەر ئەو بەیانییەکە چوار زەلامەکەی بۆ هەر چوار لای دەڤەری هەورامان رەوانە کردن، بە پێی ئەو نەخشەیە کە بۆ بنیاتنانی پەرستگاکەی کێشا بوو، دەست بەکارکردن کرا، ئۆستا(باوەجان) کە ئۆستا دیوارێکی شارەزاو بینا سازێکی ناودار بوو، بانگکراو نەخشەی پرۆژەکەی پێ راگەیەنرا.. کە بەم جۆرە بوو:

پەرستگایەکی گەورە کە بەچەندان حوجرەی دوونهۆمی حەوشەی بۆ کرا بێ، لەناویدا حەوزێکی لاکێشە هەبێ ئاوەکەی لەژێرەوە بڕواتەوە سەر ئاوی چەمەکەی خوارەوە، بەشێکیش لەو ئاوە بگاتەوە ئەو حەوزو ئاودەسانەی کە لە پشتەوە بۆ خۆشوشتن دروست دەکرێن.. لە سەرەوەی پەرستگاکەوە تەلارێکی دوونهۆمی بۆ خێزانی پیرەو ئاوی کارێزەکە کەلە سەرەوە بەکارێز رادەکێشرێ بەشێکی دەچێتە ناو ئەو تەلارەو بۆ خوارەوە بەرەو چەمەکە رەت دەبێ.. لە نێوان پەرستگاو ئەو تەلارەدا هۆدەیەك بۆ رامان و خەڵوەتی پیر دروست دەکرێت کە ناوی نرابوو

(کۆمسای).. بۆ میوانداری تایبەتی و هەم بۆکۆبوونەوەکانی پیاو ماقوڵانی شاری هەورامان

هەر ئەو رۆژە بەسەرپەرشتی پیر شالیار خۆی و کارمەندی هیشاو هۆزاو واران دەستکرا بەروخاندنی کۆنەپەرستگاکەو.. خەڵکی دەگا بەگەورەو بچووکەوە، بەژن و پیاوەوە، قۆڵیان لیٚ ماڵییەوە و دەسیان دایەکار،پیاوە دەوڵەمەندەکانیش، چی کەرەسەی بیناسازی وپیویستیەکان هەبوون خستیانەسەر ئەستۆی خۆیان، هەنارخانیش گفتی دا کەخەرجی و خۆراکی رۆژانەی ئەوکرێکارانە کەکاری تیا دەکەن لەسەر ئەو بێ ..ئیتر لەو رۆژەوە دەگای هەورامان وەك پورەی هەنگی لیٚ هات، لەهەمومولایەکەوە خەڵك بۆ ئاریکاری کردن لەبنیاتنانی ئەوپەرستگایەدا دەرژانە ناو دەگاو بەشانازییەوە، قوڕوداروو بەردیان لەسەرشانی خۆ دەناو بەردەستیان دەکرد، پیریش ئافەرینی دەکردن و لەکاردا بەشداری دەکرد..

دوای بڵاوبوونەوەی هەواڵەکانی پیرشالیارو بنیاتنانی پەرستگاکە،(پیروەسان بەگ) بەسەروبەماڵ یارمەتی نارد.ئەو خۆی بەپەیمان شکینی پیرشالیار دەزانی.. ئەوەبوولەپرسەکەی خواجەدا بەشداری کرد، بەڵام کەهەواڵی هاتنەوەی پیرشالیاری بیست لەوەترسا لەحزووریدا شەرمەزار بیێ وبیناسیتەوە کەپەیمانی شکاندووە، ئەوەبوو لەدەربەند شاهۆ دا تەڵەی بۆ هیشا نایەوە، وەلێپیوەی نەبوو، دوایئەوەی لەوپرسەیەگەڕایەوەتووشی نەخۆشی (سەراسیٚ) بوو، هەرجارکەدەیگرت لەمردن نزیکی دەکردەوە، زۆر لەخۆی دەترسا، دەیویست کاریکی وائەنجام بدا پیرشالیار لەخۆی رازی بکات بەڵکو ئەونەخۆشییەی لەسەرلادەبا !..داوایلەئۆستا (گروون) کرد کەبیناسازیکی ناو داربوو وەك یارمەتیدان لەکەڵچەند بارو بارخانەو ئازووقەوتفاقدا بەناوی ئەوەوە بڕۆنە شاری هەورامان و بەپیر شالیارو هەنارخان خۆیان بناسینن.. ئەژدەریش کەپەنای

بردەلای پیر وەسان بەگ، لای خۆی گلی دایەوە، تابەو گلدانەوەی کەفارەتی خوێنەکەی باوکی بدات کەبەدەسیسەی ئەو کوژرا.. لەدڵیشەوە وابڕیاری دابوو کەئەگەر لەو نەخۆشییەی رزگار ببێ،یەکێك لەکچەکانی خۆی بداتە ئەژدەر، تابەو بۆنەوەخۆی لەشاری هەورامان نزیك بکاتەوە! وەڵێ نەخۆشییەکەی دەرفەتی نەدا. ئەوەندەی پێ نەچوو مردو، ئەژدەریش لەوێ وەدەر نرا.

## (١٥)

پیر شالیار لەلای خۆی ماوەیەکی دیاری کراوی بۆ تەواوبوونی ئەو دامودەزگایەدانابوو، دڵسۆزی خەڵکەکەو خۆشەویستی پیر وایان کرد لەماوەیەکی کەمتر لەوەی کەپێشبینی کرابووتەواوببێ، ئەوهاوکاری وباربووانەی کە لەدەرەوە دەگەیشتن کارێکی باشیان لە چاکسازی ئەو پڕۆژەدا کرد

(کۆمسای) بەر لە پەرستگاو جێنیشتەکەی پیر تەواوبوو، ئۆستا باوەجان چی هونەری بیناسازی خۆیبوو لەکۆمسایدا خستبووە کار،پێش ئەوەی پەرستگاکە بگاتە دواقۆناغی تەواو بوون( ژیرلەی‌مەرێ)لەپرمردووخەمێکی بۆ پیر و هەنارخان و سەرجەم خەڵکی دەگا دروست کرد.. پیر بەتاسەوەی ئەورۆژەبووپەرستگاکە تەواو ببێ و لەیەکەم چوارشەممەی حەفتەی یەکەمی تەواو بوونیدا ژیرلە پێش خۆی بخاتو تیایدا نمای ستایش بکەن بۆ ئەو یەزدانەی کەیارمەتی دان ئەوپەرستگایە، بەو ئاسانییە بنیاتنرا، وای دانابوو ئەویەکەم کەس بێ دەست بداتە قوفکڵی پەرستگاکەو لەرووی خەڵکدا بیکاتەوە ونزای شوکرانەی تیابکەن..

ژیر لە بەتەمەنترین ریش سپی دەگابوو، تارۆژێ بەر لەمردنی هۆش و مێشکی نەلەقیبوو، هەموویبیروهۆشێکی لەسەردەگاو بۆ دەگا دەخستە کار، لەراوێژ کاریدا هەنارخان پشتی بەبیروراکانی ئەو دەبەست، زمانحاڵی بنەماڵەی خواجە بەهمەن

بوو، ئەوەی ئەو بڕیاری لەسەردەدا ڕەتکردنەوەی نەبوو، بۆیەکەمرد هەنارخان پێی وابوو پایەکی تری ڕاگرتنی دەگا ڕما..

تەرمەکەی شەوو ڕۆژێك لە(کۆمسای)دا مایەوە، ڕۆژی دوایی پیش بردنی بۆ گۆرستان پیر بە ئامادەبوونی هەموو خەڵکی دەگا لەژووری(کۆمسای)دا نزای(یاسنا)ی لەسەر تەرمەکەی خوێندو داوای لەهەمووان کرد کەگەردنی لالۆ هەواس ئازاد بکەن، پیر چی داوا کرد خەڵکەکە وایان کردو بەنەزاکەت و ڕێزەوە دوا دیداریان کرد..

پاش پیاوان ژنان چوونە سەر تەرمەکەیو دوادیداریان کرد، هەنارخان داوای لەنازەنین کرد یاسنای لەسەر بخوێنێ

دوای ئەسپەردەکردنی ژیرلە،ئەوجا خەڵکەکە بیریان لەوە کردەوە کەئایا(کۆمسای) یەك بەو بچووکییە، چۆن ئەو هەموو خەڵکەتیایدا جێیان بووەوە! ئەوەبوو خەڵك بەتاك و جووت و کۆمەڵ کە دەچوون سەریان بەژووردادەکێشا و دەیان دی جێی کەسیتری تیانابێتەوە، کەچی کەدەچوونەژوورەوەبەئاسانی جێیان دەبووەوە!.. ئەوەی یەکەمجار دەرکی بەودیاردەیەکرد ژنان بوون، لەوانەوە شتەکە بەناو پیاواندا بڵاوبووەوە، بۆئەوەی ئەونهێنییەنەبێتەگرێی سەردڵ، هەربابا بوو لەوەی دەیدی لێیدەپرسی، ئەرێچۆن ئەو هەموو خەڵکە لەناو کۆمسایدا جێیبووەوە؟!.. یەکەم ژن کەهەستیبەو دیاردەیەکرد (سەوسەن) دایکی هێشا بوو،کەبیستی هەنار خان داوای لەژنانی دەگا کردووە بۆ دواچاو پێ کەوتنی ژیرلە بڕۆنە سەرتەرمەکەی کەلەناو کۆمسای دانرابوو،خواحافیزی لێ بکەن، سەوسەن ماڵیان لەوپەڕی دوگاوە بوو تاگەیشتە ئەم پەڕی دەگا لەدەرگای هەرماڵێکی دەدا بۆ ئەوەی ژنی ئەو ماڵە لەگەڵیدا بێت و بڕۆن بۆسەرتەرمەکەی ژیرلە، بۆی دەرکەوت بەرلەوژنی ئەوەماڵانە ڕۆیشتبوون، ئەوتاکە ئافرەت بوو

کەبەجێ مابوو،خەمی لێنیشت کەبڕوات و جێنەمابێ بچێتە ژوورەوە هەی هاوار جا ئەوهەموو ژنانە لەو خەڵوەتخانە بچووکەدا چۆن جێیان دەبێتەوە!. کەگەیشتە بەر دەرگاکەی کۆمسای، دی چەند ژنی دەگا هەن تەنها ئەو نەبێ هەموو لەژوورەوەن، ئەویش کەچووە ژوورەوە بەئاسانی جێی بووەوە! چاویشی بەشوێن هەرژنێکدا دەگێڕا لەوێدەیدی!..سەرسام ما ..زۆری دایە بەرخەیاڵ، لەوەدەترسا، دەسیان لیْ وەشاندبێ!..دوای ئەسپەردەکردنی ژیرلە.. سەوسەن چارەی نەما..کەوابڵێ کێ بڕوای پێ دەکات! خۆی گەیاندە هەنارخان و نازەنین و وتی:

– هەنارخان!..شتێك دەڵێم نەمکەن بەکەڕا حەزدەکەم نازەنین خانیش گوێی لیْ بێ..

هەنارخان شوێن دانیشتنەکەی خۆی خۆش کردوو پاڵی دایەوەو نازەنینی بانگ کردە لای خۆیو وتی:

– نازەنین داوەرە بزانین سەوسەن چیمان پێدەڵێ دیارە شتێکی سەیری لایە.. خوا پەنابدات هەر خەونی تێکەڵ و پێکەڵ نەبێ..سەوسەن کەهەستی کرد هەنارخان بەتاسەوە گوێی بۆ دەگرێ ..دەمی کردەوەو وتی:

– نا..نا خەون نییە.. لەخەون عاجباتی ترە ..تۆ با نازەنین خان بێ بەڵکو ئەو بڕوام پێ بکات

نازەنین هات ..هەنارخان رووی کردە سەوسەن و وتی:

– دەی واچە..

– جۆرە وڕمانێك پەردەی سەرسامی بەسەر دەم و چاویدا ،داو وتی:

– ئەرێ ئێوە لەسەر تەرمەکەی لالۆ هەواس، لەناو خەلوەتخانەکەی پیرشالیاردا کە راوەستابوون هەستان بە چتیْ نەکرد؟..

- هەنارخان سەرسام ماو وتی:

- وەك چی؟..

وەك ئەوەی هەموو ژنانی دەگا لەناو ئەو هۆدەدا گوێیان لە خوێندنی یەسناکەی نازەنین خان بوو..

هەنارخان، وتەکەی سەوسەنی بەوتەیەکی تفت و بیٚ مانا وەرگرت، بۆیە بەساردییەوە وتی:

- جا لەوە باشتر هەیە..

سەوسەن زوو هاتە دەم..

- بەڵیٚ باشە.. وەلیٚ چلۆن ئەو هەموو ژنە لەو شوێنەدا جێیان بووەوە!..

نازەنین هاتە دەم..

- جا هەموو ژنانی دەگا هاتبوون؟!..

- جەرگم، حەز دەفەرمووی بپرسە.. بزانە هەموو ژنان لەویٚ نەبوون! من خۆم لەو پەڕی دەگاوە تا ئەم پەڕی بانگی یەکەیەکەی ژنانم کرد، هەرکەسم بانگ دەکرد دەیانوت چووە بۆ سەر تەرمەکەی لالۆ هەواس، کە من هاتم جێی کەسی‌تر نە دەبووەوە، کەچی منیش هاتمە ژوورەوە بە ئاسانی جێم بووەوە!.. پێم بڵێن ئەوە یانی چی؟!..

نازەنین لەمەبەستەکەی سەوسەن چاك حاڵی‌بوو گەلیٚ بیری لیٚکردەوە کە هۆدەیەکی وای بچووك جێی ئەو هەموو حەشاماتانەی تیا بێتەوە! کەسیش تەنگە نەفەس نەبیٚ!.. چۆن ئەو هەموو ژنە کە پتر لە سەد ژن تێدەپەڕین جێیان بووەوە،نازەنین لە هۆش خۆیدا وای دایە بەر بیر کردنەوە، ئەوجا دەنگی بۆ دایکی هەڵبڕی و وتی:

- دایە! ئەگەر وابیٚ شتێکی سەیرو عاجباتییە!..

هەنارخانیش کە بیری لێ کردەوە، زانی شتێکی سەیرە بۆیە وتی:

– ئەوە ئێوە دەڵێن چی؟!.

نازەنین رووی کردە دایکی:

– ئەگەر ئەوەی کە سەوسەن دەیڵێ وابێ، شتێکی سەیرە!..

سەوسەن کە هەستی کرد نازەنین لە بۆ چوونەکەی ئەو نزیك بووەتەوە، هەناسەیەکی بە بەر خۆیدا هێنایەوە وتی:

– حەز دەفەرموون بپرسن..

ئەو دیاردەیە لەناو پیاوانیشدا ببوو بە جێی سەرسوڕمان ئەوەندەی نەخایاند،بیرو هۆشی خەڵکەکەی راوەشاندو بە ئاگای هێنان. هەرکەس کە دەیدایە بەرهۆش و ئەندێشەی خۆی و کە دەچوو سەیری کۆمسای دەکرد، تەنها یەك هۆدە بوو هەر بیست کەس، تۆ بڵێ سی کەسی بە قەرەپەستانێ دەگرت.. ئەو کەسە پرسیاری لە خۆی دەکردو دەیووت: ئەی ئەو هەموو خەڵکە چۆن تیایدا جێی بووەوە؟!. وەڵێ هۆش لە مەیدانی ئەندێشەدا سەرگەردان دمبێ و لغاوی بۆ شل دەکات و پێی دەڵێ: دیارە مۆدزەیەك رووی داوە دەنا شتی وا نابێ.. لەبەر کێ؟ لەبەر پیرشالیار؟ یان لەبەر ژیرلەی‌مەرێ یان لەبەر هەردووکیان؟ یان هەر ئەجیا(واهیمە) یەکەو هاتووەو دەیەوێ تەفرەی هۆش بدا؟

دیاردەکە رووداوێکی وا نەبوو لەناو دۆڵی دەگای هەوراماندا شەفە بکرێ و ببڕێتەوە بەڵکو ئەوەندە گەورە بوو، لە ماوەیەکی کەمدا لە هەموو لایەك بڵاو بووەوە، رۆژگاریش تا ئەمڕۆ نەیتوانیوە پەردە پۆشی بکات و لەناو یادەوەری مێژوودا بیسڕێتەوە..

* * *

جۆشان و چوار سوارەکەو هامان و گەرامەکەڕ، ئێوارە وەختەیەکی درەنگ بوو کە لە شارۆچکەکەی رەنگین نزیك بوونەوە، لە کەنار شار هەواڵیان زانی کە چەند رۆژێك دەبێ دەهقان، مامی رەنگین مردووەو خەڵکی شار لەناو تازییەی دان، وەلێ ئەوەندە بۆی غەمبار نین! بۆیە یەکسەر رێی کاروانسەرایان گرت و بۆ شەو بە رۆژ کردنەوە چوونە ئەوێ، گەرامە شارەزا بوو، هەموو کوچەو ماڵێکی پێ دەزانی، پاش گەیشتنیان بۆ پەیدا کردنی نان و خۆراك کەوتە گەڕیان، دەم و چاوی خۆی بەلایەکی شەدەکەی سەری داپۆشی، بۆ ئەوەی جارێ کەس نەیناسێتەوە، خۆی پێ رانەگیرا یەکسەر بەرەو ماڵی رەنگین رۆیشت کە لە دەرگای دا، کەیمنا هاتە دەرەوە کەدی ئەوەی لە دەرگای داوە لەدەرۆزەکەری ئێوارانە، روی لێکرژکردو پاڵی پێوەنا..

لە سروشتدا کەیمناو رەنگین گەلێ لەیەکەوە دوور بوون، ئەو پیاوێکی خۆ بەزل زان و تڕن و فیزاوی، ئەو خووانەی پەردەیەکی رەشیان بەسەر هۆش و مێشکیدا دابوو، لە دەبەنگی و کورت بینیدا نموونەی کەم بوو، کەچی رەنگین کچێکی سەلارو سەنگین و هۆشمەند، جوانیەکەی نموونەی کەم بوو، لە زۆر رووەوە لە نازەنین دەچوو، گەرامە بە دەرکردنەکەی کەیمنا خۆی نەشێواندو بە کۆچەو کۆڵانەکاندا گەڕا، خارەتێ خۆراك و چەند نۆردێ نانی خڕ کردەوە، لەگەلێ ماڵاندا سەرنجیان لێ دەداو بە بیچم و قەوارەو کەڕو لاڵەکەیدا گومانیا دەکرد کە ئەوە گەرامەکەڕ بێ‌و سەری هەڵدابێتەوە! هەر ئەو شەوە لەناو خەڵکدا دەنگ بڵاو بووەوە کە گەرامە کەڕ گەڕاوەتەوە.. ئەو کەسانەی کە پێیان وابوو گەرامە یەکێکە لە پیاو چاکەکانی یەزدان و بۆ لای خۆی بردوویەتیەوە، لەو بڕوایەدا بوون کە

ئەگەر رۆژێك گەرامە بگەڕێتەوە مانای وایە سەر لە نوێ مژدەی بەختەوەری و خێرو خۆشییان بۆ دێنێتەوە! چونکە لەو کاتەوە کە ونبووە، گەلێ کەس مردن و گرانی پەیدا بوو، نەخۆشی- کەوتن- گەلێ کەسی کەواند، بەسەر هەموویانەوە دەهقانی شار، کە نەخۆشییەکە کەواندی، بڕسی بڕی و هەلێ نەسایەوە.. هەر ئەو شەوە هەواڵەکە گەیشتە ڕەنگین کە زۆر کەس گەرامەیان بە بەرگی فریشتەوە دیووە و گەڕاوەتەوەو لە گەلێ ماڵان بۆ خۆ پیشاندان و تاقیکردنەوەی خەڵك خۆراکی خڕ کردووەتەوە..ڕەنگینیش بڕوای بە هەواڵەکە هات و گومانی بۆ ئەوە چوو، ئەوەی کەیمنای برای پاڵی پێوە نا، ئەوە، ئەو بووە، ئەو ڕووداوەش کە بە بەگوێی کەیمنادا درا، کەوتە ناو گێژاوی خەمەوە چونکە سبەی نا، دوو سبەی هەڵبژاردەی جێنشینی دەهقان دەکرێ، ئەویش بەو نیشانەیە کە لە بنەماڵەی دەهقانی مردووە، خۆی بۆ ئەو هەڵبژاردنە ئامادە کردبوو، خۆ ئەگەر ئەو کەسە گەرامە کەڕ بووبێ و لە ئاسمانەوە هاتبێتەوە! ئەگەر لە هەڵبژاردنەکەدا پرسی پێ بکرێ ئەو هەلێ ناچنێ!.

هەر بەو شەوە کەیمنا کەوتە ناو شارو کۆڵانە وکۆڵان و ماڵەو ماڵ لە دەرگای دەداو لە گەرامەی دەپرسی.. کە زانی نانی بۆ کاروانچییان کۆ کردۆتەوە، هەر بەو شەوە بەرەو کاروانسەراکە ڕۆیشت.. جۆشان پیاوێکی ژیرو بلیمەت بوو، خاوەن کاروانسەراکەی بانگ کردە لای خۆی، حاڵ و باری ئەوێی لێ پرسی، لەوەوە بۆی دەرکەوت کە دووسبەی جێنشینی دەهقان دیاری دەکرێ، ئەوانەش کە خۆیان بۆ ئەو کارە ئامادە کردووە چەند کەسێکن، ژنەکەی دەهقان، کوڕە دەساڵانەکەی، ڕەنگین، کەیمنای برازای.. هەر لەو پیاوەوە بۆی دەرکەوت کە ئەگەر موغانەکەی ئەوێ پشتگیری هەر کەسێك بکات ئەوە هەڵبژاردنەکە دەباتەوە.. کابرای خاوەن کاروانسەرا پیاوێکی چڵێس و لەوچە بوو، جۆشان زوو ناسی و زانی بە بەرتیل و

دەم چەور کردن هەموو کارێك جێ بە جێ دەکات.. جۆشان پێی ڕاگەیاند ئەوەی لەوانی پرسی دەنگ نەکاو ناوی کەس نەدا..

کەیمنا کە بەو شەوەدا گەیشتە کاروانسەراکە، بە توندی بەسەر خاوەنەکەیدا نەڕاندی:

– گەرامە کەڕت نەدیووە؟!..

کابرای خاوەن کاروانسەرا لە زووەوە و لە دڵەوە ڕکی لە کەیمنا دبووەوە.. لە سەرخۆ و بە هێمنی وەرامی دایەوە:

– گەورەم.. کابرایەکی وا لەناو کاروانسەرادا چی دەکا!..

ئەی خەڵك ناڵێن خوا بۆ لای خۆی هەڵی کێشا وەتەوە.. بۆ دێتە لای منێکی گوناحبار و ڕووت و ڕەجاڵ!..

– دەی کە وا بوو یەکێك لەو کاروانچییانەم بۆ بێنە ئێرە..

کابرای خاوەن کاروانسەرا، بەبێ ئەوەی بڵێ ئەوە کەیمنایەو برازای دەهقانی مردووە، هەواڵی بە جۆشان دا کە قسە لەگەڵ ئەو پیاوەدا بکات..

– جۆشان تۆزێ سەرو پۆتەلاکی خۆی تێك داو، دەم و چاوی خۆی بە لەچکێك داپۆشی و لێی چووە پێشەوە..

– ها ئاغام چە کارەت بەمنە؟..

– کەیمنا بەبێ ئەوەی لێی ورد بێتەوە وتی:

– پیاوێکمان لێ گوم بووە، ناوی گەرامەیە.. لای ئێوە نییە؟..

– گەورەم من ناوی وام نەبیستووەو کەسی ئەم ولأتەش لای ئێمە نییە!.. پیاوێکی چۆن چۆنییە؟!..

– کەڕو لاڵە.. پۆشاکێکی سپی لەبەر دایە..

– ئۆ!.. دەی وا بڵێ!..

– دەی بڵێ، لە کوێیە؟..

– گەورەم.. نازانم کەڕو لاڵە یان نا.. وەڵێ کابرایەکی جل و بەرگ دەرە دامان سپی، سواری ئەسپێکی سپی ببوو، بەبێ ئەوەی قسە بکات، لە دەرەوەی ئەم شارەدا بە دەور ئێمەدا دەهات و دەسوڕایەوە، وەسەبیەوێ بزانێ ئێمە بۆ کوێ دەڕۆین و چیمان پێویستە، بە دەورماندا گەڕاو یەکدوو نوردە نان و هەندێ خۆراکی لەسەر بەردێ بۆمان داناو تێی تەقاندو وەك بەرق رۆی..

– بۆ کوێ؟..

– بەرەو ئەشکەوتەکانی ئەو شاخە بەرزەی کە ئێمە پشتمان لێی کردبوو هەڵکشا، چاوم لێ بوولەبەر دەمی ئەشکەوتە گەورەکەدا رەخشەکەی بەستەوەو، خۆیشی لە دەرگای ئەشکەوتەکەدا دانیشت و دەیڕوانییە ئەم شارە.. من ئەوەم بە چاوی خۆم دیووە، ئیدی نازانم..

– بەراستیتە؟!..

– ئەی خۆ لەگەڵ کەسێکی نەناسراوی وەك بەرێزتاندا درۆ ناکەم.. کە جۆشان وای وت، کەیمنا واقی وڕماو هیچ نقەی نەکرد، چۆن هاتبوون وا گەڕایەوەو لەناو تاریکیەکەدا ون بوو..

سەبارەت بەو هەڵوێستەی خاوەن کاروانسەرایە،جۆشان دیاری و بەرتیلێکی چاکی دایە.. رازی کرد کە بەو شەوە لەگەڵیدا بڕوات ماڵی مۆغانەکەی ئەوێی پیشان بدات، هەر لەو کابراوە بۆی دەرکەوت مۆغانەکەش وەك ئەو وایە،ئەگەر شتێکی بداتێ چی دەوێ دەیکات.. کە چووە ماڵیان زوو خۆی پێ ناساندو سڵاوی پیرشالیاری پێ گەیاند، تێی گەیاند کە لەلایەن ئەوەوە راسپاردەی هێناوە کە سبەی لە هەڵبژاردندا پشتی رەنگین بگرێ نەك کەیمنا.. ئەویش بۆ هەڵێکی وا دەگەڕا کە پشتی کەیمنای بۆ لە زەوی بدا، چونکە لەوەتەی ئەو بووە بە مۆغانی

ئەویٚ ئەو کەیمنایەنەلێی پرسیووەتەوە، نەدەسگرویەکی کردووە،بۆیە قینی لێی بوو، لە دڵەوە خەمی ئەوەی بوو خەڵکەکە لە ترسا هەڵی بژێرن.. ئەویش دەترسا کە ئەگەر ئەو رەنگین سەربخات، کەیمنا ببێتە دوژمنی و سبەی رۆژ شار بەدەری بکات.. جۆشان دڵنیای کرد کە سبەی چەندان کەسی لایەن پاشای ئاریان زەمین ئامادە دەبن، هەر لەویش جێنشینییەکەی رەنگین مۆر دەکەن.. جگە لەوەش هەڵی نا کە ئەگەر پشتی رەنگین بگریٚ پلەو پایەی بەرز دەکرێتەوە. مۆغانەکەش بەهانەی دەهێنانەوە بۆ ئەوەی پتر وەربگریٚ بۆیە وتی:

– پشتگرتنی رەنگین بۆ من گێچەڵ دروست دەکات.

– بۆ؟. جۆشان وتی..

– بۆندی شووکردنی هەبوایە، ئاسان بوو.

جۆشان تێی گەیاند کە رەنگین شووی کردووە، دەستبەجیٚ بۆندی مارەبرینەکەی کە دەسماڵە نووسراوەکە بوو پیشانی کابرای مۆغانی داو دڵنیای کرد کە ئەگەر ئەو ببێتە جێنشین شاو پیرشالیار لەیادی ناکەن و چاویان لێی دەبیٚ..

بەیانی تازە تیشکی خۆر لە لووتکەی شاخەکانی ئەو بەری دابوو، کەیمنا خۆی پێچایەوەو بە هەڵەداوان بەرەو شاخەکە، بۆ ناو ئەشکەوتەکان هەڵکشا، بەڵکو لەویٚ بچێتە لای گەرامەو داوای لێبوردنی لیٚ بکات و لای خوا بۆی بپارێتەوە، کە دڵی خەڵکەکەی بۆ نەرم بکات و ئەو هەڵبژێرن!..

جۆشان هەموو برادەرەکانی خۆی تێگەیاند، کە ئەو رۆژە لە کاروانسەراکە نەیەنە دەرەوە.. دەستیٚ جلی سپی یەك نیشانی بۆ گەرامە کری و داوای لیٚ کرد، بیانکاتە بەری و لەویٚ نەیەتە دەرەوە، خۆیشی دەستیٚ جلی دەروێشانەی لەبەر کردو بە پرسین ماڵی کەیمنای دۆزیەوەو خۆی گەیاندە رەنگین، دوای خۆناساندن

دەسماڵنامەکەی دایەو ئەویش زۆر لێی ورد بووەوە و لە مەبەستی نەخشکارییەکەی ناوی حاڵی بوو وەلێ ناوەکەی پیرشالیاری پێ نەخوێنرایەوە، بەتاسەوە دەسماڵەکەی بەسنگیەوە نووساندو تێر ماچی کرد..

جۆشان راسپاردەکەی خۆی بە رەنگین گەیاند کە ئەو بۆ ئەوە هاتووە داخوازی بکەن و هێشا هەر لەسەر پەیمانی خۆیەتی.. ئەو هەولأنەی کە لەو شەو رۆژەدا بۆ سەرکەوتنی ئەو نواندبووی بۆی گێرایەوە، ئیدی رەنگین ئەوەندەی تر متمانەی بە خۆی پەیدا کرد کە سبەی لە هەڵبژاردندا سەرکەوتوو دەبێ، جۆشان هەڵی نا کە سبەی پڕ بە متمانەوە بێتە مەیدانی هەڵبژاردن، باسی ئەوانیش نەکات تا لەوێ یەکتری دەبیننەوە..

رەنگینی ناو خەیاڵی جۆشان وەك ئەوە نەبوو کەدی، ئەو وای دەزانی لە جوانی و سەلاری و نەزاکەتدا کەس ناگاتە نازەنین خانی دەگای خۆیان، وەلێ کە رەنگینی دی خەریك بوو بتاسێ، لە جوانی و نەزاکەت و بەژن و باڵادا نازەنینێکی تر بوو!..

لە دڵەوە هەر دەیووت، خوایا هەر خۆت کارسازی.. لەگەڵ نازەنیندا دەڵێی: یەك سێو بوون کراون بە دوو کەرتەوە. سەرسوورمانەکەی لەوەدا بوو لە دڵ خۆیەوە دەیووت:(باشە ئەم کچە چۆن توانی لەو بەندو باوەی کە هەیانە لا بدا؟!. چی وای لێ کرد کە بەبێ سڵ کردنەوە ئاوا بکات خواستی خۆی بخاتە کارو بە ئارەزووی خۆی بڕیاری هەڵبژاردنی هاوسەر بۆ خۆی بدات!.).

ئەو رۆژە لەناو کوچەو بازاردا جاڕ درا(کەس نەچێتە دەرەوە، سبەی نیوەڕۆ جێنشین هەڵدەبژێردرێ). ئیدی سەرو بنی هەموو قسەو باسێك دەچووەوە سەر بابەتی هەڵبژاردن. کێ هەڵبژێرین؟ ژنەکەی دەهقان، یان کورەکەی یان کەیمنا،یان رەنگین؟.. چیمان لە دەهقانی مردوو سەوز کرد تا لە ژنەکەی و کوڕەکەی سەوز

بکەین؟ ڕەنگینی لێ دەرکەوێ ئەوانی تر دڕکی یەك بنە پەیکوڵن.. خۆزگا ڕەنگین لەو خانەوادەیە نەبوایە، عەیبەکەی هەر ئەوەیە دەنا لەگەڵ ئەواندا ئاسمان و ڕێسمانە.. خەڵکەکە لەناو خۆیاندا وەها ئەو چوار کەسەیان هەڵدەسەنگاند. شەوی ئەو بەیانییە کە هەڵبژاردنی تیایدا دەستی پێ دەکرد، جۆشان ئەو دەستە جلە سپییەی کە بۆ گەرامەی ئامادە کردبوون لەبەری کردن و کڵاو بوورگەیەکی قوچی سپی کە لە پارچە قوماشێکی سپی دروست کرابوو لەسەر نا، خەرقەیەکی ڕەشیشی پەیدا کرد و خۆی وەك گەرامە تیف تیفە داو بۆی دەرچوو! لە هەر کۆڵانێك لە دەروازەی یەك دوو ماڵی دەدا، خاوەن ماڵەکان کە دەهاتنە دەرەوە وەك گەرامە کەڕ بە هێما هەندێ شتی دەووت:

(ڕەنگین بووکی ئاسمانە، سبەی دەیکەن بە سەرداری خۆتان) وای دەوت و تێی دەتەقاند، کە لە حەوشە دەردەچوو خەرقە ڕەشەکەی لەخۆ دەئاڵاندو لەگەڵ شەوەکەدا تێکەڵاو دەبوو، بۆ ئەوەی لەچاو بزر بێ و کەس نەزانێ بۆ کوێ دەچێ.. لە زۆر ماڵان وای کرد، هەر ئەو شەوە هەمدیسان دەنگ بڵاو بووەوە کە گەرامە کەڕ زمانی کراوەتەوەو وتویەتی:(ڕەنگین بووکی ئاسمانە) لەهەمان شەودا چەندان ژن و منداڵ خەویان بە گەرامەوە دیبوو کە لە ئاسمان هاتووەتە خوارەوە.. جۆشان نەخشەیەکی تری جوانی کێشا،ئەو ڕۆژە کە دانرا بوو کەس لە شار نەچێتە دەرەوە، ئەو داوای لە گەرامە کرد جلە سپییەکان لەبەر بکات و سواری یەکێك لە ئەسپی چوار سوارەکە ببێ و لە قەراغی شار خۆی داگرێ، تا خەڵکەکە خڕ دەبنەوەو دەس دەکەن بە هەڵبژاردن لەو کاتەدا دێتە ناو شارەوەو ڕوو دەکاتە مەیدانی هەڵبژاردنەکە.. جۆشان چۆن نەخشەکەی کێشا گەرامە وای کرد. بەیانی ئەو ڕۆژە خەڵکەکە لە مەیدانی شار خڕ بوونەوە، چاوەڕوانی ئەوانەیان دەکرد کە خۆیان هەڵدەبژێرن، کەیمنا پێش هەموویان هاتوو لەسەر

سەکۆیەك خۆی پیشانی خەڵکەکە دا.. کەس چەپڵە ڕێزانی بۆ نەکرد، پاش ئەو کوڕەکەی دەهقان و ژنەکەی هاتن بە ساردییەوە خەڵکەکە پێشوازییان لێ کردن، کە ڕەنگین هات خۆی ڕازاندبووەوە و دەتووت مانگی تابانە، لەمە دەرکەوت خەڵکەکە بە چەپڵە ڕێزان پێشوازییان لێ کرد..

سێ ڕیش سپی و مۆغانەکە بەرامبەر خەڵکەکە ڕاوەستان و مۆغانەکە هەر چواری بە خەڵکەکە ناساندن و وتی:

– خەڵکینە! ئەوە کوڕی دەهقانی کۆچ کردووە، ئەوەش خێزانیەتی ڕوانییە کەیمنا، ئەوەش کەیمنایە هەمووتان دەیناسن.. ڕەنگین خانیش برازای کۆچکردووە، کامیانتان دەوێ ببێ بە جێنشینی دەهقان؟. مۆغانەکە دەسی کوڕی دەهقانی گرت و بەرزی کردەوەو وتی:

– کوڕی دەهقان؟ دەتانەوێ؟.

کەس دەنگی نەکرد.. دەستی خێزانی دەهقانی هەڵبڕی..

– ئەمەش خێزانی دەهقانە.. دەتانەوێ؟.

کەس دەنگی نەکرد.

دەسی کەیمنایشی بەرز کردەوە..

– ئەمەش کەیمنایە.. دەتانەوێ؟.

کەس دەنگی نەکرد..

کە دەسی ڕەنگینی هەڵبڕی و وتی:

– ئەمەش ڕەنگین خانە..

هەموو بە جارێ دایانە قریوەو چەپڵە ڕێزان..

مۆغانەکە بە پەلە پیرۆزبایی لە ڕەنگین کردوو وتی:

کەواتە رەنگین خان لە ئەمڕۆ بەدواوە سەری گەورەی ئەم شارەیە.. کە مۆغانەکە وای وت: کەیمنا هەردوو چاوی پەڕینە تەوقی سەری و هاواری کرد:

- بە چ حەقێك من ناکەن!.. کوا رەنگین مێردی کردووە؟ ئافرەتێك شووی نەکردبێ چۆن دەبێتە دەهقان!.

کەوای وت جۆشان هاتە پێشەوەو وتی:

- رەنگین دەزگیران دارەو مارە بڕاوە! دەسماڵنامەکەی دەرهێناو پیشانی مۆغانەکەی داو وتی: ئەوە بۆندی مارەکردنەکەی پیرشالیار خۆی بۆ هێشای مارەی بڕیووە، مۆغانەکە دەسماڵەکەی کردەوەو نیشانی خەڵکەکەی داو وتی:

- راستە ئەمە گرێبەندی مارە بڕینە..

پیشانی رەنگینی داو وتی:

- تۆ رەزات لەسەر ئەم مارە بڕینە هەیە؟..

رەنگین بەو پەری خۆشییەوە وتی:

- بەڵێ بە رەزامەندی خۆم بووە، خۆم بەسەر دەستی پیرشالیار دا خۆم لە هێشا مارە کردووە.. مۆغانەکە وتی:

- تەولو، ئەم مارە بڕینە وەك ئاوی ژیان پاك و بێگەردە..

کەیمنا هاواری کردو وتی:

- نا.. نابێ.. نا..!.

لە پڕ گەرامە دەرکەوت و بەغاردان‌و پڕتاڤی ئەسپەکەی هاتە ناو حەشاماتەکەوەو بە هێماو رمووك، ئاماژەی دا کە رەنگین بووکی ئاسمانە.. خەڵکەکە هەموو بە جارێ هاواریان کرد:(رەنگین بووکی ئاسمانە) هەر لەوێ مۆغانەکەو سی ریش سپیەکە کران بە راوێژکاری رەنگین‌و هەر لەوێش لە هێشا مارە کراو مۆغانەکە دەسماڵەکەی کردە ملی رەنگین و گرێی لێدا.. لەو کاتەدا کە

مۆغانەکە دەسماڵەکەی هێشای لە ملی ڕەنگین گرێ دەدا حەشاماتەکە دەوری گەرامەیان دابوو، دەس و دامەنی کراسەکەیان ماچ دەکردو لێ ورد دەبوونەوەو داوای مەفەڕکیان لێ دەکرد..

*　　*　　*

تا سێ ڕۆژ جۆشان و چوار سوارەکەو هامان لە لای ڕەنگین مانەوە، لەو ماوەدا خۆیان بە خەڵکەکەی ئەوێ وا پیشاندا کە ئەوان لە لایەن کۆشکی شای ئاریان زەمین و پیرشالیارەوە بۆ ئەو دوو کارە ڕەوانە کراون: هەڵبژاردنی ڕەنگین، داخوازی کردنی بۆ هێشا. خەڵکەکەش بەو پەری شادی و خۆشییەوە هەردوو کارەکەیان پیرۆز کردو، ڕزگار بوون لە دەست کەیمناو ئەو کارەشیان بە سەرکەوتنێکی بێ هاوتا نرخاند.. کەیمناش لەو ڕۆژەوە ڕەنگین کرا بە جێنشین سەری خۆی هەڵگرت و کەس نەیزانی بۆ کوێ چووە.. بەتەکبیری جۆشان‌و ڕەنگین نەیان هێشت لە ماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا،گەرامە کەڕ بڕواتە دەرەوەو تێکەڵاو بە خەڵکەکە ببێتەوە، گەلێ کەس تکایان لێ دەکرد کە ماوەیان بدەن بچنە لای، بۆ ئەوەی داوای متفەڕکی لێ بکەن و ڕازو نیازەکانی خۆیان پێی بڵێن بەڵکو بەهۆی ئەوەوە خوا مرازەکانیان دەهێنێتە دی!.. هەر بە تەکبیری جۆشان لەکاتی گەڕانەوەیاندا گەرامەیان بە جلە سپییەکانیەوە سواری ئەسپەکەی چوار سوارەکە کردو تا لەو شارە دوور کەوتنەوە وەك کەسێکی پیرۆز بە دووی کەوتن.. کە لە چاو گومبوون جۆشان و گەرامە بەرەو هەورامان ڕوویان ناو چوار سوارەکەو هامانیش بەرەو ئەکباتانەو تەیسەفۆن ڕێیان گرتە بەر.

هەر لەو ماوەیەدا، مۆغانەکەو چوار ریش سپییەکە، کە سەرپەرشتی هەڵبژاردنەکەی جێنشینی دەهقانیان کرد، لە لایەن جۆشان و گەرامەو چوار سوارەکەوە، بەجۆری(مەرێگا) ی هەورامان کران بە پیاو ماقوڵ و ئەندامی ئەنجومەن،خەڵکەکەش ناوی رەنگینیان نا (بووکی ئاسمان).. بووکی ئاسمان و ئەوانەی کە لەگەڵ جۆشاندا بوون و ئەندامانی ئەنجومەن، ماڵەو ماڵ بەسەر خەڵکەکەدا گەڕان و لەوە دڵنیایان کردن کە ئیتر کەس ناتوانێ ستەمیان لێ بکات..

*      *      *

ئەنجامدانی ئەو راسپاردەیە کە خرا بووە سەر ئەستۆی جۆشان کارێکی سووك و ئاسان نەبوو،کەچی ئەو بە زیرەکی خۆی و بەپێی خۆ گونجاندن لەگەڵ سروشتی کارەکەدا توانی بە ئاسانی ئەوەی کە دەبوو بیکات، کردی و بە گورجی لەگەڵ گەرامەدا بەرەو شاری هەورامان بگەڕێنەوە، رەوت و رێ گرتنە بەرەکەی جۆشان سەری لە گەرامە تێکدا بوو، بە جۆرێکی وەها بوو رێگران نەتوانن زەفەری پێ ببەن.. کە گەیشتنە بەرەوەو بە رووی دەگادا شۆڕ بوونەوە، لەگەڵ گەرامەدا بۆ پشوودان روو بە رووی دەگا لەسەر گاشە بەردێك بە جووتە دانیشتن و سەیری ناو دەگایان دەکرد، ئەو کاتە دەگا خۆی دابووە بەر هەتاو و گەڕەکە هەڵکشاوەکانی قەد پاڵی شاخەکانی ئەو بەر بۆ خوارەوە بەرەو پەرستگاو کۆمسای و تەلارخانەکە دەیانڕوانی و بەبێ لاقی و بە روێکی سپییەوە دەستە نەزەر دەیانروانییە ئەو دیمەنە هونەرییەی پڕ ئەندازەیە کە پەنجەی ئۆستا باوەجان و ئۆستا گروون و چەند کار سازێکی تر بە بەرهەمیان هێنا بوو..

جۆشان چێژێکی ئەفسوناوی لەو سەیرکردنەی وەر دەگرت، گەلێ جار لەو شوێنانەداو لەو کاتانەدا سەیری دەگای کرد بوو هیچ جارێك ئەوەندەی ئەو جارە دیمەنی دەگای بە گەورەو شکۆمەند نەهاتبووە بەرچاو! دیتنی ئەم جارەی وەك دیتنەکانی جارانی نەبوو، دیتنێکی پڕ لە نهێنی بوو، هەموو دەرگاکانی هۆش و هزری خستبووە سەرگازی پشت.. پێی وابوو دەگا هەرزەکارێکی شۆخە، یان بووکێکی رازاوەیەو خۆی بۆ رۆژی زەماوەندو پەردە ئارایش داوە.. ئەو هەموو جمووجوولێ و ئەو هەموو تاشین و سفتو سۆکردنە، ئەو هەموو بێنەو بەردەیە، ئەو هەموو شان و بازوو بەکارهێنانە ئەو هەموو هێزو توانا لە قاڵبنانە هەموو خستنەکاری ویستێکی راپەڕیوی بەتین و بەرچاو روو بوو بۆ هێنانە دی ئاوات و خەونەکانی مرۆڤی ئەوێ، زاڵ بوون بوو بەسەر سروشتدا. دیارە سروشت ئەگەر بەسەریا زاڵ نەبێ وەك زارۆڵەیەکی بەزیوو و داماو دەستە ئەژنۆ لە ئامێز خۆیدا گلت دەداتەوە و دەتگوشێت و گیرۆدەی لە قاڵبدان و نەبزوتنت دەکات.. جۆشان وا دەگای هاتە پێش چاو دەگاش وەها خۆی لە ئاوێنەی هۆشیدا دەنواند.

ئەوەتا خەڵکەکە بوونەتە دڵی دەگاو بەشەوقەوە جمووجوولێ دەکەن و بە هازەوە پەلاماری کار دەدەن و پێش رەوتی رۆژگار دەکەون. لەوکاتەدا جۆشان دەرگای هۆش و بیری خۆی بۆ دەگا کردبووەوە گەرامەش بەهەمان چەشن رووەو دەگا راکشا بوو تەماشای چاوت بکردایە دەیروانی و واقی ورما بوو، داخۆ دەگا چی بە گوێی ئەودا چرپاندبێ؟ چۆن ختکەی هۆشی دابێ؟ لەگەڵ یادەوەریە بێ دەنگەکانی ئەودا چۆن کەوتبێتە گفتوگۆ؟ داخۆ ئەو روانینە بەچ هێمایەك لە مێشکی بێ دەنگی ئەودا کەوتبێتە ئاخاوتن؟. جۆشان کە لە دەگا دەرچوو پەرستگاو کۆمسای و تەلارخانەکە بەرەو تەواو بوون دەچوون، ئەو کات ئۆستا گرون تازە دەیویست نەخشە بۆ نانەوەی ئاشێك دارێژێ کەچی ئەوەتانێ دوو

ئاش بەیەکەوە لەسەر یەك بنیات نراون لەسەر چەمەوە ئاو بۆ یەکەمیان ڕاکێشراوە، ئاوەکەی ئەو لە خوارەوە دەرژێتە ناو گلۆەی دووەم هەردووکیان بەیەکەوە بەیەك ئاو ئیش دەکەن.دەگا سەر بەجەنجاڵ بوو، ببووەکاروان سەرای هاتوو چۆی

دەڤەرەکان بۆیە گەڕانەوەکەی جۆشان و گەرامە سەرنجی خەڵکی ناو دەگای ڕانەکێشا بەڵام هەندێ منداڵە وردە کە لە قەراغ دەگادا یاری و کایەیان دەکرد کە گەرامەیان دی یارییەکەیان واز لێ هێناوبە دەوریدا سورانەوەو دەیانووت:( گەرامە ئاماوە، گەرامە ئاماوە) ئەویش هەستی کرد ئەوانە ئەویان خۆش دەوێ بەو پێشوازیەیان دڵی دەکرایەوە.یەکەم کەس لەپیاوان کەلەناو دەگادا تووشی بوون هێشا بوو نەزانرا کە ئایا ڕێکەوت ئەو هەڵوێستەی ڕەخساند بوو؟ یان ئەو پێشبینی کردبوو کە ئەوان بەو زووانە دەگەڕێنەوە و لەو کاتەدا دەگەنەوە ناو دەگا؟! یان لەوەتەی ئەوان ڕۆیشتبوون ئەو لە چاوەڕوانیدا بووە؟.. دەشبێ لەبەر ئەوە بوو بێ چونکە جۆشان دەستە گوڵی ئەوی بە دەستەوە بوو هەر بە توندی دەستیان لە مل یەك کردوو دوای ئەو ڕامووسانە گەرمە جۆشان ڕوانییە ناوچاوی هێشاو دی پڕە لە نیشانەی پرسیاری شەرمن و چاوەڕوانی بێ ئۆقرە. بەر لەوەی لافاوی مەنگی پرسیارو چاوەڕوانی هێشا شەتاوە بکەن جۆشان زوو وتی:

– هێشا! ئەوە بۆ لە خۆشیدا خۆت نوقمی ناو فرمێسك ناکەی؟!.

– حەز ناکەم بەر پێی تۆ بەقوڕ کەم.

جۆشان هەردوو سەر شانی هێشای گوشی وەك بیەوێ ڕەوگەی هەموو هەستەکانی بکاتەوە بۆ مژدەیەکی وا نەك هەر ئەو بەڵکو هەموو دەگای پێ دڵشاد بێت. مژدەکە ئاوا بوو ئەوەی ئەو گەرەکی بوو هاتە دی، هەموو شتێ بە دڵی

ئەوەو لەوەش زیاتری بۆ هاتووەتە دی پیرۆزباییەکی خستە ناو قاڵبی سوحبەتەوەو وتی:

– ئافەرین هێشا.. سەد جار ئافەرین.. یادی بەخێر بێ ژیرلەی مەرێ کە دەیوت:(دەگای هەورامان رۆڵەی وەك سیمیارو هێشای هەبێ شای هەموو دەگایەکە). ئافەرین هێشا لەوەتەی من تۆ دەناسم هەر دەستی بۆ کاری مەزن بردووە،پیاو کە دڵداری بکات وەك هێشا بیکات پیاو کە راو چی بوو تیر نەوەشێنێ کە وەشاندی لە کەڵە کیوی ئاوای بسرەوێنێ!.. هەی دەست خۆش چ خەدەنگێکت وەشاندووە لە دڵی کێت داوە! کورە نەدەبوو تۆزێ بەزەییت لەدڵدا هەبێ! کەی خەڵکی هەورامان ئەوەندە دڵ رەقن؟! یەکجاریش وانا! ئەرێ هێشا پێم بڵێ شاگردیت لەبەر دەست فەرهادی کۆکەندا نەکردووە؟!. بەلأم نابێ تۆ وەك ئەو تیژ رەوبی. وتەی:(نابێ وەك ئەو تیژ رەوبی) هێشای راچڵەکان بۆیە توند هەردوو باڵی جۆشانی گوشی و وتی:

– بۆ چی بووە؟!..

– هیچ نەبووە هەروا قسەیەك بوو کردم، هەموو شت بە دڵی تۆیە با برۆینە لای پیرشالیار لەوێ هەموو شتێکت بۆ روون دەکەمەوە.

که هەواڵی هاتنەوەی جۆشان درایە پیرشالیار یەکسەر داوای کرد لە کۆمسایدا بە ئامادەبوونی هەنارخان و نازەنین و هەندێ ریش سپی کۆ ببنەوەو گوێ لە جۆشان بگرن کە چی ئەنجامداوە؟..

لە کۆبوونەوەکەدا جۆشان چۆنیەتی چوون و هاتنەوەکەی و ئەنجامدانی کارەکانی بە وردو درشتەوە گێرایەوە، هەموو ئامادەبووان لە بلیمەتی و کارسازی و هۆشمەندی جۆشان و سەرکەوتنەکەی خۆشحاڵ و بەختەوەر بوون. یەکێك لە ئامادەبووان پرسیارێکی خۆ سەپێنەری ئاراستەی جۆشان کرد کە ئەمە بوو:

- ئەی نەدەبوو دوو کەس لەلایەن رەنگینەوە بخرێنە تەك هامان، تا لەو سەرەوە بەتاك نەگەڕێتەوە؟ نەوەك بە ناشارەزایی خۆی رێی گەڕانەوە هەڵە بکات یان لە رێدا تووشی پیاو خراپ ببیٚ؟!.

جۆشان تێی گەیاند کە ئەو لای رەنگین ئەوەی نەدرکاندووە کە پیاوەکانی شاو هامان رێیان لەوان جیایە، وای دابووە قەڵەم کە ئەوان هەموویان بۆ داخوازی ئەو هاتوون و بەیەکەوە دەگەڕێنەوە هەورامان. پیرشالیار ئەو نەخشەی جۆشانەی بە کردەیەکی هۆشیارانە نرخاند، دەنا ئەگەر وا نەبوایە لەوانە بوو کەیمنای برای رەنگین سەری خۆی لەداخاندا هەڵنەدەگرت و ئەوسا وەك مامی دەکرد، پیلانێکی لە رێی هاتنەوەیاندا بۆ دەنانەوە ئیدی سەرکەوتنی جۆشان لەو کارەدا خۆشییەکی رادە بەدەری خستە ناو دڵی هەمووانەوە.. هەر لەو کۆبوونەوەدا نازەنین خانیش پرسیارێکی سوحبەت ئامێزی ئاراستەی جۆشان کردبوو وتبووی:

- جۆشان رەنگینت چۆن هاتە پێش چاو؟

- لە چ روێکەوە؟

- هەروا دەڵێم!..

جۆشان دەبلوماتیکی لیٚ هاتوو بوو وەلیٚ لە سروشتی ژناندا ئەوەندە شارەزا نەبوو، بەم جۆرە وەڵامی نازەنینی دابووەوە:

- نازەنین خان خۆت دیووە؟ تۆ جامێك بەرامبەر بە خۆت رابگرە تیا بروانە نازانی ئەوەی ناو جامەکە رەنگینە، یان ئەوەی دەرەوەی جامەکە!.. من ئێستا تۆم دی وام دەزانی ئەوە لێرەیە ! کە ئەویشم لەویٚ دی وتم : خوایا من کیٚ دەبینم ؟! نازەنین! یان خوشکی نازەنین!. وەلیٚ ئەو کچی ئەو کابرایە بوو کە هێشا دەبێتە

زاوای ، نازەنینش کچی خواجەی هەورامانە   نازەنین دوای قسەکەی جۆشان رادەمێنێ و ئیتر دەنگ ناکات

گەرانەوەکەی جۆشان لەدەگادا بووبە سەرتۆپی هەموو قسەو باسێکی تر، دەوترا کچە بەگزاوەیەکی بێستون زەمین عاشیقی هێشابووە و بەهیمەتی پیرشالیار لێی مارەکراوە، گوایا ئەویش وەك نازەنین  خان  کچە سەرداری ولاتی خۆیەتی و بە (بووکی ئاسمان ) ناودەبرێ..

خەڵکی دەگا بەو کارەی جۆشان ئەنجامی دابوو دڵشاد بوون، لە دەگادا تەنها سەپان و لاپان بە خەمباری مانەوە خەمی هامانیبرایان بە هاتنەوەی جۆشان لا بار بوو لەبەر خۆیانەوە گلەییان لە جۆشان دەکردو دەیانووت:

(کوا جۆشان پیاوێکی کارسازو بلیمەتە؟ ئەگەر وا بوایە هەڵبەتە کەسێکی لەتەك هاماندا دەنارد..) ئای چ هەڵەیەکی گەورەیان لە دەست قەوما هامانێکی نا شارەزاو تاکە نەفەر، تۆ بڵێی ئەو چوار سوارە بە سەلامەتی بیگەیەنن بە کۆشکی شا؟ ئەوان سوارو ئەو پیادە چەند دەیاندایە بەر خەیاڵ پتر خەمیان لاجەم دەبوو، خەمەکە خەو و خواردنی لە هەردوو برا تاڵ کرد هانایان بردە لای پیرشالیار تا بزانن ئەو چییان بۆ دادەنێ. ئەویش بوو بە هاوخەمیان و داوای لێ کردن تا ماوەیەکی تر خواین بکەن ئەگەر سەری هەڵنەدایەوە هەڵبەتە تەگبیرێکیان بۆ دەکات..

*   *   *

هەنارخان دەشێ بێ خەم نەبێ، توشی دڵە راوکەیەکی خراپ ببوو وای بۆ دەچوو کە گواستنەوەکەی نازەنین تەم و توالێکی تێ دەکەوێ، ئەگەر چارەنووسی رەنگین بە نازەنینەوە ببەسترێ بۆیە هەوڵی دەدا پەلە لە گواستنەوەی نازەنیندا بکرێ و ئەوجا مەسەلەی رەنگین بخرێتە ناو تەگبیرەوە، پیرشالیار رەنگە هێشایش هەستیان بەوە کرد بوو کە هەنارخان لە نێوان مەسەلەی نازەنین و رەنگیندا تووشی جۆرە نیگەرانییەك بووە، چەند جارێکیش هەنارخان لای پیر خواداد ئەوەی درکاند بوو کە دوای تەواو بوونی پەرستگاو تەلارخانەکە نۆبەی زەماوەندە.. پیریش هەردوو سەری گوریسەکەی وەك یەك راگرتبوون هەنارخانیش حەزی لەو پەندە نەدەکرد کە دەڵێ:

(پادارێ گێردێ بێ پا هینو وێمانە) پیرشالیار وای بەباش زانی ماوەیەك چاوەروان بن تا هەواڵێکی رەنگینیان بگاتێ و بزانن ئەو نیازی چییەو چۆنی پێخۆشە ئەو کارەی مەیسەر بێ؟ ئایا دەکرێ هێشا بچێتە لای ئەو یان دەیەوێ ئەو بۆ لای هێشا بگوازرێتەوە؟ یا چاوەروان بن خوایێ هەبێ کارسازی ئاسانە.

پیر لەوە بیری دەکردەوە کە ئەگەر رەنگین بەپێی خۆی بۆ هێشا هات خۆ دەبێ شایی و زەماوەندێکی وای بۆ ساز بدرێ شایستەی بێ و هاتنەکەی بۆ ئەوێ لەکەدار نەکات، جا کەوا بوو ئەو شاییەی کە نیازە بۆ خۆی و نازەنینی بکات بۆ نەبێتە شایی بۆ ئەویش، بەو جۆرە بەیەك تیر دوو نیشانە دەپێکن و لە خەرجی زۆر و دەسکورتی رزگار دەبن. هەنارخان دەزانێ شایی نازەنینەو حەق هەیە شتی وای بۆ بکرێ لە دنیادا دەنگ بداتەوە، ئەویش کە دێت وا دەزانێ بە بۆنەی هاتنی ئەوەوە ئەو شاییە سازدراوە بۆ وا نەکەن؟.. پیر لەو باوەڕەدا بوو دەرگای

هەرشتیٚ بکەیتەوە دوو ڕێت دەخاتە بەردەم چاکەو خراپە هەردووکیان لاشیپەرانی یەك دەرگان وەك شەوو ڕۆژ هەردووکیان دوو قۆڵی ڕۆژگارن و بە دەور یەکدا دەسوڕێن وەلیٚ سەرکەوتن لە ڕۆژەکەیدا ئاهەنگی خۆی ساز دەدات،

ساپان ولاپان خەم سەری تێکردبوون، خەمی جارانیان بۆ خوشکەکەیان بوو کە هامانیان بۆ سۆراخی نارد وایان دەزانی ئەو خەمیان لە کۆڵ کەوت، کەچی نەگەڕانەوەو دیار نەبوونیهامان کێچی نا ئارامی کردبووە کۆڵیان، لە پیرشالیار دەپاڕانەوە کە روخسەتیان بدا بچن سۆراخێکی براکەیان هامان بکەن.

دوای ماوەیەك پیر وای بە باش زانی ساپان و لاپان لەگەڵ دوو کەسی تردا ڕێکیان بخات و نامەیەکیان بۆ مۆغانەکەی ئەویٚ پێدا بنێریٚ و بەناوە ئەوەوە بڕۆنە لای ڕەنگین و بیدوێنن، ئەگەر ویستی بێتە هەورامان ئەو کاتە مۆغانەکەو چەند ریش سپییەك لەگەڵیا بێن بۆ ئەوەی ئەوجا زەماوەندی بۆ بکەن و بێستوون زەمین بە هەورامانەوە ببەستن. جوڵەو چاوین و ساپان و لاپان هەر چوار ڕێکخران لەگەڵ چەند دیاری نایاب و نەختینەی گران بەهادا ببەن و بڕۆن. نەخشەکە وەها بوو تا کارەکەی ڕەنگین مەیسەر نەبیٚ ساپان و لاپان نەکەونە سۆراخکردنی هامانی برایان. نامەیەکی پیر درایە دەستیان بەرەو بێستون زەمین بەرێکران پیر ئامۆژگاری ساپان و لاپانی کرد کە لە بێستون زەمین بەولاوە نەترازێن.

چەند ڕۆژێك پاش چوونی ساپان و لاپان، هەواڵدرا کە هامان گەڕاوەتەوە بەڵام هامانی چی! گیان تەنها لە کوونە لووتیا مابوو، لەمە نزیکی دەگا دەبێتەوە بە دەما دەکەویٚ و ئاگای لە خۆی نامێنیٚ دیارە ڕێگەی سەختی بیٚ نان و بیٚ ئاو هەر ئەوەندە هێزی تیا هێشتووە کە گەیاندبوویەوە ئەو شوێنەی کە ڕێبوارێك دەیناسێتەوەو داوای خێرەومەندان دەکات بیگەیێننەوە ناو دەگا .. بە فەرمانی پیر

فریای دەکەون و شوێن حەواندنەوەو خۆراك پێدانی بۆ تەرخان دەکرێ، دوای شەو ڕۆژێك دێتەوە سەر خۆی و چاو دەکاتەوەو یەکسەر داوای براکانی ساپان و لاپان دەکات.. تێگەیەنرا کە پیر لەگەڵ چەند کەسێکدا بۆ سەفەر ناردوونی و بەو زوانە دەگەڕێنەوە.

کە تەواو هاتەوە سەرخۆی، بردیانە لای پیرشالیار سەربووردەی چوون و هاتنەوەکەی خۆی بەم جۆرە بۆ پیر گێڕایەوە:

(لە چۆڵەواریەکانی ئیلامدا بەبێ پشوودان شەوو ڕۆژێك ڕێ دەبڕن، ئەوان بە سواری ئەو پیادە، نەخۆشی و ماندووبوون وا شەکەتی دەکەن بی ھۆش دەکەوێ و ناتوانێ بروا، سوارەکان لەو چۆڵەوارییەدا بۆ مردن بەجێی دێڵن و لوولە حەمایەڵەکەی دایکی دەبەن و دەڕۆن.. بەرازەوانێك لەو ناوەدا ڕاوە بەراز دەکات کە تووشی دەبێ بەزەیی پیادا دێتەوە، بەهەر حاڵ دەبێ دەیگەیەنێتە ناو ئەو کێڵەی کە دوور لە خەڵك خۆی و خێزانەکەی و تاقە کچێکی تیایدا دەژین کە ژنەکەی بەرازەوانە دەیبینێ ڕەحمی دەچێتە سەری و نگا بانی دەکات. کە حکایەتی خۆی بۆی باس دەکات، دەیناسێتەوە وەلێ خۆی لێ ئاشکرا ناکات، تا بزانێ ئەو بەرەحم پەی بەوە دەبا کە ئەو ئەو خوشکەیەتی کەئەو دەیەوێ سۆراخی بکات! هامان کەکچەکەی بەرازەوانەکە دەبینێ سەرسام دەبێ چونکە کت و مت لە دایکی(ڕەخشان) دەچوو، ئەو ماوەیە کە لەوێ دەبێ خۆی دەکاتە بە لەلەی و هەر لەباوەشی دەکات چەند بەخۆیەوە دەینووسێنێ وا دەزانێ نیگای دایکیەتی وبە بۆن کردنی هەناوی خۆی دەبووژێنێتەوەو وا دەزانێ لە بەهەشتەوە بۆی دێ ڕۆژێك کابرای بەرازەوان لەماڵ دوور دەکەوێتەوە، خوشکەکەی بە ئەنقەست گۆرانییە بە سۆزەکەی دایکی بە هەمان ئاواز پێی دەسۆزێ ئەویش کە گوێی لێ دەبێ بەگوڕ دەگری وفرمێسك بەردەداتەوە.. بە ژنەکە دەڵێ:

- ئەوە گۆرانی دایکی من بوو..

ژنەکە خۆی پێرا ناگیرێ و بەتووند دەست دەکاتە ملی و دەڵێ:

- من لە دایکمەوە هەر ئەو گۆرانیەم بۆ ماوەتەوە... لەوێدا بەیەك شاد دەبنەوە تا دەتوانن پێکەوە تێر دەگرین بە تەکبیری خوشکی بریار دەدەن لای مێردەکەی خۆی ئاشکرا نەکات.

هامان چەند رۆژێك لەوێ دەمێنەتەوەو پێشنیار بۆ خوشکەکەی دەکات کە بەیەکەوە هەرا بکەن وەلێ خوشکەکەی رازی نابێ هەرا کردنی پێ بێ ئەمەکی دەبێ بۆ پیاوێك کە هەردووکیانی لە مردن رزگار کردبوو

رۆژێك بەرازەوانەکە کە لە راوشکار دەگەرێتەوە پیاوێکی بە شان و شەوکەت و خەنجەر لەبەر کەمەرو تیرو کەوان لە شان لەگەڵ خۆیدا دێنێتەوە کە هامان لە دوورەوە دەیبینێ دەزانێ ئەوە کەیمنای برای رەنگین خانە.. دەردەکەوێ ئەویش ویستوویەتی بەرەو تەیسەفۆن برواو رێی لێ بزر بووەو ماوەیەکە لەچۆڵەواری ژیان بەسەر دەبات، لەلای بەرازەوانەکە وا دەداتە قەڵەم کە یەکێکە لە بەگزادەکانی ناوچەی مایە دەشت و خاوەن دەسەڵاتە .. شەو لای ئەوانە دەبێ،وەلێ هامان ناناسێتەوە ئەوانیش پێی نالێن کەئەویش وەك ئەو رێبوارە بەیانی کەرۆژدەبێتەوە بەرەو شاری ئیلام رێی پیشان دەدەن،لەجیاتی ئەو چاکەیە خەنجەرەکەی دەیانداتێ.

رۆژی دوایش هامانیش بەرەو دوا دەگەرێتەوە،وەلێ خووشکەکەی دڵنیادەکات کەزوو خەبەر بەبراکانی دەدات و دێنەلای. ئابەو جۆە سەربووردەکەی خۆی بۆ پیرشالیار گێرایەوە،کەخەمی لەدەست چوونی لوولە حەمایەڵەکەی دایکی بۆ ئەو دەربری پیر دڵی دایەوە ووتی: (ئەوجا دەگاتە دەست شا. چوونکە پاداشتی لەسەرە، وەلێ کە ئەوانە دەگەیەنن لەجیاتی خەڵات وەرگرتن سزامەند دەبن!)

بابڕۆینه لای جووڵەو چاوین و سەپان و لاپان تا بزانیین چیان کرد..جووڵە کەنامەکەی دایە موغانەکە، خستییە سەر چاوی و بەو لووتفەی کەپیرشالیار تیایدا نواندبووی دڵشاد بوو،سەبارەت بەوەی کە ڕەنگینی لەهێشا مارەکردبوو سوپاسیبۆ ناردبوو، پێشی ڕاگەیاندبوو لەجیاتی ئەوو لەباتی باوکیو بەونیشانەی کەموغانی ئەو دێیە، ئەگەر دەکرێ لەگەڵیدا بێتە شاری هەورامان و لەوێ زەماوەندی بۆ بگێڕن، موغانەکەش لەزووەوە حەزی دەکرد ڕەنگین شوو بکات و بڕوات تا دەسەڵات بۆ خۆی بمێنێتەوە،لەوەش زیاتر خەمی ئەوەی لێنشتبووسبەی ڕۆژ هێشا بێت حوکمڕانیان بکات و لەدوایشدا ببێت بەدەهقانی ڕاستەقینەیان، لەبەر ئەوە داواکەی پیرشالیاری بەدەرفەتێکی خۆش بەختانە زانی، پێی وابووئاواتی هاتەدی.. ئەو ڕۆژەی کە چاوەڕوانی دەکرد ئەوەتا هات .. خۆی گەڵێ بە بەختیار زانی ئەوەی لەو ساتەدا دڵی تۆزێ سەخڵەتی دەکرد، بێ سەرو شوێنی کەیمنا بوو ئەویشی دایە دەست بەخت و حوکمی هات و نەهات..

مۆغانەکە لەگەڵ چوار کەسەکەدا چووە لای ڕەنگینو داواکاریەکانی پیرشالیاری پێ ڕاگەیاند..

ڕەنگین پێی شوورەیی بوو خۆی بکاتە بووك و بەرەو هەورامان ئەو هەموو شاخ و دەشت و دەرە ببڕێ!. چییە؟! بووکەو بۆ لای دەزگیران دەڕوا..

مۆغانەکە چونکە مەبەستی خۆی تیا بوو، ڕەنگینی بۆ ئەو کار هەڵدەناو ڕاوتەگبیری بۆ دادەنا، بەوە ڕازی کرد: خۆی و چەند پیاو ماقوڵێکی ئەوێ لەگەڵیدا دەڕون، بەو ناوەوە کە گوا ڕەنگین تووشی نەخۆشییەکی کوشندە بووە، هیچ چارەی نییە ئەوە نەبێ کە ببیەنە هەورامان لای پیری شالیار نزای بۆ بکات

خۆ خەڵکی ئەوێ دەیانزانی ڕەنگین تووشی دەردی عەشق بووەو تاکە دەرمانی ئەڤینداریش گەیشتنە بە خۆشەویستەکەی....

به پیٚ ی ئەو تەگبیرە، بڕیاردرا رەنگین لە ماڵەوە لە هۆدەیەکی تاریکدا خۆی بشارێتەوە، یا وەك جاران سواری ئەسپەکەی ببیٚ و روو بکاتە ئەو شوێنەی کە بۆ دواجار لەگەڵ هێشادا جیا بووەوە.... بەو تەگبیرە مۆغانەکە دەچێتە لای و دەرمانی بۆ دەنوینی کە بیبات بۆ لای پیری شالیار... بەو جورە دەکریٚ بەرەو هەورامان بەڕیٚ بکەون... ئەگەر بە شایی و زەماوەندێکی شایستەو پایەدار پێشوازییان کرد ئەوا لەویٚ دەمێنێتەوە... مۆغانەکە کە بۆی دەرکەوت رەنگین نەخشەکەی پیٚ باشە، لە خۆشیدا پیٚ ی لە زەوی نەدەکەوت، چونکە بە سازدانی ئەو کارە ئەویش پایەی بەرز دەبێتەوەو دەبێتە خاوەن دەسەڵات و شارەکە دەکەوێتە بەر دەستی خۆیَ... ئیدی مۆغانەکە بۆ جێبەجێکردنی نەخشەکە لە هات و چوو نەدەکەوت و رۆژانە دەیان خەونی ئەفسانەوی بە پیرشالیارو ناوچەی هەورامان و رەنگینەوە هەڵدەبەستن و وەك رووداوێك بۆ خەڵکی دەیگێڕانەوە!.

لە شاردا هەواڵ بڵاوکرایەوە کە رەنگین خان تووشی نەخۆشییەکی کوشندە بووە، چارەی نەماوە ئەوە نەبیٚ کە لەگەڵ مۆغانەکەیان و چەند کەسانێکدا بیبەنە لای پیر شالیاری هەورامی.... گوایە چەندان کەس خەونیان دیووە، لە خەونەکانیاندایێیان وتراوە رەنگین رەوانەی لای ئەو بکەن.....

دایکی و کەسو کارەکەی رەنگین چی پێویستی ئەوسەفەرە هەبوو باریان کردو رەنگینیان لەگەڵ مۆغانەکەو چەند کەسانێکی خەڵکی ئەوێداو، لەتەك ئەوانەشدا کەلەلایەن پیرشالیارەوە هاتبوون، بەرەو هەورامان بەرێیان کردن... ساپان و لاپان خەمی هامانی برایان ناو هەناویانی برژاندبوو، ئاگایان لەو خۆشیە نەبوو کە رەنگین خان وەك خاوەری چین بەرەو هەورامان بەریٚ کەوتووە، ماوەیەك رۆیشتن، نیازیان کرد لەقافڵە جیاببنەوەو بە شوێن هامانی برایاندا بڕۆن، خەریك بوو ئامۆژگاریەکەی پیرشالیار بخەنە پشت گوێیان کە پێیانی وتبوو(لەبیستوون زەمین

بەولاوە نەترازێن). هێشتا لەوان نەترا زابوون ڕەنگینیان تێ گەیاند: کەنیازیان چییە .... ڕەنگین وەبیری کەوتەوە براکەیان هامان ماوەیەك لەمەوبەر چووە لای ئەوو پێ ی وتووە، چووە سۆراخی خوشکی بکات،کە بە مەبەست گەیشتووە بەپەلە گەڕاوەتەوە،... کە ساپان و لاپان لە وتەو ناونیشانەکانی هامانی برایان دڵنیا بوون کەوا بەرەو دوا گەڕاوەتەوە ئەوجا زانییان کە پیر بۆچی فەرمووی (لە بێستوون زەمین بەولاوە نەترازێن)... ئەوانیش پڕ بە شەوقەوە بەرەو هەورامان، لەگەڵ کاروانەکەی ڕەنگیندا هەنگاوی بەگوڕیان دەناو لە خۆشیاندا خەریك بوو باڵ بگرنەوە.. بڕیاردرا کە لەمە بەچەند قۆناخێك لە دەگای هەورامان نزیك بوونەوە (چاوین) پێش کاروان بکەێ و زوو هەواڵ بگەیەنێ کە چاوەڕوانی گەیشتنیان بن... سەپان و لاپان داوایان لە کاروانەکە کرد کە یەکێك لەوان بۆ ئەو کارە دابنرێ، ئەوانیش بێ دڵییان نەکردن و لاپانیان دانا، دیار بوو تاسەی شاد بوونەوەی بە هامانی برایان و تینوی هەواڵ زانینی خوشکەیان بێ ئوقرەی کردبوون...

* * *

بەر لەوەی هەواڵ بە دەگا بدرێ کە ڕەنگین بە کۆچ و بارەوە بەرەو هەورامان بەرێوەیە، دەگا خۆی ئامادەکردبوو زەماوەند بۆ نازەنین خان سازبدەن و، پیاو ماقولان بۆ ئەرکی زەماوەندەکە وایان دانابوو هەموو بەیەکەوە هاوکاری تیا بکەن وخەرجی زەماوەندەکە لەسەر هەموویان بێ، زەماوەندێك بۆ نازەنین بگێڕن لەحەوت مەملەکەت دەنگ بداتەوەو حەوت شەوو حەوت ڕۆژ شایی بەردەوام بێ..

هەر هۆزو تیرەیەکی دەگا بە هەوەس خۆی و بە قەد تواناو هەبوون چی لەدەست دێ بۆ زەماوەند بیدا.. ئەمە جگە لەو دەسو دیارییەی کە بەگزادو سەردارو مۆغانەکان بەو بۆنەوە دەیان هێنا... هەنارخان ئەوەی هەیبوو بۆ خەرجی بنیاتنانی پەرستگا و تەلارو خانەو کۆمسای دەری دابوو، ئەوەشی کەمابوو بۆ پیرشالیار درێغی نەبوو، هەمووی بەقوربانی ساتێکی نازینینی کچە تاقانەی دەکرد.

هەموو ئافرەتەکارامەو جلوبەرگدروو و دەسو تەقەڵ خاسەکان ئامادە کران کە خەریك بن و رانەوەستن، جلی بووکێنی بدورن و هونەری دەسودروومانیان بخەنەکار، هەورامان دوو بووکی نازدار: نازەنین خان و بووکی ئاسمان بۆ پیرشالیارو هێشا دەگوێزرێتەوە... دەی دەست و درومان رەنگینەکان پەلە بکەن تەدارەکی ئەو دوو بووك و زاوا بە نموودە بدوورن.

پیرشالیار بەوانەی کە بۆ لای رەنگین ناردنی وای راسپاردبوو: (ئەگەر هاتوو رەنگین بە هاتنی بۆ هەورامان رازی بوو، دوو رۆژە رێ بمێنێ بگەنە پێشەوە یەکێکیان هەواڵ بۆ دەگا بێنێ).

چی ئاغاو سەردارو بەگ و مۆغان و مۆبیدی دەڤەری هەورامان هەبوون بە بۆنەی شایی کردن و گواستنەوەی نازەنینی خواجە بەهمەن بۆ پیرشالیار خوڵك کرابوون کە بێنە شاری هەورامان. پیرشالیار وای دانابوو بەو بۆنەوە بە ئامادەبوونی ئەو هەموو سەردارو مێوانە بۆ یەکەمجار دەرگای پەرستگاکەیان بکاتەوەو هەردوو ئاشەکانیش بخاتەکار....

نەخشەکەی وادانرابوو: چەند رۆژێ بەر لەوەی رەنگین بگاتە بەرەوە شایی و زەماوەند بۆ گواستنەوەی نازەنین ساز بدرێ، رۆژێك پێش ئەو بگات نازەنین بگوێزرێتەوە، ئەو شایی و زەمزەیە کە بۆنازەنین دەکرێ بە هاتنی رەنگین بۆ هێشا

به هه‌مان جۆر گه‌رم بكرێته‌وه‌، ئه‌و رۆژه‌ی كه‌ ره‌نگین ده‌گاته‌ پێشه‌وه‌.. تا به‌ڵكو بۆ رۆژی دوایی ئه‌ویش بكرێته‌ بووك و بۆ هێشاش بگوێزرێته‌وه‌....

كه‌ لاپان گه‌یشته‌وه‌ ده‌گا پاش ئه‌وه‌ی به‌ هامانی برای شادبووه‌وه‌، هه‌واڵی گه‌یاند كه‌ ره‌نگین به‌ كۆچ و باره‌وه‌ دوو رۆژی تر ده‌گاته‌ به‌ره‌وه‌، هه‌ر ئه‌و رۆژه‌ پیر چه‌ندان كه‌سی بۆ پێشوازی ره‌نگین ناردو داوای لێ كردن په‌له‌ی زوو گه‌یشتن نه‌كه‌ن و دوای دوو رۆژی دیكه‌و له‌ساتێكی دیاری كراودا بگه‌نه‌ ناوشار، دوو له‌و كه‌سانه‌ لاپان و هامان بوون، بۆ ئه‌وه‌ش زوو دڵی ساپانی براگه‌وره‌یان خۆشكه‌ن و به‌یه‌ك شادببنه‌وه‌....

چی ده‌نگ خۆش و گۆرانی بێژو سازنده‌و كلاوچی و سازو سه‌متورو زڕنا ژه‌ن و جوزه‌له‌ لێده‌رو ده‌هۆڵ كوت و نه‌قاره‌ژه‌ن هه‌بوون بۆ سازدانی شایی و گه‌رمكردنی هه‌ڵپه‌ركێ و سه‌ما بانگ كران.

ده‌یان ژنی كارامه‌و ده‌سوپلدار بۆ نان په‌چین و خوان دانان و چێشت لێنان دیاری كران، چه‌ندان كه‌سیش بۆ چاودێری ناندین و گه‌له‌هێزم ده‌ست نیشان كران، چه‌ندان گه‌نجی قۆزو لێوه‌شاوه‌ش بۆپێشوازی و دامه‌زراندنی مێوان و ئاوان دانران...

كام ئافره‌ت جوان و كارامه‌و ده‌ست ره‌نگین و لێوه‌شاوه‌و نزیك هاوشانی هه‌نارخان و ژنی كوڕو كۆبوونه‌وه‌وجفات بوو له‌گه‌ڵ چه‌ندان ژنی دیكه‌دا كران به‌، پاوه‌یو، پێخه‌سوو، به‌ربووك ، بۆ رازاندنه‌وه‌و خه‌نه‌به‌ندانی نازنین رێكخران.

جلوبه‌رگی بووكێنی بووك له‌ پارچه‌ی نایاب و قوماشی دانیسقه‌ و گران به‌ها دوورابوون، به‌ پێ ی داب و نه‌ریتی ئه‌وسا نرانه‌ ناو چه‌ند له‌نگه‌رییه‌كی پاك و به‌رین، قۆڵ و په‌راوێزو قه‌راغی داوێنه‌كانیان له‌ لێوی له‌نگه‌ریه‌كانه‌وه‌ شۆڕ كرانه‌وه‌، بۆ ئه‌وه‌ی خه‌ڵك بیانبینێ كه‌ پاوه‌یو له‌كه‌رنه‌ڤاڵێكی تایبه‌تدا له‌ماڵ

زاواوه دەچووه ماڵ بووك، چەند كچێكی جوان و شۆخ ئەو لەنگەریانەیان دەخستە سەرسەریان و لەپێش بەربووكەوه یەك لەدواییەك دەچوون و بەرێ دەكران، هەنارخان و نازەنین و دەستوو پەیوەند لەسەر باڵەخانەكەی خۆیانەوه سەیری كەژاوەی پاوەیویان دەكرد كە بەرەو ماڵی ئەوان بەرێوه بوو...

هەڵپەركێ ی ژنان و بەگزادەو مۆغان و مۆبیدەكان چین لەسەر چین بوو، مۆغان و مۆبیدەكان جۆره هەڵپەركەیەكیان داهێنابوو تا ئەو كاتە ئەو جۆرەهەڵپەركێیە لەناوچەی هەوراماندا لەهیچ شاییەكدا نەكرابوو لەرێكوپێكی و جمان و جووڵەو دەستگرتندا هونەری هەڵپەركێ‌و سەمای كوردەواری گەیاندبووه ئەوپەری جوانی و جاویدانی، پیاوسێ چین‌و چوارچین هەڵدەپەرین، كە ئەوان دەسییان دەگرت خەڵكەكە دەسی بەردەداو سەیری ئەوانییان دەكرد، كە ئەوان دەسیان بەردەدا منداڵان لە سووچێكی مەیدانەكەدا پێكەوه دەسیان دەگرت و لاسایی ئەوانیان دەكردەوه، لای مۆغانەكان وابوو، ئەوەی هەڵپەركێ ی جوان نەزانێ بەندەگی خوای بە جوانی پێ ناكرێ.

كە ئەوان دەسییان بەردەدا، ژنی جوان و شەدەلارو بەژن و باڵا بەرز قریوەیان دەپێكا، یەكێكی كارامەو دڵ رەفێن سەرچۆپی دەگرت و قەتارەیان دەبەست، خشپەی پێیان و لەنجەی بەژنی نەرم و شلیان، بریقەو باقەی لاچەناخ و پلپڵەی بێ ئارام و گێلگێلەی ناو ئەگریجەی خاوو زرنگەو دلێدانی مێخەكبەن و هارەی هەیاسەو كەمەرە، قۆڵ هەڵدان و بادانی چۆپی سەر چۆپی كێش، سیمفۆنییەكی یەزدانی بوو هێزی بەردەوام بوونی ژیانی بەسروشت دەبەخشێ...

كە كەرنەڤاڵی پاژەیو بەرەو ماڵی هەنارخان جما هەموو شاییكەران و گۆرانی بێژان، بەژن و پیاوەوه لەتەك پاوەیودا بە گۆرانی و چەپڵەرێزان بەرەو ئەوێ كەوتنە رێ.

له دووه‌مین رۆژدا ده‌رگای په‌رستگا کرایه‌وه‌و نزای هورمزان له‌لایه‌ن پیرشالیاره‌وه خوێندرایه‌وه‌و خۆشترین خۆشاوو مه‌ی به‌ده‌م مه‌یخواران و ئه‌ڤینداراندا درا، به چه‌پڵه‌رێزان و زڕناو ده‌هۆڵ کوتان‌و به‌زمی(هه‌ی باده‌و باده)ی نه‌واژه‌نانداا هه‌موو شایی گێڕانی به گه‌وره‌و بچووکه‌وه به به‌گزاده‌و ئاغاو مۆغانه‌وه، به ژن و پیاوه‌وه، به‌داراو نه‌داره‌وه، هه‌موو جمان و بۆ گواستنه‌وه‌ی بووك روویان کرده ماڵی هه‌نارخان و ته‌لاره‌که‌ی خواجه به‌همه‌ن.

له‌به‌رده‌م ته‌لاره‌که‌یدا ده‌نگی شایی و زه‌مزه‌مه ده‌گه‌یشته که‌شکه شانی ئاسمان، هه‌مووکه‌یل‌و ده‌م به پێکه‌نین بوون، به‌غه‌مزه‌و نازو خۆنواندنی ئه‌ڤیناوییه‌وه، له فڕکوهۆڕو هاتوو چۆدا بوون، کێ دڵداری هه‌بوو له‌وێدا به‌سه‌ری ده‌کرده‌وه‌و شانی له‌شان ده‌دا.

چاوه‌روانی هاتنه ده‌ره‌وه‌ی بووك بێ ئۆقره‌ییه‌ك بوو ئاگری خۆشه‌ویستی له دڵان به‌ردا بوو.. هه‌موو له چاوه‌روانیدا بوون بووك ده‌رکه‌وێ، هه‌موو ده‌م به‌بزه‌و لێو به خه‌نده بوون، هه‌نارخان نه‌بێ هه‌ردوو چاوی له‌ناو ده‌ریای فرمێسکی یاده‌وه‌ری و سوزی خۆشی و کامه‌رانیدا خنکا بوون، به کوڵ له دڵه‌وه بۆ خواجه ده‌گریاو فرمێسکی خۆشی ئه‌و رۆژه‌ی به‌سه‌ر ئاگری ئه‌و یاده‌وه‌رییه‌دا ده‌کردو زمانی حاڵی ده‌یووت: خواجه خۆزگه ئێستا له گه‌ڵماندا ده‌بووی، ده‌تبینی که چ جۆره شاییێك بۆ نازه‌نین ده‌کرێ.. له‌مه بووك هاته ده‌ره‌وه قریوه‌ی ژنان و ئاوازی هه‌مه ره‌نگه‌ی گۆرانی بێژان هه‌موو ده‌وروو به‌ری هێنایه سه‌ما..

ئه‌و ماینه‌ی که‌بوو سواربوونی بووك ئاماده‌کرابوو جه‌سته‌ی به جوانترین مه‌وج و پۆشمینی ره‌نگاوره‌نگ داپۆشرابوو، هه‌رچوار گۆشه‌ی مه‌وجه‌که به گوڵه‌نگی ریشه درێژی ته‌لا ئامێز رازرابووه‌وه... یاڵ و داوه‌کانی سه‌ری پارچه‌ی هه‌ودای ره‌نگاو ره‌نگی پێوه به‌سرابوو، داوه‌کانی کلکیشی لۆکه‌ی هه‌مه‌ره‌نگه‌ی پێوه

کرابوو  لاس و ساتای پیرخواداد بەجوانترین پۆشاکەوە لەبەردەمیا راوەستابوون، لغاوەکەی لەدەست پیاوێکی کارامەدا بوو، دووکەسی خۆیی و پیاوماقوڵ قۆڵی بووکیان گرت و سواری ئەو ماینەیان کرد، کە بووك لەسەر ماینەکە دامەزرا، لە ژێر تارای تەنکەوە ئەستێرەی گەلاوێژی پشت تەمێکی تەنکی ئاسمانەوە وەها نەدیترابوو بدرۆشێتەوە... بە پێچەوانەی نەریتی بووکانی ترەوە لەمە لەسەرماینەکە سەقامگیر بوو دەسی بە مانای رێزو سڵاو بۆ هەمووان بەرز کردەوە... کناچەی باڵا بەرزو هەرزەکار ئاوێنەی باڵانمایان لەسەر سەرناو لەگەڵ رەوتی جمانی بووکدا دەرۆشتن و ئاوێنەکانیان بۆ بووك رادەگرت....

پاوەیوەکانی ماڵی زاوا سواری ئێسترە خۆشرەوەکانیان بوون و کەوتنە پێش بووك، چەمچە و کەوچکی چێشتی خواردنی ماڵ بووکیان بە پۆشین و لاچەناگەی خۆیاندا کردبوو، بەنازو فیزەوە، بە قیت و قۆڵیەوە خۆیان پیشان دەداو شابانوی ئاریان زەمینیان بەکارەکەری خۆ نەدەزانی، رەشوی ئێسترەکانیان بەدەست کەسانی خۆ بەشت زانەوەبوو. پاوەیوی ماڵی بووك لە دوای بووکەوە دەڕۆیشت، دەبوو ئەو کەسوار بوو خۆی مرومۆچ بکات و بەلای کەسدا نەڕوانێ و وەڵامی کەس نەداتەوە، وەلێ چونکە شووکرنەکە، بە عیشق و ئاوات بوو، ئەویش وەك بووك شادو دەم بە خەندە بوو..

کەرنەڤاڵی بووك بە ئاستەم دەجووڵا، لەهەر چەند هەنگاوێکدا ریزی شایی گەرم دەبوو، تا کەسێکی ناسراوو قسە بیسراو فەرمانی نەدایە کەرنەڤاڵەکە نەدەجولا... کە بە بەرماڵەکاندا تێدەپەری، ژنان لەسەر گوێسە بانەی خانووەکانیان بە تاسەوە چاوەروانی هاتنی بووکیان دەکرد، شایی و خۆشیان بۆ نازەنین دەردەبڕی و نوقڵ و نەبات بارانیان دەکرد، هەندێکیش مشتەگەنم و گوێزو بادامی و مێوژیان بەسەر پاوەیوو بووکدا دەپژان، تا بووك گەیشتە ئەو مەیدانەی

که دوو ڕۆژ بوو شایی تیایدا گەرم بوو کاتێکی زۆری خایاند، هەرچەند سەماکاران و گۆرانی بێژەکان پێیان خۆش نەبوو بەو زوویە گەیشتنە بەرەوە...

که گەیشتنەوە مەیدانەکە پیاو ماقوڵان دەستیان گرتەوەو بەزمی چەپەو بەگزادانەیان دامەزراندەوە، بووك و زاوا_ پیرشالیارو نازەنین_ پێکەوە چوونە ناو ڕێزی شاییەوە، نەکەی‌و نەخۆی سەیری ئەو بووك و زاوایە بکەی، کام بووك و زاوا ؟!. پیرشالیارو نازەنینی خواجە بەهمەن . نازەنینی هەورامان

*         *         *

بە پێ ی نەخشەکەی پیرشالیار چی بۆ نازەنین کرابوو، دەبوو بۆ ڕەنگینیش بکرێ، کە نازەنین کرا بە بووك و گوازرایەوە ناو ئەو تەلارەی کە بۆی دروست کرابوو، دوای دابەزین و دامەزراندنی، پیر فەرمانی دا کە شایی سەرلەنوێ دەست پێ بکاتەوە، هەر ئەوکاتە دایك و باوکی هێشای بانگ کردن و داوای لێ کردن کە سەروکاری شاییەکە بکەن، کە زانرا کۆچ وباری ڕەنگین نزیك بووەتەوە، چی پیاو و ژن و هەرزەو منداڵ هەبوون دەسی هەڵپەرکێیان بەرداو بە گۆرانی و چەپڵە ڕێزان بەرەو پێشوازی ڕەنگین کەوتنە ڕێ.

هەنارخان داوای لە پیرو هێشا کردبوو کە ڕەنگین لە ماڵ ئەوان دابەزێ و لەوێوە بەبووك بۆ ماڵی هێشا بگوێزرێتەوە، پیرشالیاریش پێشنیارەکەی هەنارخانی لاپەسەند بوو...

لەسەر ڕێ ی هاتنی ڕەنگین، لەدەرەوەی شاردا پیرشالیارو هەنارخان و پیرخوادادو هێشاو پیاو ماقوڵانی سەرشایی ڕاوەستان و پێشوازی گەیشتنی

کەژاوەی رەنگینیان دەکرد و هەر لەو شوێنەدا هەڵپەرکێش گەرم بوو، وەلێ لافاوی خەڵك لەوێدا پەنگی نەخواردەوە، بەڵکو خۆیان پێ رانەگیراو رێیان بەرەو رووی هاتنی کاروانەکە گرتەبەر....

کە کەژاوەی رەنگین دەرکەوت، شایی و زەمزەمە و قریووە قریوەی خۆشی ئەو ناوەی پڕ کرد، لەمە نزیك ئەو شوێنە بوونەوە کەپیرو هەنارخان و هێشاو ئەو هەموو حەشاماتەی تێدابوو لەسەر ئەو ولاغەی کە سواری ببوو هاتە خوارەوە...

هێشا پێشکەوت و چوو هەردوو دەستی ئەو مۆغانەی کە لەگەڵیدا هاتبوو ماچکردن و راموسانی لەگەڵ یەکە یەکەی مێوانەکاندا کرد، رەنگین کە چاوی بە هێشا کەوت دڵی پڕ بوو، هێشا نەی زانی چۆن چۆنی بەخێر هاتنی بکاتو حەپەساو هیچی پێ نەوترا، ئەوەندەی نەمابوو ببێ بە خاکی بەر پێ ی و بەسەریدا بڕوات، کە خەڵکەکە هێشایان دی هەردوو دەستی بەخێرهاتنی بۆ درێژ کردبوو هاواریان دەکرد و دەیانووت:(هێشا! بووکی ئاسمانت لێ پیرۆزە..) هێشا هەر ئەوەندەی پێ وترا بەرەنگین بڵێ: (ئازیزەکەم دەبینی پیرشالیارو هەنارخان و ئەو هەموو پیاوە گەورانە بۆ پێشوازی تۆ هاتوون!).

دایکی هێشا پەلاماری داو باوشی پیاکردو کۆمەڵێ ماچی ناڕێکی بە سەردا باران... هەستی کرد بەو ماچانە نارەحەت بوو بۆیە وەك نەوازشێك پێ ی وت:

_ بالا گەردانت بم.. من دایکی هێشام... ئەم ولاتە هەمووی پێشکەشتە...

هەنارخان لێ ی چووە پێشەوەو بە ئاستەم ئەملاو ئەولای ماچ کرد، دایکی هێشا وتی:

– ئەوە هەنارخانەو سەرداری ناوچەی هەورامانە، ئەویش هەردوو دەستی ماچ کردو لە پاشدا لە پیرەوە تا دوا کەس کەبەریز راوەستا بوون بە بەردەمیاندا رابووردو رێزو نەوازشی لێ وەرگرتن...

تا ئەو ناسین و پێشوازی و ژوانە جاویدانە تەواو بوو، ریزی هەڵپەرکێ و سازو سەمتورو زرناژەنان دارو بەردیان بە ئاوازی خۆش و نەوای بە جۆش ئەو ناوەیان مەست و سەرخۆش کردبوو... ئیدی بەرەو ماڵی هەنارخان بەرێ کەوتن، پیرو مێوانەکان و پیاوان پێشکەوتن، ژنانیش هەنارخان و رەنگینیان خستە ناوەراستی خۆیان و بەدوای پیاوەکاندا جمان و هەرچوار دەورەیان سەماو زەمزەمە بوو، ناوی رەنگین و بووکی ئاسمان لەگەڵ ئاوازو نەوای نەیدا تێکەڵاو بەیەك بوون، لەبەردەم تەلارەکەی هەنارخاندا بەزمی هەڵپەرکێ و سەماو زەمزەمە دەسی پێ کردەوە....

ئەو مێوانانە کە لەگەڵ رەنگیندا هاتبوون بۆ حەواندنەوە لە دیوەخانی هەنارخاندا دامەزران، خەڵکەکەش بەرەو مەیدانی شایی و هەڵپەرکێ بە چەپڵەرێزان و سەماکردن گەرانەوە...

لەو رۆژەوە جۆشان بە نازەنینی وتبوو(نازەنین خان! خۆت دیوە؟ تۆ جامێك بەرامبەر بە خۆت رابگرە، تیا بروانە، نازانی ئەوەی ناو جامەکە رەنگینە یان ئەوەی دەرەوەی جامەکە...)

هەنارخان لە تەوقی سەریەوە تابن پێ ی هەر لە سەرنجدانیا بوو.لە دڵ خۆیدا دەیووت: راستە، ئەوەی لەدەرەوە سەیری بکات،کت ومت پێی وایە نازەنینە، وەلێ لە نزیکەوە جیاوازییان هەیە ئەم چاوی مەندە، کوا وەك چاوی نازەنین بریسکەدارە! کوا لووتی وەك لووتی ئەو سفت و سۆو شووشەییە، ئەوەتا هی ئەو نەختێك لە خوارەوە نووکنە!... لێوی ئەم مەیلەو قەیتانییە!.. لە قسەکردندا وەك ئەو رەوان نییە! ئیتر ئەوەی لەتای ترازوودا، بۆ دا نەنا کە ئەو لەسەر شێوە زاری خۆی راهاتبوو!... بەڵام لەبەرو سنگدا وەك خەرمانی گەنم ئاوەدان و پر بوو....

ژنان بەهەنارخانیان دەوت:

_ خانم: دەڵێ ی لەگەڵ نازەنین دا دوانەن !...

هەندێکیان لەناو خۆیاندا دەیانووت: دەڵێی یەك سێون کراون بە دوو لەتەوە... نەیان دەزانی هەنارخان... حەزی لەو جۆرە بەراوردکردنە نەبوو... بەتایبەتی لەو قسانە کە لەپەناوە گوێ ی لێیان دەبوو دەیانووت: تۆ بڵێ ی خوالێخۆش بوو خواجە بەهمەن لەو وڵاتەی رەنگیندا ژنێکی تری نەهێنابێ؟!.

یان هەندێکی تر دەیانووت: جاریێ با ئەم شەو بحەوێتەوەو خۆی تیف تیفە و پاك و پاکیزە بکاتەوەو تۆز رێ‌و تەزووی ماندوویەتی لێ دوور بکەوێتەوە ئەوجا وەرو سەیری بکە... مەگەر نازەنین خان، دەنا کەسی تری ناگاتێ.

کە بەیانی رۆژ بووەوە، دەنگی هەڵپەرکێ و بەزاوابوونی پیر گەیشتە ناو کەمەری ئاسمان... ژنان دەسە دەسە کە دەچوونە لای نازەنین و پیرۆز باییان لێ دەکرد، لەوێشەوە دەچوون سەیری بووکی تازەیان دەکرد، کە دەهاتنە دەرەوە دەیانووت: کامیان رەنگینەو کامیان نازەنین؟! خۆ، لەلای یەك رایان بگری لێت دەشێوێ؟!. سەرسورمان لە ژن هێنان بۆ هێشا بەو جۆرەو لەیەك چونی نازەنین‌و رەنگین گەیشتبووە ئەو رادەیە کەخەڵك ئەو کارە بە مۆدزەیەکی تری پیرشالیار بزانن..

نازەنین پەیامی بۆ دایکی نارد کە حەز دەکا زوو رەنگین ببینێ، ئەویش بۆ ئەوەی بەچاوی خۆی ببینێ کە ئەوان چ شایییەکیان بەبۆنەی ئەوەوە سازداوە، لەگەڵ کۆمەڵێك ژندا بەرەو مەیدانی شایی و زەماوەندو تەلارەکەی نازەنین ناردی، کە لە دوورەوە سەیری چین چینی هەڵپەرکێی کرد بە خوڕ فرمێسك لە چاویەوە دەهاتنە خوارێ... نەزانرا فرمێسکەکانی ئەو وەك هینەکانی هەنارخان بوون، خۆشی و یادەوەریان تێکەڵاو بەیەك دەکرد، یان سەرچاوەیان لەدوور وڵاتی و غەریبییەوە گرتبوو! نەزانرا! فرمێسکەکان دەهاتن و چییان دەگەیاند!.

که چووه لای نازەنین، ماوەیەك بەیەکدا رامان و هەریەك خۆی لەوی تردا دەدییەوە! وەك دوو کۆنە ناسراوی لەیەکتری دابڕاو، باوەشیان بەیەکدا کردو تێر فرمێسکی خۆشیان بۆ یەکتری رژاند!.

رۆژی دوایی که بووك سوار بوو، بەرەو مەیدان هێنایان بۆ ئەوەی لەگەڵ زاوادا هەڵپەڕێ و تا هەموو شاییکەرانیش ببینن، نازەنین خان داوای لە پیر کردبوو حەز دەکا لە گەڵیدا، لە شاییدا دەستبگرێ، پیر داواکەی پەسەند کردبوو... ئەوە بوو هەنارخان و نازەنین لە زووەوە بەڵێنیان دابوو هەرکات هێشا زەماوەند بکات لە شاییەکەیدا هەڵپەڕن..

لەناو ریزی هەڵپەڕکێ ی پیاو ماقوڵاندا نازەنین و رەنگین دەستیان گرت، هەنارخان لە نێوان هەردووکیاندا، پیر لە نێوان نازەنین و خواداداو هێشاش لە نێوان رەنگین و دایکیدا، سەرچۆپیش درابووە دەست (بەهرۆز) باوکی هێشا... ئەگەر چی رەنگین ئەو بەزمەی نەدەزانی و ترازووی رەوتی هەڵپەڕکێکەی لەنگ کردبوو، وەلێ تا ئەمڕۆ شاییەکی دیکەی وەها لەناوچەی هەوراماندا ساز نەدراوە....

ماڵی بەهرۆز لەو سەری دەگاوە بوو، بووك بەرەو ئەوێ کەوتە رێ، لەم پەڕی دەگاوە تا ئەو پەڕی دەگا نوقڵ و نەبات و گەنم و باوی و مێوژ بۆ فەڕو دەرامەت بۆ رێزو سەلامەت بەسەریدا کرا...

ئەو شەوە مێوانەکان لەوێ مانەوە، بەیانی چێشتینگایەکی دەرمنگ لەمەیدانی پەرستگاکەدا گشت مێوانەکان لەلایەن پیرشالیارو تەواوی پیاوو ژنی دەگاوە بەرێ کران...

پیر هەموو مێوانەکانی تێ گەیاند کە دەگای هەورامان هاتن و ماندوو بوونی ئەوان لەبیر ناکات و ئەو پەرستگایە بۆ هەمووان بنیات نراوە، ئەوەی دەیەوێ

منداڵی فێری ئاین و خوێندنی ئاوێستا بکات، پەرستگای بۆ کراوەتەوە...
هەروەها تێ ی گەیاندن: کە ژیانی مرۆڤ کورتەو نابێ لەبێ کاری و تەوەزەلیدا بە فیڕۆی بدرێ، دەشێ تائەو ساتەی دەمرێ لە هەوڵ داندا بێ و خۆی بەکاری چاك و ڕەفتاری چاك و بیری چاکەوە خەریك بکات....

پاش بەبووك چوونی ڕەنگین بە سێ ڕۆژ، لە ماڵی هەنارخانەوە (تەل) تەلانێ بۆ هەردوو بووك و زاوا ئامادەکرا، دوو قازان چێشتی بەتاسوَخ و کۆمەڵێ خەپلەو گێتە مەژگە، دروستکران، ئەوانەی کە تەلەکەیان دەبرد بوون بەدوو پەلەوە، یەکێکیان بۆ ماڵی پیرشالیار ئەوی دیکەیان بۆ ماڵی هێشا، سەرکردەی پەلەکەی ماڵی پیر هوزا بوو، سەرکردەی ئەویتر وارانی پوورە ڕەنێ بوو قازانە چێشتەکەی ماڵی هێشا گەرامە خستییە سەرسەری، ئەوەی ماڵ پیر پەروەر خستییە سەرسەری خۆی...

## (١٦)

دواهەمین میوان بەڕێ کران، کە میوانەکانی بێستون زەمین بوون، ئیدی پیر پەردەژایە سەر ئەوەی دەست بداتە کارو ئاوەدان کردنەوە، هەستی بەوەکرد، ماوەیەکە دەگا باری قورسە و تووشی ماندوو بوون بووەو نۆبەی حەواندنەوەو پشوودان و ڕەوتێکی نوێیە هەیە، ئەو تین و توانایە لەماوەی پێشودا دەری بڕیبوو حەقی پڕکردنەوەی هەبوو، ئەو دەگایە کە جاران بە کپ و ماتی لەناو قاپلکی خۆیدا ئارامی گرتبوو، دەبێ تەکان بە هەنگاوەکانی خۆی بدات و جمان بەرەو هەڵکشان بکات... لەچی کەم بوو؟ ئەو هەموو شاخ و پێدەشت و دەرو ئاوو دارو درخت و ڕووبارە، ئەو هەموو خەڵکە زیت و جوست و هۆشیارو دەست ڕەنگینە، ئەو دوو هێزە ئەگەر بۆ یەکتری بخرێنە کارویەکبگرن، دەگا دەبێتە شارو کاروانسەراو لە بێخی دنیاوە ڕووی تێ دەکەن و لە گێتی دا دەنگ دەداتەوە... ئەگەر ئەو دوو هێزە بخرێنە بەرکار هەردووکیان دەگەشێنەوە، خەڵکەکە بە ڕوێکی ترەوە دێنەوە مەیدان، دەگاش دەبێتە ئەو شارەی کە چرای ڕووناکی بۆ هەموو دەڤەرەکانی تر هەڵ دەکات... لەبەر ئەوە پیرشالیار پەلەی کرد زوو دەست بدرێتە کار، کاری بە پێزو چاك، بەر لە هەموو کارێ دەسی دایە فراوانکردنی مەرێگا و کار پێ سپاردنیان و بوونیان بە پێشەنگی کارمەندان، بەراوێژی پیرو هەنارخان و پیرخوادادو نازەنین و پیاو ماقوڵان وادانرا لەمەولا ئەندامانی مەرێگا بەزستاندا لە

ماڵەوە لەبەر ئاگرداندا پیێ رانەکێشن و لە هاویندا لە سێبەری دارە تووەکاندا پشتوێنی لیێ نەکەنەوە، گویێ قولاخی ئەوە بن یەکێك پرسێکیان بیێ بکات یان گرفتێکی قەوماو بخەنە بەر دەمیان ئەوجا ئەوانیش بەقسەی قوم و قەڵەو بەنازو فیزەوە خۆیان بخەنە ناو کاروباری خەڵکەوەو تەگبیریان بۆ بکەن لە کاتێکدا تەگبیرو ئالیەتی تەگبیر لای خەڵك خۆیانە...

پیر دەیویست ئەندامانی مەرێگا و هەرکەسێك کە دەیەویێ خۆی بکاتە پێشرەوی خەڵك دەبیێ وەك ئاوی ئەو ئاشەی لیێ بیێ لە جوڵە نەکەویێو هەردەم لەکاردا بیێ، دەیویست ئەوانیش دەبیێ هەمیشە لەناو کاردا بجووڵێنو هەمە دەم لەکار دوورنەکەونەوە، خەڵکەکەش وا رابێنن بتوانن لەکاتی تەگانەدا خۆیان تەگبیرکاری خۆیان بن و دەسەپاچە نەبن... لەبەر ئەوە ئەندامانی مەرێگا فرەکران... بەهرۆزو جووڵەو هۆزاو واران و نگین و جۆشان کران بە ئەندام و هەرکەسەی بەپیێی ئارەزوو و توانای خۆی چمکێکی مەرێگای درایە دەست...

هێشا کاری ئەوە بوو، ئەو دەسکەوت و خێرو سەوقات و بووجەی ئاشەکان و دەرامەتی سالانەی پەرستگاکەو ئازووقەو تفاقی دیوەخانی هەنارخان ئاگاداری بکات...

کاروانو کەڵەك بەجووڵە سپێدراوکرا بەسەرقافڵەی ئەو کاروانانە کە کالای ئاوردەو بردەی ساخ دەکردەوە ...

بەهرۆزو واران و جۆشانو هۆزا، دارو درخت و مەڕو مالات و هەولرو لەوەڕگاکانیان پیێ راسپێدرا...

فریاکەوتنی لیێ قەوماوان و مێوانداری بۆ پیرخواداد مایەوە... نازەنین و رەنگین، بۆ فێرکردنی ژنان دانران، فێری ماڵداریو تەون نانەوەی هەلاوەو چنینی مەوج و جاجم و پۆپەشمین نانەوە دووخ رێسان و تفاق دانانی ناومالو ئەوەی کە

پەیوەندی بە ژنانەوە هەبوو... گەرامەکەریش بۆ ئایرەوانی پەرستگاکە... پەروەر بۆسەروکاری کردنی ئاشەکان...

پیر بۆفێرکردن و پێگەیاندنی منداڵان و پاراستنی ئاین و نگابانی ئاوێستاو رێنماییەکانی زەردەشت...

هەنارخانیش دایکی هەمووانەو، ئەو دوادەنگی بیسراویان بوو، هەر ئەو هەموو کارەکانی هەموانی دەنرخاندو حەقی ئافەرین و بەخشینی بەهەر کەسێ کە شایستە بوایە دەبەخشی...

بەو جۆرە پیرشالیار پێشرەوی دەگای هەورامانی بەرەو ئاسۆیەکی روناك و بەرفراوان کرد

* * *

(باوە نەروز) لە دێی سەرگەت دادەنیشت، گەورەترین مۆغانی ناوچەی شارەزوور بوو، تەمنی بەرەو سەد ساڵە هەڵکشا بوو لاهوتێکی کەم وێنەی ئەو سەردەمەی خۆی بوو، گەلێ شتی لەپیر شالیارەوە دەبیست بەڵام بڕوای نەدەکرد، کەسێکی وەها لەو تەمەنەدا بگاتە ئەو پایەو ئەو هەموو مۆدزانەی کەلێ ی دەگێڕنەوە هەبێ، نەك هەر لە مۆزدەکانیدا بەڵکو پێ ی عاجباتی بوو یەکێك لەو تەمەنەدا ئەو هەموو ماریفەتەی کە خەڵك لێوەی دەگێڕنەوە هەبێ!.

ناوبانگی پیرشالیار وەك تیشکی رۆژ بە هەموو لایەکدا بڵاوبووەوە... باوە نەوروز بڕوای نەدەهات کە وابێ و بەرنگاری ئەو هەموو شتانەشی کەلێیان دەگێڕایەوە پێ نەدەکرا، تا وای لێ هات بۆ ئەوەی خۆی دڵنیا بکات و بەدەم خەڵکەوە نەیان بیسێ، بەرەو شاری هەورامان کەوتە رێ، ئەو رۆژەی ئەو گەیشتە ئەوێ پیرشالیار چووبووە ناو رزە دێمەکەیان، خەریکی کێڵانی بنیان و بژارکردنیان بوو، باوە نەوروز خۆی لێ ئاشکرا ناکات لێ ی نزیك دەبێتەوە، بەو

گیاو شەخەڵ و بازەڵەی بن رزەکان کەپیر دەیەوێ بژاریان بکات، دەڵێ (کش ئەوە دەر) واتەکەش بۆ دەرەوە!. گیاو گوڵەکان لەبن درەخت و دەخڵەکان دەردەپەڕن و دێنە دەرەوە، پیرشالیاریش دەزانێ ئەوە کێیە و بۆ کشەی کرد، خۆی لێ گێل دەکات و دەڵێ (کش ئەوە دل) واتەکەش وەرنەوە شوێن خۆتان، گیاو بازەڵەکان دەگەڕێنەوە شوێن خۆیان کە دووبارە (باوە ئەوروێز) کشێکی تریان لێ دەکاتەوە، ئەوجارە گیاکان لە شوێن خۆیان نابزون، بەوا بۆی دەردەکەوێ کە پیرشالیار لەو بەتواناو دەسەڵات دارترە.

پیرشالیار روو دەکاتە (باوە ئەوروێز) و پێ ی دەڵێ:

– گەورەم باوە ئەوروێز جا ئەگەر بە (کش ئەو دەر) خۆمان و خەڵك فێر بکەین، دەبێ واز لە پەنجەو شان و بازووی خۆمان بێنین و سکی خۆمان بەشان خۆماندا بدەین و هۆش و ئەندامەکانی کارمان لەکار بخەین و ببین بە مشەخۆری ئەو (کش ئەوەدەر)ە!.

ئەوجا باوە ئەورۆز تێدەگات پیرشالیار مەبەستی چییە وتەکەی چی دەگەیەنێ، تا ئەوکاتە ئەو پێ ی وا دەبێ نابێ لە ناو پیرەکانی هەوراماندا کەس شان لەشانی بدا... ئەوەتا بۆی دەرکەوت لەحیکمەتزانیو لاهوتدا دەسی بالآیە لاهوتی خەڵك لە ئاسمانی وەهمدا وێڵو بێ سەرو بەرە کەچی هی ئەو لەبەر دەستیایەتیو بە پەنجەکانی هەڵگێڕو وەرگێڕی پێ دەکات، دەبێتە خۆراكو خەڵك فێر دەکات.

بۆ زێدە دڵنیایی لە مۆدزەکانی، پلانێکی بۆ تاقیکردنەوەی لەو بوارەدا بۆ دانا..ئەویش ئەو خێگە (هیزە) رۆنە بوو کە بەناوی دیارییەوە بۆی هێنا بوو، ئەوەی بە کاڵی بیخواردایە تووشی (یاو، لەرزوتا) دەبوو... پیرشالیار لەرووی

نەزاکەتەوە، راستی هێنان و بەدیاری کردنی ئەو خیگە ڕۆنەی وەك پلانێك بەرووی (باوە نەورۆز) دا نەدایەوە، بەرێزەوە لیّ ی وەرگرت.

ئەو ماوەیە کە باوە نەورۆز لەلای پیرشالیار مایەوە، زۆر شتی تری لەپیرشالیارەوە زانی، تەریق دەبووەوە کەپیرشالیار وەك شاگردێك لەبەردەمیدا بەچۆکدا دەهات و رێزی لیّ وەردەگرت...

کە(باوە نەورۆز) بەرەو ئەودیوی هەورامان گەڕایەوە، پیرشالیارخیگە ڕۆنەکەی بەبێ ئەوەی کەس دەستی لیّ بدا، یان تامی بکات، چۆن بەرەیین کرابوو وەها لەگەڵ بارێك زەڕات و هەرزندا بۆی ناردەوە، بەتەوسەوە سوپاسێکی بۆ ئەو خیگە روونەو دیارییە بەنرخەی بۆنارد!.

کە باوە نەورۆز زانی پیلانی خیگە ڕۆنەکەی ئاشکرا بووەو پیرشالیار هەستی پیّ کردووە... لەناخی دڵیەوە باوەڕی هێنا کە کەس لە حیکمەت و ماریفەتدا ناگاتە زانای سیمیار، پیرشالیار ... سەبارەت بەوەی ئەو دەردو بەڵای بۆ نارد ئەویش بارە زەڕات و خەڵەو خۆراك بۆیە داوای نەوازش و لێبوردنی لیّ کردو هەواڵی بۆ ناردو وتبووی: پیرشالیار من کردبیتم تۆ نەیکەی ... بەگەورەیی خۆت بیکە نەك بەوەی ئێمە...

دوای ئەو تاقیکردنەوە هەواڵی بۆ سەرجەمی پیرەکانی هەورامان و دەوروبەر نارد کە هەموویان باوەڕ بە گەورەیی پیرشالیار بێنن و بیکەن بە پیری خۆیان و بە دڵ و بەگیان پیّ ی بڵێن :(پیرشالیار) هەواڵیشی بۆ(کۆسەی هەجیج) نارد کەتا زووە بڕوا بۆلای پیرشالیارو حەزیش دەکا: بەمۆدزەکانی خۆی تاقی بکاتەوە، ئەوجا بۆی دەردەکەویّ کەشایستەی ئەوەیە (پیرشالیار)بیّ یان نا؟...

*   *   *

هەواڵ بە پیرشالیار درا کە (کۆسەی هەجیج) بەبارو بارخانەوە بەرەو شاری هەورامان بەڕێوەیە، ئەویش داوای لە خەڵکی شار کرد ئەوەی حەزی لێیە بۆ پێشوازی کۆسەی هەجیج لەشار بچێتە دەرەوە.

(وەیسە) یەکێك بوو لەوانەی کە بۆ پێشوازی لەگەڵ خەڵکدا چووە دەرەوە، ئەو لە زووەوە ناوی کۆسەی بیستبوو، حەزی دەکرد بیبینێ، تا بزانێ چ کەسێکی مەزن و پایە بەرزە...هاتنەکەی کۆسە دواکەوت و ئەویش لە چاوەڕوانیدا بێزار بوو...هەستی بە جۆرە دڵ تەنگییەك کرد، ئارەزوێکی نهێنی پاڵی پێوەنا کە بەرەو ماڵ بگەڕێتەوەو لەوە زیاتر چاوەڕوانی پێ نەکرا، کەبەرەو ماڵ گەڕایەوە، سەیرێکی ئاسمانی کرد، دووکەڵێکی سپی لەتۆز دەچوو لە ئاسمان لوول دەبوو، دەهاتە خوارەوەو بەسەر شاری هەوراماندا دەباری، دووکەڵەکە نەتۆز بوو نە بەفر، نەتەم بوو نەباران! لە تەمەنی خۆیدا بارینی بەفری وای لەو وەرزەدا نەدیبووی نەیبستبووی، لە وەرزی پایزی وەهاشدا بارینی بەفری وەهاو تۆزاوی و بە گەردەلوولی بەو جۆرە رووی نەدابوو! پێ ی سەیر بوو... کەی ئاسمان بەبێ هەور بەفری باراند بوو! بەفر ساردە، ئەم بەفرە مەیلەو گەرمە!.

دڵ تەنگییەکەی لێ بوو بە دڵە راوکەیەکی وەها هەموو شتێکی لێ تێکدا... لەوە دەترسا لێ ی قەومابێ، یان دەسیان لێ وەشاندبێ بۆیە چاوی رەشکەوپێشکە دەکات، هەر دووچاوی خۆی پرواند، لەناو حەوشەکەی ماڵ خۆیاندا هەڵوەسەیێکی سڵو سەرسامانەی کرد، لەبەفرەکە راما، تۆزێکی سپی بوو! ئەوەتا گوێسەبانەی ماڵەکەیان سپی کردووەتەوە! ئەوەتا سەر سانالەی

سەکۆکەی خوارەوە بەو تۆزە داپۆشراوە! خوایا ئەمە ئەگەر بەفرە بۆ ناتوێتەوە! ئەگەر تۆزە بۆ قورگ پێ ی ناخوێرێتەوە؟!.

سەیرێکی سەربانی ماڵەکانی خوارەوەی کرد، تۆزەکە بە خەستی دەبارییە سەربانە ساودراوەکانی گەڕەکەکانی خوارەوە! خۆی پێ رانەگیراو بانگی ئافتاوی ژنی کرد:

– هۆ ئافتاو؟

– هۆ بەڵێ...

– ئافرەت وەرە دەرەوە، فریام کەوە بزانە من چاوم ڕەشکەو پێشکە دەکات، یان شتێك رووی داوە!.

ئافتاو کەسەیری سەروگوێلاکی وەیسەی مێردی کرد، واقی ورماو وتی:

– ئەوە بۆ وات لێ هاتووە! دەڵێ ی ئاشەوانی و تازە لە ئاش هاتویتەوە... وەیسە! ئەوە بۆ وا سەروگوێلاکت بۆز بووە؟!.

– ئافرەت تۆ سەیری من مەکە... سەیری سەرساناڵەی سەکۆکەمان بکە... سەیری ئەوسەربانانەی خوارەوە بکە، ئەوەی هەم نەمدیوەو نەم بیستووە بەفری گەرم بباریَ یان تۆزی سپی لە ئاسمانەوە رهێڵە بکات و ببێتە خوارەوە! ئافتاو(تەرسوو من تووشو یاوی بیەبو)!.

ئافتاو سەیرێکی دەوروبەری کردو سەری سوڕما، سەرسنگ و گوێچکەی فەرنجیەکەی وەیسەی تەکاند، یەکسەر هاواری کرد:

– (وەیسە ئاردی وارا،ئاردی..!)

ئافتاو چنگێ لەو ئاردەی کەلەسەر کەندەلآنەکەیان باری بوو گیرکردو پڕ مشتێکی لێ ماشییەوە، لەناو لەپی دەستیدا سەری پەنجەی لێداو بە نووکی زمانی چەشتی و دەنگی هەڵبڕی و وتی:

– ئەها!(وەیسە نەواتم ئاردی وارا)..

ئافتاو خەریك بوو لە خۆشیاندا باڵ بگرێتەوەو هەر دەیووت: (ئاردی وارا).

وەیسە لەوە دەترسا ئافتاویش وەك ئەو تووشی (یاو) بووبێ و ئەو تۆزە بارانەیان لێ بووبێ بە ئارد باران... بۆیە وتی:

– ئافتاو دەنگ بەرز مەکەوە با خەڵك بەشێتمان نەزانن... (کەی ئاردی وارێنی).

ئافتاوپڕ هەردوو چنگی ئاردی خڕکردەوەو بردیە بەردەم وەیسەو پێ ی وت:

– کورە، تۆ تەماشا بکە ئەی ئەگەر ئەوە ئارد نییە! چییە؟!. لە مشتومڕی ئافتاو و وەیسە و سەرسوڕمانیان لەو دیاردەیە، پوورە مەنیجی دەرهاوسێیان هاتە دەرەوە، ئافتاو زوو ئاردەکەی ناومشتی پیشان داو وتی:

– (تۆخوا، مەتی مەنیج ئینێ ئاردی نییەنێ؟).

پوورە مەنیجی دنیا دیتە کەسەیری ئافتاوو سەربانەکەی خۆیان و جاجمە راخراوەکەی سەر سەکۆکەی خۆیان کرد پڕ بوو لە ئارد، یەکسەر هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان پان کردنەوەو، دەسی بەوێردو یاسنا خوێندنەوە کردو ستایشی بۆ ئەهرۆمەزدا دەربڕی، دوای تەواوکردنی وێردەکان، رووی کردە ئافتاوو وەیسەو وتی:

– ئەی نازانن کۆسەی هەجیج ئەمرۆ مێوانی پیرشالیارە؟.

هەریەك دەیەوێ مۆدزەی خۆی بۆ ئەویتر بنوێنێ! بارینی ئەم ئاردە نیشانەی گەیشتنی کۆسەی هەجیجەو خۆ نواندنی پیرشالیارە....

ئافتاو پەلاماری دا هەوڕو کاسەوکەوڵ بۆ گلێرکردنەوەی ئارد ئامادە بکات و کەنووەکەیان پڕ بکات... لەوکاتەدا دەنگێك بەناو شاردا بانگێشەی کردو بە خەڵکەکەی راگەیاندو دەیووت:

- جاریٚ کەس ئارد نەماشێتەوە، تا کاروانەکەی کۆسەی هەجیج بەناو دەگادا تێدەپەڕیٚ، باهەر کەسەو بڕواتە سەربانی خۆی، بەدەست خەریکی ماڵینی ئارد بیٚ و بەچاو سەیری کەژاوەکەی کۆسە بکات.

ژنان لەمە گوێیان لەم دەنگە بوو هەموو بە دەفرو هەوڕەکانیانەوە چوونە سەربان.... کە کەژاوەکەی کۆسەی هەجیج گەیشتە پێشەوە، ئەو مۆژدەیە کە دەیویست بەشاری هەورامانی بنوێنیٚ بەتاڵ بوو بووەوە.... مۆژدەکە ئەو کۆمەڵە کەرووڵاغە بوون کە بارە تەڕکیان لیٚ بار کرابوو، بارە تەڕکەکە کرابوون بەمار، ئێسترێکی بارکراو لە تەڕەداری کێکف، لەپێشەوە دەڕۆیشت لەسەر بارەکەوە پیاوێك وەك کۆسە بەبەی هەمەدان سوار ببوو، کڵاوێکی قوچی لەسەر نابوو، بە ئاسوودەیی وەك سانی سانان لەسەر بارەکە دانیشتبوو، دەسی بەریشە شاش‌و واشەکەیدا دەهێناو سەری ئەو گوریسەی کە تەلیسە بارەکەی پیٚ تەنگ درابوو گرتبوو، گوایا ئەژدیهایەو قوڕقوڕاگەی گرتووە، پیاوێکی حوچی لاقۆر درێژیش، لەپێشەیەوە دوورۆیشت و کۆتەرەیەکی قرۆلی، بەسەر شانیەوە نابوو رەشوی ئێستری سەر قافڵەی گرتبوو بەنازو فیزێکەوە بەناو راستەریٚ ی دەگادا بەرەو ئاسانەی پیرشالیار دەرۆیشتن....

کۆسە بارە تەڕکی ئەو هەموو کەرو وڵاغەی بە مۆدزە کردبوون بەمار، هەر بارەمارێکی بەمارێکی شڵی درێژ بەیەکەوە شەتەك دابوون، خۆی لەسەر بارە مارە رەشەکانی ئێسترەکەی سەرقافڵە بەفیزەوە داتیشتبوو، کۆتەرەکەی سەرشانی پیاوە حوچەی رەشووگری ئێسترەکەی کردبوو بە دێوێك، کەچی نەیان زانیبوو لەمە گەیشتبوونە کەناری شاری هەورامان، پیرشالیار مۆدزەکەی لیٚ بەتاڵ کردبوونەوە، بەتەڕکەدار! کەچی کۆسە بەخۆی نەزانیبوو ئەو کەبەناوی شاردا تێپەری بوو، سواری تەڕکەدار بووە، لای خەڵکی ئەوێش شتێکی شوورەی بوو

یەکێك لەسەر بارە دار سوار ببێ، کاتێ کەزانی مۆدزەکانی بەتاڵ بوونەتەوەو بەناو دەگادا تێپەڕی بوو، چەند جار چاوی خۆی هەڵ پشێوی بۆ ئەوەی خۆی دڵنیا بکات کەئایا تەلیسمی مۆدزەکانی خاوکراونەتەوە یان چی؟ کەدی خەڵکەکەی ئەوێ لە خۆی و کاروانەکەی سەرسام نابن، بۆی دەرکەوت کار لە مۆدزەکانی کراوەو پیرشالیار گەورەیی خۆی بەسەریدا زاڵ کردووە...

بەرامبەر بەترس نانەوەی مۆدزەکانی کۆسەی هەجیج، پیرشالیار ئاردی بەسەر خەڵکەکەدا باراندبوو، لەوساڵە بێ دەرامەتەدا بەئارد بارین دڵی خۆش کردن...

کۆسەی هەجیج یەقینی لاپەیدا بوو کە پیرشالیار لەپایەو سایەدا گەلێ بڵندە و بالآیە، لەوانە نییە بە ئەو ببەزێ.

کۆسە کە زانی پیر کاری لە مۆزدەکانی کردووە لەسەر بارە دارەکەی دابەزی و پێش کاروانەکە کەوت، سەری نەوازشی بۆ گەورەیی پیرشالیار دانەواندو پێ ی وت:

– گەورەم من کردبێتم، تۆ نەیکەی!... ئەی پیری گەورە،دەزانی ئەو بارە دارانەم بۆ هێناوە؟ بۆ ئەوەی لە جەژنی (کۆمسای) مەشخەڵی ئاگرە پیرۆزەی پێ خۆش بکەن!.. نەوازشەکەی کۆسە بوو بە زەردەخەنەیەکی تەشەر شانی پشت پەردە، پیر بەخێرهاتنی گەرمی کرد.... هەر لەوکاتەدا ئاسمانەکەی شاری هەورامان وەك سامالێ دوای بەفر بارین ساف و رووناك بووەوەو بارینی ئاردەکە راوەستا، سەربانەکان بەئاردە سپیەکەی سەریان وەك بەت دەدرۆشانەوە، پێشوازی کردنی پیرشالیار بۆ کۆسە وەك دڵێکی شادبوو، هەست بە گەردێك لە سەخڵەت بوونی نەدەکرا...

کۆسە راموسانێکی گەرمی لەگەڵ پیرشالیاردا کردو چاوێکی بەسەر سەربانە سپیەکاندا گێڕا، لەگەڵ روانینەکەی ئەودا پیر یەکسەر ناودڵی خوێندەوەو پێ ی وت:

– باش بوو هاتی، ئەو هەموو وڵاغانەت هێنا، بۆ ئەوەی بەشی خۆتان و (دەگا و هەجیجی) ئارد ببەنەوە...

کۆسەکە ئەو نەزاکەتەی لەپیرەوە دی پەنجەی پەشیمانی گەزت و داوای بەخشینی لێ کردو وتی:

– (وێت مەزانی کێ ئینەش پەنە کەردا)!.

پیر وتی:

– (زانو، زانو، ئانە باوەنەوروژە کەچەڵی، ورنییایی،ئادیچ هەر وێمانە،ئا دارە مەڕیا کەتۆش وستی سەر، وەڵێ تۆنە وێش لوابێ سەرش...) ئەی! لەجیاتی خێرو خۆشی ئەو شارەزوورەمان بۆ بێنی(یاو)ی بۆ ناردبووین.... هاتبوو فێری تەمەڵی دەکردین... گەرکی بوو فێری (کش بۆ دەرەوەمان بکات)..

کۆسەی هەجیج چاك لە فەرمایشتەکانی پیرشالیار حاڵی دەبوو، چەند رۆژێك لای مایەوە، گەلێ شتی بە سوودو نوێ ی لێوە فێر بوو، وەختێ کە گەڕایەوە بۆ هەجیج دەستی خستە ناو دەستی پیرو وتی:

– قوربان تاکە دەسگیری ئێمە هەر تۆ دەبی، تۆیش هەر بە گەورەیی و سەروەری خۆت بکە....

* * *

دەنگەکە وا بڵاوبوو بووەوە!(ئا، وەرویَ کەپیرشالیار جە ماریفەتەنە نامێش بەروَ (وارێنە)). بەڵام نەدەنزانرا! (ئا،وەرویَ ساردەنە! یان گەرمە!... بە گەدەلوولونەیان کرێوەکەرە؟... گیجیا و گێج کەرو یان بەزریانەنە؟.... وەروە تا وەروەکەوتێنە... بەڵێ زانای سیمیار (پیرشالیار) فەرماوانیش (وەرویَ واروَنە، وەروە وەرێنە) چۆن بەفرێك دێت بەفرەکانی تر دەخواتەوە!!...

بەفرەکە لە سارایەکی لماوی تینودا باری بوو، لیتاوەی بە ساراکە کردبوو، هەرەسەکەی لافاوێکی بیَ ئامان بوو، بەرەو وشکانی و خوار نەبوو، بەرەو ئاودانیو هەورازبوو! توقینی لەگەڵ خۆیدا هێنا بوو، بۆ هەرلایەك رووی دەنا بەرباوی دەکرد... هەواڵەکان رۆژ دوای رۆژ لەو بارەوە خەست دەبوونەوەو سامناك تر دەبوون، خەڵکەکە لە منداڵ و زارۆڵەی خۆیان دەیان شاردەوە، بۆ ئەوەی نەتۆقێن....

هەواڵەکان وایان دەگەیاند کە لافاوەکە تەختی ساسانی بەدەم تاڵانەوە داوەوچی نەختینەی ناوی هەبووە، شرۆشیتاڵ کراوەو، هەر پارچەی یەکێك رفاندوویەتی، لەوێشەوە تەوژمی بەرەو ئەکباتانەو ئیلام و بیستوون زەمین هێناوە....

کەس وەکو رەنگین و سیَ کوڕەکەی رەخشان تووشی خەم و نارەحەتی نەبوو بوون، ئەو خەمی ئەوەی بوو هەموو کەسوکاری و دایکە پیرەکەی بکەونە ژێر سمی و وڵاغی برسی و تینوەوە.... سیَ براکەش خەمی ئەوەیان بوو بە خوشکەیان شاد نەبنەوە، بەخۆی منداڵیەوە بەر تاڵانی بکەونو بەرەو سارای خەم راپێچ بکرێنو بەدەم لافاوی ئاڵۆشەوە بدرێن و لەبازاری نەخاساندا بفرۆشرێن...

ڕەنگین داوای لە هێشا کرد، کەلای پیرشالیار تەگبیرێکی بۆ بدۆزێتەوە، هیچ نەبێ دایکە پیرەکەی بۆ ڕزگار بکات...

تەگبیرەکە هاتە سەر ئەوە سێ براکەو گەرامەکەڕ بەرەو بێستون زەمین بگەڕێنەوە، ئەوان خۆشکەکەیان ڕزگار بکەن، گەرامەش فریای دایکی ڕەنگین بکەوێ.

پیرشالیار لە (ماریفەتە)دا وتوویەتی (ئەم جیهانە سرەوتی بۆ نییە، سرەوت دەزێ و شتی تری لێ دەبێتەوە، ئەو شتانەش هەندێکیان ڕوو لە ڕووناکی دەکەن و هەندێکیشیان ڕوو لە تاریکین، وەلێ ئەوانەی کەڕوو لە ڕووناکین زاڵ دەبن... هەڵبەتە گەردوون بەوکارەی مەبەستێکی هەیە.... گەردوون چی دەکا بابیکات بەڵام نابێ مرۆۃ خۆی بەدەم بای تاریکییەوە بدات، دەنا تووش دەبێ و تیایدا دەرناچێ...).

خەڵکەکە لە (کۆمسای) گلێر بوونەوە، گەرگیان بوو بزانن هەواڵەکان گەیشتنە کوێ؟ کە ئایا ئەو لافاوە لەوە زیاتر بەرەو هەوراز هەڵدەکشێ؟ بە شاخەکاندا هەڵدەشاخێ ؟ لە کوێدا پەنگ دەخواتەوە؟ ئەگەر ڕووی لەوانە تەگبیر چییە؟... هەڵبەتە تەگبیر لای پیری پیرانە، پیرشالیار... (کۆمسای) پڕ لە خەڵك ببوو، چۆکیان بە چۆکی یەکترییەوە نابوو، جێ ی کەسێکی تری تیا نەدەبووەوە، دەرزیت هەڵدایە نەدەکەوتە خوارەوە، چەند کەس لەوێ دانیشتبوون بگرە ئەوەندەش لەگەڵ پیردا هاتن، خەڵکەکە کەدییان پیر هات، ویستیان بچنە دەرەوە تا جێ بۆ، ئەوو ئەوانەی کە لەتەکیدا بوون بکەنەوە، ئەویش بەدەست ئاماژەی دا بە هەڵسانەوەو دانیشتنەوەی ئەوانەی پێشوو بە ئاسانی جێ ی هەموویان بووەوە!. ئەوەش کە دەهات هەمدیسان جێی دەبووەوە، خەڵکەکە سەریان لەو دیاردەیە سوڕمابوو، تەماشای خۆیان دەکردو لە بنمیچ و دیوارەکانی (کۆمسای)

ورد دەبوونەوە! نەیان دەزانی: ئایا ئەوان بچووك بوونەتەوە یان (کۆمسای) پان و فراوان بووە!. یان شتێکی تر! سەرسوڕمان لەو مۆدزەیە خەریك بوو هەواڵی لافاوی (وەروە)کەیان لەبیر بباتەوە... کە زانییان ئەوە یەکێکە لە مۆدزەکانی پیر بۆ یەکتریان دەڕوانی و دەنگیان نەدەکردئەوجا پیر ، زوو چووە سەر تەگبیرو وتی:

(خاستەر ئانەن دوێ کەسێ ئەنەیاوێ، دنیا دیدێ بلا پەی دوڵەو(جەڵەولار)ی و (باغوبەرە)ی. ماچا لافاوەکە چاگە پەنگش واردەنۆ... بلا بزانا راستا: هورمزان کوڕان! راستا وێشان شاردەنۆ گەورە گەورەکان! بزانا بەلاو ئا لافاویە روەش ئەوکۆگە نێەنەو نیازیش کوگەن؟).. پیر ئەوەی وت و دانیشتوان بۆ ئەوکارە روویان کردە پیرخوادادی مامی پیرو هێشا، هەردووکیان ئەوکەسانە بوون کە بتوانن راسپاردە ببەن و نامەی راستی بگەیەنن و ئەهریمەنیش شەرم لە ریشی سپی پیرخوادادو ویقاری هێشا دەکاو دەتوانن لە تەنگ و چەڵەی رۆژگار خۆیان دەرباز بکەن.... هەردووکیان زمان زان و دنیا دیدەبوون پیر کەزانی خەڵکەکە بۆ ئەو دووکەسە دەڕوانن ئەوانیان بەدڵە، ئەویش ئەو هەڵبژاردنەی رەت نەکردەوە....

هەر ئەو رۆژە پیرخوادادو هێشا توێشەی رۆیشتنیان لە پشت خۆیان بەست و بەرەو شارەزوور شۆڕبوونەوە، لەوێشەوە بەرەو گەرمەسێرو دوڵی جەڵەولار کەوتنە رێ.... دوای چەند رۆژێ گەیشتنە ئەوێ....

ئەوەی ئەوان لە دوڵی جەڵەولارو باغوبەرەدا دییان وبیستیان نەك جەرگی دەتواندەوە بەڵکو بەردیش بەرگەی نەدەگرت، خەیاڵ نەبوو، رووداو بوو، تا ئەوکاتە شتی وا نەقەومابوو.... لەترسی ئەوەی نەبادا ئەوانیش بکەونە ناوداوی بەندبوون و ئەنفالەوە، زووبەرەو دوا گەڕانەوە، سوپاسی یەزدانیان دەکرد کە توانییان بە پێستی نەوەژێنراوی خۆیانەوە گەڕانەوە!... زانییان کە لافاوی

(وەروە)کە، مرەی دێ و لەسەر لاکی ئەو دێهاتە سەر بڕوانە دەخواو دەکا... بەوەش تەسەلای نەهاتووە دەیەوێ لەدوو قۆڵەوە هەڵکشێ و روو بنێ! قۆڵێکی بەرەو ئەکباتانەو نەهاوەند خۆی تەیار کردووەو قۆڵەکەی تری بەرەو هەولێرو شارەزوور تێ ی تەقاندووە... چی یەخسیرو زارۆك و کناچەو ژنی بەردەست کەوتوون رەوانەی سارای ئەوە نەگێڵای کردوون!.

خوادادو هێشا زوو بەخۆ کەوتن، توانیان خۆیان لە لێشاوی ئەنفال دەرباز بکەن، بەناو زەل و قامیشەڵانی رووباری سیروانددا دەزیان بەرەو دوا بۆ کردو بەرچاو نەکەوتن و گەڕانەوە....

ئەوان نەیان زانیبوو بەرلەوەی بگەنەوە شارەزوور لافاوەکە لە قۆڵێکی ترەوە گەیشتبووە ئەوێ، شاری خۆرماڵی لێ دەرکەی گشت شارەزووری تەخت کردبوو، کە گەیشتنەوە ئەوێ هەردووکیان یەخسیرکران... دیاربوو پێویستیان بەچەند کەسانێك هەبوو، لغاوی ئەوان لەدەم بکات و چاوساغیان بێ، گەلێ ئازاریان دان و مردنیان دەهێنایە بەرچاویان، هێشا کەسێکی ژیرو هۆشیار بوو زانی چۆن مدارایان بکات بۆ ئەوەی لەچنگیان رزگار بێ، کەمێك لێیان چووە پێشەوە، چی لەوان بوو تەواوە، رامبووە، یەکەم شت کە دەربارەی کرا: گرتیان کڵاوی عەورەتیان لێ کردەوە، گوایا سوننەتیان کردووە! وەلێ دەسییان لەپیرخواداد نەدا، چونکە کارێکی تریان پێ ی هەبوو... ئاوا پاداشی چوونە پێشەوەکەی هێشایان دایەوە!... هێشا لەوگەشتەیدا گەلێ شتی بۆ روون بووەوە، بۆی دەرکەوت یەکێك لەوانە کەبووەتە چاوساغی ئەو لافاوە (کەیمنا)ی برای رەنگینی خێزانی بووە، بەرەو ئەکباتانەو نەهاوەند پێشیان کەوتووە!. بەپێ ی نەخشەیەکی ورد کەلەگەڵ پیرخوادادا دایان نابوو هێشا لەگەڵ ئەوەشدا کە بریندار کرابوو، بەگەواڵە گەواڵ دەرباز بوو و خۆی گەیاندەوە بنار شاخەکانی

هەورامان... خۆی گەیاندە(بابا زەردەڵە) کە ئەویش یەکێك بوو لە پیرەکانی ئەو سەردەمەی هەورامان و دەسی حەکیمی هەبوو، ماوەیەك لای ئەو مایەوە... تا برینەکەی چاك نەبووەوە بەرەو شاری هەورامان نەگەرایەوە....

لەشارەزووردا لافاوی تۆقین دەشتەکەی خنکاند بوو، پیرەخوا پەرستەکان لەسەر شاخەکان لەترس کوشتن خۆیان حەشاردابوو، پیرخوادادیان نەکوشت، چونکە دەیانزانی پیاو ماقووڵی شوێن خۆیەتی و خەریکی هەڵ خەڵەتاندنی بوون، کە نەچووە ژێر باریانەوە زیندانیان کرد چونکە کۆلکە ئومێدێکیان پێ ی هەبوو، ئەوان یەکێکیان دەویست رێنموونیان بەرەو شاری هەورامان بوو بکات بۆ ئەوەی دەستیان بگاتە ئەو پیرشالیارە کە دەڵێن: ئاینی زەردەشتی پاراستووەو دەڵێت مرۆڤ چەند هەنگاو بنێ بەرەو رووناکی دەڕوات... ئەوان پێیان وابوو رووناکی ئەوە بوو لای ئەوان سەری هەڵداو کوژایەوە، ئیتر دنیا بەرەو تاریکی هەنگاو دەنێ!!. ئەوەی دەیەوێ لەرووناکیدا بەشدار بێ بڕواتە لای ئەوان تا بەشی بدەن، دەنا سەرو سامان و خوێنی بۆ ئەوان حەڵاڵە!.

کابرایەکی بێ رەچەڵەك و ناکەس بەچەی ناوچەی باغوبەرە ببوو بەچاوساغیان و پێشیان کەوتبوو، ناوی (بەرزۆ) بوو، لەو هەموو تاڵانی و دەسکەوتە ئەوەندە بەشیان دابوو کە ناوەکەیان گۆڕیبوو بۆ(حەمەد) و پاداشیان بەوە دەدایەوە کە گوایا لە دوایدا رەگ و رەچەڵەکی دەبنەوە سەر هۆزێك لە هۆزەکانی خۆیان، ئیتر ئەوە لە دنیاو ئایندەدا دەبێتە مایەی بەختەوەری‌و نگین بۆی!....

ئەو کابرایە خۆی کردبوو بە دۆستی پیرخوادادو هەموو رۆژێ لتە نانێکی لە کەلاوڕۆژنەی زیندانەکەیەوە بۆ فڕێ دەدایە خوارەوەو قسەی لەگەڵدا دەکرد کە رێگەی ئەودیوی هەورامانیان پیشان بداو بەرەو ئەوێ پێشیان بکەوێ!. چەند

مانگێك هەوڵی لەگەڵدا بۆی هەڵ نەخەڵەتا، ئەو خەریکی ئەوە بوو، ئەوانیش کە ئەویان وەك خامینە لەپێیان کردبوو، هەر خەریکی تەفرو توونا کردنی خەڵك و دەردانی گەنجینەو سامانی بەجێماویان بوون...

پیرخواداد لەماوەی ئەو چەند مانگەدا کە لەزینداندا بوو هەر خەریکی خوا پەرستن دەبێ... ئیدی حەوسەڵەی نامێنێ و لەخۆی وەڕس دەبێ... ئەو حەمەدەی کە ڕۆژانە لتەنانێکی لە کلاوڕۆژنەوە بۆ شۆڕ دەکردەوە، ئاگادار دەکاتەوەو پێ ی دەڵی (ئەگەر بەرم نەدەن سبەی کاولی دەکەم، بەخەڵك بڵێ با لەشار بچنە دەرەوە!).. ئەو ئاگاداری ئەوە نەبوو کەشار داری بەسەر بەردییەوە نەمابوو، خەڵکەکەی تەفرو توونا کرابوون، خانوو بەرەیان لەگەڵ زەویدا تەخت ببوون... سەروماڵیان بەتالان و بەر ئەنفال کەوتبوو، ئەوەی بە پێستەکەی خۆیەوە دەرباز ببوو پەنای بۆ ناو کێوو هەردەکان بردبوو، یان لەناو قەلاکەی خۆرماڵدا خۆیان حەشاردابوو،،، کارەساتەکەیان لەوابوو نەیان دەزانی لەبەرچی و چییان کردووە وایان پێ دەکرێ! لەشکری خوێن و تالانی بۆ هاتووەتە سەریان!.

لەشکری وێرانکار بۆ حەواندنەوەو پشودانی دوای نغرۆکردن و سەرژماری دەسکەوتەکانیان لە مێرگەپانەکەی نێوان (تەپە_گولاوی) و (تەپەکوڕە)دا مۆڵ ببوو، (بەکرە سوور) ناوێك کە لەو ساوە تا ئەمڕۆش وردەکارییەکانی مێژووە ڕەشەکەیان بەتاکە وشەیەکیش ناوی نەبردووەو بێزی نەهاتووە ناوی بخاتە ناو ناوانەوە! کە قسەکەی پیرخوادادی بۆ گێردرایەوە کە وتبووی (کاولش کەرو) دایە بەر گاڵتەو قوشمەکردن و بۆ ئەوانەی کە ئەویان بە هەرزان کڕی بوو پەرچەفە دەرکرد بەرلەوان خۆی گاڵتەی بە واچەکەی پیرخواداد دەکردو دەقلایەوە، ئەوانیش نەشوەی کەیل بوونی ئەو وێرانکارییە لە گێژەنەی مرۆیانەی خۆیاندا ترازابوون و گاڵتەیان بەو جۆرە قسانە دەهات.... ئێوارە درەنگێك بوو،

گەردەلوولێك هات و چی پووش و پلاشی ئەو شارەزوورە هەبوو هەمووی ماشییەوەو هێنای بەسەر موڵگەکەیاندا بارانی و لە بنەوە دەوارو کوڵیت و زنجەکانیان بە مێخ و کاریتەوە هەڵتەکاندو چی کاسەو کەلوسیان هەبوو، چی دەسکەوت و تالانیان هەبوو لوولی داو، کەس نەیزانی لە کوێ و لەناو چ چەم و چەخوورێکدا پڕاندی! تەمتوومانێکی خوایی بوو، ئەوەندە خەست و بەتین بوو هیچ شتێك لە بەریدا خۆی نەدەگرت، ولاغ و وشترەکانیان وەك نەقیزەی ژەهراوی بەلاسمتیاندا بکەی پەتیان دەپساندوو یاغی دەبوون و لەناو چاڵ و زەلکاوکاندا لنگاو قوچ دەبوون... پیاوەکانیش بەگوریسەکانی سەریان توونت خۆیان بە مێخی ولاغەکانیانەوە شەتەك دەداو دزداشەکانی بەریان شیتاڵ، شیتاڵ دەبوون و لە ملیان دەئالان و لەسەر عەورەتی خۆیان دەمانەوە، نەفرەتی یەزدان بوو بۆیان هاتە خوارەوە...

پاش ئەو نەفرەتە ئەوەی مابوو تووشی رشانەوە بوو، لەشەو و رۆژێکدا جگە لەو وێرانکارییە کە کردبوویان هیچ ئاسەوارێکی تریان نەما.... تا ئێستاش نەزانراوە، بەکرە سوور لە کوێدا چەقەڵەکانی شارەزوور بەکەللە سەری گاڵتەیان کردووە....

نزاکەی پیرخواداد گیرا بوو، پاش ئەو رووداوە لەسەرخۆ رووی بەرەو شاخەکانی هەورامان ناو (حەمەد)یش لەپەنای ئەودا خۆی لەو کارەساتە رزگار کردو کەوتە دوی ... بەرەو دۆڵی (هانە گەرمەڵە) هەڵکشان، بۆ ئەوەی لە رێگەی (وڵە دەرەوە) بگاتەوە شاری هەورامان، حەمەد تا ئەوکاتە چەشەی کاسەلێسی لەناو زاریدا شیلەی مابوو، لەگوێ ی گادا نووستبوو، نەی زانیبوو ئەوانە تۆزیشیان نەماوە، کەزانی رێگەکەی ئەودیوو لەکوێوە دەست پێ دەکات، دەرفەتی قۆزییەوە خۆی وا پیشان دا (یاوو لەرزەکە) گرتوویەتی، بەشی ئەو لەو

نەفرەتەدا کە بۆ لەشکرەکەی هات (یاوو لەرز) بوو، لە راستیدا لە دۆڵی هانەگەرمەڵەدا یاوەکەی هاتەوەو خۆی کەواند، پیرخواداد خەرقەکەی خۆی پیاداو داوای لێ کرد کەلەژێردا ئارام بگرێ، تا دەڕوا هەندێ مێوەی ئەو ناو باخانەی بۆ شارۆ دەکات..... حەمەد لە ژێر خەرقەکەدا خۆی مات کردو لەژێریشەوە خەریکی دەرفەت هێنان بوو کەخۆی بدزێتەوەو زوو بگەڕێتەوە، کە زانی پیرخواداد ئاگای لێ نییە، دزەیەکی بۆ کردو بەرەو دواگەڕایەوە... پیرخواداد کە هاتەوە لای کە خەرقەکەی لەسەر لادایەوە دی گوم بووە، لەشوێن خەرقەکەیدا هەندێ بەردی کۆمکردن و خەرقەکەی خۆی پیادان، نیشانە بوو کە ئەو کابرایە تا ئەوێ هاتووە، لەوکاتەوە ئەو شوێنە بووەتە مەزارگاو پێ ی دەوترێ مەزاری (حەمەدی غەیبی)! خەڵکی ئەو دەڤەرە بۆ بەردانی (یاوو لەرزو سێبەرۆ) دەچنە سەری!...

پیرخواداد بۆیە نیشانەی لەسەر ئەو شوێنە دانا تا نیشانە بێ کە بەدفەڕی و نەفرەت تا ئەو شوێنە هاتووەو و ئەوەی بەوێدا گوزەر بکات بەردی تێبگری کەچی ئەو بەسەزمانانەی کەئەوێیان کردە مەزارگا، بەچەوتی حاڵی کرابوون کەس تێ ی نەگەیاندبوون کە ئەو کابرایە بەدەم لەرزو تاوە کە دەگاتەوە شارەزوور، خەڵکی ناو قەڵاکەی خۆرماڵ کە لە گوشارو دەورەگرتنی دوژمنان رزگار دەبن و دێنە دەرەوە ئەو کابرایە دەبینن و دەیناسنەوەو پارچە پارچەی دەکەن، پارچەکانی بەدەم لافاوی ئاوەکەی زەڵمەوە دەدەن، بۆ ئەوەی پارچەکانی بۆ ئەو شوێنەی لێ ی هاتووە بباتەوە، نەوەك چەقەڵەکانی شارەزوور دەمی خۆیان بەخوێنەکەی پیس بکەن...

هێشا دەرەنگ گەڕایەوە، برینەکەی تەشەنەی کردبوو، پێ ی شوورەیی بوو بەو برینەوە کە مۆرکی عار پێوەنان بوو بگەڕێتەوە ناوشاری هەورامان، نەیزانیبوو شاری هەورامان، سەرباری ئەو خەمەی کەشارەزووری تیا نوقم ببوو،

بەخەمی گەورەی خۆیەوە خەریکە... هەرپاش دەرچوونی ئەو و پیرخواداد، هەنارخان کۆچی دوایی دەکات و بەر لەگەرانەوەی ئەویش بەچەند رۆژێك پیرشالیاریش گیانی بەرەو بارەگای یەزدان دەگەرێتەوەو شاری هەورامان لە ناو خەم و داخ و پەژارەدا بەجێ دێلێ... کە ئەو هەواڵەی بە گوێدا دەدرێ هەر لەو شوێنەدا بێ هۆش دەکەوێ، لەناو بێ هۆشیدا پیرشالیار دەچێتە خەوی و پێی دەڵێ: (هێشا: نەکەی خەم بخۆی، شاری هەورامان، نازەنین ، رەنگین ، ئەو خەڵکە هەمووی لە ئەستۆی تۆدان، بەو زوانەش پیرخواداد دەگەرێتەوە، یارمەتیت دەدا... هێشا دەزانی ئەو تلانچیانە چی بوون؟ ئەوانە لەشوێن خۆیان نامەیەکیان پێ راسپێردراوە کە خۆیان و خەڵکی پێ حاڵی بکەن، لە هەڵنانی ئەو نامەوە وەربوونەتە گیانی خەڵکی، نامەکەیان لەگەڵ خۆیاندا نەهێناوەو بەدەستی بەتاڵ هاتبوون و بەدەستی بەتاڵیش دەگەرێنەوە.... داخۆ چەند قەرنێك دەبا تا ئەو نامەیە بەسەلامەتی دەگات... کە گەیشت لێ ی حاڵی نابن و شتێکی واتان پێ ناڵێ).

هێشا کە بەهۆش هاتەوە دی خەڵکێکی زۆر لەسەری راوەستاون! لەناویاندا نازەنین و رەنگین سەرتاپا خۆیان بەجلی رەش و کەوە داپۆشیبوو، هەندێکیان چاوی پر فرمێسك و گریانیان سوور هەڵ گەرابوو' هەندێ سەیری کردن و لەپر دەنگی هەڵبری!...

- کوا پیر خواداد!؟ کوا پیر خواداد؟! بانگی بکەن بێتە لام!.

نازەنین لێ ی هاتە قسەو وتی:

- ئێمە بڵێن کوا پیرخواداد! یان تۆ؟!

هێشا وەك تێك چووبێ! وتی!.

- من پێتان بڵێم! یان ئێوە پێم دەڵێن؟!

نازەنین... تووند بەسەریا خوڕی!

- هێشا پێمان بڵێ! کوا پیرخواداد؟

هێشا تۆزێ تر هاتەوە سەرخۆی و، بەوڕماوی سەیری خۆی و ئەوانەی کە لەدەوریا راوەستابوون کردو خەونەکەی پیرشالیاری هاتەوە یاد دای بەسەر خۆیاو وتی:

- بمبەنە سەر ئارامگەکەی ... هۆهۆ پیرشالیارەکەم، هۆ زانای سیمیارو پیری پیران؟! ئەوە بۆ منت بێ کەس هێشتەوە؟ هۆ دایکە ئازیزەکەم هەنارخان! من بێ ئێوە لە هەوراماندا قوڕی کوێ بەسەر خۆمدا بکەم! یەکێکتان پشتان شکاندم ئەویترتان هەناوی دارزاندم! بۆ بەجێتان هێشتم بۆ؟!...

جۆشان و نازەنین و بەهرۆزی باوکی گەلێ دڵیان دایەوەو داوایان لێ کرد، خۆی بگرێ و نزای چاکەیان بۆ بکات...

کە هاتەوە سەرخۆی، باسی یەخسیر بوونی پیرخوادادی بۆ گێڕانەوە، وەلێ دڵنیای کردن کە پیر لەخەوندا پێ ی وتووە، بەو زوانە بە ساغی دەگەڕێتەوە... دوای ئەوەی سەربووردەی رۆیشتن و یەخسیر بوونەکەیان و گەڕانەوەکەی خۆی بۆ گێڕانەوە... چەند کەسێك و باوکی قۆڵیان گرت و بردیانە سەر ئارامگەکەی پیرشالیارو هەنارخان گەلێ بەسەر کێلەکەی پشت سەری پیردا گریا... ئەوەندە ئەسرینی گەرمی بەسەردا رژاند تا گەرمایی فرمێسك مابێ ئەو کیلە نارزێ و دەمێنێ...

دەنگ پەیدا بووکە پیر خواداد گەڕاوەتەوە، ئەویش بەبیستنی کۆچکردنی پیرشالیارو هەنارخان، دنیای لاتاریك بوو، لەو تەمەنە درێژەیدا کەبەسەری بردبوو هیچ خەمێك کاری تێ نەکردبوو، کەچی بەو هەواڵە وای دەزانی چی شاخ و لووتکەی هەورامان هەن هەموویان روخاون و بەسەر ئەودا کەوتوون...

خەڵکەکە لە(کۆمسای)دا کۆبوونەوە، بۆئەوەی بە بۆنەی هاتنەوەی پیرخوادادەوە هەم پرسە تازە بکەنەوە هەم گوێ ی لێ بگرن، پاش پیرشالیارو هەنارخان چی بکەن و خۆیان لەو بەڵای ناگەهانە کە ناوچەی گەمەسێرو گەرمیان و شارەزووری راماڵی چۆن بپارێزن.... ئەویش جگە لەو رووداوانەی لەگەڵ هێشادا بەسەریا هاتبوون شتێکی تری نەوەت... دەرەکانی وتن پاش پیرشالیارو هەنارخان و ئەوکارەساتەی هەموو وڵاتی گرتبووەوە لەناو قوڕگیدا تاسا بوون... هێزی دایە خۆی شتێ بڵێ، وەلێ خەمی مردنی پیرشالیارو هەنارخان و ئەوکارەساتانەی کەبەسەر ناوچەی گەرمەسێرو شارەزووردا هاتبوون وایان تاساندبوو، نەی دەزانی چی بڵێ!.

رێکەوتی ٤/٢/٢٠٠٣

هەولێر

*Roman*

# PÎR ŞALYAR

کەش‌و هەوای ڕۆمانی (پیر شالیار) لە فەزاو
زەمینەی کات‌و شوێنی ئەوسای کوردەواری‌و
ناوچەی هەورامانی پێش سەد ساڵەی هاتنی
ئیسلامەوە هەڵ هێنجنراوە.



Nûsînî
Hemekerîm Hewramî

Silémanî

لە بڵاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری - بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ‌و بڵاوکردنەوە
نرخی (2000) دینارە